# سەردەم

گۆڤـارێكی تایبەتــە بــەوەرگێڕانو كــەلتووری بیــانی
دەزگـــای چـــاپو پەخشـــی ســـەردەم دەریدەكـــات
ژمـــارە ( 4 ) ئـــابی 1999 – ســـاڵی یەكـــەم

خاوەنی ئیمتیاز : شێركۆ بێكەس

سەرنووسەر : ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین : ئازاد بەرزنجی

دەستەی نووسین :

ڕێبین هەردی    ئازاد سدیق محەمەد

دەرهێنانی هونەری : قادر میرخان

ناونیشان:
سلێمانی – فولكەی یەكگرتن
دەزگای چاپو پەخشی سەردەم
تەلەفۆن : 29839

بۆ پەیوەندی كردن لەدەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 00873 761 477 268 – 00873 682 040 391

Fax: 00873 682 040 392 – 00873 761 477 269

بەرگ: ئۆفسێتی دلێر    چاپ : سەردەم    كۆمپیوتەر : جەلیل حسەین

# سەردەم

ژمارە (4) ئابی 1999 ساڵی یەکەم

# وتەیەك

کەس گومانی لەوەنیە کە پرۆسەی گۆڕین لەم سەردەمەدا وەك بوەتە سیمایەکی شارستانی و پێویستیەکی پرپایەخی فەرهەنگی، کارێکی گران و ڕێگایەکی کوڕیشە، چونکە لەلایەکەوە کارێکە لەسەر سیستمی زمان دەکرێت کە فاکتەری سەرەکی گوێزانەوەی بیرو ئەندێشەکانی مرۆڤ و ئەو خەسڵەت و ئەدگارانەیشە کە لە خودی زمانەکە دا هەیە. لەلاکەی ترەوە — بەتایبەتی بۆ ئێمەی کورد— دەست بردنە بۆ بوارگەلێك کە تائێستا لە زەوی ڕەقەنی ئێمەدا زنەیەکی بێداروبارە، وەك بواری فەلسەفە و فیکر و زانستە هەمەجۆر و تەکنەلۆژیا سەراسیمەهێنەکان، کەواتە لە ناو گەرداوی کۆمەڵێك ئیشکالاتتدا، کە لە ئەنجامی دەست بردن بۆ ئەو چەمکانە و ئەو ترسەی لە هەناوی دڵەڕاوکێی کردن و نەکرندا ڕامان دەگرێت ئێمە دەتوانین چی بکەین! ئەمە بە لەبەرچاو گرتنی کۆمەڵێك راستی کە ڕەنگە دووبارە کردنەوەیان کەڵکی هەبێت، وەك نەبوونی پسپۆڕ لە مەیدانی گۆڕیندا بەتایبەت ئەوانەی کە بە قەناعەت و ئارەزووەوە لە نێوەندێکی ئەکادیمیەوە پێ گەیشتوون لە بوارەکەیشدا ئەزموونیان هەیە. ئەمانە لەگەڵ ئەوەیشدا کە کەمن زۆربەیان پەراگەندە و هەندێکیشیان گوێ نەبیستن.

ئەوانی دی کە دیراسەی ئەکادیمی بواری گۆڕینیان نەبوە و لە ڕێگای گۆڕینی ئازادەوە پێگەیشتوون و ئەزموونێکیان هەیە ڕووبەڕووی گەلێك تەنگژە دێن کە چاری بەسەردا زاڵبوونیان ئاسان نیە. وەك نەبوونی فەرهەنگ بۆ هەموو بوارە مەعریفی و ڕووناکبیریەکان، نەبوونی زاراوەی یەکگرتوو کە بۆتە هۆی زاوزێکردنی بەردەوامی بەهەڵەبەکارهێنانی چەمك و وتەزاو موفرەدەکانیش، نەبوونی پێشینەیەکی دەوڵەمەند لەبواری گۆڕیندا بۆ پەیرەوی لێکردن. دەبێت ئەوەیش بڵێین کە زۆربەی هەرەزۆری ئەو فەرهەنگانەی کە هەمانە لە سنووری زمانە ئاساییەکەی قسەکردنی نێو خەڵکی تێناپەڕێت و ئەوانیش پڕ لە کەم و

کووڕین، ئەخۆیان لە زاراوەیەکی فیکری و فەلسەفی داوەو لەبواری زانستی ئینسانی و عەمەلیەکانیشدا وێرانن.

بێجگە لەم ڕلستیە ئاشکرایانە ئێستا لە زانکۆو سازمانە فەرهەنگی و نێوەندە ئەکادیمیەکاندا رایەك لە ئارادایە کە دەبێت بۆ گوێزانەوەی هزری بیرمەندێك و تەکنیکی هونەرمەند و نووسەرێك لەخودی زمانە رەسەنەکەوە دەست پێ بکرێت و دەستی دوەمی گۆرین بیڕەواجە، واتا دەبێت ئێمە راستەوخۆ لە زمانی ئەڵمانیەوە ئاسەوارەکانی هیگڵ و نیچە بکەینە کوردی و گرامشی و دانتیشی لە زمانی ئیتالیەوە بگۆڕین، چونکە ئەو راستیە بۆتە پاساودەری ئەم بانگەشەیە کە زۆرجار جیاوازیەکی دیار لەنێوان دەقە سەرەکیەکەو ئەو گۆڕینانەدا هەبوە کەلەزمانی دوەمەوە کراون، چ لەڕووی گەیاندنی ماناو ناوەڕۆکی بابەتەکانەوە بووبێت یان لە گوێزانەوەی فۆرمدا. ئەگەر بڕوامانبەمە هێنا — بێگومان زۆر راستی تێدایە— دەبێت چاوەڕێکەین تا زمان زانێکی چاکی ئیسپانی گارسیا مارکیزمان بۆ وەرگێرێتە سەر زمانی کوردی و فەرەنسی زانێکی بلیمەتش ڤۆلتێر و سان جۆن بیرسمان بۆ بگۆڕێت، ئەمە لەکاتێکدا کە تەنیا زمان زانین مەرجی رەخساندنی وەرگێڕی هونەرمەند نیە. بۆچی کەمن ئەوانەی زمانی ئینگلزیی دەزانن، بەڵام هەموو ئەوانە دەتوانن دەقێکی فەلسەفی و فیکری، یان تەنانەت دەقێکی ئەدەبی بەبڕشت بکەن بەکوردی؟ ئەی کەمن ئەو عەرەبی زانانەی لای خۆمان کە دەیان ساڵە لە نهێنیەکانی رێزمانی و رەوانبێژی ئەو زمانە دەکۆڵنەوە کەچی تائێستا کارێکی نەوعیان بەرهەم نەهێناوە.

لەڕاستیا هەر دڵسۆزیەکیش بۆ هەرکارێك ئەندازەی تواناو بەهرەمەندی ئەو گروپەی سەرپەرشتی دەکات سنووری بۆ دەکێشێت، واتا ئەندازەی لێزانین و ئەزموون و ئەو زانیاریانەی لە هەر ڕێگایەکەوە بێت دەستیان کەوتوە، توانای ئێمە لەم بوارەدا وەك سەرجەم توانای بەهرەمەندی و ئەفراندنی بوارەکانی تر زۆر خاکیە، بۆیە هەر لە یەکەم ژمارەی گۆڤارەکەمانەوە داوای هاوکاری و، بە پەرۆشەوە چاوەڕێی قەڵەم و قسەی ئەوانە بووین کە بەنیازپاکی ئەم ڕاستیانەیان لەبەرچاوگرتوە و هەر لێرەوە دەستی عەتراویان بۆ راکێشاوین، بێگومان پێزانینی ئێمە لە سنووری چەند وشەیەکی رووتا ناگاتە ئاستی ئەو گیانە گەورانە، وەك چاومان ئەمە دەبینێت دەرگای گوێیشمان لەسەر ئەوانە کلۆمە کە تەنیا لە کون و کەلەبەرە تاریکەکاندا و لەسەر وێرانەی ئێستاو رابوودویان دەخوێنن.

دەرکردنی چوار ژمارەی (سەردەم) بێجگە لە بەرهەم هێنانی گۆڤارێك بۆ ئێمە خوێندنەوەیەکی تایبەتی و پڕ لە ئەزموونی ئەمرۆی روناکبیری کوردیمانە، چ لەبواری وەرگێڕان و بەرجەستەکردنی ئەو ناوانەدا کە تواناو دەسەڵاتیان شایانی لەسەروەستان و جیاکردنەوەیە، چ وەك ئەرك و پێداویستیەکانی هەنووکەیی بوارێك کە مانەوەو گینگڵ و خۆبەدەستەوەنەدانی واقیعی گەرەکە.

سەرنووسەر

# فیکرو فەلسەفە

- مۆدێرنیتی و قەیران



- رۆڵی رۆشنبیر



- خولقێنەر کێیە؟



- پیرفوجیرۆلاس و تاریکخوازیی هاوچەرخ
- محەمەد ئەرگۆن و بیریارانی ئەوروپا

# مۆدێرنیتی و قەیران

- بابەك ئەحمەدی
- و: ڕێبوار سیوەیلی

## بەشی یەکەم

{بینەرێکیت، داواکارێکیت، ئەفرێنەرێکیت، هەر خۆشت داهاتویت و هەم پردێکی بەرەو داهاتوو؛ بەداخەوە بەوێنەی زویرو دەستەوەستاوێکی سەر ئەم پردەیشی}

نیتچە

سالانی هەشتا مۆدێرنیتی بابەتی گفتوگۆ فەلسەفیەکان بوو. هەرچەندە چوارچێوەی گفتوگۆکان تەنیا لەکاری فەیلەسوفەکان خۆیاندا سەقامی نەگرتو بەشێکی زۆر لەبیریارانی زانستە مرۆڤایەتیەکان تیایدا بەشدارییان کرد، بەلام جەختکردنەوە لەسەر(گفتوگۆی فەلسەفی) خالێکی گرنگە، چونکە کۆمەلناسانو تیۆریزانەکانی تری زانستە کۆمەلایەتیەکانیش بەناچاری کەوتنە ناو مەیدانی گفتوگۆی فەلسەفیەوە. ڕەنگە هەر لەبەر ئەم قورساییە پڕ بەها فەلسەفیەش بێت کە ئەورۆکەش – لەکاتێکدا کەهێشتا گەرداوی گفتوگۆو مشتومڕەکان ئارامی نەگرتووە – ناتوانین پێناسەیەکی ورد، هەمەلایەنەو تایبەتیانەی مۆدێرنیتی بکەین.

### مۆدێرنیتی: ماناو لێلی

لەکاتێکدا مێژوو نووسەکان هێشتا لەمەڕ (ئەو ڕۆژگارە مێژوویی یەی پێیدەگوترێ ڕۆژگاری مۆدێرن) هاوڕانەبوون، دەکرێ پێشبینی بکرێ، کەبە خۆهێنانە پێشەوەی فەیلەسووفەکان لەو بوارەدا، چەندە ئاستی (دژوارییەکان بەرز

دەبێتــــەوە. یـــەکێك لەمـــــەزنترینی ئـــــەم فەیلەسووفانە، میشێل فۆکۆ گوتویە: (من هەرگیز بەوردی نەمزانیوە کەئێمە لەزمانی فەرەنسیدا بەچ شتێ ئـەڵێین مۆدێرینتـی، هەڵبـەت بـەو مەبەستەی بۆدلێر بەکاری دەهێنا دەشێت لەمانای زاراوە کە تێبگـەین، بەڵام لەدوای ئـەو، ئیدی ئەو مانایە شتێ نیە بزانرێت.. دیارە ناونیشـان گرنـگ نیـە، هەمیشـە دەتوانـین ناونیشانێکی بەدڵی خۆمانی بـۆ بەکاربـهێنین، بەڵام من نازانم ئـەم ناونیشانە پەیوەندی بەکام جۆرە مەسەلانەوە هەیە[1] ئەوەی خودی فۆکۆ لێرەدا باسی دەکات و من لەبەشی شەشـەم دا دەگەڕێمەوە سەری هیچ لێکچوونێکی نیە لەگەڵ ئـــــەو پێناســــەکردنەی مۆدێرنیتــــــی)دا کەمێژوونووسەکان خستویانەتە روو.

ڕێگەبدەن تـا لەگشتیترین مانـای مێژوویـی مۆدێرنیتــــەوە دەســـــتپێکەین. زۆربـــــەی مێژوونوسەکان کاتێ باسـی (رۆژگـاری مۆدێـرن) دەکـەن مـاوەی نێـوان ڕێنیسـانس و شۆڕشـی فەرەنسایان لەزەیندایە. بەڵام کەسانێکیش هـەن کە سەرەتای بەپیشەسازی بوونی کۆمـەڵگاکانی ئـەوروپا، ســـەرهەڵدانی شـێوەی بەرهەمـهێنانی سەرمایەداری و تەنینـەوەی بەرهەمــهێنانی کـاڵا دەکەنـە ســـەرەتاکەی مۆدێرنیتـی. لەلایـــەکی تریشـەوە هـەندێ نووسـەر سـنووری کۆتـایی مۆدێرنیتـی بەناوەڕاستی سـەدەی بیسـتەمەو تەنانەت بە(ئـەمڕۆ) دادەنێن. کێشـەکە ئـەوەندە لەسەر (دابەشکردنی مێژوویی) نیە، بـەڵکو خـاڵی سـەرەکی ناسینی تایبەتمەندیـە بنەڕەتیـەکانی مۆدێرنیتیە کاتـێ دەگەینـە ئـەم مەسـەلەیەش بەسەر سوورمانەوە تێدەگـەین کەلـەتوندوتیژی ناکۆکیـەکان کەمبۆتـەوە. زۆرن بڕوایـــان وایـــە مۆدێرنیتـی واتـە رۆژگـاری سـەرکەوتنی عـەقڵی مرۆیـــی بەســـەر بـــیروبڕوا نەریتیــــەکاندا (ئەفسانەیی. دینـی، ئـەخلاقی، فەلسـەفی و..)، گەشـەی بیری زانستی و عەقڵانیـەت، زیـادبوونی بایەخی تێڕوانینەکانی فەلسەفی رەخنەگرانە، کە هـەموو ئەمانـە هاوشـانن بەڕێکخسـتنێکی نـوێی بەرهەمهێنان و بازرگانی، دروستبوونی یاسـاکانی ئـاڵوگۆڕی کاڵاکـان، و سـەرکەوتنی پلە بەپلــەی کۆمەڵگای مەدەنی بەسەر دەوڵەتدا. بەم پێیەش، مۆدێرنیتـی کۆمەڵەیــەکی کلتـوری، سیاسـی، ئـابووری، کۆمەڵایـەتی، فەلسـەفی‌یە کـە لەسـەرو بەندی سەدەی پازدەیەمەوە، چاکتر بڵێم، لەکاتی ســەرهەڵدانی ئەســتێرە تازەکانــەوە، داهێنـــانی چاپ و دۆزینـەوەی ئەمـەریکا تـا ئـەمڕۆ، یــاخود چەند دەیەیەك لەمەوپێش درێژەی هەبووە.

بـەم پێیـە سەرنجڕاکێشـی مۆدێرنیتـی کـە بەهۆی دەسـتکەوتە مـادی و فەرهەنگی‌یەکانیـەوە دەناســرێتەوە (و بەئاســانی دەشـێت نــاوی "شارســـتانیەتی نـــوێ"ی بەســـەردا دابڕێـــت) بیروبڕوایــەك دەهێنێتــــەدی کــە لەبنــەمایدا بیروبڕوایـەکی مۆنیستی‌یە: هــاو جـووت لەگـەڵ ئــــەوەی فەیلەســـووفەکانی ڕێنیسانســـیش دەیانگوت، مرۆڤ لەگەڵ سرووشت دەبێتە یەك، و دنیاو مێـژووی بەشـەریەت لەگـەڵ جیهانی بـاڵادا هەم ئاهەنگ دەبن. هەرجۆرە هـێزێکی مەعنـەوی لـەدەرەوەی پانتـایی عـەقڵی مـرۆڤ یەکـەمجار بێبایـەخ دەبێـت، تــاکو لەپاشــاندا بــەجارێ رەتبکرێتـــــەوە، و ئـــــەم عەقڵانیەتــــەو رەتکردنەوەیەی هـێزە نـا سرووشتیەکان هێندە گەشــەدەکات کەلەئـــەنجامدا نیتچــە دەتوانــێ بارودۆخەکــە لەیــەك رســتەدا کورتبکاتـــەوە. سپێدەیەکیان زەردەشتە قەدیسێ دەبینـی، و دوای مشتومڕێکی کـورت، ئـەو دوانـە (وەك دوو کوڕی بچکۆلانە) لێکـدی جودا ئەبنـەوە: (وەلـێ چونکا زەردەشت تـەنیا مایـەوە، بـەدڵی خـۆی گوت/ (دوورنیـە! ئـەم قەدیسـە پـیرە هێشـتا لەجەنگەڵەکـەیدا شتێکی لەمـەڕ ئـەوەی کـەخودا مردووە، نەبیستبێ)[2]

ئەو تێگەیشتنەی کە لەسەر مۆدێرنیتی باسکرا، مۆدێرنیتی لەگەڵ شارستانیەتی نوێدا، کەشارستانیەتێکی هەم مرۆڤ تیایدا رۆخەو هەم چەق وەك یەك دەبینێ‌و دەیکاتە نمونەیەك‌و پێشەنگێك‌و ئۆلگۆیەك. شارستانیەتێك کەلەدڵی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەورووپاوە پێکهات‌و فەرهەنگێکی هێنایەدی، کەبانگەشەی جیهانگرەوەیی دەکات،و لەسەر رێگای کۆمەڵگا دواکەوتووەکان قووت دەبێتەوە، کەواتە بەمانایەك، لێرەدا مۆدێرنیتی‌و وەك ئایدۆلۆژیەك دەخرێتەڕوو. مژدەدەران‌و پێشڕەوەکانی رێنیسانس لەبابەتی (رابلەو مونتنی) کەم تازۆر لەدژی پیرۆزیی هێزە باڵاکان‌و بەسوودی مرۆڤی خاکی، باسیان لەناچاریی عەقڵانیەت‌و تێگەیشتنی بایەخی یاساکانی ژیانی سەرزەوی دەکرد، و رەخنەیان لەسەر نەرێتەکان، دامەزراوەکان‌و هێزە کۆنەکان (لەهەموویان گرنگتر لەکەنیسە) هەموو دەکرێ راشکاوترین‌و تەواوترین شێوەی ئەم ئایدۆلۆژیەش لەئامۆژگاریەکانی میراتگرانی رێنیسانسدا واتە لای رۆشنگەرەکانی سەدەی هەژدەیەم بدۆزینەوە.

ئەوەی ئەمڕۆ لەم (بیرۆکە کلاسیکیەی مۆدێرنیتی) ماوەتەوە، نە گۆشەنیگاو ئاراستە پۆزەتیڤیستانەکەیەتی (خستنەڕووی زەروورەتی ژیان لەکۆمەڵگا یەکدا کەعاقڵانە رێك خرابێت، هەروەکو تۆماس هۆبز و دوای ئەویش رۆشنگەرەکان خستیانەڕوو) بەڵکو لایەنە نەفییەکەیەتی (رەتکەرەوەکەیەتی)، واتە بڕواهێنان بەکارایی هەمەلایەنەو پێویستی‌بوونی بیری رەخنەگرانە، و وێرانکردنی سەراپای ئەوەی لەجەوهەری خۆیدا بەنەرێتە دێرینەکانەوە گرێدراوە. بەم تێگەیشتنەش مۆدێرنیتی رەخنەیەکی بەردەوامە لەنەرێت‌و لەخۆشیی. نوێخوازیی‌و هەنووکەیی بوونە،. بەردەوام تازە بوونەوەو خۆرەتکردن‌و پێهاویشتنە بۆناو بواری تازەیی‌یەکان. زۆربەی بیریارەکانی ئەمڕۆ، کاتێ باسی مۆدێرنیتی ئەکەن هەمان ئەم مانایەیان لەپێش چاوە: کۆمەڵەیەکی ئاڵۆزو کلتووری کەبواری رەتکردنەوە دەرەخسێنێ‌و رێخۆشکەری دەستەڵاتی عەقڵ‌و پایەدارکردنی ئازادییە. کەواتە لەشوێنی خۆیدایە لەمەڕ ئەم تێگەیشتنەوە کەمێ زیاتر تێفکرین. کۆمەڵگایەك بەمۆدێرن ناودەبەین کەبەپێی (یاسا مرۆییەکان) ببرێ بەڕێوە نەك لەسەربنەمای یاساکانی ئاسمان، سیستەمەکەی لەسەر بنەمای عەقڵانیەت‌و کردەوەی حساب بۆکراوی ئەوتۆوە بەندبێ کە بەئاراستەی وەدەستهێنانی ئامانجێکدا بڕوات، واتە کردە زانستی‌و تەکنەلۆژییەکان. بەوتەی ماکس ڤیبەر مۆدێرنیتی رێکخستنی عەقڵانیانە (فیکری رۆشنگەرانە)ی کۆمەڵگایە، جۆرێ لەدابڕانێکی تەواوە لەهەموو بیروبڕوایەکی غایەتناسانە (باوەڕ بەکۆتایی مێژوو، بەکۆمەڵگای نمونەیی‌و یۆتۆپیا)یەو بڕوا هێنانە بەئەنجامە زانستی‌و لەڕوانگەیەکی عەقڵانیەوە ئاراستەکراوەکانە، بەم پێیەش مۆدێرنیتی (سەرەتای پلەکانی دەوڵەتی عەقڵ)ەو بڕواکەیشی هێندە پابەندی بڕواهێنانە بەئاوەزو عەقڵ کە ئەگەر یەکێکیان رەتکەینەوە ئەویتریشیانمان لەدەست دەرئەچێ. کەواتە ئەتوانین لەجێگەی باسکردنی کێشەی مۆدێرنیتی باسی چەمکی (کۆمەڵگای عەقڵانی) بکەین: کۆمەڵگایەك کە عەقڵ تیایدا نەك هەر تەنیا کردە زانستی‌و چالاکیەکانی هونەری – تەکنەلۆژیەکان دەستنیشان دەکات، بەڵکو فۆرمەڵەی شێوەی حکومەت (ژیانی سیاسی)و ژیانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاش دەکات. عەقڵ، بەچەکێکی رەخنەگرانە دەدرێتە قەڵەم کەلەدژی دەستەڵاتی هێزە کۆنەکان‌و نەریتیەکان بەکاردەهێنرێت‌و، تاکە بنەمایەکی رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و

فەردی‌یەو، بەجەوهەری (زەمینی‌کردنی ژیانەوە)، گرێدراوە، واتە لەدوا ئەنجامدا دابڕانێکە لەهەر جۆرە ئەفسوونێکی غایەتگەرانە، بەپێی ئەم پێناسەیەش مۆدێرنیتی بریتیە لەبەرفراوانکردنی هێزی ئیداریی دەوڵەت گەشەدانی زانستی‌و تەکنەلۆژی بەپێی گۆڕانە کۆمەڵایەتیەکان، پشتگوێخستنی بەشێکی زۆری نەریتەکان‌و بیروبڕوا کۆنە فەرهەنگی‌یەکانە.

بەدەربڕینێکی‌تر مۆدێرنیتی بەهەمان ئەندازە بەستراوە بەچەمکی (عەقڵ باوەڕی)یەوە کە بەچەمکی (پێشکەوتن)ەوە، بەمانا فراوانەکەیی‌و، بە(پێشکەوتنی ئاوەزی مرۆڤ)ەوە بەمانا تایبەتیەکەی. واتە گەشەی ئابووری، بەرزبونەوەی ژمارەی دانیشتوانی شار، پێشکەوتنی هۆیەکانی پەیوەندیکردن‌و زانیاری مانای مۆدێرنیتی پێکدەهێنن. مۆدێرنیتی سرووشتی گۆڕییەسەر یاساکانی سرووشت، واتە سرووشتی بەشتێ لەقەڵەم دا کەشایانی ناسین (و لەئەنجامیشدا دەستپێگەیشتوو) بێت‌و هەرچەندەش ئەم ناسینە پڕ زەحمەت بێ هێشتا ئیمکانی هەیە. لەمەش گرنگتر، مۆدێرنیتی خۆی وەك (بابەتێكی ناسێنەر) یاخود (ئایدۆلۆژیای کەشفکردن‌و زانین) ناساند، گەڕیدەیەك بەدوای ئەوپەڕی خۆشبەختی بەشەر لەسەر رووی زەوی، و دۆزەرەوەی ئازادی وەکو خودئاگایی مرۆڤایەتی. بنەمای مۆدێرنیتی وەك هیگڵ خستیەروو بریتیە: لە هەوڵدان بۆ دەستەبەسەراگرتنی سرووشت (رۆحی بابەتی)ی خۆمان دەناسین (واتە دەگەینە خود ئاگایی رۆحی زەینی‌مان). بەڵام رەخنەگرەکانی مۆدێرنیتی ئەوەیان نیشاندابن کەهەرچەندێ زیاتر بەسەر سرووشتدا زاڵ بوین، هێندەش کەمتر خۆمانمان ناسکردووە،و لەهەوڵدانیشدا بۆ گەیشتن بەو دەستەڵاتە، رەگەزی ناسکەر یاخود سۆبژێکت هەمیشە بێبایەخ تر بووە. بەڵام رێگەبدەن بەر لەئاشناییمان لەگەڵ زمانی ئەو رەخنەگرانەدا، جارێ هەر لەسنوری (بانگەشەو خۆشبینی‌یەکانی مۆدێرنیتی)دا بمێنینەوە.

ئایا ئەوانەی مۆدێرنیتیان بە(رەخنەگرتن‌و دابڕان لەنەریتەکان) دەزانی مەبەستیان لەدابڕانێکی رەهابوو؟ ئاشکرایە دوا ئامانجیان دابڕانی رەها بوو، بەڵام ئەم خاڵەیان بەوە نەدەزانی کەلەهەر ساتەوەختێکی مێژووی مۆدێرنیتیدا، دابڕانێکی تەواو بواری بۆ رەخساوە. لەهەموو شێوازێکی (نوێبوونەوە)دا چەندین رەگەزو توخمی کۆنینەو نەریتی دەمێننەوە، هەندێ شت دەگۆڕێن‌و چەندین شتی تازەش بەدیاردەکەون. کەواتە مۆدێرنیتی مانایەکی تەواوخوازی نیە، {بەڵکو} ئامانجێکە. ئەگەر دەکرا هەروا بەئاسانی دەست بەرداری هەرجۆرە نەریتێك ببوینایە ئەوە گەشەو پێشکەوتن مانای پڕ بایەخی خۆیان لەدەست دەدا. بونیادی مۆدێرنیتی لەئامادەیی رەگەزە کۆن‌و نەریتەکان‌و شکڵ گۆڕینیان‌و بەردەوامی ژیانیان لەپاڵ رەگەزە ئەمڕۆیی‌و نوێکاندا، پێك دێت. هەموو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی تێکەڵێکە لەکۆن‌و نوێ پێکهاتووە کەهەم تا ئاستێ نوێ‌یەو تا ئاستێکیش کۆن. شارل بۆدلێر کە یەکێکە لەگەورەترین پێشڕەوە مۆدێرنیتەکان لە(وێنەگەری ژیانی مۆدێرن) (1863)دا نوسیویە/ (مۆدێرنیتی لەجوڵەدایە، زوو رادەبووڕێ، بەڵام شتێکی مومکینە، واتە نیوەی لەهونەرە،و نیوەکەی تریشی نەمرو نەگۆڕە)[3]

کەواتە رەنگە بتوانین بڵێن ئەو مانایەی تائێستا بۆ مۆدێرنیتی قایل بوین نیسبی (رێژەیی)و مێژوویی‌یەو خەسڵەتی نمونەی‌و سەرمەشق بوونی (ئەگەر بەشێوەیەکی تەواویش نەبێ ئەوە تا ئەندازەیەکی زۆر) لەدەستدەدات. ئەوەی وەك جەوهەری حیکمەتەکانی خۆی دەنوێنێ عەقڵە. مۆدێرنیتی بەواتای برواببوون

بەعەقڵ، و هەوڵدان بۆ عەقڵانیکردنی هەرشتێ، تێکشاندنو وێرانکاری نەرێتە کۆمەڵایەتیەکانو بیروڕا دێرینەکان هاوشان لەگەڵ پشتگوێخستنی بەهاکان، هەستەکان، بڕواو، بەکورتی شێوازە مادیو فیکریەکانی ژیانی کۆن. بەکورتی، مۆدێرنیتی ئاراستە وەرگرتنێکی عەقڵانیەو، بەرپرسی تازەکردنەوەیە، نەک هی چینێکی تایبەتو ئاینێکی هەڵبژاردە، بەڵکو هی عەقڵەو (پێویستی مێژووی (ضرورت تاریخی) سەرکەوتنی عەقڵ). عەقڵانیکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی واتە مۆدێرنیزەکردنی ژیان بەشێوەیەکی پێویستو کەمتا زۆر بنەڕەتیانە. (دەستەڵاتداری پێشکەوتنخوان)،(شۆرش جەماوەری)،(ئیرادەی نەتەوەیی)و(کردەی ئاگایانەی چینێکی تایبەت) هیچکامیان هۆکارو جێبەجێکەری مۆدێرنیتی نین. بەرگریکەرانی مۆدێرنیتی بەئاشکرا دەڵێن کەنوێگەریو هەنووکەیی بوون کاری زانست، تەکنەلۆژیو فێرکردنە: خواستێکەو بوێرییەک، ئاراستەیەکە بەرەو تێپەڕبوون لەهەرزەییو قەبووڵکردنی بەرپرسیاری. دەرئەنجامی زانستو تەکنەلۆژیو پەروەردەکردن لەئاستی سیاسیدا پێویستی (دیموکراسی سیاسی) دەهێنێتە پێش واتە پێویستی رێکخستنی دەسەڵات لەسەر بنەمای عەقڵ،

بەرگریکەرانی مۆدێرنیتی بەدڵنیاییەوە دەڵێن کە لەنێوان مۆدێرنیتی، عەقڵباوەڕیو دیموکراسیدا پەیوەندییەکی نەپساو هەیە. بەپێی ئەم تێگەیشتنە، مۆدێرن بوون، هەنووکەییبوون، و بەمانای واقیعی هاوچەرخ بوون؛ لەپڕو بەیارمەتی ئیرادەیەکی بەهێزەوە نایەتە دەست. دیارە حەزی جێهێشتنی هەرزەیی پێویستیەکەو دەبێ بکرێ. بەڵام ئەوە بەتەنیا بەس نیە. مۆدێرن بوون لەڕوانگەی مێژووییەوە قۆناغێکە، کە دەبێ کەم تا زۆر تیایدا فێربین بە عاقڵی بژین، و لەگەڵ ئەمەشدا (یاخود چاکتروایە بڵێم بێ‌پچڕان لەمە) خەباتکردن لەپێناوی ئازادی کۆمەڵایەتیو سیاسیدا. لەسەرەتاوە نووسیم کە ئەمە تاقە تێگەیشتنێك نیە بۆ مۆدێرنیتی. تەنانەت ئەم تێگەیشتنە لەڕوانگەی مێژوویی‌شەوە (کە بەهێزەو لایەنگرانی زۆرشی هەیە) تاقە شێوازێکی تێگەیشتن لەمۆدێرنیتی نیە. ئەو شێوازانەی دیکە، کەفەیلەسووفەکان لەباسەکانی خۆیاندا هێناویاننەتەگۆڕێ پەیوەندیان هەیە بەرەخنەگرتنی ئەوان لەرۆژگاری نوێ یاخود پەیوەندی هەیە (بەتێڕوانینی رەخنەگرانە لەمۆدێرنیتی). بەڵام بەرلەدرێژەدان بەم باسە، دەبێ ئاوڕێ لەچەمکی رەخنەو بیری رەخنەگرانە بدەمەوە.

## بیری رەخنەگرانە

بنەڕەتی وشەی (کریتیك) کە لەسەرجەمی زمانە ئەوروپاییەکاندا بەمانای رەخنە بەکاردێت، دەگەڕێتەوە سەر وشەی Kritesی یۆنانی کە مانای جیاکردنەوەو داوەریکردن دەدات؛ وشەیەك کەلەناو دادگاکاندا بەکاردەهێنرا. سەیرلەوەدایە کەوشەی (کریسیس)یش کەبەمانای قەیران دێت لەهەمان رەگەوە هاتووە. تائێستاش لەفیزیادا ئەم دوو وشەیە لەجیاتی یەکدی بەکاردەهێنن،و بۆ نمونە لەتێرمۆدینامیك دا باسی خاڵی قەیراناوی دەکرێ، یاخود لەرووناکی ناسین دا گۆشەی قەیراناوی دەخرێتەڕوو کە لەهەردوو بارەکەدا شێوەی بەرامبەری وشەی (کریتیك)یش بەکاردەهێنرێت. بەکارهێنانی سەرەکی چەمکی قەیران لەپیشەی پزیشکیدایە. لەگەڵ توندبوونی نەخۆش، قۆناغی قەیراناوی دەستپێدەکات کەتیایدا جەستەی نەخۆشی چیدی توانای نیە بەهۆی بەرگریکردنە ناوەکیەکانی خۆییو رەگەزە پێکهێنەرەکانیەوە بەرگری لەخۆی بکات، ئەگەرچی بڕبڕەی وشەی

کریتیك دەچێتەوە بۆ یۆنانی کۆن، بەڵام ئەو مانایانەی ئەمڕۆ لەم وشەیەیان هەڵدەهێنجین، تەمەنێکی هێندە درێژیان نیە، واتە سەرچاوەی بەشێکی زۆریان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی رۆشنگەری. بەرلەوە کریتیك مانا گەلێکی دیکەی هەبوو. لەزمانی لاتینی دا Critieus Gramaticus دەستنیشانکردنی بنەڕەتی دەق بوو. ئەم مانا تایبەتیو تەکنیکیە هەتا ئێستاش بەکاردەهێنرێ. بۆ نمونە لەزمانی فارسی ئەمڕۆدا دەگوترێ (راستکردنەوەی رەخنەگرانەی غەزەلەکانی حافز). کریتیك لەسەدەی حەڤدەیەمدا مانایەکی تایبەتی بەخۆیەوە گرت:

تێگەیشتن لەمەودای نێوان فەرهەنگی رۆژگاری بەرهەمهێنانی دەق لەگەڵ فەرهەنگی رۆژگاری وەرگرتنی ئەو دەقەوە. ئەم ماناو باسەی هرمنوتیك ئێستاش هەر نرخی خۆی هەیە. کاری رەخنەگر ناسینی مەودای مانای (سەرەکی) دەقو مانای هەنووکەیی ئەو دەقەیە. (پیەربی) لەفەرهەنگی مێژوویی و رەخەگرانە (1697)دا رەخنەی دەق بە(ناسینی هەڵەکانی دانەر)و(تێگەیشتن لەوەی کەدانەر لەچ بوارێکدا زانیاری تەواوی نیە) زانیبوو. بەم پێیەش کاری رەخنەگر لەگەڵ (گەڕان بەدوای راستی)و(زانست)دا بەیەك چاو تەماشا دەکران بەزمانی شکسپیر کریتیك واتە کردەوەی کەسێ کەسنووره پەسەندکراوەکانی ئەخلاقیو ماف رەتبکات، ئەو وشەیە لەناونیشانی تەواوی شانۆنامەکەی مۆلێردا (کریتیکی قوتابخانەی ژنان) مانایەکی تایبەتیو نوێی هەیە: واتە ناسین. لەم نمونانەدا، کریتیك هەمیشە پابەندی بەرامبەرە دوالیستییەکانە واتە جیاکردنەوەی نێوان راستو چەوت، باشوخراپ، زاناییو نەزانی.

لەئەدەبیاتی رۆشنگەریدا وشەی کریتیك بەمانای (داوەریکردنی بەرهەمێکی فیکری یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بوو، ئەمەش تا ئێستا یەکێکە لەمانا گرنگەکانی رەخنەکاری. نووسەرانی زانستنامە (ئینسکلوپیدیا 1705-1770) وەك رۆسۆ، مونتسیکۆو هەروەها ڤیکۆ بەهەمان مانا وشەی (کریتیك) یان بەکارهێناوە. لەوتاری (کریتیك)ی زانستنامەدا، رەخنەکار بەکەسێ لەقەڵەمدراوە کەبتوانێ جیاوازی لەنێوان راستو ناڕاستدا بکات.

لەبواری تایبەتی رەخنەی ئەدەبیو هونەریدا، دەشێت ئەوە بەدیکەین، کە لەکۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا لەئەوروپا، رەخنەگری سەربەخۆ سەریانهەڵدا. بەرلەوەش رەخنە لەبەرهەمی هونەری دەگیرا، بەڵام لەلایەن هونەرمەندانو هەندێ جاریش فەیلەسووفەکانەوە. نووسینەکانی راسین لەبارەی بەرهەمەکانیەوەو ئاماژەکردنی بۆ بەرهەمی شانۆنامەنووسەکانی دی بەو نیەتە بڵاودەبوونەوە کەبنەماکانی کارەکەی خۆی دەقیقتربن، یاخود بۆن جۆنسۆن کە بۆ خۆی شانۆنامە نوسێ بوو کەچی لەمەڕ بەرهەمی هونەری خەڵکانی ترەوە تیۆریزەی دەکرد. خاڵی گرنگ ئەمەیە کەچوارچێوەی بنەڕەتی کاری ئەمانە تیۆریزەکردنو مانەوە بوو لەبواری فەلسەفەی هونەرو جوانناسیدا.، ئەوانەی لەبارەی جوانناسییەوە، لەرێنیسانسەوە تا سەدەی هەژدەیەم دەیاننوسی، رەخنەیان لەبەرهەمێ یاخود بەرهەمەکانی تاقە نووسەرێ نەدەگرت یاخود ئەگەر ئەوەشیان کردبا، ئامانجی بنەڕەتیو لەپێشەوە ئامادەکراویان بریتبوو لەخستنەڕووی هەندێ تیۆری لەمەڕ ئەفراندنو بەرهەمهێنانی هونەرییەوە.

هەرچەندە بەر لەسەدەی هەژدەیەم رەخنە بەمانای داوەریکردن بەکاردەهێنرا، بەڵام کەسانێکی زانای ئەوتۆ هەبوون کەبکەونە داوەریکردنی سەردەمەکەیانورەخنەکاری بیروراو بەرهەمەکان. سوکرات داوەری رۆژگاری خۆییو

راجر بیکۆن بەئاشکرا خۆی بە(نوێنەری عەقڵ) ناودەبرد. مونتنی، ئیراسمۆس و تۆماس مۆر رەخنەگرانی ژیانی کۆمەڵایەتی رۆژگاری خۆیان بوون بەبێ ئەوەی بەرەخنەگر لەقەڵەم بدرێن. بزوتنەوەی چاککردنی ئایینی داوەرییەکی رەخنە کارانە بوو لەئاست دینی رەسمیدا. لەڕاستیا رۆشنگەرەکانیش بەوەی خۆیان ناو دەنا داوەر، ناویشیان بۆ رۆڵی تایبەتی رۆشنبیرانی سەدەکانی پێشوو دەدۆزیەوە. ئەوان قسەکەرەکانی مۆدێرنیتیبوون و لەگۆشەنیگای دەوڵەتی عەقڵەوە دەکەوتنە رەخنەگرتن لەشێوەژیان و بیروڕای هاوچاخەکانی خۆیان. رۆسۆ، کەباسی ناچاریی (رەخنەی هەمەلایەن)ی دەکرد، مرۆڤی دڵپاک و بەبەختی (بەر لەمێژوو)ی لەگەڵ مرۆی داماوی کۆمەڵگای شارستانیدا بەراورد ئەکرد، یاخود گاڵتەجاڕیە بێبەزەییانەکەی ڤۆڵتێر (شێوازێکی مرۆڤانەتری ژیان)ی بۆ هەمان ئەو مرۆ داماوە پێشنیاردەکرد. بەباوەڕی رۆشنگەرەکان عەقڵی رەخنەگرانە هاودەمی عەقڵی زانستی بوو، بەڵام لەجێیەکدا لەو زیاتر دەرۆی بەلای ئەوانەوە بیری زانستی هەڵسەنگاندنێکی وردی واقیعیەت بوو، واقیعیەتێکی ئامادە کەدەشیا بەهۆی ئەزموونکردنەوە ناسبکرێ، بەڵام بیری رەخنەگرانە خستنەڕووی ئەنجامێکی ئایدیاڵی بوو لەبەردەمی هەر پرۆسەیەکدا، ئەنجامێ کەڕەوتی شیکردنەوەی زانستی بەرەو رێگایەکی تایبەت دەبرد. زانا باسی ئەوە دەکات کە هەیەو رەخنەکار یان فەیلەسووف باس لەوە دەکا کەدەبێ هەبێ. بەم پێیەش رەخنە بەکردەیەکی غایەتگەرا لەقەڵەمدرا. شیللەر ئەم خاڵەی بەمجۆرە دەربڕیوە: (هونەر نومایشی رەخنەکارانەی کۆمەڵگایە، و رەخنەکاری نومایشی کردەیەکی ئەخلاقییە).

عەقڵی رەخنەگرانە کە لەزانست زیاتر دەڕوا لەگەڵ عەقڵی فەلسەفیدا بەیەك چاو تەماشاکران. لێرەوە سەدەی هەژدەیەم، بەقسەی ئەرنست کاسیرر ئارەزووی بووە هەم بەسەدەی فەلسەفەو هەم سەدەی رەخنە ناو ببرێ:

ئەم دوو ناونیشانە دوو دەربڕینی جیاوازی یەك باروودۆخن کە دەیانەوێ لەگۆشەنیگای جیاوازەوە، ئەو هێزە عەقڵیە بنەڕەتیەی (سەدەی هەژدەیەمی) گرتۆتەوەو شێوازی بیرکردنەوەی هەمان سەدە پێکدەهێنێ، دەستنیشان بکات. یەکبوونی فەلسەفە لەگەڵ رەخنەی ئەدەبی و جوانناسیدا، لەزەینی هەموو ناودارەکانی ئەم سەدەیەدا بەدیدەکرێ، ئەم بابەتەش بەهیچ شێوەیەك رێکەوت نیە، بەڵکو لەسەر بنەمای یەکبوونی قوڵی و لەبنەمادا ناچارانەی ئەو دوو سنوری بیرکردنەوەیەوە هاتۆتە دی. هەمیشە لەنێوان مەسەلە سەرەکیەکانی فەلسەفەی سیستەماتیکی و مەسەلە سەرەکیەکانی رەخنەی ئەدەبیدا پەیوەندییەکی نزیك لەئارادا بووەو لەدوای دووبارە لەدایکبوونەوەی رۆحی فەلسەفیانە لەسەردەمی رێنسانساندا کەبانگەشەی لەدایکبوونەوەی هونەر و زانستەکانی دەکرد ئەم پەیوەندییە بەکاریگەرییەکی دوولایەنەی بڕیاردەر و بێهۆ {گەیشت}، واتە بەوەرگرتن و بەخشینی بەردەوامی نێوان ئەم دوو سنورە کۆتایی هات.. رۆشنگەری فەلسەفەو رەخنەی ئەدەبی وەك دوو پێکەوە بەسراو، و لەبەرهەمە ناڕاستەوخۆکانیشیاندا بەهاوئاهەنگی یەکتر دەزانێ و هەروەها دەکۆشێ بۆ هەرکامێکیان تاکە سرووشتێکی بدۆزێتەوە. هەر لەم تێگەیشتنەی پێکەوە گرێدراویی فەلسەفەو رەخنەیەو یەکبوونیانیشەوەیە کەجوانناسی سیستەماتیکی (ستاتیکا) لەدایك دەبێت؛ و لەناوەوەی خۆیدا

دوو مەيلی جیاواز رادەگرێ کەهەریەکەیان بەئاڕاستەیەکدا ئیش دەکات،[4]

هەر بەهۆی ئەم (یەکبوونەی فەلەسەفەو رەخنە)وەیە، کە لە وتاری فەیلەسووف (1755)دا، کە دەدرێتە پاڵ دیدرۆ، دەخوێنینەوە: (یاسا دانەر عەوداڵی یەکسانیو راستیە بەڵام فەیلەسووف لەنێوان راستو ناڕاست دا جیاوازی دەکات). هەر لەهەمان وتاردا فەلسەفە بە(خوی رێکخراوی رەخنەکاری) پێناسەکراوە.[5]. رەخنەگرانی رۆشنگەری زۆریان بە(بابەتگەرایی)،(زانست گەرایی)و(بڕوای رۆشنگەرەکان بەعەقڵ) کردووە، بەڵام خاڵی گرنگ لەوەدایە کەهەموو ئەم رەخنەگرانە خۆیان شتێکیان لەرۆشنگەرییەوە بۆ ماوەتەوە: بڕوا بەبیری رەخنەگرانە.

فەلسەفەی رۆشنگەری لەکردەی سیاسی خۆیدا بەشۆڕشی فەرەنسا گەیشتەوە، بەڵام میراتە عەقڵانیەکەی لەشوێنێکیدی بەکارهات. فەیلەسووفە ئایدیاڵیەکانی ئەڵمانیا کەسایەتی فەیلەسووفن وەك رەخنەکار – داوەر بەیارمەتی رۆشنگەرەکان ناسی. کانت لەکتێبی (هەڵسەنگاندنی عەقڵی پەتی)دا (1781). کاری رەخنەگری وەك کاری داوەرەکانی دادگا لەقەڵەمدا، و لەپێشەکی هەمان کتێبدا، هێندە چووە پێش کەبەرۆژگاری خۆی بڵێ (سەردەمی رەخنە)و نووسی. (سەردەمی ئێمە سەردەمی راستەقینەی هەڵسەنگاندن {رەخنە}یە کەپێویستە هەموو شتێ لەژێر رکێفیدا بێت) [6]. هەروەها لەوتاری (رۆشنگەری چییە؟)دا سەرنجی بۆ ئەم خاڵە راکێشا کە: رۆشنگەرەکان هەوڵیاندا رەخنەگرانە رۆژگاری خۆیان بناسنەوە. واتە تێگەیشتنو دەرکی ئەمرۆیان بەمەسەلەی گرنگی فەلسەفە دانا. رەخنەکاری لەمۆدێرنیتی جیانابێتەوە. ئەمەش شتێکە دەکرێ لەبەرهەمەکانی کانت دا، کەبەدروستی ناوی (فەیلەسووفی مۆدێرنیتی)یان لێناوە، بەڕوونی بدۆزرێتەوە، مۆدێرنیتی لەسەر بنەمای رەخنەگرتن لەنەریتەکانەوە شێوازی گرتووەو، بەردەوامیش بەپشتیوانی گوتاری رەخنەگرانە بەرەو پێشچووە. حوکمی کانت بێگومان بەمانای گواستنەوەیە لەدۆگماتیزمەوە بەرەو بیری رەخنەگرانە بەڵام کانت بەپێچەوانەی رۆشنگەرەکانەوە سەودای بنیاتنانی (زانست نامە)ی لەسەرا نەبوو، وە پێچەوانەی هیگڵیشەوە بەوەسوەسەی دانانی (سیستەمی زانستی فەلسەفیانە) دووچارنەبوو. پتەوی بناغەکانی رەخنەکاری لەبیری کانت دا بووە رێگر لەبەردەمی دروستبوونی سیستەم دا. ئەو هەمیشە کریتیکی بەمانا یۆنانییەکەی، واتە وەك هەڵسەنگاندن. بەوێنەی داوەرییەك دەخستەڕوو. حوکمی بنەڕەتی کانت ئەوەیە کەدەڵێ، بەبێ هەڵسەنگاندنو داوەری ورد نابێ هیچ شتێ قەبووڵ بکەین، و بەر لەنرخاندنی سنوورەکانی ناسین، ناتوانین لەهیچ نرخێ دڵنیابین، کانت لەسێ کتێبی گرنگیدا خۆی بۆ هەڵسەنگاندن یان رەخنەکاری عەقڵی رەها، عەقڵی پراکتیکیو هێزی داوەریکردن تەرخانکرد. بۆ هەڵسەنگاندنیش پێویستیمان بەپێوەر و سەنگێکی مەحەك هەیە. دەشێت سەرجەمی ئەو کۆشکە فەلسەفیە بەرزەی کانت هەڵیچنی بەهەوڵدانێکی بێماندووبوون دابنرێ لەپێناوی گەیشتن بەو سەنگی مەحەکەدا.

لەکاتێکدا بەلای رۆشنگەرەکانەوە، رەخنەکاری واتە (لەدەرەوە داوەریکردن)ەو وردبوونەوە لەدەق، یان لەکردە، یاخود لەئایدیاڵێك وەك بابەتێك؛ بەلای کانتەوە رەخنەکاری کردەیەك لەناوەوەی زەین، عەقڵ خۆی هەڵدەسەنگێنێو خۆی دەنرخێنێ لەسەر دێری هەڵسەنگاندنی عەقڵی پەتیدا وردییەك هەیە: عەقڵی پەتی هەم کردەی هەڵسەنگاندن

بەئـــەنجام دەگەیـــەنێت و هـــەم خۆیشـــی هەڵدەســـەنگێنرێ. جێبەجێکـــەری ئـــەم هەڵسەنگاندنەش (لایەنێکی دەرەکی) نیە، بـەڵکو لـەکردەی هەڵسـەنگاندندا لـەخۆی بـەئاگادێت و خۆی دەنرخێنێ. کەواتە عـەقڵاندنی رەخنـەکاری قووڵبوونەوەیە کە لەبارەی هەلومەرجەکان یاخود ئیمکانی گەیشتن بـەزانین. یـاخود بـەدەربڕینێکی باشـتر، قووڵبونەوەیـە لـەبارەی سـنوورەکانی دانایی‌یـەوە. کـانت دەپرسـێ کەهەل‌ومـەرج و سـنوورەکانی زانیـاری ئێمـە کامانـەن؟ کـام هەل‌ومەرجانە بوارمـان بـۆ دەرەخسێنن ئێمـە سـەبارەت بەجیهانی سروشتی و زەینـی خۆمـان بزانین؟

هەڵسـەنگاندنی عـەقڵی پـەتی لـەو پرسـیارە سەرەکیەوە دەستپێدەکا، کە بۆچی زەینی ئێمـە دەرەوە بەشێوەیەکی (سیستەمدار و رێك وپێـك) دەبینـێ؟ ئێمـە بـەردەوام جیهان وەك دنیایـەکی پێکهاتو لەشتە سیستەمدارەکان دەبینین. هـێزی تێگەیشتنی ئێمـە نـەك واقیعی بابـەتی، بـەڵکو رووخسارێکی بنـەڕەتی و سیستـەمدار دەهێنێتـە بەرهەم کەتیایدا واقیعیـەت دێتـە پێش چاومـان و دەزانرێـت، هـەموو شـتێ بـەو جـۆرە شـێواز وەردەگرێ کەبتوانین لەرێگەی زانستی پێشترەوە یـاخود بـەهۆی هـێزی تێگەیشـتنی خۆمانـەوە بیانناسـین، ئـەم دووبـارە عەقڵانیکردنـەی هەل‌ومەرجەکانی زانین باسی سەرەکی کانت بوو، کەئەمڕۆکـەش لـەبواری باسـکردنی (یاسـا زمانیـــەکان)ی زمانـــەوانی هاوچـــەرخداو لەدۆزینـــەوەی یاســـاکانی بونیادگـــەریدا بەکاردەبرێت.

هیگڵ یەکەمجار بـەمانا کانتی‌یەکـەی چـەمکی رەخنـەکاری پەسـەندکرد پاشـان لـە(ئۆدیسـەی رۆح)دا جێگەی کردەوە. تـێڕوانینی رەخنـەکارانە بـەلای ئـەوەوە، واتـە خودئاگـایی رۆح. رەخنـە بەئاگابوونەوەی رەخنـەکارە لەشـوێنگەی خـۆی. رەخنـەکاری بـالاترە لەهەڵسـەنگاندنی بـیروڕاو تـــەعالی‌کردن {بڵندبونەوەیـــە}. دەســـتەواژە بەناوبانگەکـەی هیگـڵ، واتـە Auflaebung بەهـــەردوو مانـــای رەتکردنـــەوەو تـــەعالی رۆشنکەرەوەی ئەم مانا تازەیەی رەخنەکاری‌یـەو لێکدی جودانین. مۆدێرنیتی پلەیەکە لەکامڵبوونی رۆح بەرەو ئازادی. رۆژگاری مۆدێـرن بـەپێی ئـەو حوکمە بەناوبانگەی کـە لەپێشـەکی دیاردەناسی رۆح (1806)دا هـــاتووە (دەورانـــی گـــۆڕان و ئاڵوگۆڕە. گران نیـە تێبگـەین کـەرۆژگاری ئێمـە، ســـەردەمی لـــەدایکبوون و گواســـتنەوەیە بـــۆ سەردەمێکی نوێ. رۆح لەو شـوێنە جیادەبێتـەوە کە تا ئێستا دنیای بووەو لەوێ مـەنزڵی گرتـووە، و بەوێنای دەکـرد، و دەیـەوێ ئـەم دنیایـە بداتـە دەست رابردوو. رۆح گیرۆدەی گۆڕینـی خۆیـەتی)[7] خـود ئاگـای رۆح گرنگـترین رەوتـی رۆژگـاری تازەیەو بیری رەخنەکارانـەش بنـەمای ئـەو خـود ئاگایی‌یـە یـە. هیگـڵ کەبنـەمای مۆدێرنیتـی بە(رەگەزێکی زەینی و خود گـەرا – سۆبژەکتیف –) دەزانـی، دەینووسـی خـود ئاگـایی پێویسـتی بەئازادی، قووڵبوونـەوە، فەردیـەت، سـەربەخۆیی کرداروو لەهەمووشی گرنگتر پێویستی بەرەخنەیەو ئەمـە خـاڵێکی تـازە نیـە کـەهیگڵ بـۆ یەکـەمجار لەدیاردەناسـی رۆح دا خسـتبێتیەڕوو. ئـەو پێنـج سـاڵ پێشـتر لـەدانراوێکی گرنگیـدا بـەناوی جەوهەری رەخنـەی فەلسـەفی (ینـار 1801)کە زۆر کەم ناسراوەو خوێندراوەتەوە، روونیکردبۆوە کەرەخنەکاری پابەندی قووڵبوونەوەیە لەخودێکی دیاردەناسانەدا، کەتایبەتمەندی رۆژگاری ئێمەیە.

هیگـڵ لـەوێدا رەخنـەکاری بەبەشـێك لـەو تایبەتمەندیەی رۆحـی زەینـی لەقەڵـەم دابوو کـە بۆخۆی کوری رۆژگاری نوێیە.[8]

لـــەلای پـــەیرەوکاران و قوتابیەکانیشـــی رەخنەکاری وەك گرنگترین میراتی هیگڵ مایەوە. لەبەرهەمی هیگڵی‌یە لاوەکاندا، ئەوەندەی سوود

لەوشـــەی رەخنـــەکاری وەرگـــیراوە لـــەهیچ وشـەیەکی تـر وەرنـەگیراوە. مـارکس‌و ئینگلـس لـەکتێبی خـێزانی پـیرۆز (1845)دا رەخنـەیان گرتـووە لـەو (شـێوازی رەخنەگرانەیـەی سـەرنج لــەخودی رەخنەگرانــە دەدات)، پاشـــانیش لـەئایدیۆلۆژی ئـەڵمانی (1846)دا نوسـیویانە: (رەخنـەکاری ئـەڵمانی تـا دوایـین هەوڵدانـەکانی، هــەرگیز سـنوری فەلسـەفەی جێنەهێشـتو پێشنیارە فەلسەفیەکانی خۆی بـەهیچ شـێوەیەك تاقینـەکردەوە، بـەڵکو بـەردەوام خـاڵ‌و مەسـەلە بنەڕەتیەکەی لەسیستەمێکی فەلسەفی تایبـەتدا، کەهیگڵە، بەدەستبەسەری مایـەوە. بـەهۆی ئـەم پابەندبونەیشـیەوە بەهیگڵـــەوە، رەخنـــەگرە مۆدێرنـەکان نـەیانتوانی رەخنەیـەکی بـەرفراوان لـەخودی سیسـتەمی هیگـڵ بگـرن، ئەگـەرچی هەریەك لەوان دەیویست لـەهیگڵی تێپـەڕێنێ)[9] خـودی مـارکس رەخنەیەکی لەسـەر سیسـتەمی هیگـڵ پێشـکەش کـردو زۆر هـەوڵیدا لـەوی تێپەڕکات، بەڵام جێی ئەوەیە پرسیار بکرێ ئایا لەمـەڕ خـودی رەخنەکاری‌یـەوە، واتـە لـەبواری تێگەیشـتنی بنـەڕەتیدا لـەکردەی رەتکردنـەوەو تـەعالی؛ توانـی لـەهیگڵی تێپـەڕێنێ یـان نـەء؟ مـــارکس جـارێك ئـەم جیاوازیـەی بـەکورتی روونکردەوە. ئـەو لە رەخنـە لـەبیروڕای هیگـڵ لەمـەڕ دەوڵـەت (1843)دا بـەمجۆرە نووسـی: (رەخنەی راستەقینەی فەلسـەفی لەهـەر شـتێکی ئامادە، خـۆی بەخستنەڕووی دژایەتیـەکانی ئـەو شـتەوە سـنووردار ناکـات، بـەڵکو روونیـــان دەکاتـەوە، سـەرچاوەو پێویسـتی بوونەکـەیان دەناسێ، و دەلالەتی تایبەتیان دەدۆزێتەوە ئـەم ناسـینە بەپێچەوانـــەی ئـــەوەی هیگـڵ بـیری لێدەکـردەوە ئاشـکراکردنی یاسـاکانی لۆژیـك لەهەرشتێکدا نیـە. بـەڵکو ئاشکراکردنی لۆژیکی تایبـەتی هەرشـتێکی تایبەتـە).[10] رەخنـە لـەئابووری سیاسـی کـە ناونیشـانی دووەمـی یەکـەمین بـەرگی سـەرمایە (1867)و هـەروەها گروندریســـە (1857–1858)یـــە، وەك رەتکردنـەوەو تـەعالی (ئاشـکراکردنی لۆژیکێکـی تایبـەتی) ئـابووری کلاسـیك لـە (حاڵـەتێکی تایبەت)دا. هەمان ئەم خاڵە لەمەڕ (رەخنـەکاری ئـایدۆلۆژی)شـەوە هـەر راسـتە. رەخنەیـەك، کەبناغەکەی لەبەرهەمەکانی لاوێتی مارکس لەمەڕ لەخود نامۆبوونـەوە دادەنرا، و دواجار دەکرێ تەواو ترین شێوازی دەربڕین لەبەشی چوارەمی یەکـەمین بەشی سـەرمایەدا بەناونیشانی (بـەبت بوونی رازو رەمزی کاڵاکان)دا ببینرێتەوە.

چ بمانـــەوێ وەك کـــانت رەخنـــە بەهەڵەسەنگاندن لێك بدەینەوە، یان وەك هیگڵ‌و مـارکس بەڕەتکردنـەوەو تـەعالی بدەینـە قەڵـەم، لـــەتۆڕی بەرامبـــەرە دوالیســـتی‌یەکانی راست/ناڕاست‌و چاك/خراپ دا گیرۆدەین. لـەم بارودۆخانەدا رەخنـەگر بـەپێی پێوەرێك داوەری دەکـات، ئەگـەر پێوەرەکـەی راسـت بـێ ئـەوە راسـتی لای ئـەوە واتـە توانیویـەتی لایەنـە ناڕاستەکانی بابەتی رەخنەکاریەکەی بناسێتەوە، بـەڵام هـــەرکاتێ پێوەرەکـــەی هەڵـــەبێ، هەڵسەنگاندنەکەیشـی هیـچ نرخێکـی نیـە. بەبۆچوونی هیگڵ ئایدیای رەهاو بەبڕوای مـارکس (پراکتیکی کۆمەڵایەتی) دەریئەخەن ئایا پێوەری رەخنەگر راستە یـان نـەء. واتـە خـودی رەخنـە بەشـتێ (بـاڵاتر لەرەخنـە) هەڵدەســـەنگێنرێ. گـەورەترین رەخنـەکارەکانی سـەدەی پێشـوو نـەیانتوانی خۆیـان لـەناچاری هـەبوونی (بـاڵاتر لەڕەخنـە) دەربازبکـەن، و لەلایـەکی تریشـەوە نـــەیانتوانی بەشـــێوەیەکی وردو هەمەلایـــەن دایبڕێژنـەوە. نیتشـە بـەو پـەڕی زویری‌یـەوە نووسی: (ئەو کەسەی وتویەتی نەء، و نـەء ی تـا سـنووری بـەرەو پێـش بـردووە کەبـەر لـەوە نەبیسـراوەو نەناسـراوە، و لەبەرامبـەر هـەموو شـتێکدا کەهـەموان پەسـەندیانکردووە ئـەو

وتویەتی نەء، بەناچاری لەدوا ئەنجاما دژایەتی هەمان ڕۆحیەتی ناگوتنیش دەکات) [11]. نیتشە بەلای بیرکردنەوەی مۆدێرنی بەنەبوونی ئەو پێوەرە دەزانی، ئێمە ناچارین لەتۆڕی زماندا بیربکەینەوەو لەگێژاوی گرفتار بوونماندا بەبونەوە بیر لەبوون بکەینەوە. ڕەخنە دۆزینەوەی ناڕاستیەکان لەبابەتی ڕەخنەکەدا، بەلام پێوەری ڕاستو ناڕاست لەکوێیە؟ چ شتێ خودی ئەو پێوەرە دەخاتەژێر باری ڕەخنەوە؟ و ئایا ئەم کردە زنجیرەییە تا ئەبەد بەردەوام نابێ؟

ئەم پرسیارانەمان لەبیربێت، چونکە نیتشە کە قوولترین ڕەخنەگرتنی لەمۆدێرنیتی دەستپێکرد، هەر لەسەرەتاوە باسی ئەم ڕەوتی (بیرکردنەوەی خود)ەی کردبوو.

## مۆدێرنیتیو عەقڵ باوەڕی

ئایدۆلۆژیای مۆدێرنیزم لەگەڵ نوێبوونەوە (مۆدێرنیزاسیۆن)ی کۆمەڵگاکانی ئەورووپا بەدرێژایی چاخەکان، شێوازی خۆی وەرگرتووە، واتە لەگەڵ بەهێزبوونی کۆمەڵگای مەدەنی لەئاست دەوڵەت، چوارچێوەگرتنی ژیانو پەیوەندیەکان بەیاساوە، دەرکەوتنی گرنگی تاکە کەس، سەرهەڵدانی دەوڵەتانی دیموکراسیو لەهەموو یگرنگتریش، هەموو ئەمانە بە(سەرهەڵدانی دەوڵەتانی دیموکراسیو لەهەمووی گرنگتریش، هەموو ئەمانە بە(وەدیهاتنی سەرکەوتنی عەقڵی مرۆڤایەتی) لەقەڵەم دان. هەم عەقڵی مرۆڤ بەدوا پێوەر لەقەڵەمدانو هەم بەدیاریکەری ڕەوتی پێشکەوتن، و سوودلێوەرگرتنی بۆ سەلماندنی ئەوەی کە کۆمەڵگای مۆدێرن لەکۆمەڵگای کۆن باشترە. زەمینی یاخود دنیایی کردنی یاساکانیش بەپشتیوانی هەمان تێگەیشتن بوو کەعەقڵی مرۆڤی لەڕووی (زانستی، فەلسەفی، یاسایی، هونەریو..) لەچاو یاسا تەقلیدیەکاندا بەباشتر دەزانی. عەقڵ بوو کەهەم زانستی بەرەو پێش دەبردو هەم بارودۆخە کۆمەلایەتیەکانیش. بەگوتە بەناوبانگەکەی هیگڵ لەسەرەتای کتێبی فەلسەفەی مافەکان (1821)دا (ئەوەی عەقڵانیە واقیعیەو، ئەوەی واقیعیە عەقڵانیە) [12] ئەم عەقڵانیبوونو ڕەوایەتیەی بارودۆخی کۆمەلایەتی، بەناچاری پایەو پلە هەبووەکانی کۆمەڵگا (و شێوازەکانی دەسەڵاتو کۆنترۆڵ)یش ڕەوایانە پێشاندەدات، و لەدوا ئەنجاما ڕەوایەتیش دەداتە جیاوازی نێوان تاکەکان (بەپێی پۆلێنکردنی کۆمەلایەتی، جنسو ڕەگەزو تەنانەت بیروڕاش) لەڕاستیدا ڕەخنەگرتن لەمۆدێرنیتی ڕەخنەیە لەئایدیۆلۆژیای عەقڵ باوەڕی. ڕەخنەیەك کەپەلاماری ئەنجامو دەستکەوتەکانی ئەو باوەڕە دەدات: پەلاماری زانست، زانستگەرایی، بەهۆکار کردنی عەقڵ، تەکنەلۆژیو.. ڕەخنەگر دەپرسێ. ئێمە چۆن دەتوانین بەوردی دەستنیشانی بکەین، کە وەدیهێنانی غەریزەیەك یان نیازێك یاخود ئارەزوویەك کارێکی عەقلانیە.؟ کەواتە ئایدیای عەقڵانیەت دروست ئەکەین تاهەموو ئەمانەی لەڕێگەوە ئاڕاستە بکەین لەمەش گرنگتر، دەسەلاتو کۆنترۆڵو جیاوازیی کۆمەلایەتی نێوان تاکەکان ئاڕاستە بکەین کە لەناو سەنگەرەکانی کۆمەڵدا بەدەسەلاتدارو بێدەسەلات ناودەبرێن، نیتشە ئەوەی هێناوینەتەوە یاد، کە دەسەلاتی عەقڵ لە بەعەقڵانی ناوبردنی شتە ناعەقڵانیەکانەوە دێتە دەستو لەهەمان کاتیشدا هەموو ئەو شتانە ئاڕاستە دەکات. لەدوا ئەنجاما عەقڵ باوەڕی شتێ نیە بێجگە لە یەك ئایدیۆلۆژی کەدەسەلاتی پیاوی خۆرئاوایی لەبەرامبەر ئافرەتان، چینە هەژارەکان، منداڵان، خەڵکانی سادەی کۆلۆنیکراوە، کەمەنەتەوەییو جنسیەکان ئاڕاستە دەکات.. لەلایەکیترەوە دەشبێت ببینین

کە ئەم تێڕوانینە عەقڵباوەڕە چۆن بەهێواشی بووە تێڕوانینێکی کەم ئیدیعاتر، تێڕوانینێ کەعەقڵانیەتی کورت کردەوە بۆ باوەڕهێنان بەعەقڵئامێری، عەقڵێ کەچووە خزمەتی وەدیهێنانی نیازو ئارەزووەکان و لەپاشانیشدا بووەهۆی دامەزراندنی "کۆمەڵگای بەرخۆر". کۆمەڵگایەکی ئەوتۆ کەتیایدا لایەنی عەقڵانی بەرهەمهێنان بەمانای چەقبەستنی بەرهەم (یاخود بەگوتەی مارکس هاوبەش بوونی موڵکایەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان) نەدەزانرا، و (خەرجی) بەهای زیاتر بوو لەپاشەکەوتی. ئەم (تێگەیشتنە لەمۆدێرنیتی) بۆ خۆی رووبەڕووی رەخنەی توند بۆوە. دیارە سەرکەوتنی مۆدێرنێتی سەرکەوتنی عەقڵی بابەتی (ئۆبژەکتیڤ) بوو بەسەر سیستەمی کۆن دا. ئەمەش تا ئەو شوێنەی کە ئەو سیستەمە ئیمکانی گەڕانەوەی نیە، بەڵام رەخنەگر دەپرسێ ئایا شێوازێکی تری سەرکەوتن ئیمکانی نەبوو؟ یاخود ئێستاش ئیمکانی نیە؟ ئایا چەمکی (رزگاری) کورت ئەبێتەوە بۆ بەدیلی مۆدێرنیتی یاخود لەیەکێك لەشێوازە ئەزموونکراوەکانی مۆدێرنیتیدا؟ باسکردنی رەخنەگرانە لەم بارەیەوە بەرلەهەرشتێ -و گرنگتر لەهەر شتێکیتر - رەخنەگرتن لەعەقڵباوەڕی دەهێنێتە پێش، گرنگترین پرسیار لێرەدا سەرهەڵدەدات: ئایا ئەم تێگەیشتنە گشتیو جیهانگرەوەیە لەعەقڵباوەڕی کام رێگاو شێوازی ژیان؟ بەرگریکەرانی مۆدێرنیتیو وەڵاممان دەدەنەوە: عەقڵباوەڕی رۆژئاوا، مۆدێرنیتی، سەرجەمگری کام عەقڵە؟ کام شێوازی نوێبوونەوە؟ دەپرسین ئایا ئەمە شێوازێکی تری نوێبونەوەی (یاخود رەنگە بتوانین بڵێین بەهێز بوونی) سەنتەریزمی ئەوروپی نیە؟ پێمان دەڵێن نەخێر ئەوەنیە، دەڵێن عەودالی ئەوە مەبن کەبناغەی عەقڵباوەڕی مۆدێرن چیە، خۆرئاوا بەساتێ لەمێژووی مرۆڤایەتی (مێژووی خۆتان) بزانن. بەرهەمی بەدەستهاتووی ئەوان هی هەموومانە. دیارە ئەگەر هەموو ئەم قسانەشمان قبوولْ کرد، دیسانەوە دەبێ ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتیانەمان لەبەرچاوبن کەلەئەنجامی دژایەتیکردنی لایەنی عەقڵباوەڕی گشتیو لایەنی تایبەتی (کە لەفەرهەنگ و زمانو شێوازەکانی ژیانی نەتەوەییەوە) سەرچاوەیان گرتووە، دروست دەبن. کارل ئۆتۆ ئاپول لەوتارەکەی خۆیدا کە لەکۆبوونەوەی شتراسبۆرگ (21-22ی نۆڤێمبەری 1991)دا خوێندیەوە باسی ئەم دژایەتییەی کردووە، بەڵام هەر بەهەمان جەختکردنەوە لەسەر لایەنی گشتی (وتا ئەندازەیەك کانتیانەی) بنەما ئەخلاقیەکان (بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم بیردەکەمەوە، کە ئەرکی هەنووکەیی ئێمە بەهیچ شێوەیەك ئەوەنیە کەتایبەتمەندێتی جیاوازیو (خەمی خۆخواردن)ی شتە فەردیەکان لەبەرامبەر ئەو پێوەرانە قووتکەینەوە کە بایەخی گشتیان هەیە، بەڵکو پێویستە لەنێوان ئەخلاقی بەرپرسکەرو گشتیدا پەیوەندی ببەستین لەگەڵ بەهاکانی تاك گەرایی ئەرستۆیی نوێدا. هەروەکو چۆن کانت بەباشی لەوە تێگەیشتبوو، ئەم کارە پێویستی بەوەیە کەئەخلاقی هەندێ بنەمای سەرەکی کەبەهای گشتییان هەیە پێش بەهاکانی گەشەی فەردی بخرێن، ئەمە جگە لەوەی ئەم پێشخستنە بەنۆرەی خۆی خزمەتی هیواو خواستە فەردیەکان دەکات، چونکە هەر لەسەردەمی دانانی مافەکانی رۆمیەکانەوە کە ئەنگێزەیەکی رواقی هەبوو، پێشکەوتنە ئەخلاقیو قەزاییەکانی مافی مرۆڤ بەردەوام بۆتە هۆی فراوانکردنی رێزدانان بۆ تایبەتمەندێتی تاکەکان. ئەوەی پۆست مۆدێرنەکان کەهەمیشە تایبەتمەندیەکان لەبەرامبەر یەکێتی عەقڵی تەقلیدیەکان دا قووت

دەکەنەوەو لەڕووی فەلسەفیەوە بەتێکشکان گەیشتوون، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنیان لەم خاڵە)[13].

لەبەشی دوایی ئەم کتێبەدا خۆمان بەڕەخنەگرانی پۆست مۆدێرنەوە خەریك دەکەین لەو بەشەدا بۆمان دەردەکەوێ کەئایا ئەوان (لەڕووی فەلسەفیەوە) تێکشکاون یان نەء. بەڵام خراپ نیە لێرەدا بنەمای ڕەخنەکەیان بهێنینەوە یاد کەدەڵێن، ئەم خۆبەستنەوەیە بەحوکمی ئەخلاقی گشتییەوە تەنیا چاو نوقاندنە لەئاست واقیعیەتی ئەو دژایەتیو ناکۆکیەدا. واقیعیەتێ کەلەپراکتیکدا – نەك لەبیروڕاکانی فەلسەفەی ئیستعلاییدا – ڕێگە نادات کە بنەماکانی ئەو ئەخلاقە گشتییە پەیدابن.[14]

ماکس هورکهایمەر لەوتاری (کۆتایی عەقڵ) (1941)دا، دەنووسێ کە ڕۆشنگەرەکان لەپیاهەڵدانی عەقڵدا ببوونە هاودەنگی باوکانی کەنیسە. ئۆریجن دەیگوت ئێمە نابێت هیچ مرۆڤێ (تەنانەت خراپترین مرۆڤیش) لەگەڵ گیاندارانی تردا بەراوردبکەین چونکە نابێت بوختان بۆ عەقڵ بکەین، و ڤۆلتێریش عەقڵی بە(دیارییەکی کەس سەرلێدەرنەکردووی خوا بۆ مرۆڤ) دەزانێ، کە (سەرچاوەی هەموو کۆمەڵگاکان، دامەزراوەکانو هەر سیستەمێکە)[15]. بەلای پێشینیانەوە عەقڵ (بنەما پیرۆزەکەی خەڵق) بوو، بەلای کانتیشەوە بریتیبوو لە(رزگارکەری هەمیشەیی مێژووی مرۆڤ). هەر لەم بڕواهێنانەشەوە بوو بەعەقڵ کەئایدیاکانی ئازادی، یەکسانیو ڕاستی دروستبوون، ئایا دەکرێ لەگەڵ ئیدمۆند هوسرل دا تەبابین کەفەلسەفەی کانتی بەزەمینەی سەرەکی بیری مۆدێرنیتی نەدەزانی؟ لای هوسرل، خاڵی بنەڕەتی بەلای کانتەوە لەهەمان پانتاییو ئاسۆی فەلسەفی دیکارتیدا خراوەتەڕوو، پشت بەستنی کانت بەجۆرێ لەعەقڵباوەڕیو گرنگی سۆبژێکت (بکەر) کە "لایەنی نابابەتی (ئۆبژەکتیڤی) بەهەرجۆرێ بوو لەباس وەدەردەنا" ئیمکانی ئەوەی بۆ نەدەهێشتەوە کەخۆی لەنەرێتی دیکارتی بپچڕێنێ،[16]. مارتین هایدگەر بەپێچەوانەی هۆسرلەوە، بڕوای وابوو کەکانت (بزوێنەری مۆدێرنیتی فەلسەفی)یە. ئەوەش کەکانت هەوڵیدا سنووردارێی بوونی مرۆڤ لەسنورداری توانای ناسینیدا بدۆزێتەوە، خاڵێکی نوێیە. ئەو سنورداریتیە، کەبەبانگەری یان بەزمانی کانت darstellung بەڕێخۆشکەری ناسینی مرۆڤ حسابدەکرێ[17] بەقسەی مێشیل فۆکۆش (سەرەتای گوتاری مۆدێرنیتی)یەو هەروەها کێشمەکێشی جۆری (گوتارەکانی مۆدێرنیتی) پێشاندەدات.

لووك فری دەنووسێ کانت ئەو پەیوەندیەی نێوان مرۆڤو خوا کە بەلای زۆربەی فەیلەسووفەکانی پێش ئەوەوە کەم تازۆر پارێزراوبوو، بەشێوەیەکی بنەبڕ لادا،[18] و هایدگەریش بەچاکی لەو خاڵە تێگەیشتبوو، کە کانت لە هەڵسەنگاندنی عەقڵی پەتیدا لەبەرامبەری فەلسەفی دیکارت، تیوریەکی لەمەڕ "غایەت" خستبووەڕوو کەتیایدا گرنگییەکی کەمورێژەیی بە"بیرۆکەی خواوەند" دابوو. بیری فەلسەفی سەدەکانی پێشوو مرۆڤی وەك کۆیلە دەبینی، هەبوونێکی سنووردار کەگیرۆدەی هەست، نەزانی، گوناهو مەرگ بوو. بەڵام کانت پایەی ئەو جۆرەی بیرکردنەوەی زەمینییەی دارشت کە (ئێمە هێشتاش بیری پێدەکەینەوە). لەڕاستیا کانت پەیوەندیەکەی پێچەوانە کردەوە. بوونی ترانسندنتالی (متعالی) بووە ئایدیایەکی دەستکردی مرۆڤ. ئەمەش بووە ڕێگە خۆشکەر تاچەند دەیەیەك لەوەدوا فویرباخ هێندە بڕوات نەفسی باڵا بە(بت بوونی عەقڵ) لەقەڵەم بدات. لای کانت زەینی مرۆڤی کرایە سۆبژەکتێکی باڵا کە"ئارمانجی (نمونەی باڵای) ئەخلاقی خۆی

لەشێوەی خواوەندا دروست ئەکات". واتە خوا دەبێتە مەرجی هاتنەدی ژیانی ئەخلاقی مرۆڤ. وێڕای هەر ئەنجامێ کە ئەم پێشنیارە بۆ فەلسەفەی ئەخلاقی هێنایە گۆڕێ. دەشێت بگوترێ بەهۆی هەمان پێشنیارەوە بوو کەڕوانگەی بنەمایی فەلسەفەی مۆدێرن سەریهەڵدا. لووك فری جەخت لەسەر ئەوە دەکا کەکانت بەو حوکمەی (داوای لێکردووین نەك هەر تەنیا بیر لەسیاسەتو مافەکان بکەینەوە بەڵکو بیر لەئەخلاقو کلتوریش بەدەر لەتێڕوانینی تەکنەلۆژی، بکەینەوە. هەر لەبەرئەم هۆیەشە دەکرێ بڵێین کانت بیریاری مۆدێرنیتیە). لەبەشی شەشەمدا کاتێ باس لە وتارەکەی کانت (ڕۆشنگەری چی‌یە؟) و شیکردنەوەکەی میشیل فۆکۆ لەسەر هەمان وتار دەکەم، جارێکی دی دەگەڕێمەوە سەر باسی کانتو مۆدێرنیتی. ئێستا بەوەندە دەیبڕێنمەوە کەبڵێم لەگەڵ ئەو تێزەی کانت دا کە لەمەڕ سنووردارىو کارابوونی ئاوەزی مرۆڤ خستیەڕوو، کێشەیەکی گرنگ لەبەردەم فەلسەفەی مۆدێرن دا هەڵگیرا.

بڕوابوون بەعەقڵی مرۆڤ، مرۆڤێ کەچیدی کۆیلەنیە، میراتی سەرەکی ڕۆشنگەری بوو بۆ ئایدیالیزمی ئەڵمانی. دژی ئەم بڕوابوونە بەعەقڵ، ڕۆمانتیکە ئەڵمانیەکانو هۆڵدرلین زۆریان نووسی. ئەوان هێزی ئەفراندنی هونەرىو لەدوا شیکردنەوەدا هەست (و بەگوتەی هۆڵدرلین شۆڕ {یان سۆز}) یان لەبەرامبەری (بڕوای کوێرانە بەعەقڵ) دانا. بەر لەنیتشە، ئەمە گرنگترین رەخنەبوو لەعەقڵباوەڕی ڕۆشنگەری بەڵام ڕێگەبدەن، بەر لەهەرشتێ دیقەت بدەین لەخاڵێکی گرنگ لەباسی فەیلەسوفێکدا کەبڕوابوونی بە(دەستەڵاتی عەقڵ) بەرەو ئاڕاستەیەکی نوێ‌برد. ئەودەمەی جۆرج فیلهلم فریدریش هیگڵ لەپێشەکی دیاردەناسی ڕۆح دا باسی (ڕۆژگاری گواستنەوە)و(سەردەمی مۆدێرن)ی دەکرد، هێمای دەکرد بۆ تێگەیشتنی کەم تا زۆر باڵادەستی سەردەمی خۆی. کاتێ نووسەرانی فەرەنسىو ئینگلیزی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە باسی (ڕۆژگاری مۆدێرن)یان دەکرد، مەبەستیان گەشەی فەرهەنگی ئەوروپا بوو لەڕێنیسانس بەملاوە. بەلای هیگڵیشەوە ئەم زاراوەیە مانا مێژوویی‌یەکەی خۆی پاراستبو، بەتایبەتیش کاتێ هیگڵ بەردەوام ئاماژەی دەکرد بۆ جیاوازی بنەبڕی ڕۆژگاری مۆدێرن لەچاو سەدەکانی ناوەڕاستدا،و باسی(ڕۆحی سەردەم)ی دەکرد. زاراوەکەی هیگڵ واتە Zeitgeist یەکێکە لەبەناوبانگترین زاراوە فەلسەفیەکانی مۆدێرنیتی). ڕۆحی سەردەم کە گەرەکیە ڕۆژگاری خۆی – کەوابوو: خۆی بناسێ. گرنگترین بنەمای سەردەمی مۆدێرن لەڕوانگەی هیگڵەوە، ئەو گرنگی‌یە یە کەڕۆحی زەینی یاخود سۆبژێکتیڤ بەدەستی دەهێنێ، ئەم بنەمایە هەم سەرهەڵدانی مۆدێرنیتی ڕووندەکاتەوەو هەم قەیرانەکانیشی. یورگن هابرماس کەهاوڕای ئەم تێڕوانینەی هیگڵە، دەنووسێ کەهەر لەبەر هەمان هۆیش گشت هەوڵدانێ بۆ دەستنیشانکردن (یان پێناسە)ی چەمکی مۆدێرنیتی هەر لەیەکەمین هەنگاوەوە ڕەخنەیشە لەهەمان چەمك[19] ئەو حوکمەی هیگڵ کە لەڕاستیدا گرنگترین بنەمای مۆدێرنیتی بەئازادی ڕەگەزی زەینی دەزانێ، لەتوێژینەوەی ڕۆژگاری نوێ‌دا بەردەوام لەسەر دەستەڵاتی هەردەم زیادبووی زەینو عەقڵی مرۆڤ کە لەڕاستیا بەواتای ئازادی‌یە، جەخت دەکاتەوە.[20] بەڕای هیگڵ ئەم ئازادی‌یەی ڕەگەزی زەینی هاوشان لەگەڵ خۆیدا تاکانەی (فردگرایی) مافی ڕەخنەگرتن، و سەربەخۆیی کردار دەهێنێتە پێشەوە کەهەموو ئەمانەش دەبنە هۆی بناغە دانانی فەلسەفەی ئایدیالیزم. ئەم (ئازادی‌یەی سۆبژێکت)ە لە بزووتنەوەی

چاککردنی ئایینیدا بەهەمان هێزەوە دەرکەوت کەلەسەردەمی ڕۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسادا، ئەم ڕووداوە مێژووییانە هاوشان لەگەڵ خودی بنەمای عەقڵباوەڕیدا، بوونە هۆی پتەوکردنی بڕوا بەیاسا سرووشتییەکان (و لەئەنجامیشدا زانستی نوێ). لەپارچەی 124ی فەلسەفەی مافەکاندا هیگڵ نووسیویە کە لەڕۆژگاری مۆدێرن دا ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، دینی پێبەپێی زانستو هونەر (هەر لەسەر بنەمای هەمان ئازادی زەینی) دەرکەوتوون. هەر لێرەشەوەیە سنوری فەلسەفەی مۆدێرن لەلایەن (من بیردەکەوە)ی دیکارتەوە دەستنیشان کراوە کە ئەوەش لەدڵی پانتایی ڕۆحی زەینیدایە، و کانتیش بەهۆی هەوڵدانیەوە لەپێناوی تێگەیشتن لەسنوورو کارکردەکانی عەقڵ یاخود زەین هەر دەیویست ئەو پانتاییە دەستنیشان بکات. بەبڕوای هیگڵ گوتاری فەلسەفەی مۆدێرن هێشتاکەش لەو سنوورانە، واتە لەپانتایی ڕەگەزی زەینی تێنەپەڕیوە: (مافی سۆبژێکت بۆ گەیشتن بەفەردیەت، و مافی ئەو بۆ سوودوەرگرتن لە {ئازادی} یاخود بەدەربڕینێکیتر مافی ئازادی سۆبژێکت (ئازادی ڕەگەزی زەینی) دڵو چەقی جیاکارەیە لەنێوان ڕۆژگاری دێرینو ڕۆژگاری مۆدێرن دا) [21]. مێشێل فۆکۆو ئەو ستراکچرالیستانەی کەجەختیان لەسەر بێنرخی سۆبژێکت دەکردەوە، لەڕاستیا نیشانەیان لەسەر دڵی کێشەی فەلسەفەی مۆدێرن (لە دیکارتەوە تا هیگڵ) گرتبوو.

هیگڵ لەبەرهەمەکانی قۆناغی گەنجێتیا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە زەینییەت (سۆبژەکتیڤیزم، هەمان شت کەلەدیاردەناسی ڕۆح دا سەردێڕی "ڕۆحی سۆبژێکتیڤ"ی پێدا) لەدنیای بابەتی (پۆزەتیڤیزم، یاخود ئەوەی جارجارە پێیدەگوت "عەقڵی جیهانی") جیا دەبێتەوە. نامۆبوونی ڕۆح لەعەقڵی جیهانی، هەر هەمان لەخۆنامۆبوونی ڕۆحە. بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو نامۆییەیەدا، "ئاگایی ناکامەران" پەنا بۆ دین دەبات، دینێ کەبەشێوازێکی عەقڵانی دەشێت ئاڕاستەبکرێت. هەر لێرەیشەوەیە کەهیگڵ هەرگیز نەبووە بەشێ لەکایەو یاریی ڕۆمانتیکەکانی ئەڵمانیا، هۆڵدرلینو تەنانەت شلینگو شیللەر تا هونەر وەك ڕەقیبێکی ئایین بخاتەڕوو. بەپێچەوانەوە، هونەرو ئایین، لەگەڵ فەلسەفەدا بونە پێشاندەری دووری (و هەروەها هەوڵدان بۆ یەکبوون)ی دنیای زەینو دنیای ڕۆحی بابەتی. لەو ڕووەوە جەخت دەکەمەوە سەر خاڵی دوایی، چونکە لەسەردەمی هیگڵ دا لەنێو فەیلەسووفو ڕۆشنگەرەکانی ئەڵمانیادا باسکردنو مشتومڕ لەسەر نەریتو مۆدێرنیزم (نوێبوونەوە)، لەچوارچێوەی دەربڕینی جوانناسیدا هاتبووە ئاراوە. شیللەر لەناو هەموو شتێکدا "نمونەی باڵای جوانی" بەدەربڕی ڕۆژگاری نوێ دەزانیو دەیگوت ئاڵۆزیی جیهانی تازە، بۆتە هۆی ئاڵۆزی دەربڕینیش لەهونەردا. دیارە ئەو لەسەری دەڕواو ئەڵێ، بەدرێژایی سەردەمێکی دوورودرێژ (هەر لەیۆنانی کۆنەوە تا "هونەری کلاسیك") مەبەستو ئامانجی سەرەکی شتێ نەبوو لەجوانی زیاتر، بەڵام لەڕۆژگاری مۆدێرن دا ئەم ئامانجە بۆتە "باڵایی "بەرزیی".. لە هونەردا ڕزگاری لەنا وسروشتدا دێتە دەست بەڵام لەچوارچێوەی "بابەتی بەرز"دا ڕزگاری واتە سەرکەوتن بەسەر سرووشتدا. شیللەر (و بەمانایەك شلینگیش) فێرکردنی ستاتیکی یان بەئاشتکردنەوەی جوانیو بابەتی بەرز دەزانی، و ئەمەش بەڕاستی ئاشتکردنەوەی هونەرە لەگەڵ ئەخلاق دا.

هیگڵ لەباسی جوێبوونەوەی ڕۆحی زەینی لەڕۆحی بابەتیدا، خۆی لەم باسە نەدا. لەدوایین بەشی دیاردەناسی ڕۆحیشدا کە لەم کێشەیە نزیك کەوتەوە، باسی ئەخلاق نا، بەڵکو باسی

ئاییني کرد. هونەر، فەلسەفەو دین دەتوانن لەشوێنێکی بەرزتر لەشوێنی ناکۆکی ئاغاو کۆیلە، لەم بارودۆخە وردبینەوە. ئەخلاق (تا ئەو شوێنەی کەدەربڕی بارودۆخی سەربەخۆی ئاگایی بێت) لەڕاستیا بەیانکەری بارودۆخەکانی ئەم ناکۆکییەیە، بۆیە هاوشانی ئەو سیانەی تر (هونەر، فەلسەفەو دین) نایەت. فەلسەفە، هونەرو دین چەند ساتەوەختێکن لەرۆحی رەها. بۆ سەلماندنی ئەمەش ئەوەندە بەسە بەپێی نەریتێکی ناپەسەندکراو بجوولێینەوە کە باسەکەی هیگڵ لەسەر دیالێکتیکی ئاغاو کۆیلە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەتوێژینەوە مێژوویییەکەی کەلەپاش ئەو باسە دێت، بخوێنینەوە ئاغاو کۆیلە پارچەی یەکەمە لەبەشی خود ئاگایی. پارچەی دووەم هەمان بەشی "ئازادیو خود ئاگایی: رەواقیەت، گومانداریو ئاگایی ناکامەران" ئەوە پێشاندەدات کەچەمکی "سەربەخۆیی ئاگایی" خۆی لەخۆیدا لەدایکبووی بارودۆخە ناکۆکییەکانی ئاغاو کۆیلەیە، و خود ئاگایی جێهێشتنی ئەم بارودۆخەو دۆزینەوەی پەیوەندی دوو لایەنەیە.

ئەمەش تێڕوانینێکی تازە نیە لەکارەکانی هیگڵ دا. ئەو پێشتر لەکتێبی سیستەمی ژیانی ئەخلاقی (1802–1803)دا، کەبەیەکێك لەیەکەمین کارە گرنگەکانی لەبواری فەلسەفەی سیاسیدا دەژمێردێ، باسی ئەم خاڵەی کردبوو، کەهەر کاتێ بمانەوێ بۆ تێگەیشتن لە "بارودۆخە مۆدێرنەکان" سوود لەئەخلاق وەرگرین، دەبینین باسی دەوڵەت دێتە پێشەوە، لەبەشی سێهەمی هەمان کتێبدا ئەوە دەخوێنینەوە کە "ژیانی ئەخلاقی تاك لەتاکبوونی ئەودا دەخاتەڕوو، وەك بوویەکەی نەمر کەبوونو کردە ئەزموونیەکانی بەشێوەیەکی رەهاو سادە لەچوارچێوەی گشتیدا تەماشایان دەکرێت" [22]. بەلاّم کاتێ بە پەیوەندی دوو لایەنەی ئاگاییەکان دەگەین، وەك ئەوە وایە ئەو تاکبوونە لەناو بچێتو "خەڵکی" بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەژیانی ئەخلاقیانەی تاك، "شێواز دەبەخشنە" دەوڵەت [23]. هیگڵ هەر لەیەکەمین هەنگاوەوە بۆ سازدانی فەلسەفە سیاسیەکەی، دەوڵەتی وەك "بوونێکی بەهاداری ئەخلاقی کەباڵاترە لەئەخلاقی فەردی" ناساندووە. تیۆرەی هیگڵ لەمەڕ دەوڵەتی مۆدێرنەوە کە لەکتێبی فەلسەفەی مافەکان دا بەباشترین شێوە دەربڕراوە، ئەو پێشاندەدات چۆن عەقڵو زەینییەت، کەبنەمای مۆدێرنیتین، لەگشتێکیتردا شوێنی خۆیان دەگرن کەبەشێوەیەکی تەواو قەبووڵیان دەکاتو شێوازیان پێدەبەخشێ، ئەم گشتەش دەوڵەتی مۆدێرنە، ئەم دەوڵەتە شوێنی ژیانی رۆحی زەینییە. تەواوترین دەربڕینی سیاسی رۆح لەدەوڵەتدا سەرهەڵدەدات.

## مۆدێرنیتی و گۆڕان

بەرگری لێکەرەکانی مۆدێرنیتی کەم نەبوون، بەلاّم مۆدێرنیتی بەکانتو هیگڵ دا بووە خاوەن فەیلەسووفی خۆی. خاڵەکەش لەوەدایە کەفەیلەسووف تەنانەت لەلوتکەی بەرگریکردن لەهەر شتێکدا تۆوی گومانداری دەچێنێ. هیگڵ بۆ بەرگریکردن لەمۆدێرنیتی بناغەیەکی تەواوی دارشت. رایگەیاند کەمێژووی نوێ، بزاڤێکی پتەوە بەرەو ئازادی. لەدامەزراوە سیاسییەکانو دەوڵەتدا وەدیهاتنی ئازادی بەدیکرد، لەدەوڵەتی عەقڵیش، نەك وەکو یۆتۆپیایەکی دوورە دەست، بەڵکو وەك "ئامادەیی"و هەبوونێکی راستەقینە کەوتە بەرگریکردن. ئەگەر هیگڵ شتی ئامادەو هەبووی ناونا عەقلانی، و سەرنجی دایە هەموو ئامادەییو هەبوونێکی عەقلانی، لەبەرئەوە بوو کەبەرگریدەکرد لە رۆژگاری نوێو دەستکەوتەکانی. لەسەرەتای دەیەی پڕ کاری 1840دا قوتابیو پەیڕەوکارە فیکریەکانی هیگڵ

کەوتنە هەڵسەنگاندنو نرخاندنی سیستەمی فەلسەفی مامۆستاکەیان. گرووپ بوونی ئەوان دەوران سازو مشتومڕی فەلسەفیشیان مەزن بوو. ئەوان لەبواری رەخنەکاری فەلسەفەی هیگڵ دا، چ ئەوکاتەی مەسەلەی رەتکردنەوەی ئایدیالیزمو بنەمای دینی فیکری ئەو دەخرایەڕوو (فویرباخ، مارکس)، و چ ئەوکاتەش ناکۆك بوون لەگەڵ ئەنجامە سیاسیەکانی فەلسەفەکەیدا دەردەکەوت (برونوبائر، ماکس شتایرنر، موسی هس، ئارنۆڵد روگەو کارڵ مارکس)، لەڕاستیا رەخنەیان لەبونیادەکانی بیروای هیگڵ لەمەڕ مۆدێرنیتەوە دەگرت. هیگڵی‌یە چەپەکان، بەتایبەتی کەلەبیروڕای سیاسیاندا بەتوندی کەوتبوونە ژێر کاریگەری شۆڕشی فەرەنسا، یەکەمین وانەیەك کە لەم "تەقینەوەی مۆدێرنیتی"یە وەریانگرت، گرنگیدانو ئاوڕدانەوەیان بوو لە (بارودۆخی هەبوو). رادیکالیزمی فەلسەفی ئەوان بەگوتەی موسی هس پشتی بەستبوو بە "رەخنەگرتنی بەردەوامو بنەبڕ لەهەموو شتێکی هەبوو"، بەڵام لەڕاستیا لەبەرامبەری یەکێ لەگرنگترین دەستکەوتەکانی مۆدێرنیتیدا ئەم چەکی رەخنەکاری‌یەیان دادەنا. برونوبائر دەیگوت: "مێژوو تا ئێستا هیچ راستیەکی دروستنەکردووە کەبەئاگری رەخنە کڵپەی نەسەندبێ، بەڵام بەرزترینی ئەو راستیانەی ئێستا دروستیکردوون – و بەپشتیوانی رەخنەکاری دروستیکردوون – واتە مرۆڤ، ئازادیو خود ئاگایی ئیدی ناچنە ژێر باری رەخنەوە" [24]. هەر ئەم بیریارە لەتوێژینەوەیەکی گشتیتری کۆمەڵگای مۆدێرن دا دەگەڕایەوە بۆ یەکێك لەگرنگترین تێزەکانی هیگڵ: لەخود نامۆبوون. و لەبەرئەوەی بیری لە"جودابوونەوەی جەوهەری مرۆڤ لەمرۆڤ لەرۆژگاری مۆدێرن دا" ئەکردەوە، رەخنەی دەگرت لە"بارودۆخی ناهەمواری ئەمرۆ"، بەڵام لەدوا ئەنجامدا گەشبینانە "ئەمرۆ"ی بە"دەروازەیەکی تازە لەمێژووی مرۆڤایەتی" دەناساند. راستە ئەمرۆ، رۆژی لەخودنامۆبوونو نەبوونی ئازادی‌یە بەڵام هەر لەم رۆژەشەوەیە کەقۆناغی دووەم واتە "ژیانەوەو هەستانەوەی رەهای مرۆڤ" دەسپێدەکا بائر لەنامەیەکدا بۆ کارڵ مارکسی هاوڕێ ی نووسی: "کارەساتێکی مەزن، تەقینەوەیەك، لە بەردەمایە کە ئەنجامەکانی چەندین جار لەئەنجامەکانی مەسیحیەت بەرفراوانترن" [25].

ئەم تێڕوانینە دوولایەنیە بۆ مۆدێرنیتی لەبەرهەمەکانی مارکس دا – کەهەر زوو خۆی لەبائرو هیگڵی‌یە لاوەکان جودا کردەوە – تەنانەت بەهێزتر دێتەپێش چاو. ئەو لەلایەکەوە بەرگری دەکرد لەدەستکەوتەکانی رۆژگاری تازە، و لەلایەکی ترەوە کەموکوڕی ئەو دەستکەوتانەی دەژمارد. وەکو بائر ئەوەی کەهەبوو بەرێخۆشکەری رۆژگارێکی باشتر دەزانی، کەواتە لەبەرامبەر سیتەمی کۆن دا بەرگری لێدەکرد، بەڵام لەبەرامبەر داهاتوودا رەخنەی لێدەگرت. دەشێت ئەم خاڵەش لەو نامانەدا کە لەمارت تا سێپتەمبەری 1844 بۆ ئەرنۆڵد روگەی نووسینو لەبلاوکراوەی روگەداچاپکران، بدۆزینەوە. لەو نامانەدا مارکس باس لەبارودۆخێکی تایبەت دەکات: هەڵومەرجەکانی رزگاربوون لەگۆڕێن، بەڵام تەنیا بەرەتکردنەوەی هۆی ئەم هەلومەرجانەوە، رزگاری دێتە دەست. دنیای کۆن بنەماکانی دنیای نوێی داڕشتوون. لەسەرمانە کە لەدژی دنیای کۆن "نوری دنیای تازە" درەوشاوەتر کەین. [26] ئەم بیرە گشتی‌یە لەمانیفێستی پارتی کۆمۆنیست (1848)دا (کە مارکس بەهاوکاری ئینگلز نووسی) بەشێوازێکی راستەوخۆترو روونتر دەربڕدراوە، کۆمەڵگای نوێی ئەورووپایی واتە کۆمەڵگای بۆرژوازی کە لەسەر وێرانەکانی کۆمەڵگای فیودالی‌یە بینابووە،

پیشەسازی نوێی گەشە پێداوەو بازاڕی جیهانی کردۆتەوە: "بۆرژوازی شۆڕشگێڕانەترین ڕۆڵی لەمێژوودا دیتووە" [27] و "ناتوانێ بەبێ شۆڕشگێڕانەکردنی بەردەوامی هۆیەکانی بەرهەمهێنان و لەئەنجامیشدا پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و لێرەیشەوە سەراپای پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان، بەردەوامبێ". [28] یەکەمین بەشی مانیڤێست ڕوونکردنەوەی سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مۆدێرن و بەرهەمەکانی چینێکن، واتە بۆرژوازی، کە مارکس و ئینگلز بەهۆکاری مێژوویی مۆدێرنیتیان لەقەڵەمداوە. بەڵام مانیڤێست بۆ پیاهەڵدانی بۆرژوازی نەنووسراوە، بەڵکو مەبەستی سەرەکی نووسەرەکانی سەلماندنی پێویستی ڕووخاندنی سیستەمی سەرمایەداری و کۆمەڵگای بۆرژوازییە. بۆرژوازی بەهۆی چەوساندنەوەی، چینی کرێکار، توانیویەتی هێزەکانی بەرهەمهێنان گەشەپێبدات. ئێستا کەهەلومەرجی ڕزگاری کرێکاران هاتۆتە پێش، ئەوان بەگۆڕینی تەواوی هەلومەرجی ڕزگاری کرێکاران هاتۆتەپێش، ئەوان بەگۆڕینی تەواوی هەلومەرجەکانی ژیانی خۆیان، دەتوانن ئامانجی سەرەکی شۆڕشە بۆرژوازییەکان -ئامانجێ کەتەنیا ڕاگەیەنراوە، بەڵام بەهۆی دابەشکردنی کاری سەرمایەداران و بەهۆی بەکاربردنەوە، ئیمکانی دەست پێگەیشتنی لەگۆڕێ نیە - بهێننەدی، کەواتە دەکرێ ئەنجامگیری ئەوە بکرێت، کەدوای چەندین سەدە کەتیایدا بۆرژوازی هۆکاری بەرەو پێشبردنی مۆدێرنیتی بوو، ئێستا پرۆلیتاریای پیشەسازی و هاوەڵەکانی کەلەڕووی مێژووییەوە بەرهەمی سەرمایەدارین، لەهەلومەرجی تازەدا هۆکارو بەجێهێنەری بنەڕەتی مۆدێرنیتین. بۆ گەیشتن بە کۆتایی ڕێگەیەک کەڕۆژگاری نوێ هەنگاوی لەسەر هەڵهێناوەتەوە،و بەمەبەستی وەدەستهێنانی سەرجەمی دەستکەوتەکانی مۆدێرنیتی، شۆڕشی کۆمەڵایەتی چینی کرێکاران پێویستییەکی ڕەهایە. لەبەرامبەر کۆمەڵگای داهاتووشدا کەکرێکاران سازی دەکەن، بەرهەمە بەرچاوو ئامادەکانی بۆرژوازی کۆن دەچنەوە: "لەجێگەی کۆمەڵگای کۆنی بۆرژوازی، بەهەموو چین و ناکۆکیە بێ چارەسەرە چینایەتیەکانیەوە، ئێمە کۆمەڵگایەکمان دەبێ، کەتیایدا گەشەی ئازادانەی هەر کەسێ، مەرجی گەشەی ئازادانەی هەمووان دەبێ" [29].

بەگوتەی ئالان تۆرین "مارکس بەتەواوترین شێواز مۆدێرنە، چونکە ئەو کۆمەڵگای وەك بەرهەمێکی مێژوویی کردەی مرۆڤ پێناسەکردووە، نەك وەکو سیستەمێ کەبەچواردەوری بەها فەرهەنگی و یان تەنانەت پایەو پلە کۆمەڵایەتیەکاندا دروست بوبێ، بەڵام ئەو ڕوانگەی مۆدێرنیتی لەگەڵ فەردگەرایی دا بەیەك شت نەدەزانی، بەپێچەوانەوە باسی مرۆڤێکی کرد کە مرۆڤێکی کۆمەڵایەتیەو بەپێی شوێنی لەبواری بەرهەمهێنان دا، لەچوارچێوەی تەکنەلۆژی و پەیوەندیەکانی موڵکایەتیدا پێناسەدەکرێ، مرۆڤێ کە بەهۆی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانەوە دەناسرێتەوە. نەك بەهۆی کۆششی فەردیانەی بەرژەوەندیەکانەوە" [30]. لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت مارکس بە "بیریاری مۆدێنریتیس" ناوبەرین، بەڵام ئەم ناوە بەمانای بەرگریکردنی بێمەرج لەدەستکەوتەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن نیە. ڕەخنە لەئایدیۆلۆژی کەمارکس بناغەی دانا، ڕەخنەیە لەزەینییەتی مۆدێرن. لەوێوە کەمارکس بەپێچەوانەی بەرگریکەرە پڕ کەفو کوڵەکانی مۆدێرنیتیەوە پێشکەوتنی بەمانای "سەرکەوتنی عەقڵ" یان "وەدیهاتنی ڕۆحی ڕەها" نەدەزانی، ڕەخنەی دەگرت لەبڕوا بەپێشکەوتنی میکانیکی و خۆبەخۆی کۆمەڵگای نوێ، و ئەو دیدەگایەش کەگەشەی بەشتێکی ڕەتنەکراوەو ڕەها دەبینی

لەژێر سەردێڕی "ئاگایی درۆزن"دا ڕەتکردەوە. بەتێڕوانینی ئەو پێشکەوتن وەدیهاتنی تێگەیشتنێکی ئەخلاقی نەبوو لەمرۆڤ، بەڵکو ئیمکانی گەیشتن بوو بەخۆشبەختی، ئیمکانێ زادەی گەشەی هێزە مادیەکان بوو، کەچی ئاگایی درۆزنانە یاخود ئایدیۆلۆژیا ڕەتیدەکردەوە. هەرچەندە ئەنجامگیری مارکس لەزۆربەی کێشە فەلسەفیەکان لەسەردەمە جیاوازەکانی ژیانی فیکریدا گۆڕان، بەڵام ئەو هەمیشە وەك ماتریالیستێك مایەوە، و بەردەوام بوو لەشەڕکردن لەگەڵ ئەوەدا کە بۆ خۆی "زەینیەتی ئایدیالیستی" پێدەگوت. مارکس هەرگیز بەرهەم و کاری بیریارێکی بەجیدی نەگرت کەسەرەتاگەی فیکریی ئاگایی یان کردەی مەبەستدار، یاخود ئایدیاکان بێت، و بەردەوام بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر و تووڕە ڕایگەیاند، کە ئەو شێوە تێڕوانینە تەنیا لەسوودی شتێك دایەو ئەویش شاردنەوەی بەرژەوەندیە ڕەهاکانی ئابوورییەو بەس. ئێستا کەئێمە لە "زانستگەرایی" و تێڕوانینێ کەبەبێ ڕەخنەگرتن پۆزەتیڤانەیە دوورکەوتوینەتەوە، تێدەگەین کە گرنگترین دەستکەوتی مارکس نەك لەڕەخنەگرتنیدایە لەئابووری سیاسی، بەڵکو لەنووسراوەکانی سەردەمی گەنجێتیدایە کەلەمەڕ دەوڵەت، لەخود نامۆبوون و "بەشت بوون" نووسیونی. بەڕێکەوت هەمان ئەو نووسینانە بناغەی سەرەکی ڕەخنە لەئایدیۆلۆژی و بەتایبەتیش ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتین.

ئەنجامگیری مارکس لەپێشکەوتن و گەشەسەندن بەشێوەیەکی قووڵ پابەندی ئەنجامگیری ڕۆشنگەرەکان بوو، بیرۆکەی گەشەسەندن ئەو خاڵە سەرەکیە بوو کە بڕیارە کۆمەڵایەتیەکانی سەدەی نۆزدەیەم بەهۆیەوە توانیان "یاسا سرووشتیەکان" بخەنە ناو پانتایی کارەکانیانەوە. مارکسیش هەر لەهەمان بیرۆکەوە دەستیپێکردبوو. بەبڕوای ئەو بزوتنەوەی کرێکاری شۆڕشگێڕ دەربڕی ڕاستەقینەی گەشەی هێزەکانی بەرهەمهێنانەو لەتوانایدایە دژایەتیە دەروونیەکانی سەرمایەداری "چارەسەر" بکات. ئازادی سیاسی و کۆمەڵایەتی، واتە ئەو ئازادیەی کە لەگەڵ ڕزگاربوونی کرێکارانی کرێ گرتەدا، دێتەدی، گەڕانەوەیە بۆ سروشت و سرووشتی مرۆڤ. مارکس لەپێشەکیەکی کورت و لەڕوانگەیەکی میتۆدۆلۆجی زۆر گرنگەوە کە بۆ کتێبی سەرەتایەك بۆ ڕەخنە لەئابووری سیاسی (1859) نووسی، و لێرەدا لەژێر ناوی "پێشەکی 1859" ناوی دەبەم، نووسی کەدەبێ ڕێگری لەسەر ڕێگای "کاملبوونی هێزەکانی بەرهەمهێنان" بخرێتە لاوە، واتە: بەربەستی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە کۆنەکان. ئەو پەیوەندیانەی لەبەرئەوەی هاوشان نین بەپێگەیشتنی هێزەکانی بەرهەم هێنان ئەوە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی "دەورانی شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکان" و لەئەنجامیشدا لەناو دەچن و لەجێگەی ئەوان پەیوەندی بەرهەمهێنانی نوێ دێنە ئاراوە کە ئەمانەش دەبنە هۆی ئاسانکردنی پێگەیشتنی هێزەکانی بەرهەمهێنان (31). ئەم تێڕوانینە لەسەر گەشەی هێزە بەرهەمهێنەرو سرووشتیەکان لەبنەڕەتی خۆیدا زۆر نزیکە لەتێگەیشتنی کۆندریسە لەسەر گەشە. تێگەیشتنێ کەبەهەر شێوەیەك بخرێتە ڕوو، بەستراوە بەمێژووگەرایی، و ئەمەشیان هەرچۆنێ بهێنرێتە پێش پابەندی بیرۆکەی "تەواوکاری - (تۆتالیتی)"یە. مارکس ژیانی کۆمەڵایەتی و سەرجەمی کۆمەڵگای بەبەرهەمی دژایەتیێك دەزانی: دژایەتی گەشەی ناعەقڵانی هێزەکانی بەرهەمهێنان لەگەڵ پەیوەندیە چینایەتی، کۆمەڵایەتی و ئابووریەکانی سەرمایەداریدا، کەلەڕاستیا ڕێگرن لەبەردەم شێوازی ڕاستەقینەو عەقڵانی هەمان گەشەدا، و هۆی ئەم ڕێگرتنەش

میکانیزمی بەدەستهێنانی سوودو زێدەبایی‌و دەستەڵاتی کاری مردووە بەسەر کاری زیندوودا، واتە دەستەڵاتی سەرمایە بەسەر هێزی کارەوە. لەم تێڕوانینەدا ئایدیای تەواوکاری رۆڵێکی گرنگی هەیە. رێك بەو مانایەی کە لەپاشاندا جۆرج لۆکاش یەکێك لەدیارترین فەیلەسووفە مارکسیەکان، ناوی نا "سەرجەمی دیاریکراو"

هەرچەندە جەوهەری تێگەیشتنی مارکس لەسەر گەشە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ تێگەیشتنی رۆشنگەرەکاندا نیە، بەڵام ئەو لەسەر "هۆکاری گەشە" لەگەڵ ئەوان جوێ دەبێتەوە. رۆشنگەرەکان بەهۆی وەڕووخستنی خود وەك "هۆکاری سەرەکی پێشکەوتن" رێگایان بۆ هیگڵ خۆشکرد تا باسی دەستەڵاتی عەقڵ بکات. لەفەلسەفەی هیگڵ دا – بەپێی پەیرەوی کردنی لەمشتومڕو تێگەیشتنی رۆشنگەرەکان – هۆکاری گەشەکردن عەقڵە، و مارکسیش دەقاودەق رەخنە لەم خاڵە دەگرێت‌و وەکو "رازو نهێنی عەقڵ" ناوی دەبات [32]. هیگڵ بوون نەك وەك بوون بەڵکو وەك بیر دەناسێت. واتە ئەو شتێکی سنووردار، ئەزموونکراوو ئامادە دەگۆڕێتە سەر شتێکی بێ سنوور، ترانسندنتالی‌و دوورەدەست. کەواتە، مرۆڤە زیندووە بکەرو بەرهەمهێنەرەکان دەبن بەشتێکی غەیرە خۆیان (و دژی خۆیان)، واتە دەگۆڕێنە سەر بیرێکی گشتی، ئەم بیرەش بەشێوەیەکی ناڕاست وەك بارێکی تایبەت تەماشای دەکرێ. بابەت یاخود Subjectum کە شتێکی تایبەت، ئەزمونی‌و هەبووە {موجود}، دەبێتە شتێکی هەمەکی {کلی}و مەحمول وەك شتێکی تایبەتیش دەناسێنرێ. هیگڵ لەسەرەتاوە ئایدیا وەك جەوهەر دەهێنێتە پێش چاو و پاشانیش واقیعیەت وەك شێوازێکی دەرکەوتنی ئەم جەوهەرە دەناسێنێ. ئەمە ئەو کەم‌و کوڕیەیە کەمارکس لەرەخنە لەبیروڕای هیگڵ لەمەڕ دەوڵەت (1843)ەوە دەیخاتەڕوو، وە چەند ساڵیش لەوەدوا، لەپاشکۆی چاپی دووەمی بەرگی یەکەمی سەرمایە دا دووبارەی دەکاتەوە.

جەوهەر یان رۆح یاخود ئایدیای سەردەمی مۆدێرن بەمەزەندەی هیگڵ شتێکە دوورە دەست، و بەمەزەندەی مارکسیش بەشێوەیەکی زۆر سادە مرۆڤی کۆمەڵایەتیە، کە هەڵەو گیری پەیوەندیە کۆمەڵایەتی – چینایەتیەکانی بەرهەمهێنانە، و لەبەرهەمی کارەکەی نامۆیە، وە لەئەنجامیشدا نامۆیە لەپرۆسەی کۆمەڵایەتیانەی بەرهەمهێناون، لەتوانا داهێنەرەکانی، لەهێزی بەرهەمهێنەری‌و لەدواجاریشدا بێگانەیە لەئیمکانی رزگاری‌و خۆشبەختی. بەڵام هەمان ئەم مرۆڤە دەتوانێ‌و دەبێ رێگای بەرەو پێشچوونی مۆدێرنیتی ئاوەڵاکات، پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە کۆنەکان توورهەڵدات‌و کۆتایی بهێنێ بەسەردەمی تێکشکانی بۆرژوازی تەنیا لەم بارودۆخەدایە کە ئامانجە بەرزەکانی مۆدێرنیتی دێنەدی. کەس نیە درێژەی ئەم داستانە غەمگینەی نەبیستبێ.

تێبینی: پەراوێزەکانی ئەم بەشەش لەم نووسینە لەژمارەی داهاتوودا لەگەڵ بەشی دووەمدا دادەبەزن.

سەردەم

# ڕۆڵی ڕۆشنبیر

■ ئێدوارد سەعید
● و: ئازاد بەرزنجی

ئایا ڕۆشنبیران بەشێکی زۆری خەڵك پێکدەهێنن، یان دەستەیەکی بچووکی خەڵکن کە لەچەند تاکە کەسێك پێکهاتوون؟ لەدوو توێی وەڵامی ئەم پرسیارەدا، دوو پێناسەی بەناوبانگی سەدەی بیستەم خۆیان حەشارداوە؛ گەرچی لەبنەڕەتدا دژبەیەکیشن. ئەنتۆنیۆ گرامشیی مارکسیستو کردەییو ڕۆژنامەوانو یەکێك لە فەیلەسوفانی سیاسیی گەورەی ئیتالیایی؛ وەختێ لەنێوان سالانی 1926، 1937دا لەبەندیخانەکانی مۆسۆلینیدا زیندانی بوو؛ لە"یادداشتەکانی زیندان"دا دەنووسێت: "بەم پێیە دەتوانین بڵێین کەخەڵك هەموو ڕۆشنبیرن، بەڵام هەموویان لەکۆمەڵگادا ڕۆڵی ڕۆشنبیر نابینن" (1). شێوەی ژیانی گرامشی خۆی نموونەی ئەو ڕۆڵەیە کە ئەو بۆ ڕۆشنبیری بەپێویست دەزانی. ئەو وەکو زمانناسێکی پراکتیکاری هەڵکەوتوو، چ وەك ڕێکخەری بزوتنەوەی چینی کرێکارانی ئیتالیاو، چ لەکاری ڕۆژنامەگەریی خۆیدا بەئاگاترین نووسەرێك بوو کەشیکردنەوەی کۆمەڵایەتی لەنووسینەکانیدا ڕەنگی دەدایەوەو ئامانجیشی بەتەنها بەرپاکردنی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی نەبوو، بەڵکو دروستکردنی پێکهاتەی ڕۆشنبیریی هاوجۆری ئەو بزوتنەوەیەش بوو.

گرامشی مەبەستێتی ئەوە لەخەڵکی بگەیەنێت کەئەوانەی ڕۆڵی ڕۆشنبیر دەبینن لەکۆمەڵگادا دەبن بەدوو گروپەوە: گروپی یەکەم، ڕۆشنبیرانی تەقلیدی، وەکو مامۆستایان، قەشەکان، بەڕێوەبەرانو کارمەندان کەکارەکانیان لەوەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دی بەردەوام دەبێت، گروپی دووەمیش: ڕۆشنبیرانی ئۆرگانیك، کەلای گرامشی لەپەیوەندیەکی

راستەوخۆدان لەگەڵ ئەو چینە یا پێکهاتانەی کەرۆشنبیرانیان بۆ ڕێکخستنی خواستەکانیانو وەچنگهێنانی دەسەڵاتو ڕکێف گرتنە دەست بەکارهێناوە، بۆ نموونە گرامشی دەربارەی ڕۆشنبیری ئۆرگانیك دەڵێت:

"خاوەنکاری سەرمایەدار، لەپاڵ خۆیدا، تەکنیکاری پیشەسازو، پسپۆڕی ئابووریی سیاسیو، ڕێکخەری ڕۆشنبیریو، سیستمی یاسایی نوێو شتی لەم جۆرانە دەهێنێتە ئاراوە"[2]. لەڕوانگەی گرامشییەوە، کارناس (خبیر)ی ڕاگەیاندن یاهی تۆڕەکانی پەیوەندیکردنی هەمەکیی ئەمڕۆ، کاتێ دەیەوێت لەڕێی ئامرازە تەکنیکیەکانی خۆیەوە کڕیارێکی زیاتر بۆ بەرهەمەکانی پاکژکەرەوە یاکۆمپانیایەکی فرۆکەوانی پەیدابکات، بەرۆشنبیرێکی ئۆرگانیکی لەقەڵەم دەدرێ. ئەو کەسێکە کە لەکۆمەڵگای دیموکراتدا، لەپێناوی ڕاکێشانو قایلکردنی کڕیارانو فۆرمەلەی بیروبۆچوونەکانی مەسرەفکەر یا دەنگدەردا تێدەکۆشێت. گرامشی لەو باوەڕەدا بوو کەرۆشنبیرانی ئۆرگانیك بەشێوەیەکی کارایانە لەکۆمەڵگادا لەململانێدان، بەو مانایەی کەهەمیشە لەپێناوی گۆڕینی بیروراو گەشەسەندنو پێشکەوتنی بازاڕەکاندا تێدەکۆشن. بەپێچەوانەی مامۆستایانو قەشەکانەوە کەوا دێتە بەرچاو کەم تازۆر لەشوێنێکدا جێگیرنو ساڵ دوانزدە مانگ سەرگەرمی دووپاتکردنەوەی کارێکن؛ ڕۆشنبیرانی ئۆرگانیك بەردەوام لەگەڕانو پشکنیندانو سەرگەرمی بیناکردنن.

لەلایەکی دیکەوە، پێناسە بەناوبانگەکەی "جۆلیان بیندا"مان هەیە کەرۆشنبیران بەدەستەیەکی بچووکی "فەیلەسوف – شا" دەناسێنێ کەخاوەنی بەهرەو تایبەتمەندێتیی ئاکاریی باڵاتری ویژدانی مرۆڤایەتین. ئەوە ڕاستە کە باسەکەی بیندا "خیانەتی ڕۆشنبیران" بۆ کەسانی دوای خۆی بەشیکردنەوەیەکی سیستماتیکانەی ژیانی ڕۆشنبیرانە نا؛ بەڵکو زیاتر بەڕەخنەیەکی توند لەقەڵەم دەدرێ بۆ ئەو ڕۆشنبیرانەی کەوەفایان بۆ پیشەکەیان نەماوەو وەکو جاران بەبنەما ئاکارییەکانی خۆیانەوە پابەند نین، بەڵام ئەمەش ڕاستە کە ئاماژە بۆ ناو و خەسڵەتە بنچینەییەکانی کەسانێك دەکات کەبەلایەوە ڕۆشنبیری ڕاستەقینەن. ئەو لەکاتێکا ناوی کەسانێکی وەکو سپینۆزا، ڤۆلتێر، ئێرنست ڕینان دەهێنێ لەم چاخانەی دواییدا، بەهەمان شێوە چەند جارێك ئاماژە بۆ ناوی سوکراتو مەسیحیش دەکاتەوە. ڕۆشنبیرانی ڕاستەقینە چینێکی جیهانی پێکدەهێننو هەر بەڕاستی کۆمەڵێك بوونەوەری دانسقەن، چونکە پارێزەری کۆمەڵێك پێودانگی ئەبەدیی حەقیقەتو دادپەروەرین کەبەتایبەتی بەم جیهانەوە پەیوەست نین. لەم ڕووەوە وەسفی ئایینیانەی بیندا بۆ زانایانی ئایینی؛ پیشاندەری ئەو پلەو پایەیە کەئەو بۆ پێگەو، ڕۆڵی ڕۆشنبیرانی بەرامبەر بەخەڵکی عەوام داناوە. مەبەست لەعەوامیش ئەو کەسە ئاساییانەن کەخەریکی وەدەستهێنانی دەسکەوتی ماددیو پلەو پایەی تایبەتینو لەکاتی شیاویشدا هەوڵی پتەوکردنی پەیوەندیی نزیك بەدەسەڵاتە دنیاییەکانەوە دەدەن. لەڕوانگەی ئەوەوە، ڕۆشنبیرانی ڕاستەقینە "کەسانێکن کەچالاکییان شوێن هەندێ ئامانجی کردەیی ناکەوێت، کەسانێکن کەچێژ لەتاقیکردنەوەی کاری هونەری، زانستی، یان تێڕامانی میتافیزیکیو بەکورتی لەسەرگەرم بوونە باڵاترە ناماددییەکان دەبینن و، بەدەربڕینێك لەدەربڕینەکان دەڵێن: (قەڵەمڕەوی من قەڵەمڕەوی ئەم جیهانە نییە"[3].

بەهەرحاڵ ، لەنموونەکانی بینداوە بەڕوونی دەردەکەوێت کە ئەو هەڵاتن لەبەرپرسیاری،

دونیاییبوون، لەبورجی عاجدا مانەوە، گۆشەگیری، نوقمبوون لەمەسەلە ئالۆزەکانداو، بەتایبەتیش نوقمبوون لەقەڵەمڕەوی مەسەلە رەمزیو نهێنی ئامێزەکاندا رەت دەکاتەوەو بەڕاستیان نازانێت. رۆشنبیرانی راستەقینە بەتەنها کاتێ خۆیان دەدۆزنەوە کەهانی هەستی توندوتیژی میتافیزیکیو پرنسیپە بێگەردەکانی دادپەروەریو گەڕان بەدوا حەقیقەتدا بدەنو بیوروژێننو دژ بەخراپە بوەستنەوەو، بەرگری لەبێدەسەڵاتانو ستەمدیدەکان بکەنو، دژ بەدەسەڵاتی نارەواو ستەمکار بوەستنەوە. وەکو خۆی دەڵێت: "پێویست دەکا ئەوە بەبیر خۆمان بهێنینەوە کەچۆن فنلۆنو ماسیۆن دژ بەژمارەیەك لەشەڕەکانی لویسی چواردەیەم بوونەوە؟ چۆن ڤۆلتێر وێرانکارییەکانی کۆنت نشین پالاتینیتی مەحکوم کرد؟ چۆن رینان دژ بەتوندوتیژییەکەی ناپلیۆن وەستایەوە؟ چۆن باکل رەفتارە نابەجێکانی بەریتانیای بەرامبەر بەشۆڕشی فەرەنسا خستە ژێر پرسیارەوە؟ هەروەها چۆن لەم سەردەمەی خۆماندا نیچە رەخنەی لەکردەوە نامرۆییەکانی ئەڵمانیا گرت کە دژ بەفەرەنسا نواندنی؟" (4) بەبۆچوونی بیندا کێشەی ئەمڕۆی کۆمەڵگا لەوەدایە کەرۆشنبیران دەسەڵاتی ئاکاری (ئەخلاقی)ی خۆیان سپاردووە بەشتێك کە ئەو لەدەربڕینێکی پێشبینانەدا ناوی ناوە "ئۆرگانیزەکردنی هەڵچوونی دەستەجەمعی - Organization of Collective Passions" وەکو دەستەگەری، هەستو سۆزی جەماوەری، رکابەریی ناسیونالیستیو بەرژەوەندیی چینایەتی. گەرچی بیندا ئەم شتانەی لەساڵی 1927دا نووسیوە، واتە ساڵانێك بەر لەچاخی راگەیاندن، بەلام ئەو مانایەی دیاریکردبوو کەبەکارهێنانی رۆشنبیران بەلای حکومەتەکانەوە چەند گرنگە؛ بەڵام نەك بۆ رابەریکردن، بەڵکو بۆ قایمکردنی سیاسەتی




دەوڵەتو بەردەوامیدان پێیو هەڵڕشتنی پڕوپاگەندە دژ بەدوژمنانی رەسمیو بەباقو بریقکردنی مەسەلەی ناپێویستو، لەئاستێکی فراوانتریشدا پەیڕەوی لەسیستمەکانی وتاربێژیی ئۆروێلیانە کەدەتوانێ لەژێر ناوی "بەرژەوەندیی" رێکخستن یا "شانازیی میللی"دا سەرپۆش بەسەر راستیی ئەوشتەدا بدات کەلەحاڵەتی رووداندایە.

توانای بیندا بۆ لاواندنەوەی خیانەتی رۆشنبیران؛ نە لەوردبینیی تۆژینەوەکەیدایەو نەلەڕوانینی رەها (موتلەق)یانەی ئەستەمی ئەودایە؛ وەختێ بۆچوونی خۆی سەبارەت ئەرکی رۆشنبیرانە دەخاتەڕوو؛ کەبریتییە لەهەمیشە دژایەتیکردن. بەگوێرەی ئەو پێناسەیەی بیندا، رۆشنبیرانی راستەقینە دەبێ هەمیشە ئەوەیان لەبەرچاوبێت کەدەشێ هەر ساتێك بێ بسوتێنرێن، یان دووربخرێنەوەو یان لەسێدارە بدرێن. ئەوانە رەمزی کۆمەڵێك کەسێتیی دیارن کەمۆری سەرکەشی بەتەوێڵیانەوەیەو، بەرامبەر ئەنجامی کاری خۆیان نیگەرانییان خستۆتەلاوە. بەم پێیەو بەگوێرەی ئەم خەسڵەتانە، ژمارەو

پەرەسەندنیان لەزیادبووندا نییە. ئەوانە دەبێ کەسانێکی زۆر وردبن، کەسێتییان جێگیربێت و، لەهەمووش گرنگتر، کەسانێك بن کەزۆربەی کات لەگەڵ دۆخی باودا ناکۆك بن. لەبەر هەموو ئەم هۆیانە رۆشنبیرانی بیندا بەناچاری گروپێکی بچووك و تەواو بینراوی پێکهاتوو لەکۆمەڵێك پیاون – بیندا هەرگیز باسی ئافرەتانی نەدەکرد – کەدەنگی زوڵاڵ و نەفرینی توندوتیژیان لەبەرزی یەوە بەرەو مرۆڤایەتی ئاراستە دەکرێ. بیندا پێمان ناڵێت ئەم پیاوانە چۆن دەرکیان بەحەقیقەت کردووە، یان ئەوەی کە دەشێ پەیبردنی کوێرانەی ئەوان بەپرنسیپە ئەبەدییەکان، وەکو پەیبردنەکەی دۆن کیشۆت، کەمێ لەخەیاڵپلاو زیاتربێ.

بەڵام من گومانم نییە لەوەی کەوێناکردنی رۆشنبیرێکی راستەقینە کەهاوشێوەی پەیبردنەکەی بیندا بێ، وێناکردنێکی سەرنجراکێش و بەهێزە. گەلێ لەنموونە ئیجابی و سەلبییەکانی قانعکەرن: وەکو، بەرگریی ئاشکرای ڤۆلتێر لەبنەماڵەی کالاس، یان بەپێچەوانەوە، ناسیونالیزمی ترسناکی نووسەرانی فەرەنسا، بۆ نموونە وەکو مۆریس بارس کەبیندا ئیعتیباری نەمریسازیی "رۆمانتیکێکی رەق و شایانی سووکایەتی پێکردن"ی لەژێر ناوی شانازیی میللیی و فەرەنسادا بۆ دانا.[5] رۆحی بیندا کەوتبووە ژێر کاریگەریی کاری دریفۆس و جەنگی جیهانیی یەکەمەوە؛ کەهەردووکیان رۆشنبیرانیان رووبەرووی تاقیکردنەوەی سەخت کردەوە. ئیدی یان دەبووایە ئازایانە دژ بەکاری دژایەتیی جوولەکە و هەڵوسانی ناسیونالیزم قسەی خۆیان بکردایە، یان وەکو مەڕ بزن لەگەڵ مێگەلەکەدا برۆیشتنایە و، بەرامبەر بەمەحکومکردنی ناڕەوایانەی ئەفسەری جوولەکە، ئەلفرێد دریفۆس بێدەربەست بوونایە و ئەو دروشمە نیشتمانپەروەرانەیان بگوتایەتەوە کەهەموو ئەوانەی دەوروژاند کەدژایەتیی ئەڵمانیان دەکرد. پاش جەنگی جیهانیی دووەم بیندا – دوای ئیزافەکردنی کۆمەڵێك هێرش بۆسەر ئەو رۆشنبیرانەی کە لەگەڵ نازییەکاندا هاوکارییان کردو، هەروەها ئەوانەش کەبەڕوانینێکی ناڕەخنەییانەوە لایەنگرییان لەکۆمۆنیزم دەکرد – سەرلەنوێ دێتێبەکەی چاپ کردەوە.[6] بەڵام لەقووڵایی گوزارشتی خەباتگێڕانەی کارەکانی بیندادا، کەلەبنەڕەتدا خۆپارێزییەکیان تیایە، دەتوانین سیمای رۆشنبیر وەکو سیمایەکی دیار ببینینەوە، کەسێك کە لەتوانایدایە بەرامبەر بەدەسەڵات حەقیقەت بڵێ. رووگرژێکی وتاربێژ، کەبەشێوەیەکی نائاسایی جەسوورو تووڕەیەو، هیچ دەسەڵاتێکی دونیایی لای ئەو هێندە گەورەو کاریگەر نییە کە نەتوانین هەڵیسەنگێنین و رەخنەی لێبگرین.

شیکردنەوەکەی گرامشی بۆ رۆشنبیر، وەکو کەسێك کەکۆمەڵگا ئەنجامدانی کۆمەڵێك ئەرکی خستۆتە ئەستۆ، لەهەموو ئەو شتانەی بیندا باسی کردوون، لەحەقیقەتەوە نزیکترە. ژمارەیەکی زۆری پیشە تازەکانی سەدەی بیستەم ئەم بۆچوونەی گرامشی دەسەلمێنن: بێژەرانی رادیۆ یا تەلەفزیۆن، پیشە ئەکادیمیەکان، ئەو لێکۆڵەرەوانەی کەبەیاریدەی کۆمپیوتەر کاری خۆیان ئەنجام دەدەن، نوێنەرانی وەرزشی و هۆیەکانی راگەیاندن، راوێژکارانی بەڕێوەبەران، کارناسان لەپلانرێژیی سیاسیدا، راوێژکارانی دەوڵەتان، راپۆرتدەرانی بازاڕ و لەراستیدا تەواوی بوارە تازەکانی هۆیەکانی راگەیاندن.

لای گرامشی، ئەمڕۆ هەرکەسێك لەیەکێك لەو بوارانەدا سەرگەرمی کاربێت کەپەیوەندییان بەبەرهەمهێنان و دابەشکردنی مەعریفەوە هەیە، بەرۆشنبیر دەژمێردرێ. پەیوەندیی زاراوەی "پیشەسازیی بەرهەمهێنانی مەعریفە" بەو شتەوە کەپێی دەڵێن بەرهەمهێنانی فیزیکی، لەزۆربەی وڵاتە پیشەسازییەکانی خۆرئاوادا بۆتە مایەی خێرایی لەزیادکردنی پیشەسازی

مەعریفــەدا. چــەند ســاڵێك لەمەوبــەر، ئێلڤــین گۆڵدنــەری کۆمەڵناســی ئــەمریکایی، رۆشــنبیرانی بەچینێکی نوێ ناوزەد کردو وتی لەحاڵی حازردا بەڕێوەبەرانی رۆشنبیر جێی چینە دەوڵەمـەندو موڵکدارەکانیان گرتۆتەوە. هەروەها گۆڵدنەر وتی کـەچیدی وەکـو پێشـوو رۆشـنبیران لـەریزی خەڵکانێکدا نین کەلەپێناوی بەرزبوونەوەی پایەی خۆیاندا رووی دەمیان لەتـەواوی خـەڵك بێـت، بـەڵکو بـوون بەئـەندامی گروپێـك کەئـەو نـاوی دەنێت "کەلتوری گوتاری رەخنەگرانە"Culture of Critical Discourse"[7]. هــەر رۆشـنبیرێك، چ کــاری پێداچوونــەوە بــێ یــا نووسەری کتێبێك بێو یان پسپۆڕێکی سـەربازیو نوێنەرێکی نێـو نەتـەوەیی بێ، بـەزمانێك دەدوێ کـەتیایدا پسـپۆڕیی پـەیداکردووەو بەتەنـها بـۆ ئەندامانی هەمان بوار شیاوی سوود لێوەرگرتنـە. لەپێودانگێکی فراوانتردا، زمانی پسپۆڕانی تایبەت کەبەزمانی باوی خۆیـان دەدوێن، بۆ کەسانێکی ناپسپۆڕ شیاوی تێگەیشتن نییە.

هەر لەم بارەیەوەو بەهـەمان شـێوە، میشـیل فۆکۆی فەیلەسوفی فەرەنسایی دەڵێت کە ئەوەی پـێی دەڵێـن رۆشـنبیری جیهانی Universal Intellectual (دەشـێ بـۆ ئەمـە ژان پـۆڵ سارتەریشی لەبەرچاو گرتبێت) جێی خـۆی داوە بەرۆشـنبیری "تایبـەت"[8]، کەسـێك کەلەیـەك بواری دیاریکراودا سەرگەرمی کارە، بـەڵام بەهـەر شێوەیەك بێـت دەتوانێ سـوود لەپسپۆڕییەکەی خۆی ببینێت. لێرەدا فۆکۆ بەتایبـەتی مەبەسـتی رۆبـرت ئۆپنهایمـەر، زانـای فـیزیکی ئـەمریکایی بـووە، کەلـەکاتی سـازدانی پـڕۆژەی بۆمبـی ئەتۆمی لۆ ئالامۆسدا - لەنێوان ساڵانی 1942 - 1945دا - و پاشـان بـوون بەکارمـەندی پلـە بـاڵای کاروبـاری زانسـتـیی دەوڵـەتی ئـەمریکا، بواری پسپۆڕییەکەی خۆی بەزاندبوو.

لەوانەیـە بـەهۆی پـەیڕەوی لـەبیرو بۆچوونـە پێشــڕەوەکانی گرامشـــییەوە بووبێــت لـە"یادداشتەکانی زیندان"دا، کەتەقریبـەن بـۆ یەکـەمین جار وەکو تـەوەرەی بنچینـەیی کـار لەکۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا، بایـەخی بەرۆشـنبیران - نـەك بەچینـەکانی کۆمـەڵ - دا. بڵاوبوونـەوەی رۆشنبیران تەنانەت لەناو بـوارە جیاجیاکانیشـدا، بـووە هـۆی ئـەوەی کـەخودی رۆشـنبیران ببنـە بابەتی لێکۆڵینـەوە. هێنـدە بەسە پیتـی (ی) یا (و) لـەدوای وشـەی (رۆشنبیران)ەوە دابنێـین، تاکتێبخانەیەکی تەواوی لێکۆڵینەوەمان سەبارەت بەرۆشنبیران بێتە بەرچاو، کەلەئاستی جیـاوازیو وردبینیدا پڕن لەشتی وردو درشتی وەها کە مرۆ گێـژ دەکـەن. هـەزاران مێـژوو و کۆمەڵناسـیی جیاوازو هـەروەها نووسـینگەلێکی بێشـومارمان سەبارەت بەرۆشنبیرانو ناسیونالیزم، رۆشنبیران و دەسـەڵات، رۆشـنبیرانو نـەریت، رۆشـنبیرانو شـۆڕشو هتـد... لەبەردەستدایە. هـەر پنتێکـی جیــهان رۆشــنبیرانی تایبــەتی خــۆی بەرهەمهێناوەو بەکەفوکوڵەوە لەسەر هەریەك لەم مەسـەلانە لێدوانو گفتوگۆ ئـەنجامدراوە. هیـچ شۆڕشـێکی گـەورە لـەمێژووی هاوچـەرخدا بـەبێ ئامادەگیی رۆشـنبیران رووی نـەداوە، هـەرچۆن هیــچ بزوتنەوەیــەکی دژە شۆڕشــیش بــەبێ ئامــادەگیی رۆشــنبیران نەکەوتۆتــە ســەرپێ. رۆشـنبیران باوکـانو دایکـانو کـوڕانو کچـانو تەنانەت برازای بزووتنەوەکانن.

ئـەو مەترسـییە لەگۆڕێدایـە کەوێنـە یـان وێناندنی رۆشنبیر لەنێو کۆمەڵێ وردو درشتدا ون ببێ، یان لەرەوتی بزاوتـی کۆمـەڵگادا بگـۆڕێ بـۆ پیشـەیەك لەپیشـەکانو یـان شـێوەیەکیتر. مـن لەلێکچـەر (موحــازەرە)ەکــانی خۆمــدا ئــەو راستیانەی کۆتاییەکانی سـەدەی بیسـتەمم پـێ قبوولـە کـەرەگو ریشـەیان دەچێتــەوە ســەر بۆچوونەکانی گرامشی، بەڵام جەخت لەسـەر ئـەو خاڵـەش دەکـەم کـە لەکۆمـەڵگادا رۆشـنبیر تاکـە کەسـێکە کـەرۆڵێکی تایبـەتیو گشـتیی هەیـەو ناتوانێ هەروا بەئاسانی خـۆی لەپیشـەیەکدا دیل بکات، یان بەتەنها ئـەندامێکی شایستەی چینێك بێت، واتە کەسێك کەبەتەنها بـیر لـەکارو پیشـەی

خۆی بکاتەوە. من وایدەبینم کەراستی‌یەکەی ئەوەیە کە رۆشنبیر تاکە کەسێکی خاوەن هێزێکی زەینی‌یە بۆ حاڵکیردن‌و، بەرجەستە کردن‌و، روونکردنەوەی پەیامێك، تیۆری‌یەك، روانینێك‌و، یان فەلسەفە یا هزر – هەم بۆ هەمووان‌و هەم بەهەمووان. رۆڵێکی وەهاش دیوێکی تیژی هەیەو، رۆشنبیریش بەبێ ئەوەی بەرهەمهێنی کۆمەڵێك پرسیاری گێژکەر بێ، ناتوانێ ئەو رۆڵە ببینێت. لەبینینی رۆڵێکی لەمجۆرەشدا، بێگومان رۆشنبیر روبەڕووی توندڕەوی‌و دۆگمایی دەبێتەوە. ئەو ناتوانێ رۆڵێکی وەها ببینێت، مەگەر حکومەتەکان‌و دەزگاکان نەتوانن بەئاسانی ئەو بەلای خۆیاندا رابکێشن. رۆشنبیر تاکە کەسێکە کە "بیانووی بوون"ی بینینی رۆڵی نوێنەرایەتیی هەموو ئەو خەڵك‌و مەسەلانەیە کە کەوتوونەتە پەراوێزی رووداوەکان‌و، یان فەرامۆش کراون‌و یان شاردراونەتەوە. رۆشنبیر لەسەر بنچینەی کۆمەڵێك پرنسیپی جیهانگیرانە ئەم کارە ئەنجام دەدات: واتە تەواوی ئادەمیزادەکان مافی ئەوەیان هەیە کەچاوەڕێی رەفتارێك بن لەدەسەلات‌و میللەتەکانی دونیاوە کە لەگەڵ پێودانگەکانی ئازادی‌و دادپەروەریدا کۆك بێت‌و، گەر پێشێلکردنێکی ئەنقەست یا کەمتەرخەمی‌یەك لەئاست ئەو پێودانگانەدا بینرا، پێویست بەگەواهی دان‌و خەباتی ئازایانە لەپێناویاندا دەکات.

رێم بدەن با ئەم مەسەلەیە لەچەند دەستەواژەیەکی شەخسیدا دەرببڕم، من وەکو رۆشنبیرێك، تێڕوانینەکانی خۆم بۆ کۆمەڵێك لەخەڵك یان گروپێك دەخەمەڕوو، بەڵام مەسەلەکە بەتەنها بریتی نی‌یە لەوەی کە من چۆن ئەم تێڕوانینانەم لەچەند خاڵێکدا دەردەبڕم، بەڵکو ئەوەشە کەمن فەردێکم بۆ هاندانی ئازادی‌و دادپەروەری تێدەکۆشم. من کەئەم شتانە دەڵێم یا دەیاننوسم لەبەرئەوەیە کە پاش کۆمەڵێك رەنگدانەوە بوون بەبەشێك لەبیروباوەڕەکانی من. هەر لەبەرئەمە ئاوێتەبوونێکی ئاڵۆز لەنێوان دونیا تایبەتیەکان‌و دونیا گشتی‌یەکاندا هەیە، لەسەرێکەوە مێژووی شەخسی، بەهاکان، نووسینەکان‌و هەڵوێستەکانم کە لەئەزموونەکانمەوە سەرچاوەیان گرتووە، لەسەرێکی تریشەوە، چۆن ئەمانە رێی خۆیان بۆ چوونە ناو کۆمەڵگاوە دەدۆزنەوە، ئەو شوێنەی تیایدا خەڵکی دەربارەی جەنگ‌و ئازادی‌و دادپەروەری لێدوان ئەنجام دەدەن‌و بڕیار دەدەن. شتێك نی‌یە ناوی رۆشنبیری تایبەت بێ، لەبەرئەوەی تۆ هەر لەوساتەوەی کەوشەکان دەخەیتە سەر کاغەزو پاشان بەچاپیان دەگەیەنیت، پێ دەخەیتە نێو جیهانێکی گشتی‌یەوە. هەروەها شتێکیش نی‌یە ناوی رۆشنبیری گشتی بێت، واتە کەسێك کەبوونی بەتەنها بریتی بێت لەوەی سەرۆکێکی بێدەسەلات یا وتەبێژو یان رەمزی بزاڤێك یا پیشەیەك بێ.

لادان (انحراف)ی شەخسی‌و هەستیاریی تایبەتی هەمیشە هەن‌و، هەر ئەمانەشن مانا بەو شتە دەبەخشن کەدەگوترێ یان دەنووسرێ. ئەوەی کە لەهەموو شتەکانی دیکە کەمتر بایەخی هەیە ئەوەیە کەرۆشنبیر رەزامەندیی گوێگران وەدەست بهێنێت، خاڵی سەرەکی هەراسانکردن‌و، بەرپەرچ وەستان‌و، تەنانەت ئەوەشە کەبوونی ئەویان پێخۆش نەبێت.

بەم پێیە، ئەوەی لەکۆتاییدا بایەخی هەیە ئەوەیە کەرۆشنبیر روویەکی دیارە؛ کەسێکە کەبەئاشکرا نوێنەری جۆرە دیدگایەکە، کەسێکە کە وێڕای کۆسپ‌و تەگەرە جۆراوجۆرەکان، خولقێنەری بەرجەستەکردنی لێهاتووانەیە بۆ کۆمەڵگاکەی خۆی. ئەوەی من دەمەوێ لێی بدوێم ئەوەیە کەرۆشنبیران کەسانێکن پیشەکەیان پەیوەستە بەهونەری بەرجەستەکردنەوە، ئیدی ئەم هونەرە قسەکردن بێ، یان نووسین، یا وانەوتنەوەو، یا دەرکەوتن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن. گرنگیی پیشەیەکی لەمجۆرە لەوەدایە کەلەسەرێکەوە هەمووان ئەوە

دیاری دەکەنو، لەسەرێکی تریشەوە، هەم ئیلتیزامو مەترسیو هەم جەسارەتو ئازاریش لەخۆدەگرێت. وەختێ کارەکانی ژان پۆڵ سارتەر، یان برتراند راسل دەخوێنمەوە، ئەوە ئامادەگیی دەنگی تاکەکەسیو تایبەتیی ئەوانە کەزیاترو بەشێوەیەکی بالاتر لەشتەکانی تریان هەستو ئیدراکی من دەخولقێنن، لەبەرئەوەی ئەوان ئەو شتە دەڵێن کەباوەڕیان پێیەتی. نابێ ئەوانمان لەگەڵ کارمەندێکی بێناو یا کەسێکی بیرۆکراتدا لێ تێکەڵ بێت.

لەتۆژینەوەکاندا سەبارەت رۆشنبیران، زیاد لەپێویست گرنگی بەپێناسەی رۆشنبیر دراوەو، بایەخی پێویست بەلێکۆڵینەوەی وێناندن، کاریگەری، بەجێهێنانی ئەو رۆڵەی کەتێکڕا خولقێنەری هێزی ژیانیی هەر رۆشنبیرێکی راستەقینەن، نەدراوە. ئایزایا بێرلین، تاڕادەیەك لەژێر کاریگەریی رۆمانتیزمی ئەڵمانیدا دەڵێت کەخوێنەرانی نووسەرانی سەدەی نۆزدەهەمی رووسیا "وایاندەبینی کەرۆشنبیر، لەدیمەنێکی کۆمەڵایەتیدا، لەحاڵەتی گەواهیداندایە"(9). بەڕای من ئەم حاڵەتە هێشتا بەرۆڵی کۆمەڵایەتیی رۆشنبیری ئەمڕۆمانەوە هەر پەیوەستە. هەر بۆیە ئێمە وەختێ رۆشنبیرێکی وەکو سارتەر دەهێنینەوە یادی خۆمان، ئەوەی بەبیرماندا گوزەر دەکا کۆمەڵە شتێکی وەکو شێوازی تایبەتیو، هەستکردن بەکاری گرنگی شەخسیو، تێکۆشانی پەتیو، خۆخستنە مەترسییەوەو، خواستی نووسین دەربارەی ئیمپریالیزمو، ئیلتیزامو، یان ئەو شێوە خەباتە کۆمەڵایەتییەی کە رقی دژمنەکانی هەڵساندووەو، هاوڕێکانی هەژاندووەو، تەنانەت لەوانەیە خودی سارتەر خۆیشیان بەرامبەر بەرابردووی خۆی سەغڵەتو پەشیمان کردبێت.

وەختێ سەبارەت پێکدا هەڵپژانەکانی سارتەر لەگەڵ سیمۆن دی بۆڤوارو، مشتومڕەکانی لەگەڵ کامۆو، هاوڕێیەتیی سەیری لەگەڵ جان جینیەدا دەخوێنینەوە، ئەو لەهەڵوێستی خۆیدا دادەنێین (ئەم وشەیەش هەر لەسارتەر خۆیەوە وەرگیراوە). لەم هەڵوێستانەداو تاڕادەیەك لەڕێی ئەم هەڵوێستانەوە سارتەر بریتی بووە لەخۆی، ئەو کەسەی کەتەنانەت سەبارەت جەزائیرو ڤیەتنامیش دژ بەفەرەنسا وەستایەوە. بەبێئەوەی مەبەستم کەمکردنەوە لەبایەخی یا رەتکردنەوەی ئەوبێت وەکو رۆشنبیریك:، دەبێ بڵێم کەئەم ئالۆزییانە رەوتو تانوپۆیەکی تایبەتی بەو قسانە دەدا کە ئەو کردوونیو ئەو وەکو ئادەمیزادێك کەقابیلی هەڵەکردنە دەخاتە بەرچاو؛ نەك وەك کەسێکی غەمبارو وەعزەرو مامۆستای ئاکار.

بەتەنها لەنێو پرۆسەی ژیانی چاخی مۆدێرندایە کەدەتوانین وەکو رۆمان یان درامایەكو، نەك وەکو پیشەیەك یان کەرەسەیەکی خاو بۆ پەیامێکی کۆمەڵایەتی، ئەوە ببینینو دەرك بکەین کەچۆن رۆشنبیران نەك هەر نوێنەری هەندێ بزاڤی گەورەی کۆمەڵایەتی یانهێنین، بەڵکو رەخسێنەری شێوەی ژیانو کۆمەڵێك رۆڵی کۆمەڵایەتیی وەهان کەهەر ئەوان دەتوانن ئەنجامی بدەن. لەهیچ شوێنێك وەسفی ئەو رۆڵە وا بەجوانی نابینینەوە، وەکو لەهەندێ رۆمانی نابراوی سەدەی نۆزدەیەمو سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا دەیبینین: رۆمانی "باوکانو کوڕان"ی تورگنێڤ، "پەروەردەی عاتیفی"ی فلۆبێر، "وێنەی هونەرمەندەکە لەتافی لاویدا"ی جۆیس، کەتیایاندا رەمزی حەقیقەتو، تەنانەت گۆڕانیشی، لەژێر کاریگەریی قووڵو دەرکەوتنی کتوپڕی کاراکتەرێکی نوێدایە کەرۆشنبیری لاوی مۆدێرنە.

ئەو وێنەیەی کەتورگنێڤ لەمەڕ روسیای قەیسەریی دەهەی 1860 ەوە دەیکێشێت، وێنەی ژیانێکی دێهاتیو خاڵییە لەڕووداوی گرنگ: پیاوە لاوەکان دابو نەریتی ژیانی خۆیان بەمیراتی لەدایكو باوکیانەوە بۆ دەمێنێتەوە، ژن دەهێنن‌و منالیان دەبێو وەکو ئەوانی پێش خۆیان درێژە بەژیانیان دەدەن. ئەم دۆخە

بەردەوام دەبێ تا ئەو دەمەی کەسێکی ئاشووبگێڕ، بەڵام لەهەمان کاتدا هەستیارو وردبین بەناوی (بازاڕۆڤ)ەوە پەیدادەبێو دێتە ژیانیانەوە، یەکەمین شت کەلەودا سەرنجمان رادەکێشێت ئەوەیە کەئەرکی خۆی بەرامبەر بەدایكو باوکی خۆی دیاریدەکاتو، زیاتر لەوەی کوڕی خێزانێك بێت وا دێتە بەرچاو کە کەسێتییەکە خۆی خۆی دروستکردووەو لەگەڵ عادەتەکانی ژیانی رۆژانەدا ناکۆکەو هێرش دەکاتە سەر میانڕەوی‌و مەسەلە سواوەکانو بەرگری لەبەها زانستی‌و ناعاتیفیەکان دەکات کەئەقڵانی‌و پێشڕەو دێنە پێشچاو. تورگنێف دەڵێ نەیویستووە باقو بریق بەکاراکتەری بازاڕۆڤ بدات، وا قەراربووە بازاڕۆڤ ئادەمیزادێك بێ "وشكو، بێسۆزو، تارادەیەکی زۆریش رەق رەفتار". بازاڕۆڤ گاڵتە بەخێزانی کریزانۆڤ دەکات، کاتێ باوکە تەمەن مام ناوەندییەکەی خێزانەکە پارچەیەك مۆسیقای شۆبرت دەژەنێت، بازاڕۆڤ بەدەنگێکی بەرزەوە پێی پێدەکەنێت. بازاڕۆڤ بیروبۆچوونەکانی زانستی ماتێریالیزمی ئەڵمانی دەخاتەڕوو:

سروشت بەلای ئەوەوە پەرستگایەك نییە، بەڵکو شوێنێکە بۆ کار. کاتێ عاشقی ئاناسێرژیڤناش دەبێ، ئەویش ئەمی خۆشدەوێ بەڵام لەهەمان کاتدا سڵیشی لێدەکاتەوە: لای ئانا، راستگۆییەکەی ئەو کە هێزێکی رۆشنبیریانەی تووڕەشی لەگەڵدایە، پەیامهێنی جۆرە ئاژاوەیەکی پەتییە. لەشوێنێکدا ئانا دەڵێت: کاتێ لەگەڵ ئەودا دەبم وا هەستدەکەم خەریکم لەهەورازێکی سەختەوە خلۆر دەبمەوە.

جوانی‌و خەمئەنگێزیی رۆمانەکە لەوەدایە کەتورگنێف بیرخەرەوەو وێنەگری ناکۆکی‌ی نێوان روسیایە کە لەلایەن بنەماڵەکانو لەگەڵ سۆزی باوکایەتی‌و رەوتی سروشتی‌و تەقلیدیەوە ئەنجامی کارەکان بەڕێوەدەبرێنو هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، هێزی پوچگەراو وێرانکەری کەسێك کەناوی بازاڕۆڤەو پێشینەی بەپێچەوانەی کەسەکانی‌تری رۆمانەکەوە وەسف ناکرێ، پێدەخاتە سەر شانۆی رووداوەکان. ئەو دەردەکەوێ، دە جەنگێو لەپڕێکا تووشی پەتایەکی دێهاتی دەبێ، کەخۆی سەرگەرمی چارەسەکردنی بوو و، دەمرێت. ئەوەی سەبارەت بازاڕۆڤ لە یاددا دەمێنێتەوە هێزو توانای نەترسی بۆ پرسیارکردنو ئەقڵی شیکەرەوەو قووڵی ئەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کەتورگنێف لافی ئەوە لێدەدات کەبەلای ئەوەوە بازاڕۆڤ خەمخۆرترین کەسێتیی ئەوبووە، هەروەکو چۆن لەکاردانەوەی پەشێوو شڵەژاوی خوێنەرەکانی‌یەوە دوچاری سەرەگێژە بووە، بەهۆی هێزی بێپەرەوای رۆشنبیریانەی بازاڕۆڤیشەوە بەهەمان شێوە دوچاری گێژی بووە. هەندێ لەخوێنەران وای بۆچوون کەبازاڕۆڤ هێرشێکە بۆ سەر لاوان، هەندێکی دی وەکو پاڵەوانێکی راستەقینە ستایشیان کرد، هەندێکی تریش بەکەسێکی خەتەرناکیان لەقەڵەم دا. ئێمە هەر هەستێکمان بەرامبەر ئەو هەبێ، "باوکانو کوڕان" ناتوانێ بازاڕۆڤ وەکو کەسێتییەك لەکەسێتییەکانی رۆمانەکە لەگەڵ خۆیدا بگونجێنێت، لەکاتێکا هاوڕێکانی‌و خێزانی کریزانۆڤو تەنانەت باوكو دایکە پیرو خەمئەنگێزەکەیشی درێژە بەژیانی خۆیان دەدەن، یەکلاکەرەوەیی‌و بەرەنگاریی بازاڕۆڤ وەکو رۆشنبیرێك، دەبێتە مایەی دەرکردنی ئەو لەرۆمانەکە، چونکە ئەو کەسێکی سرکەو رام ناکرێ.

کەسێتیی "ستیڤن دیدالۆس" یش لەچیرۆکەکەی جۆیس دا لەم روونو ئاشکراترە. تەواوی قۆناغی سەرەتای ژیانی بریتییە لە بگرەو بەردەی نێوان مەراییە گروپیەکانی وەکو کڵێساو، پیشەی مامۆستایی‌و، ناسیونالیزمی ئێرلەندی‌و، پەیدابوونی لەسەرخۆی کەسێتیی لەخۆبایی خۆی وەکو رۆشنبیرێك کەدروشمی دوورەپەرێزییە لەبیروباوەڕە شەیتانییەکان. سمیۆس دین ئاماژە بۆ خاڵێکی سەرنجراکێشی

ئـەم رۆمانـەی جۆیـس "وێنـەی هونەرمەندەکـە" دەکات:

"ئـەم رۆمانـە یەکـەمین رۆمانــە بــەزمانی ئینگلیزی کەتیایدا خولیایەکی زۆر بۆ بیرکردنەوە خراوەتــەروو"[10]. هیـچ یـەکێك لەپێشـەنگان و لەپاڵەوانەکانی دیکنز، تاکری، ئۆستین، هـاردی و تەنانەت جۆرج ئەلیوتیش، پیـاوان و ئافرەتـانێکی لاو نین کەخەمیان زیندوێتیی بیرو تێفکرین بـێ لـەناو کۆمـەڵگادا، لـەکاتێکا بـەلای دیدالۆسـی لاوەوە "بیرکردنـەوە شـێوەی تەجروبـەکردنی جیهانـە." دیـن هـەقیتی بلـێ بـەر لـەدیدالۆس پیشـەی رۆشـنبیر بەتەنـها "بەرجەسـتەکردنی سەیرو سەمەرە"ی ئەفسانە ئینگلیزیـەکان بـوو. لەهــەمانکاتدا، لەبەرئـەوەی سـتیڤن لاوێکــی شـــاری‌یەوە بەرهـــــەمی ژینگەیـــــەکی ئیمپریالیســـتیانەیە، دەبـێ بـــەر لـــەبوون بەهونەرمەند؛ هۆشیاریی پتەوو باڵای رۆشـنبیرانە لەخۆیدا برسکێنێ.

لەکۆتایی رۆمانەکەدا، رەخنەو دوورەپـەرێزیی لەبەرنامەیـەکی ئـایدیۆلۆژیك کەدەرەنجامەکـەی بریتی‌یـە لەفـەوتانی تـاکێتی و بـەڵکو کەسـێتی‌ی ناپەســـەندی خـــۆی، هیچـــی لەرەخنـــەو دوورەپەرێزیی لەخێزان و بنەماڵـەی فنیان کـەمتر نی‌یە.[11] جۆیسیش وەکـو تۆرگنێـڤ لـەرێی "کنایە"وە ئەو راستی‌یە دەسـەلمێنێ کەلـەنێوان رۆشـنبیری لاوو رووداوە بەدوایەکـەکانی ژیـاندا تـەبایی نی‌یە. ئـەو چیرۆکـەی کەبەشـێوەیەکی ئاسـایی بـــەژیانی لاوێـــك دەسـتپێدەکات کەلـەخێزانێکدا نەشونمای کردووەو پاشـان بـۆ قوتابخانەو زانکۆ دەچێت، بەکۆمـەڵێك نووسینی چڕو پڕ مانای دەفتەری یادەوەریی‌ـەکانی ستیفن کۆتایی دێ. ئەم رۆشنبیرە لەگەڵ ژیانی رۆژانە یا ئـەنجامدانی کـاری ئاسـایی و سـواوی رۆژانـەدا نـاگونجێت. گـەرچی زێدەگۆیـی هەسـتیارانەی دەربڕینەکـەی جۆیـس شـێوازێکە ئـەو بـۆ رەتکردنەوەی رەونـەق و شکۆی ئـەو پیاوە لاوە بـەکاریدەهێنێت، سـتیفن لـەناوازەترین وتـاری رۆمانەکەدا بەمجۆرە چـەمکی ئـازادی لەڕوانگەی رۆشنبیرەوە دەردەبـڕێ: "مـن پێت دەڵێم کـەچ کـارێك ئـەنجام دەدەم و چـی ئـەنجامنادەم. مـن خزمـەتی شـتێك ناکـەم کـەباوەڕم پـێی نـەبێت، ئیدی ناوی ئەو شتە ماڵی من، نیشتمانی من، یان کڵێســـای مـــن بێـــت، مـــن هـــەوڵدەدەم بیروبۆچوونەکانی خـۆم لـەرێی هـەندێ شـێوازی ترەوە، یا هونەرەوە بەسەربەسـتترین و کامڵترین شێوە دەربڕم، بۆ بەرگریکردنیش لەخۆم چـەکی وەهـا بـەکاردەهێنم کـەخۆم رێی بـەکارهێنانیانم بـەخۆمداوە: بێدەنگی، جێهێشـتنی نیشـتمان و، زیرەکی".

ئێمـە تەنانـەت لەئەفسانەی "ئۆلیس"یشـدا نـاتوانین سـتیفن بـە لاوێکی کەللەشـەق و یـاخی لەقەڵەم نەدەین. ئەوەی بەباوەڕی ئـەو لەهـەموو شتێك زیاتر جـێی بایەخـە، جەختکردنـە لەسـەر ئـازادیی رۆشنبیرانە. ئەمـە یەکێکـە لەمەسـەلە سـەرەکی‌یەکانی کـاری رۆشـنبیرانە، چونکە بـوون بەئادەمیزادێکی بەدخوو یـا کەسـێك کـەتێکدەری شەوق و چالاکی‌یە، نابێتە ئامانج. ئامـانجی کـاری رۆشـنبیرانە بەرزکردنـەوەو بـاڵاکردنی ئـازادی و مەعریفەی ئـادەمیزادە. بـەباوەڕی مـن سـەرباری ئـەو تۆمەتانـەی کەگەلـێ جـار دەدرێنـە پـاڵ "چیرۆکـە شـکۆدارو بەناوبانگـەکانی ئـازادی و رۆشنگەری"، تا ئێستاش ئەو ئامانجە بەتـەوەری سـەرەکیی کـاری رۆشـنبیرانە دەژمـێردرێ. فەیلەسووفی هاوچەرخی فەرەنسایی "لیوتـار" ئـەم پایەخوازی‌یـە قارەمانانـەی بەسـتۆتەوە بەچاخی "مۆدێرن"ەوەو لەو باوەڕەدایە کـە ئـەم چیرۆکانە لـەچاخی "پۆسـت مۆدێـرن"دا هیـچ بایـەخێکیان نی‌یـە. لەدیدگایـەکی لـەمجۆرەدا، داستانە شـکۆدارو ناوازەکـان جـێی خۆیـان داوە بەگەمەکانی زمان و هەڵویستە دیاریکراوەکان.

رۆشـنبیرانی پۆسـت مۆدێرن بـەها بـۆ توانـاو شایسـتەیی، نـەك بـۆ بـەها جیهانیـەکانی وەك حەقیقـەت و ئـازادی دادەنێن. مـن هەمیشـە وای بۆدەچووم کەسەرباری پۆست مۆدێرنیزم، لیوتارو

پەیڕەویکارانی، لەبری نرخاندنێکی دروستی ئەو شتەی بەناوی ئارایشتی دەرفەتە بێسنوورە ڕاستەقینەکان بۆ ڕۆشنبیر ماوەتەوە، ڕێیان بەخۆیانداوە کەبێتوانایی‌و بێدەسەڵاتی‌و تەنانەت لەوانەیە بێدەربەستیش بەسەریاندا زاڵ بووبێت. چونکە لەڕاستیدا تائێستاش حکومەتەکان بەئاشکرا ستەم لەخەڵك دەکەن، هێشتا بێدادییەکی فراوان‌و نالەبار لەئارادایە، هاوکاریی ڕۆشنبیران لەگەڵ دەسەڵاتداو بەکارهێنانیان لەلایەن دەسەڵاتەوە، هێشتا لەتوانایدایە دەنگیان کپ بکات‌و، لادانی ڕۆشنبیران لەپیشەو ئەرکی سەرەکیی خۆیان هێشتا یەکێکە لەمەسەلە سەرەکییەکان.

گۆستاف فلۆبیر لە "پەروەردەی عاتیفی"دا، بەبەراورد لەگەڵ ئەوانی تردا نائومێدی بەرامبەر بەرۆشنبیران پیشان دەدات‌و بێبەزەییانە رەخنەیان لێدەگرێ. ئەگەر ئەوە بهێنینە پێشچاوی خۆمان کەرۆمانەکەی فلۆبیر لەقۆناغی گرژی‌و پڕ ئاژاوەی پاریس، واتە لەنێوان ساڵانی 1851-1948دا روویداوە، ئەو قۆناغەی کەلویس نامیری مێژوونووسی بەناوبانگی ئینگلیز ناوی ناوە قۆناغی شۆڕشی ڕۆشنبیران، دەبینین کەئەم ڕۆمانە لەژیانێکی سیاسیی بێسەروبەر لە "نێوەندی سەدەی نۆزدەهەم" {پاریس}دا دیمەنێکی فراوان دەخولقێنێت. تەوەری ڕۆمانەکە دوو لاوی خەڵکی شارن، فریدریك مۆرۆو شارل دولاریە، کەرەفتاریان وەکو پیاوانێکی خۆشگوزەران، دەربڕی توورەیی فلۆبیرە لەبێدەسەلاتیان وەکو ڕۆشنبیر لەدۆزینەوەی ڕێبازێکی پتەوو بەردەوامدا. هۆی بەکەم سەیرکردنی ئەمانە دەشێ لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کە فلۆبیر زۆر زیاتر لەوەی لێ چاوەڕێ دەکردن. لەئەنجامدا، یەکێك لە درەوشاوەترین وێنەکانی ئاوارەیی ڕۆشنبیر دەخرێتەڕوو. ئەم دوو پیاوە لاوە، بەتواناکانی لێکۆڵەرەوەیەك، رەخنەگرێك، مێژوونووسێك، وتارنووسێك، فەیلەسوفێك‌و تیۆریسازێکی کۆمەڵایەتی‌و بەئامانجی بەدەستهێنانی بەختەوەری‌و خۆشگوزەرانیی گشتی، کاری خۆیان دەستپێدەکەن. کاری مۆرۆ (بە نەمانی خەونی پایەی ڕۆشنبیرانەی.." کۆتایی دێ. "ساڵانێك تێپەڕی‌و ئەو بەرگەی تەمەڵی‌و بێ توانایی خۆی گرت".

دولاریە "دەبێ بەسەرۆکی فەرمانگەی کۆچ لەجەزائیرو، نووسەر لای پاشایەك‌و، بەڕێوەبەری ڕۆژنامەو پسپۆری ڕاگەیاندن، ... ئەو حاڵی حازر، لەکۆمپانیایەکی پیشەسازیدا وەکو پارێزەرێك سەرقاڵی کارە".

لای فلۆبیر، تێکشکانەکانی ساڵی 1848، بەنائومێدییەکانی نەوەی ئەو دەژمێردرێن، چارەنووسی مۆرۆو دولاریە، بەشێوەیەکی پێشبینانە وەکو ئەنجامی لەدەستدانی خواستەکانی ئەوانەو، بەهەمان شێوە وەکو ئەو کۆسپ‌و تەگەرانەیە کەلەلایەن کۆمەڵگای مۆدێرنەوە سەپێنراون؛ بەشڵەژان‌و لادان (انحراف)ە بێکۆتاییەکانیەوە، بەوەرچەرخان‌و هەڵکشان‌و داکشانی خۆشی‌و چێژەکانیەوە. لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە هاتنەکایەوەی ڕۆژنامەگەری، ڕاگەیاندن، ناوبانگی خێراو، ئەو بوارانەی کەتیایدا بیروڕا قابیلی فرۆشتنە، هەموو بەهاکان قابیلی گۆڕانن، هەموو پیشەکان گۆڕاون بۆ پیشەی پارە پەیداکردنی ئاسان‌و سەرکەوتنی پەلەو خێرا. بەم پێیە دیمەنە سەرەکییەکانی ڕۆمانەکە بەشێوەیەکی ڕەمزی بریتین لەپێشبڕکێی ئەسپ سواری، سەماکردن لەکافیتریاو سۆزانیخانەکاندا، ئاژاوەو دووبەرەکی نانەوە، بزاڤە دەستە جەمعیەکان، نمایشی شکۆدارو، هەروەها کۆبوونەوەی گشتیی ڕێکخراو کەتیایدا مۆرۆ بەردەوام لەتەقەللادایە بۆ گەیشتن بەعیشق‌و خواستە ڕۆشنبیرییەکانی، بەڵام لەهەموو ئەمانە لادەدات‌و دڵسارد دەبێتەوە.

هەرچەندە نموونەی وەك بازارۆڤ و دیدالۆس‌و مۆرۆ بەنموونەی توندڕەو دەژمێردرێن،

بەڵام ئەو مەبەستە بەدەستەوە دەدەن کەدیمەنی راستەقینەی رۆمانەکانی سەدەی نۆزدەیەم بریتی بووە لەخستنەرووی تاکی رۆشنبیر لەکاتی کارکردندا. ئەمانە دەکرێ پیشاندەری ئەو کێشەو دوو دڵییە بێشومارانە بن کەرۆشنبیرانیان گەمارۆداوە — چ لەقاڵبی مانەوەی رێگایاندا چ لەبەرگی خیانەتکردن بەکارو پیشەیان —. هەڵبەتە نەك وەکو کارێکی چەسپاو کەدەبێ بۆ یەك جارو هەمیشە لەسیستمێکی وەك "دەبێ چۆن کارەکان ئەنجامبدەین" دا فێری ببین، بەڵکو وەك تەجروبەیەکی راستەقینە کەبەردەوام لەلایەن ژیانی مۆدێرنەوە هێرشی دەکرێتە سەر. رۆڵی رۆشنبیر، روونکردنەوەی ئامانجەکانی یا بیروراکانی بۆ کۆمەڵگا، بەپێویست مانای بەهێزکردنی ئارەزووە دەروونیەکان یا پتەوکردنی پلەو پایە نییە. مەبەستی ئەوان خزمەتکردن نییە لەپەنا بیرۆکراسییە دەسەڵاتدارەکان و جێگیربوون لەپەنا خاوەنکارە دەسکراوەکاندا. رۆڵی رۆشنبیر خۆی کارەو پەیوەستە بەجۆرێك لەهۆشیاریەوە کەگومانکەرە، شەرکەرەو بەشێوەیەکی بێئۆقرە سەرقاڵی لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەی ئەقڵانی و داوەریی ئاکاری (ئەخلاقی)یە. ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کەشوناسی تاکە کەس پێکدێنێ و دەیخاتە سەر رەوت. زانینی چۆنێتیی بەکارهێنانی بێ گیروگرفتی زمان و، هۆشیاری بەوەی کەدەبێ لەچ کاتێکا دەست لە زمان بدەین، دوو لایەنی لێکنەپساوو سەرەکیی کاری رۆشنبیرانەن.

بەڵام لەم سەردەمەی ئێستادا، چ ئەرکێك بەسەرشانی رۆشنبیرەوەیەو ئەو نوێنەری چییە؟ بەبروای من، یەکێك لەباشترین و راستگۆترین وەڵامەکانی ئەم پرسیارە وەڵامی (سی. رایت میلز)ە. میلز رۆشنبیرێکە تەواو سەربەست، بەروانینێکی کۆمەڵایەتیانەی وروژێنەرو توانایەکی بەرچاو بۆ ئاڵوگۆری بیروبۆچوونەکانی خۆی لەشێوەی پەخشانێکی ئاشکراو هەژێنەردا. ئەو لەساڵی 1944دا دەنووسێت: رۆشنبیرانی سەربەخۆ، بەپێی هەلومەرجە پەراوێزییەکانی خۆیان، رووبەرووی جۆرە هەستکردن بەنائومێدیەك بەرامبەر بەلەدەستدانی دەسەڵاتی خۆیان بوونەتەوە، یان لەبەردەم ئەم هەڵبژاردنەدان کە وەکو ئەندامانی ناو گروپێکی بچوك کەبەبێ بەرپرسیاری بریاری گرنگ دەدەن، بچنە ناو رێکخراوو کۆمپانیاو حکومەتەکانەوە. بوون بەکرێکارێکی "کرێگرتە" لەکارگەیەکی بەرهەمهێنانی زانیاریشدا رێگە چارەیەکی باش نییە، چونکە لەم حاڵەتەدا بەرقەرارکردنی پەیوەندی بەخوێنەرانەوە وەکو بەرقەرارکردنی پەیوەندیی گوێگرەکانی (تۆم پین) بە تۆم پینەوە ئەستەمە. بەکورتی، خاوەندارێتیی "ئامرازەکانی ئاڵوگۆڕی کاریگەر" کەسەرمایەی رۆشنبیرە لێی زەوت کراوەو بیرمەندی سەربەخۆ لەکارێکی سەرەکیی تەنیا دەچێت.

میلز ئەم مەسەلەیە بەمجۆرە دەردەبڕێت:

هونەرمەندو رۆشنبیری سەربەخۆ لەو کەسێتیە زۆر کەمانەن کەماونەتەوەو بۆ بەرەنگاری و شەرکردن لەگەڵ رەفتارە لەقاڵبدراوەکان و بەرئەنجامەکانیان، کەمەرگی شتگەلێکن کەلەخۆباییانە دەژین؛ چەکدارن. ئەمە دەرکێکی تازەی پێویستە بۆ چارشێولادان و وردکردنی وێناندن و ئەقڵی لەقاڵبدراو کەپەیوەندیە نوێیەکان {واتە سیستمە کردەییە مۆدێرنەکان} ئێمەی لەزۆنگاویدا گەوزاندووە. جیهانەکانی هونەرو هزر تا بێت رۆژ بەرۆژ لەگەڵ خواستە سیاسیەکاندا دەگونجێن. هەر بۆیە ئەم گونجانەو تەقەللای رۆشنبیرانەیە دەبێ لەسیاسەتدا رۆڵی تەوەرە ببینێت. ئەگەر بیرمەندێك لەرەوتی تێکۆشانی سیاسیدا، لەگەڵ بەهای حەقیقەتدا خۆی بەراوردنەکاتەوە، ناتوانێ بەرپرسیارانە لەعۆدەی هەموو کێشە ئەزموونکارییەکان بێت[12].

ئەم دێرانە شایانی ئەوەن کەچەندەها جار بخوێندرێنەوە، چونکە پڕن لەئامۆژگاریی بەسوودو گرنگ. سیاسەت لەهەموو شوێنێکدا

ئامادەیەو هیچ ڕێگایەکی هەڵاتن نییە بۆ بوارەکانی هونەرو بیری پەتی، یابۆ بواری بێلایەنی بەرامبەر حەقیقەتو یان بۆ تیۆرەیەکی تێپەڕ. ڕۆشنبیران لەسەردەمی خۆیاندا دەژینو کارو کردەوە سیاسیەکان، کە لەڕێی کارگەکانی هەواڵسازی یا دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بەرجەستە دەبن، ئەوان ڕێنوێنی دەکات. هەربۆیە ڕۆشنبیران تەنها لەڕێی ململانێوە لەگەڵ وەهمەکان، ریوایەتە رەسمیەکانو پاساو هێنانەوەکانی دەسەڵات کەبەهۆی دەزگای ڕاگەیاندنێکی بەهێزەوە بڵاوکراونەتەوە )(و تا بێت هێزیشیان روو لەزیادبوونە) بەرامبەر بەم کارو کردەوانە توانای بەرەنگارییان هەیە. ڕۆشنبیران نەك تەنها بەرامبەر بەم دەزگای ڕاگەیاندنە بەهێزە توانای بەرەنگارییان هەیە؛ بەڵکو لەتوانایاندایە دژ بەتەواوی ئەو رەوتە فیکرییانەش بوەستنەوە کەهەلومەرجی باو دەپارێزنو هەموو شتێك لەسنوورێکی پەسەندکراوو روانگەیەکی قانوونی بەسەر حەقیقەتەوە قبوول دەکەن. ڕۆشنبیران یان لەڕێی ئامادەگیی ئەو شتەوە کە مێلز ناوی دەنێت "چارشێو لەروو هەڵماڵین"، دەتوانن بەرامبەر هەموو ئەوانە بەرەنگاری بکەن، و یان بەهەندێ ڕێگای دی کەتیایاندا ڕۆشنبیر، لەبەرزترین ئاستی توانایدا، هەوڵدەدات حەقیقەت بڵێت.

ئەنجامی ئەم جۆرە کارەش سەختە: ڕۆشنبیر هەمیشە لەمابەینی تەنیاییو وابەستەییدایە. لەڕووداوی دوا جەنگی کەنداودا دژ بەعێراق، چەند دژوار بوو ئەوە لەهاوولاتیە ئەمریکاییەکان بگەیەنین کەئەمریکا نەهێزێکی بێگوناهو بێلایەن بووە (ئەوانەیان لەبیرچووبۆوە کەپلانیان بۆ هێرشکردنە سەر ڤیەتنامو پەنەما دارشتبوو)و نەکەسێك کردوویەتی بەپاسەوانی سەربازیی جیهان، خۆی نەبێت. بەلام بەبڕوای من ئەوە ئەرکی ڕۆشنبیران بوو لەوکاتەدا شتە فەرامۆشکراوەکان لەژێر خاك دەربهێننەوە، پەیوەندییە نکوولی لێکراوەکان دروستبکەنەوەو، سەرنجی خەڵکی بۆ شێوازیتر رابکێشن کە لەتوانایدا بوو بەر لەجەنگو دەرەنجامەکانیشی، واتە فەوتاندنی مرۆڤەکان، بگرێت.

خاڵی سەرەکی لەمەبەستی رایت مێلزدا ئەو ململانێیەیە کە لەنێوان خەڵکی عەوامو تاکە کەسدایە. جیاوازیەکی خۆیی لەنێوان دەسەڵاتەکانی ڕێکخراوە گەورەکان، هەر لەحکومەتەکانەوە بیگرە تا کۆمپانیاکانو، لاوازیی ڕێژەیی نەك بەتەنها تاکە کەسەکاندا هەیە، بەڵکو ئەو مرۆڤانەش کەخاوەن پێگەی لاوەکین، وەکو:

کەمایەتیەکان، خەڵك و دەوڵەتەکانی ئەقل، کەلتوورەکانو نەژادە ئاست نزمەکان. من گومانم لەوە نییە کەڕۆشنبیر لایەنگری لاوازو بێنوێنەرەکانە. هەندێك هەن ڕۆشنبیرو ڕۆبن هوود بەیەك دەشوبهێنن. بەهەرحاڵ ئەمە ڕۆڵێکی ئاسان نییەو، لەم رووەشەوە ناتوانین هەروا بەئاسانیو وەکو کەسێکی ئایدیالیستی رۆمانتیك ڕۆشنبیر پشتگوێ بخەین. لەکۆتاییدا، بەلای منەوە، ڕۆشنبیر نەکەسێکی ئاشتیخوازو نەسازێنەری سازشێکی گشتیشە. ڕۆشنبیر کەسێکە کەهەموو بوونی بەستراوەتەوە بەدیاریکردنو جیاوازیکردنی رەخنەگرانەوە، دیاریکردنو جیاوازیکردنێك کە ئامادەنییە، فۆرمۆلە سادەکان، دەستەواژە ساوو لەکارکەوتووەکانو، لەڕاستیدا گونجان لەگەڵ هەر شتێکدا قبووڵبکات کەدەسەڵات یان نەریت دەبێ بیڵێتو ئەنجامی بدات. ئەمەش بەتەنها قبووڵنەکردنێك نییە کە لەکاردانەوەوە هاتبێت، بەڵکو ڕۆشنبیر چالاکانە دەیەوێ ئەوە دەرببڕێتو بیخاتەروو.

ئەمەش هەمیشە بەو مانایە نییە کەڕۆشنبیر دەبێ یەکێك بێت لەرەخنەگرانی رەوتی حکومەت، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێ وا بڕوانینە پیشەی ڕۆشنبیری کەهەمیشە بەخۆی هوشیارەو، بەردەوامیش خوازیاری ئەوەیە کەڕێ بەخۆی

نــەدات تەنــها نیــوەی حەقیقــەتو ئایدیــا پەســەندەکان رێنومـــایی بکــەن. ئــەنجامدانی کارێکی لەمجۆرەش پێویستی بەواقیعگەراییەکی جێگیرو خۆراگرو، تاڕادەیەك وزەیەکی بەهێزی مەعقولو، هەروەها کۆششێکی سەختو ئالۆز هەیە بۆ بەرقەرارکردنی هاوسەنگییەك لەنێوان کێشە تاکە کەسیەکاندا بەرامبەر ئەرکەکانی بـرەودانو بڵاوکردنـەوەی راستیەکان لـەبواری گشتیدا. هـەر ئـەم هۆکارانەشـە وا لەرۆشـنبیری دەکات ببێتە پیشەیەك کە بریتییە لە کۆششێکی بـەردەوامو ئاوێتەیـەکی ناتـــەواوو بەپێویســـت نوقسانو ناکامڵـە لەهـەمان کاتدا، گـەرچی ئـەم پیشەیە مەرج نییە ببێتە مایەی ناوبانگ بۆ تاکـە کـەس، بـەڵام بـەهێزیو ئاڵۆزییەکـەی، لانـی کـەم بەلای منەوە، دەبێتە مایەی پڕیو دەوڵەمـەندیی تاکە کەس. *

پەراوێزەکان:

1- Antonio Gramsci, The Prison Notebooks: Selections, Trans. Quintin Hoar and Geoffrey Nowell – Smith (New York: International PublisheR, 1971),P.9.

2- Ibid.,P.4.

3- Julien Benda, The Treason of the Intellectuals, trans. Richard Aldingtion (1928; rprt. New York: Norton, 1969) P.43.

4- Ibid., P.52.

5- لەســاڵی 1762ی زایینیــدا، بازرگـــانێکی پرۆتستانت کەناوی جین کالاس بوو، خەڵکی شاری تۆلوز بوو، بەتاوانی کوشتنی کوڕەکەی کەنیازی بوو بچێتە سەر مەزهەبی کاسۆلیك، دادگایی کراو پاشانیش لەسێدارەدرا. گەرچی بەڵگەکان لاوازو بێ بنچینـە بـوون، ئـەوەی بـووە هۆی پەلەکردن لەبڕیاردانی دەستەی دادوەر ئـەو بـاوەڕە بـاوەبوو کەپرۆتســتانتەکان خــەڵکێکی دەمارگــیرن کەبەئاسانی هەر پرۆتستانتێك لـەناو دەبـەن کەمەزهـەبی خۆی بگۆڕێ. ڤۆڵتـێر بۆ گەڕاندنـەوەی ئـابڕووی خـێزانی کالاس کەوتە ململانێیەکی ئاشکراوە کەتێیدا سـەرکەوتوو بـوو. (بـەڵام ئـەمڕۆ ئێمـە ئـەوە دەزانـین کەتەنانـەت بەڵگەکانی ئەویش ساختەبوون). مۆریس بارس یەکێك بوو لەنـەیارانی دیـاری ئـەلفرێد دریفـۆس. ئـەو وەکـو رۆماننوســێکی فەرەنســایی لایــەنگری فاشــیزمو دژ بەرۆشنبیرانی کۆتایی سەدەی بیستەم، لەبەرگریکارانی تیـــۆرەی بێئاگـــایی سیاســـی (Political Unconscious) بـوو، کـەتیایدا تـەواوی نـەژادەکان و میللەتەکان بەشێوەیەکی دەستەجەمعی هـەڵگری ئایدیاو بۆچوونە تایبەتیەکانی خۆیان بوون.

6- La Trahison: Was republished By Bernard Grasset in 1946.

7- Alvin W. Gouldner, The Future of Intellectuals and the Rise of the New Class (New York: Seabury Press, 1979), PP.28-43

8- Michel Foucault, Power, Knowledge: Selected Interviews and other writings 1972-1977, ed. Colin Gordon (New york: Pantheon, 1980), PP.127-128.

9- Isaiah Berlin, Russian Thinkers,ed. Henry Hardy and Aileen Kelly (New York: Viking Press, 1978), P.129

10- Seamus Deane, Celtic Revival: Essays in Modern irish Literature 1880 – 1980 (London: Faber & Faber, 1985), PP. 75-76.

11- دەستەیەکی ئەفسـانەیی کۆمـەڵێك پاڵـەوانو شـەڕکەری ئێرلـەندین، لەسـەدەکانی دووەمو سـێیەمی پاش زاییندا ژیاون. هـەروەها نـاوی نیشـتەجێیانی کۆنـی ئێرلەندەشە، کەبەرگرییان لەدوورگـەی ئێرلـەندە کـرد لەسەردەمی فین FINN پاشای ئێرلەندەدا.

12- C.Wright Mills, Power, Politics, and People: The Collected Essays of C. Wright, Mills, ed. Irving Louis Horowitz (New York: Ballantine< 1963), P.299.

* ئـەم نووسـینە بەشـێکە لـەکتێبێکی ئێـدوارد سـەعیدو لە دەقـە فارسـیەکەوە کـراوە بـەکوردی کـە ئەمەیــە: نقــش روشــنفکر – ادوارد ســعید، ترجمــەو پیشگفتار: د. حمید عضدانلو، انتشارات آموزش – چاپ اول 1377 (1998) – تهران.

# خولقێنەر چی‌یە؟*

■ میشێل فۆکۆ

● و: دانا صۆفی

ساتی پەیدابوونی چەمکی "خولقێنەر"[1]، ساتی جیاوازی پەیدابوونی فەردە لەمێژووی ئەندێشەو مەعریفەو ئەدەبیاتو فەلسەفەو زانستدا، هەتا ئەمڕۆ، کاتێ مێژووی فلانە چەمك یا ژانرای ئەدەنی یا قوتابخانەی فەلسەفی دەنووسینەوە، هەموو ئەو مەقولانە بەپێوانەیان لەگەڵ یەکەی بونیادیو سەختی خولقێنەرو بەرهەم[2]، بەڕێژەی سستو لاوەکی دەردەکەون.

من لێرە نامەوێ شیکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتی – مێژوویی لەکەسایەتی کۆمەڵایەتی خولقێنەر بخەمەڕو. بێگومان، سودی دەبو کەببینین خولقێنەر لەکولتورێکی وەك کولتوری ئێمەدا چۆن بەفەردیەت گەیشتو چ پێگەیەکی وەرگرتو مەسەلەی رەسەنایەتیو پەیوەستەگی {دەق} لەچ ساتێکەوە سەریهەڵداو خولقێنەر لەکام سیستمی ئەرزشداناندا دەستی هەبوو و گێڕانەوەی ژیاننامەی خولقێنەران لەجێی قارەمانان بۆ چ سەردەمێك دەگەڕێتەوەو ئەم مەقولە بونیادیە "رەخنەی پەیوەست بەخولقێنەرو بەرهەم" چۆن برەوی پەیداکرد. بەڵام ئێستا دەمەوێ تەنیا باس لەپەیوەندی نێوان دەقو خولقێنەر بکەمو هەروەها لەشێوە ئاماژەی دەق بۆ ئەو "سیما"یەی کە بەلای کەمی بەڕواڵەت، لەدەرەوەی ئەو و لەپێشەوەی ئەودایە.

ئەو بابەتەی کەدەمەوێ دەستی پێبکەم، بێکیت[3] بەجوانی بەم شێوەیە دەریبڕیوە: "یەکێ وتی چ گرنگیەکی هەیە کە چ کەسێ قسەدەکا." یەکێ لەبنچینە بونیادیە ئەخلاقیەکان لەکاری نووسەری هاوچەرخدا لەو نەبونی جیاوازیەدا دەرکەوتوە. دەڵێم "ئەخلاقی" لەبەرئەوەی ئەو نەبوونی جیاوازییە


فۆکۆ

لەڕاستیدا خەسڵەتێك نییە کەشێوەی قسەکردن یا نووسین دیاریبکات، بەڵکە زێتر جۆرە ڕێسایەکی دەرونیو زاتیە {immanent} کە بێ وەستان بەردەوام دەبێ، بەڵام هەرگیز بەشێوەیەکی کامڵ بەکارنابردرێت، ڕێسایەك کەنوسراو بەتەواوبویی نابینێ، بەڵکو وەك جۆرە کارێك بەسەریدا زاڵ دەبێ، کاتێ کە ئەم ڕێسایە بەئەندازەی پێویست بۆمان ئاشنایە پێویستی بەشیکردنەوەی دوورودرێژ نییە، لێرەدا بۆ بەڵگەهێنانەوە، لەو بارەوە تەنیا بەڕیشە دۆزی دوو بابەتی گشتی دەوەستین.

یەکەم، دەتوانین بڵێین نووسین ئەمڕۆ لەکۆتی ڕەهەندی دەربڕین (بیان) ئازاد بوە. تەنیا بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، بەڵام بێئەوەی لەهەناوی خۆیدا زیندانی بێ، بەهەمان ڕواڵەتی پشکوتوو دەرکەوتوی خۆی دەناسرێتەوە. بەدەربڕینێکی دی، کارو کاردانەوەیەکە لەنێوان ئەو ئاماژانەی کەزێتر لەوەی هاوتای مەدلولی نوسراوبن، بەپێی ماهیەتی دال {دەلالەتکەر} ڕێکخراون. نوسراو وەك شێوە یاریەك فراوان دەبێ کەبەبێ هەڵاوێردن لەڕێساو سنوری خۆی پتر دەڕوات. لەنووسیندا، مەبەست نیشاندان یان بەرزکردنەوەی کاری نووسین یان بزمارکوتکردنی بابەتێك نییە لەچوارچێوەی زماندا؛ مەسەلەی دروستکردنی فەزایەك دەبێتە سەرمەشق کەبکەری نووسەر [4] بەردەوام تیایدا وندەبێت.

بابەتی دووەم، واتە پەیوەندی نووسین بەمەرگ، کە کەمێ ناسراوترە. ئەو پەیوەستەگیە، ئەو نەرێتە دێرینە ئاوەژودەکاتەوە کەداستانە یۆنانیەکان نمونەیەتی. مەبەست لە داستانبێژی لەیۆناندا هەمیشەیی کردنی بێمەرگی (نەمری) پاڵەوان بوو کە ئەگەر ئامادەبوایە لەتافی لاویدا بمرێ، ژیانی ئەو بەهۆی مەرگەوە بەپیرۆزی و مەزنایەتی دەگەیشتو دەشیا بەنەمری بگات، و چیرۆك {ریوایەت} ئەو مەرگە پەسەندکراوەی قەرەبو دەکردەوە. لەچیرۆکە عەرەبیەکانیشدا، وەك هەزارو یەك شەوە، هاندەرو بابەتو بیانو دیسانەوە راکردن لەمەرگ بوو. گێڕەوە (راوی) بۆ پێشگرتن لەمەرگو بەدرەنگکردنی ڕۆژی حیساب کەدەبوا بیخزێنێتە نێو خامۆشیەوە، تا بەرەبەیان چیرۆکی دەوت. چیرۆکی شەهرەزاد لەجێی کۆششێکەوە بۆ راگرتنی مەرگ لەدەرەوەی بازنەی ژیاندا کەهەموو شەوێك سەردەداتەوە.

دوایی مەبەست شتێك بوو کەدەبوا مەرگ لەدەرەوە راگرێت. کولتوری ئێمە ئەو بۆچونەی گۆڕیوە. نووسین بەفیداکاریو هەتا فیداکاری گیان بەستراوەتەوە، و ئێستا لەنێوچونێکی ئیرادیە کەپێویستی بەنیشاندان نیە لەنێو کتێبەکاندا لەبەرئەوەی لەژیانو بوونی خودی نووسەردا روودەدات. بەرهەم کەڕۆژگارێك مەبەست تیایدا بێمەرگ کردن بوو، ئێستا، وەك لەبارەی فلۆبێرو پرۆستو کافکاوە، حەقی هەیە بکوژێو ببێتە بکوژی خولقێنەرەکەی خۆی. بەڵام مەسەلەکە بەمە کۆتایی نایەت؛ پەیوەندی نووسینو مەرگ هەروەك لەنێوچونی تایبەتمەندیە

فەردیەکانی بکەری نووسەر دەرکەوتوەکە کەرەسەی هەمەجۆرە لەنێوان خۆیو ئەوەی دەینوسێت ئامادە دەکات تا نیشانە فەردیە تایبەتیەکانی خۆی لەبەین ببات. لەئاکامدا، هیچ نیشانەیەك لەو بەجێ نامێنێ بێجگە لەنەبونە سەرسوڕهێنەرەکەی،و ئەو دەبێ لەگەمەی نووسیندا ڕۆڵی تەرم وازیبکات.

هیچ یەك لەمانە تازە نییە. لەمەوبەر لەڕەخنەو فەلسەفەدا نادیاری – یامەرگی – خولقێنەر لای لێکراوەتەوە. بەڵام پاشهاتەکانی ئەو دۆزینەوەیە هێشتا بەئەندازەی پێویست نەبۆتە جێی لێکۆڵینەوەو واتاو چەمکەکانی بەوردی هەڵنەسێنگراوە. هەندێ بۆچون کەمەبەست تیایاندا ئەوەبوە پێگەی تایبەتی خولقێنەر پڕبکەنەوە، وا دێتە بەرچاو زێتر ئەو تایبەتمەندیەیان پاراستوەو مانا واقیعیەکەیان داپۆشیوە. دەمەوێ لەدوو خاڵی ئەو بۆچونانە بکۆڵمەوە کەئەمڕۆ گرنگی زۆریان هەیە.

بۆچونی یەکەم بەرهەمە، هەموان بەو تێزە ئاشنان کەدەڵێ ئامانج لەڕەخنە نە ئاشکراکردنی پەیوەندی بەرهەمو خولقێنەرە نەداهێنانەوەی فلانە ئەندێشە یا ئەزمونە لەڕێگای دەقەوە، بەڵکو شیکردنەوەی بەرهەمە بەلاکردنەوە لەبیناو بونیادو فۆرمی (یان شێوە) زاتیو کارو کاردانەوەی پەیوەندیە ناوەکیەکانی لەگەڵ یەکتردا. بەڵام لێرەدا مەسەلەیەك دێتە پێشەوە بەو دەربڕینەی کە: "خودی بەرهەم چیە" ئەو یەکێتییە غەریبەی کەناوی دەنێن بەرهەم چیە؟ ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی چین؟ مەگەر هەمان شتێ نییە کە خولقێنەر نووسیویەتی؟" و یەکسەر کۆمەڵێ کێشە دەنێنەوە. ئەگەر کەسێك خولقێنەر نەبو، ئایا دەتوانین بڵێین ئەوەی کەنووسیویەتیو وتویەتیو لەسەر لاپەڕەکانیدا بەجێی هێشتوە دەشێ پێی بڵێین "بەرهەم"؟ لەو ڕۆژانەی کەمارکی دوساد[5] بەخولقێنەر نەدەخوێنرایەوە، نووسراوەکانی لەچ بارێکدا بون؟ ئایا تەنیا چەند لولەیێ کاغەزبوون کە ئەو بێوچان لەزینداندا خەیاڵپلاویەکانی خۆی فرێدا بوە سەریان؟

هەتا دوای ئەوەی قبوڵکراوە ئەو کەسەی کەخولقێنەرە، دیسانەوە دەبێ بپرسن ئایا هەرچیەکی کەنووسیویەتی وتویەتیو لەسەر لاپەڕەکانیدا بەجێهێشتون بەبەشێك لە بەرهەمەکانی حسێب دەکرێن؟ پرسیارەکە، هەم لایەنی تیۆری هەیەو هەم لایەنی هونەری. بۆ نمونە، کاتێ کەسێك دەیەوێ بەرهەمەکانی نیچە[6] بڵاوبکاتەوە، دەبێ لەکوێ بوەستێ؟ گومانی تیا نییە کەهەموو شتێ دەبێ بڵاوبکرێنەوە. بەڵام "هەموو شتێ" چیە؟ بێگومان هەر شتێکی کەخودی نیچە بڵاویکردۆتەوە. و بەهەمان شێوە پێشنووسی بەرهەمەکانی؟ بێگومان، و ئەو سەرمەشقانەی بۆ وشە کورتەکانی ئامادەی کردبوو؟ هەڵبەتە، و ئەو بەشانەی کەخەتی لەسەر داوەو ئەو یاداشتانەی کەلەپەراوێزی لاپەڕەکاندا نووسیویەتی؟ بەڵێ. بەڵام ئەگەر لەدەفتەرۆکەی یاداشتی وشە کورتەکانیانیدا ڕوبەڕوی شتێ ببینەوە وەك فلانە سەرچاوە یان وەبیرهێنانەوەی فلانە دانیشتن یان فلانە ناونیشان یان پێرستی ئەو جلانەی کەبەجلشۆریدا بوون، چی بکەین؟ ئایا ئەمانەش بەشێکن لەبەرهەم یان نەء؟ ئەگەر هەونین، بۆ هەونین؟ و بەو شێوەیە، تا بێ کۆتایی. چۆن دەشێ لەنێوان ملیۆنان نیشانەدا کە کەسێك لەدوای مردنیدا بەجێیان دێڵێ، پێناسی ئەوە بکەین کە "بەرهەم" چیە؟ هیچ تیۆرێك لەمەڕ بەرهەمەوە بوونی نییە، و کاری ئەزمونی کەسانێك کە سادە دڵانە هەوڵی چاککردنەوەی بەرهەم دەدەن، بەزۆری بەهۆی نەبوونی تیۆرێکیوا دوچاری کێماسی دەبن.

هەتا دەشێ هەنگاوی بالاتر بنێین و بپرسین: ئایا هەزار و یەك شەوەش بەرهەمە؟ یا کۆپلەکانی (مرقعات) کلێمسنی ئەسکەندەرانی[7]، یا ژیانی فەیلەسوفانی دیوگنیس لایرتیوس[8]؟" کۆمەڵێ پرسیار لەبارەی بۆچونێکی وا لەمەڕ بەرهەمەوە دێتە پێشەوە. بەپێی ئەوە کافی نییە کەبڵێین دەبێ نووسەر (واتە خولقێنەر) وەلا بنرێ و لەخودی بەرهەم بکۆڵدرێتەوە. وشەی "بەرهەم" و هەروەها ئەو یەکێتییەی کە ئەم وشەیە دەریبڕیەتی بەهەمان ئەندازە مەسەلەسازو شاراوەیە وەك دۆزی فەردیەتی خولقێنەر.

بۆچونێکیتر کەنەیهێشتووە دروست بەقوڵایی مانای نادیاربونی خولقێنەر بگەین و لەهەمان سڕینەوەو شاردنەوەی ساتی ئەو نادیاریەدا، بەشێوەیەکی ناسك و باریك بوونی خولقێنەری پاراستوە، بۆچونی "نووسراو"ە ئەگەر بەوردی بەکاربرێ، دەبێ مۆڵەت بدات کەنەك لەئاماژەکردن بۆ خولقێنەر رابکەین، بەڵکو دیاری بکەین کەئەو لەکوێ نییە. بۆچونی نوسراو و بەو شێوەیەی کەئێستا باوە، نەبەکاری نووسینەوە پەیوەست دەبێ و نە بەو هێما یا نیشانەی مانایەکی کە کەسێك هەندێ کات ویستویەتی بیگەیەنێ. کۆششی ئێمە لەسەر ئەوە گەڵاڵە دەبێ کە بەهەوڵی زۆر باری گشتی هەر دەقێك - هەم لەڕوی فەزاوە کەدەق تیایدا پەرت بووەو هەم لەڕوی زەمەنەوە کەمانای دەق بەرە بەرە لەتوێی ئەودا دەکرێتەوە - لەخەیاڵدا ندا جێبکەینەوە.

بەڵام لەباری باوی ئێستادا، بۆچونی نووسراو وادێتە بەرچاو تایبەتمەندیە ئەزمونکاریەکانی خولقێنەر بگوازێتەوە بۆ جۆرە دنیایەکی گومناوی سەروی جیهانی {متعالی}. دوو رێگا هەیە بۆ دەستنیشانکردنی تایبەتمەندیەکانی نووسراو کەیەکێکیان رەخنەیی و ئەوی دیکەیان ئاینییە، و ئێمە بە لەبەرامبەر یەکدی دانانی ئەم دوانە، بەسڕینەوە نیشانە دیارەکانی دال بەسەر تایبەتمەندیە ئەزمونکاریەکانی خولقێنەر وازدێنین. تایبەتیکردنی پێگەی یەکەمین بەنووسراوەوە لەڕواڵەتدا رێگایەکە بۆ بەڕاست دانانی خەسڵەتە پیرۆزەکەی لەدیدی ئاینییەوە[9] و حوکم کردنە بەخەسڵەتە خولقێنەرەکەی لەڕووی رەخنەییەوە، و هەردوکیشیان بەدەربڕینێکی نوێوە لەچوارچێوەی سەروی جیهانیدا. دانانان بەوەی کەنووسراو بەهۆی بوونی رابردوو ئەو مێژووەی کە هێناویەتیە خانەی ئیمکانەوە، ئەزمونی فەرامۆشی و پێشگرتن دەیگرێتەوە، بەڕوکەش لەچوارچێوەی سەروی جیهانیدا نوێنەری ریشەی مانا شاردراوەکانە (کە پێویستی بە تەئویلە) و هەروەها نوێنەری ریشەی رەخنەیی دەلالەتە لەخۆگرتووەکان و دەرخەرە خامۆش و ناوەڕۆکە داپۆشراوەکانە (کەسەرچاوەی راڤەو تەفسیرە). وا دەردەکەوێ ئەگەر نووسراو لەدنیای خەیاڵدا بەمانای نەبوونی {نووسەر} وەرگرین، یەکسانە بە دووبارەکردنەوەیەکی روتی ریشەی ئاینی بوونەی نەریتێکی نەگۆڕو لەهەمان باردا هەرگیز بەکام نەگەیشتوو، هەروەها ریشەی جوانناسی مانەوەی بەرهەم و مانەوە هەمیشەییەکەی دوای مەرگی خولقێنەرو لوغزاویتر بونی لەخولقێنەر.

بەکارهێنانی چەمکی نووسراو بەو شێوەیە ئەو خەتەرە دەگرێتە خۆ کە ئیمتیازە تایبەتیەکانی خولقێنەر لەژێر سایەی پێگەی لەپێشتری نووسراو بپارێزێ و، بەگوتەیەکی تر، لەنێو تیشکێکی خۆڵەمێشی نەزۆکدا کار وکاردانەوەی ئەو شێوە دەرکەوتانەی کە وێنەی تایبەتی خولقێنەری فۆرموڵە کردووە، بەزیندویی دەهێڵێتەوە. نادیاربوونی خولقێنەر کە لەسەردەمی مالارمێوە[10] لەسەر یەك دووبارە بۆتەوە، دوچاری زنجیرەیەك بەربەستی سەروی

جیهانییە. بەڕوکەش سیمایەکی جیاوازی گرنگ هەیە لەنێوان ئەو کەسانەی کەپێیان وایە هێشتا دەتوانن شوێنی دابڕانەکانی {RUPTURES} ئەمڕۆ لەنەرێتی مێژوویی سەروی جیهانی سەدەی نۆزدەهەمدا دیارییبکەنو ئەوانەی هەوڵ دەدەن بەشێوەیەکی یەکجارەکیو هەمیشەیی خۆیان لەو نەرێتە رەها بکەن.

بەڵام دووبارەکردنەوەی ئەو قسە خاڵی لەناوەڕۆکەی کەدەڵێ خولقێنەر ون بووە، کافی نییە، بەو بەڵگەوەش دووبارەکردنەوەی ئەو گوتەیە (بەپێڕەوی لەنیچە)ش کافی نییە کەدەڵێ خوداو مرۆڤ بەمەرگێکی هاوبەش مردون. لەبری ئەوە دەبێ بزانین ئەو فەزایە لەکوێیە کەلەدوای ونبوونی خولقێنەرەوە خاڵی ماوەتەوەو بەدوای دابەشبونی درزو شکانەکاندا بچین و وریا بین لەوەی کەونبوونی خولقێنەر چ کەلێنێك ئاشکرا دەکات.

سەرەتا دەبێ ئەو مەسەلانە بەکورتی رونبکەینەوە کە لەبەکارهێنانی ناوی خولقێنەرەوە هەڵدەقوڵێن. ناوی خولقێنەر چیە؟ خاوەنی چ جۆرە کارکردێکە؟ من بێئەوەی بمەوێ هیچ رێگە چارەیەك پێشنیاز بکەم، تەنیا بەئاماژەکردن بەبەشێك لەو دژواریانە {کێشانە} ئیکتیفا دەکەم کە لەو دەبنەوە.

ناوی خولقێنەر ناوێکی تایبەت (اسم خاص) یا ناسراوە (اسم علم)و، بەپێی ئەوە هەندێ مەسەلە دێنێتە پێشەوە کەهەموو ئەعلامەکان تیایدا هاوبەشن. (لێرەدا شیکردنەوەکانی جان سێرل[11]م لەبەرچاوە). دیارە کەناتوانین بەتەواوی هیچ ناوێکی تایبەت بکەینە مەرجەعێکی[12] سادە. کارکردەکانی ناوی تایبەت بەکارکردی خەبەری روت – واتە تەنیا بەخەبەرو ئاماژە و بەپەنجە نیشاندانی کەسێك – سنوردار ناکرێ. ناوی تایبەت بەرامبەر بەوەسفە. کاتێ کەسێك دەڵێ "ئەرستۆ"[13] وشەیەك لەبەرامبەر یەك یا چەند وەسفێکی دیاریکراو بەکاردەبات، لەمانە "خولقێنەری ئانابۆطیقا" "دامەزرێنەری بونناسی"و لەچەشنی ئەمانە. کاتێ پەی بەوە دەبەین کەرامبۆ[14] "رۆحانیەت"[15]ی نەهۆنیوەتەوە، ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کەمانای ئەو ناوە تایبەتە، یا ناوێکی تایبەتی کەناوی نووسەرە. گۆڕدراوە. ئەو ناوە تایبەتەو ناوی نووسەر لەشوێنێکدا لەنێوان دوو جەمسەری وەسفکردنو ناولێناندا جێگایان هەیەو دەبێ لەگەڵ ناولێنراوەکەی خۆیان پەیوەندیان هەبێ کە نە بەتەواویی لەجۆری ناولێنانەو نەبەتەواوی لەجۆری وەسفکردن، بەڵکە پەیوەندیەکە تایبەت {دیاریکراو}. بەڵام – و لێرەوەیە کە کۆمەڵێ دژواری تایبەتی پەیوەست بەناوی خولقێنەر دێنە پێشەوە – پەیوەندی ناوی تایبەتو کەسی ناولێنراو، و پەیوەندی ناوی خولقێنەر لەگەڵ ئەو ناوەی کە بەو بانگەکرێ نەوەك یەکنو نە کارکردێکی یەکسانیان هەیە. چەند جیاوازیەك بونی هەیە.

بۆ نمونە، هەتا ئەگەر پێر دوپۆن[16] چاوانی شین نەبێ یا لەپاریس لەدایك نەبوبێ یا پزیشك نەبێ، دیسانەوە ئەو کەسە هەمیشە ناوی پێر دوپۆن دەبێ، و ئەو جۆرە شتانە گۆڕانێك ناخاتە پەیوەندی ناولێنانەوە. بەڵام ئەو مەسەلانەی لەناوی خولقێنەر دەبنەوە پلە بەپلە ئاڵۆزترن. ئەگەر من ئاشکرای بکەم شەکسپیر لەو خانوەدا لەدایك نەبوە کەئەمڕۆ ئێمە سەیری دەکەین، ئاشکرایە کە ئەو گۆڕانە، کارکردی ناوی خولقێنەر ناگۆڕێت. بەڵام ئەگەر بیسەلمێنین شەکسپیر[17] ئەو غەزەلانەی نەهۆنیوەتەوە کەبەهی ئەو دادەنرێن، ئەوە گۆڕانێکی گرنگو مانادار دەبێو گۆڕانکاری لەکارکردی ناوی خولقێنەر دێنێتە کایە. ئەگەر نیشانی بدەین کەیەك خولقێنەر بەرهەمەکانی بیکۆن[18] و

شەکسپیری نووسیوەو بەهەمان شێوە بیسەلمێنین کەشەکسپیر نووسەری "ئۆرگەنۆن"[19]ی بیکۆن بووە، ئەوە دەبێتە سێهەمین جۆری گۆڕانو بەتەواوی کارکردی ناوی خولقێنەر دەگۆڕێت. بەپێی ئەوە، ناوی خولقێنەر لەچەشنی ناوێکی تایبەت نییە وەك ناوە تایبەتەکانی تر.

زۆربەی بارەکان، قسە لەپارادۆکسی سەرسوڕهێنو جیاوازی "استثنائی" خولقێنەر دەکەن. وتنی ئەوەی کەپێر دوپۆن بوونی نییە بەهیچ شێوەیەك وەك ئەوە نییە کەبڵێین هۆمێر[20] یان هێرمس تریسمگیستۆس[21] بوونی نەبووە. گوتنی یەکەم بەو مانایەیە کەهیچ کەسێك خاوەن ناوی پێر دوپۆن نییە؛ و دووەمیان بەو مانایەیە کەچەند کەسێك لەژێر یەك ناودا تێکەڵ بەیەك بوون یان خولقێنەری حەقیقی خاوەنی هیچ لەو خەسڵەتانە نەبووە کەوەك نەرێت دراوەتە پاڵ ئەو سیما کۆمەڵایەتیەی کە {پێی وتراوە – موسوم} هومیریا هێرمس. وتنی ئەوەی کەناوی حەقیقی {X} لەجێی پێر دوپۆن ژال دۆرانە[22]، وەك ئەوە نییە کەبڵێین ناوی ستاندال[23]، هێنری بێل[24] بوە. هەروەها دەتوانین لەمەڕ ماناو کارکردی دەستەواژەی لەو بابەتەش گومان بکەین، بۆ نمونە: "بورباکی فلانە و فیسارەیە" یان "فیکتۆر ئارمیتاو کلیماکۆسو ئانتی کلیماکۆسو تاکیتۆرنووسی راهیبو کۆنستانتین کۆنستانتینۆس هەموویان خودی کیرکیگاردن[26]".

ئەو جیاوازیانە هەندێ کات دەرەنجامی ئەو راستیەن کەناوی خولقێنەر بەتەنیا یەکێك نییە لەپایەکانی گوتار (کەبتوانێ ببێتە پالێپدراو یان پالپشت[27] یان وەك راناوێك لەجێی ئەو بێو لەچەشنی ئەوشتانە). بەڵکو لەگوتاری ریواییدا رۆڵێکی دیاریکراو وازیدەکاو لەدیدی ریزبەندیەوە کارکردێکی هەیە. ناوێکی وا ئەوە شیاو دەکا کە ژمارەیەکی دیاریکراو دەق لەیەك گروپدا بهێنینو سنوریان دیاری بکەینو لەنێوانی ئەو دەقانەو دەقی دیکەدا جیاوازی دابنێینو رووبەڕبوونەوە بەرقەرار بکەین. هەروەها ناوی خولقێنەر پەیوەندیەك لەنێوان دەقە جیاوازەکانیشدا بەرقەراردەکا. نەهێرمس تریسمگیستۆس هەبووەو نەهیپۆکراتیس[28] بەو مانای کە بۆ نمونە بالزاك[29] هەبووە؛ بەڵام خودی ئەو راستیەی کەچەند دەقێك لەژێر یەك ناودا هاتون دەربڕی ئەوەیە کەبەشێك پەیوەندی هاوشێوەیی یا هاوریشەیی یا وەدەسهێنانی رەسەنایەتی هەندێ دەق لەسەر بنەمای دەقەکانی دی یان تەفسیری یەکێك لەسەر پایەی ئەویتر یان سودوەرگرتنی هاوزەمان لەنێوانیاندا بەرقەرارە. ناوی خولقێنەر دیاریکەری سیمایەکی تایبەتی – بونی گوتارە. ئەو راستیەی کەناوی خولقێنەر بەسەر گوتارەوەیەو دەشێ بڵێین کە "فلانە کەس ئەوەی نووسیوە" یان فلانە کەس خولقێنەری ئەوەیە"، نیشاندەری ئەوەیە کەئەو گوتارە تایبەتە لەبابەتی قسەی ئاسایی رۆژانە نییە کەبێو بڕواتو یەکسەرە قابیلی مەسرەفکردن بێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە قسەیەکە دەبێ بەشێوەیەکی دیاریکراو وەربگیرێو لەکولتورێکی دیاریکراودا جێگایەکی تایبەت بگرێ.

وا دەردەکەوێ کەناوی خولقێنەر، بەپێچەوانەی ناوە تایبەتەکانی دی، لەدەرونی گوتارەوە نایەتە دەرەوە تا بەکەسی دەرەکیو واقیعی بەرهەمهێنەری گوتار بگات، بەڵکو هەمیشە ئامادەیەو سنورو کەلێنەکانی دەق دیاریدەکاو سیمای بوونی نیشاندەدات یان بەلای کەمی بەئاماژە باس لەوە دەکات. ناوی خولقێنەر هەواڵی دەرکەوتنی قاڵبێکی تایبەت لەگوتار دەگەیەنێو دەربڕی پێگەی ئەو گوتارەیە لەکۆمەڵگاو کولتورێکی دیاریکراودا، نەخاوەنی شایستەگی قانونیە نەشوێنێکی هەیە لەئەگەری

حقوقی بەرهەمدا؛ جێگای ئەو لەناسازگاریەکدایە کەبونیادی گوتاریو سیمای بوونی زۆر تایبەتی بەرهەم دادەمەزرێنێت. لەئەنجامدا، لەشارستانیەتێکی وەك شارستانیەتی ئێمەدا، هەندێ گوتار لە"رۆڵی خولقێنەر" پشكدارنو هەندێکی تریان لێی بەرین. نامەیەکی تایبەت بەئیحتیمالێکی بەهێز ئیمزاکەری خۆی هەیە، بەڵام خولقێنەر نییە. پەیماننامە لەزۆربەی بارەکاندا گەرەنتی هەیە، بەڵام خولقێنەر نییە. دەقێکی بێئیمزا کە بەدیوار چەسپێنراوە دەشێ نوسەری هەبێت، بەڵام خولقێنەر نییە. ئیدی رۆڵی خولقێنەر سیفەتی جۆری بوون بڵاوبوونەوەو کارکردی بەشێکی گوتارەکانە لەکۆمەڵگادا.

*

بابچینە سەر شیکردنەوەی ئەو "رۆڵەی خولقێنەر" بەو شێوەیەی کەهەنوکە باسکرا. لە کولتوری ئێمەدا، ئەو گوتارەی رۆڵی خولقێنەر دەگرێتە خۆ بەچ تایبەتمەندیەکەوە جیا دەکرێتەوە؟ ئەو جۆرە گوتارە لەچ رویەکەوە لەگوتارەکانی دیکە جیاوازە؟ ئەگەر تەنیا بەخولقێنەری کتێب یان دەق وازبهێنین، ئەوا چوار تایبەتمەندی جیاواز دیاریدەکەین.

یەکەم، گوتار شتێکە پەیوەستی خاوەنداری دەبێ. جۆری خاوەندارێتی گوتار جۆرێکی زۆر تایبەتەو سالانێ لەمەوبەر شێوەی قانونی وەرگرتووە. دەبێ ئاگاداربین کە، لەرووی مێژووییەوە، ئەو جۆرە خاوەنداریە هەمیشە بەدوای شتێکدا هاتووە کەدەتوانین پێی بڵێین خاوەنداری کیفری. راستیەکەی دەقو کتێبو گوتارەکان لەکاتێکدا خولقێنەرەکانیان (بێجگە لەسیما ئەفسانەییو "پیرۆز" وپیرۆزی بەخشەکان) پەیدا کردووە کەخولقێنەر سزادان (مجازات) گرتیەوە، واتا لەو کاتەی کەدەکرێ بڵێین گوتار دەشێ لەئاستێکی دیاریکراو تێپەڕێت. لەکولتوری ئێمەدا (و بێگومان لەزۆربەی کولتورەکانیتردا) سەرەتا گوتار بەیەکێك لەبەرهەمەکان یا شتەکان یا کاڵاکان نەدەژمێردرا، بەڵکو لەبنچینەدا لەدەستەی کردارەکان حسێبدەکرا — کردارێك لەپانتای دوو جەمسەری ئاسمانیو زەمینی، رێگا پێدراو و قەدەغە، ئاینیو کیفری — و لەدیدی مێژووییەوە، پێش ئەوەی بەشێوەی کاڵا دەرکەوێو بچێتە نێو تۆڕی خاوەنداریەوە، جوڵەیەك بوو خەتەری جۆراوجۆری لەهەناوی خۆیدا هەڵگرتبوو.

دوای ئەوەی سیستمێکی خاوەنداری تایبەت بەدەق هاتە بوونو رێسایەکی وشكو وردی چاودێر بەسەر مافەکانی خولقێنەر و پەیوەندیەکانی خولقێنەرو بڵاوکەرەوەو مافەکانی چاپو لەسەرگرتنەوەو باقی کاروبارەکانی دی هاتنەگۆڕێ، لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا تەجاوز لەکاری نووسیندا رۆژانە لەزیادبووندا بوو و بەشێوەی یەکێ لەئەرکەکان دەرکەوت. وەك بڵێی خولقێنەر لەئاستی چونە نێو سیستمی خاوەنداری تایبەت بەکۆمەڵگای ئێمە، بەقەرەبوکردنەوەی شایستەگیەکی کە لەورێگەیەوە بەدەست هێنابو، پانتای دوو جەمسەری دێرینی گوتاری سەرلەنوێ دۆزیەوەو سیستماتیکانە خەریکی تەجاوز بوو و لەو رێگەیەوە، دووبارە نووسینی فرێدایە خەتەرەوە کەلەسودەکانی خاوەنداری بەهرەمەندببوو.

بەڵام رۆڵی خولقێنەر باری تەواوی گوتارەکان بەشێوەیەکی گشتیو هەمیشەیی ناگرێتەوە، و ئەوە دووەمین تایبەتمەندێتین. لەشارستانیەتی ئێمەدا، ئەو دەقانەی کەدراونەتە پاڵ خولقێنەران هەمیشە یەك جۆر نەبوون. رۆژگارێك بوو ئەو دەقانەی کەئەمڕۆ بە"ئەدەبی" ناودەبرێن (واتە چیرۆكو داستانو حەماسەو تراژیدیاو کۆمیدیاکان) قبوڵ دەکرانو بڵاودەبوونەوەو

ئەرزشیان بۆ دادەنرا بێئەوەی کەسێك بچوکترین پرسیارێك لەمەڕ ناسنامەی خولقێنەرەکانیان بخاتەڕو، و گومناوی خولقێنەر هیچ کێشەیەکی دروست نەدەکرد. لەبەرئەوەی دێرینی دەقەکان– ئەگەر واقیعی یا خەیاڵیی – پایەو پێگەیانی دابین دەکرد لەلایەکی ترەوە، ئەو دەقانەی کەئەمڕۆ بە "زانستی" دادەنرێن – واتە ئەو دەقانەی کەسەروکاریان لەگەڵ جیهانناسیو ئەستێرەناسیو پزیشکیو نەخۆشیەکانو زانستە سروشتیەکانو جوگرافیادا بو – لەسەدەکانی ناوەڕاستدا تەنیا ئەوکاتە بە "حەقیقی" وەردەگیران کەناوی خولقێنەرەکانیان بەسەریانەوە نەقشی بەستبا. ئەو دەستەواژانەی وەك "هیپوکراتیس دەڵێ" و "پلینیۆس دەگێرێتەوە" تەنیا فۆرمولێك نەبون لەبەڵگەهێنانەوە گوازراوەکان (ئیستدلالە نەقلیەکان)؛ ئاماژەیەك بون لەو گوتارانەیکەدەبوا بەحەقیقەتی بەبەڵگە بناسرێن.

لەسەدەکانی هەڤدەهەمو هەژدەهەمدا مەسەلەکە پێچەوانە بۆوە. ئەو حەقیقەتە وەدەستهاتوانەی کەسەلمێنەرەکانیان گومناوبون بەلام خۆیان هەمیشە دەشیا بەبەڵگە بسەلمێنرێنەوە. کەم کەمە بونە جێی قبوڵی گوتارە زانستیەکان. گەرەنتی ئەو جۆرە گوتارانە پەیوەست بوو بەکۆمەڵەیەکی رێکخراو و مەنهەجی، نەك ناوی بێژەرەکانیان، رۆڵی خولقێنەر بەرە بەرە کەمڕەنگ بوو وسڕایەوە، و ناوی ئاشکراو داهێنەر تەنیا بۆ ناونانی فلانە دۆز یا دیاردە یا خەسڵەت، یا جەستە یاگرووپی رەگەزەکان یا فلانە نەخۆشی مایەوە. بەپێچەوانەوە، گوتارە ئەدەبیەکان تەنیا بەمەرجی پشکداریان لەرۆڵی خولقێنەر قبوڵ دەکران. ئەمڕۆ هەر دەقێکی شیعری یا داستانی (چیرۆکی) روبەڕووی ئەو پرسیارە دەبێتەوە کە: لەکوێوە هاتوە؟ چ کەسێكو لەچ کاتێکداو لەژێر چ هەلومەرجێکداو لەسەر پایەی چ سەرمەشقێکدا نووسیویەتی؟ ئەو مانایەی کەدەدرێتە پاڵیو ئەو بەهایەی کە پەیوەستی دەبێ بەشێوە وەڵامی ئێمە بۆ ئەو پرسیارانەی خرانەڕو بەستراوەتەوە. ئەگەر بەرێکەوت یا بەپێی ئارەزوی خودی خولقێنەر ناوی بەسەر دەقەوە نەبو، گەمەی ناسنامەی ئەو دەسپێدەکا. لەو شوێنەی کە گومناوی ئەدەبی تەحەمول ناکرێ، بەشێوەی لوغز (معما) وەردەگیرێت، لەئاکامدا رۆڵی خولقێنەر ئەمڕۆ پشکێکی گرنگی لەدیدگای ئێمەدا پەیداکردوە لەمەڕ بەرهەمی ئەدەبیەوە (بێگومان، ئەمانە هەمویان لەمەقولە گشتییەکانو لاکردنەوە لەشێوە رەخنەییەکانی ئەم دواییە پێویستی بە پەروەردەکاریو زیرەکی پتر هەیە.)(31)

سێهەمین تایبەتمەندی ئەوەیە کە رۆڵی خولقێنەر لەخۆوە لەئاکامی خستنەپاڵی فلانە گوتار بەفلانە کەسەوە نایەتەکایەوەو بەرهەمی چەند پرۆسەیەکی ئاڵۆزە کە دەبێ دواجار بونێکی عاقڵ (متعقل) بەناوی خولقێنەرەوە دروستبکات. گومانی تیا نییە کە رەخنەگران بۆ کەسێکی وا هەوڵدەدەن باس لەفاکتەرێکی "قوڵ" و هێزێکی "داهێنەر" یا "مەبەستێك" بکەنو ژینگەیەك دروستبکەن کەنووسین تیایدا سەرچاوەی گرتوە تا لەو رێگەیەوە پێگەیەکی واقیعی بۆ ئەو بونە عاقڵە چی بکەن. بەلام هەموو ئەو لایەنانەی کەدەڵێین خولقێنەر دروستدەکەن شتێ نین بێجگە لەخستنەپێشەوەی چەند پرۆسەیەك کەبەزۆر دەقەکانی پەیوەست دەکەینو ئەو پەیوەندیانەی کەدروستیان دەکەین ئەو خەسڵەتانەی کە پەیوەندیەکانیان وەدەسدێنێنو ئەو بەردەوامیەی کەدەیناسینەوەو ئەو شێوە وەلانانەی کە بەکاری دێنین، تەواوی ئەو کارانە بەگوێرەی سەردەمو گوتارە جۆرواوجۆرەکان، جیاوازن. هەروەها لەسەدەی

هەژدەدا کەسێك بەهەمان شێوە ڕۆماننوسی دروست نەدەکرد کە ئەمڕۆ ئێمە دروستی دەکەین. ئێستاش خودی ئێمە بەو شێوەیەی کە "شاعیر" دروستدەکەین "خولقێنەری فەلسەفی" دروست ناکەین. لەگەڵ هەموو ئەمانە، لەتوێی چەرخەکاندا ڕوبەڕوی هەندێ "نەگۆڕ" دەبینەوە لەخولقێنەرسازیدا.

بۆ نمونە، وادێتە بەرچاو ئەو شێوەیەی کە ڕۆژگارێك لەڕەخنەی ئەدەبیدا بۆ دیاریکردنی خولقێنەر - یابەدەربڕینێکی چاکتر، بۆ دروستکردنی سیمای خولقێنەر لەسەر پایەی دەقو گوتارە ئامادەکان - بەکاردەبرا، ڕاستەوخۆ لەو شێوەیە وەرگیرابوو کە لەنەرێتی مەسیحیاندا بەمەبەستی وەدەسهێنانی ڕەسەنایەتی (یا ڕەتکردنەوەی) دەقەکان سودی لێوە دەبینرا. لەڕەخنەی مۆدێرندا بەمەبەستی "لەنوێ ناسینی" خولقێنەر، ئەو ڕێبازانە بەکاردەبرێ لەسەر بەرهەم، لەچەشنی ڕێبازە تەفسیریە باوەکانی مەسیحیان کاتێ کەدەیانویست بەهای دەق لەسەر بنچینەی پیرۆزی خولقێنەر بسەلمێنن. قەدیس جیرۆم[32] لەکتێبی پیاوە ناودارەکان[33]دا دەڵێ هاوناوی بۆ وەدەسهێنانی ناسنامەی خولقێنەرانی کۆمەڵێ بەرهەم کافی نییە، لەبەرئەوەی لەوانەیە چەند کەسێکی جیا جیا یەك ناویان هەبوبێ، یاخود شیاوە یەکێك بەشێوەیەکی ناڕەوا لەناوی فایلی یەکێکی دیکە سودوەرگرێ. ئیدی کاتێك یەکێك لەچوارچێوەی نەرێتی پەیوەست بەدەقەوە کاردەکات، ناو وەك نیشانەی جیاکەرەوەی فەردی کافی نییە.

بەپێی ئەوە، چۆن دەتوانین چەند گوتارێك بدەینە پاڵ یەك خولقێنەر؟ یان بە سودوەرگرتن لەڕۆڵی خولقێنەر دەریبخەین کەباس لەسەر یەك کەس یان کۆمەڵێ کەسەوەیە؟ قەدیس جیرۆم چوار پێوەر پێشنیاز دەکات.

1-ئەگەر لەمیانەی چەند کتێبێکی یەك خولقێنەردا، کتێبێکیان لەئاستێکی نزمتردا بێ لەوانیتر، دەبێ لەپێڕستی بەرهەمەکانی ئەو لاببرێت (بەپێی ئەوە پێناسەری خولقێنەر ئاستێکی جێگیرە لەبەها).

2- هەمان کار دەبێ ئەنجام بدرێ ئەگەر هەندێ دەقی خولقێنەر لەگەڵ ئەو تیۆرانە متناقض بن کە لەبەرهەمەکانی تریدا هەن (لەو بارەدا، پێناسەری خولقێنەر کۆمەڵەیەك دیدو بۆچونی گونجاوە).

3- ئەو بەرهەمانەی کەبەشێوازی جیاواز نووسراون یان پێکهاتون لەو قسەو دەستەواژانەی کەبەزۆری لەکارەکانی نوسەر نابینرێنەوە، دەبێ لاببرێن (لێرەدا پێناسەری خولقێنەر جۆرێکە لەیەکێتی شێوان).

4- سەرئەنجام، ئەو بەشانەی کە تیایاندا گوتە هاتۆتەوە یا ئەو ڕوداوانەی باسکراون کەبەدوای مردنی خولقێنەرەوە هاتون، دەبێ بەپاشکۆ {لکێنراو} بناسرێن (لێرەدا خولقێنەر وەك سیمایەکی مێژوویی لەشوێنی پێکگەیشتنی ژمارەیەکی دیاریکراوی ڕوداو لەقەڵەم دەدرێت).

ڕەخنەی ئەدەبی مۆدێرن هەتا لەو کاتانەی کەوەك باوە لەگەڵ مەسەلەی وەدەسهێنانی ڕەسەنایەتی سەروکاری نییە، دیسانەوەش پێناسەری خولقێنەر دەخاتە ژێر ئەو مەسەلانەوە: لەسەر بنچینەی ژیانی خولقێنەرو دیاریکردنی دیدگای فەردیو شیکردنەوەی پایەی کۆمەڵایەتیو ئاشکراکردنی مەبەستو سەرمەشقی بونیادی ئەو، لەکارەکانیدا نەك تەنیا بونی بەشێك لەڕوداوەکان. بەڵکو گۆڕینو لادانو چاکردنەوەی ئەو ڕوداوانەش دەردەخات. لەبەرئەوەی هەمو جیاوازیەکان بەلای کەمی بەشێکیان بەپەنابردنە بەر بنچینەکانی گۆڕانکاریو کامڵبونو پێگەیشتنو کاریگەریەوە دەبێ وەلا بنرێن خولقێنەریش دەسپێکی

بەشێکی یەکێتی نووسراوە. جگە لەوە، خولقێنەر بەکەڵکی نەزۆککردنی جیاوازیە ئیحتمالیەکان (تناقضات احتمالی) دێ لەزنجیرەیەك دەقدا. لەئاستێکی دیاریکراوی بیرو ئارەزووەکانی یان خود ئاگاییو ناخود ئاگایی خولقێنەردا، بەناچاری دەبێ ئەو خاڵە بگات کەجیاوازیەکان (تناقضات) تیایدا بەرزبونەوە قبوڵ بکەنو بەلای کەمی رەگەزە نەفیکەرەکانی یەکتر لەدەوری تەوەری جیاوازی (تناقض) بونیادیو سەرەکی کۆبنەوەو فۆرمەلە بن. و سەرئەنجام، خولقێنەر سەرچاوەی شێوە دەربڕینێکی تایبەتە کەبەشێوە کەم تازۆر کامڵەکان، بە بەهایەکی یەکسانەوە، لەنێو بەرهەمو سەرمەشقو نامەو رەشنووسە پارچە پارچەکانداو شتی لەو بابەتانە دەردەکەوێت. ئیدی دیارە کە چوار پێوەرەکەی قەدیس جیرۆم بۆ دیاریکردنی رەسەنایەتی، گەرچی لەدیدی راڤەکەرانەی ئاینی ئەمڕۆدا بەهیچ شێوەیەك کافی نییە، پێناسەرێکی چوار ئاراستەیە کە رەخنەگرە مۆدێرنەکان لەسەر پایەی ئەو ئاراستانە رۆڵی خولقێنەر دێننە گۆڕێ.

بەلام رۆڵی خولقێنەر دروستکراوەیەکی پوختو سادە نییە کە لەکەرەسەو کەلوپەلی کارئامێز بەشێوەی دەستی دووەم دروست بێ. دەق هەمیشە هەندێ لەو ئاماژانە دەگرێتە خۆ کەبۆ خولقێنەر دەگەڕێنەوە. ئەو ئاماژانە کە بەچاکی لەلایەن ئەوانەی خەریکی دەستوری زمانن ناسراون، بریتین لەڕاناوە کەسیەکانو کۆتەکانی شوێنکاتو دەمەکانی فرمان. ئەو رەگەزانە بەیەکسانی لەنێو ئەو گوتارانەدا کارناکەن کەرۆڵی خولقێنەریان تیا ئامادەیە یا ئامادە نییە، ئەمانەش لەگوتاری بێبەری لەرۆڵی خولقێنەر، بۆ بێژەی حەقیقی و تایبەتمەندیە شوێنکاتیەکانی گوتاری خولقێنەر دەگەڕێنەوە (هەرچەندە بۆ نمونە سەبارەت بەگێڕانەوە لەسەر زاری کەسی یەکەم، دەشێ هەندێ لادانو چاککردن روبدات). بەلام لەگوتاری پشکدار لەرۆڵی خولقێنەر، کارکردەکانیان ئاڵۆزترو گۆڕانکاری ئامێزترن. هەموان دەزانن لەکاتێکدا کە لەسەر زاری کەسی یەکەمەوە گێڕانەوە ئەنجام بدرێ، راناوی کەسی یەکەمو رانەبردوی خەبەری بۆ "منی دیکە"[24]ی خولقێنەر دەگەڕێتەوە کەدوری لەو بەزۆری گۆڕان دەخاتە رەوتی بەرهەمەوە، نەك لەنووسەرو ساتی نووسین. هەڵەیە ئەگەر خولقێنەر بەنووسەری واقیعی بزانین. بەهەمان شێوە، دروست نییە لەگەڵ بێژەری داستان (چیرۆك) بەیەکیان بزانین. رۆڵی خولقێنەر لەخودی ئەو ناسازگاریەدا – لەنێو ئەو دابەشبونو ئەو ماوەیە (دوری)دا – بەڕێوەدەچێو کاردەکات.

دەشێ ناکۆك بن لەگەڵ ئەوەی کە ئەو خەسڵەتە، تایبەتە بەگوتاری داستانی یا شیعری، واتە شێوە "گەمە"یەك کەتەنیا "نیمچە گوتارەکان" تیایدا هاوبەشن. بەلام راستیەکەی ئەوەیە هەمو ئەو گوتارانەی کەرۆڵی خولقێنەریان تیا ئامادەیە خاوەنی ئەو فرە "خود"یەن. خودێك کەلەپێشەکی نامەیەکی ماتماتیك قسەدەکاو هەلومەرجەکانی پۆلبەندیکردنی راڤەدەکا، نە لەڕوی پێگەو نەلەڕوی شوێنی کار کردەوە یەك نییە لەگەڵ خودێك کەلەڕەوتی سەلماندنیو مەسەلەکاندا قسە دەکاو دەڵێ "ئیدی نەتیجە وەردەگرم" یان "وای دادەنێم". لەباری یەکەمدا، "من" دەگەڕێتەوە بۆ تاکێك کەبەرامبەرو هاوبەهای نییەو لەشوێنکاتێکی تایبەتدا کارێکی دیاریکراوی بەئاکام گەیاندوە؛ لەباری دووەمدا من" قسە" لەڕاستیو ئاستێکی بەڵگە دەکات کە هەر کەسێك دەتوانێ ئەنجامی بدات بەمەرجی ئەوەی کەهەمان دەزگای هێماو بنچینە بابەتیو کۆبەڵگەکانی رابردوو قبوڵبکات. هەروەها لەهەمان نامەدا دەشێ بتوانین خودی سێهەمیش پەیدابکەین کاتێ کە قسە دەکا، قسە

لەمانای بەرهەمو ئەو بەربەستانەی کە لەسەر ڕێگا بوون و ئەو ئەنجامانەی کەبەدەستهاتون و مەسەلەی تر دەکاو جێگای ئەو لەزەمینەی ئامادە یان ئایندەی گوتاری ماتماتیکەوەیە. خودی یەکەم، ڕۆڵی خولقێنەر بەبێ بەڕێکردنی دوو خودەکی تر لەئەستۆ ناگرێ، چونکە ئەو کارە شتێکی زێتر نابێ لەدوولەتبونی خۆی. لەو جۆرە گوتارانەدا، ڕۆڵی خولقێنەر بەشێوەیەك کاردەکات کە ئەو سێ خودە هاوزەمانە لەیەکتر دوربکەونەوە.

بێگومان، لەڕێگای شیکردنەوەوە دەتوانین تایبەتمەندیەکانی تری ڕۆڵی خولقێنەر ئاشکرا بکەین. بەڵام من بەو چوارانەی کە لەهەمویان بەرچاوترو گرنگترن و کە بەو راڤەیەی ژێرەوە پوختدەبنەوە، وازدێنم:

- ڕۆڵی خولقێنەر پەیوەستە بەو سیستمە قەزایی و نەهادی (بونیادی)یەی کەدەوری دنیای گوتاری داوەو لەسەر بنچینەی ئەو دیاریدەکرێ و دەخرێتەڕو؛
- ڕۆڵی خولقێنەر لەهەمو سەردەمەکان و لەشارستانیەتە جۆراوجۆرەکاندا بەیەکسانی کاریگەری ناخاتە سەر گوتارەوە؛
- پێناسەری ڕۆڵی خولقێنەر زنجیرەیەك پرۆسەی دیارو ئاڵۆزە، نەك خستنەپاڵی لەخۆوەی گوتار بەبێژەر؛
- ڕۆڵی خولقێنەر تەنیا بۆ فەردێکی واقیعی ناگەڕێتەوە، لەبەرئەوەی دەشێ هاوکات چەند خودو ناسێنەر[36] بەرهەم بێنێ، واتە ئەو بابەتانەی کەتاکە جیاجیاکان دەتوانن جێی خۆیانی تیا بکەنەوە.

*

تا ئێرە من بەشێوەیەکی نائاڕاستەکراو بابەتی {ئەو وتارە}م بەسنورداری هێشتۆتەوە. بێگومان دەربارەی ڕۆڵی خولقێنەر لەهونەری تەشکیلی و مۆزیك و هونەرەکانی دیکەش دەبوایە باس بکرێ. هەتا ئەگەر بمانەوێ لەجیهانی گوتاردا بەگەمارۆدراوی بمێنێتەوە (بەو شێوەیەی کەمن دەمەوێ)، دیسانەوە وا دەبینرێ ئەو مانایەی کەمن لە"خولقێنەر"م خواستوە زیاد لەئەندازە سنوردار بوە. من بەمانایەکی سنورداری کەسێکەوە باسی خولقێنەرم کردوە کەدەتوانرێ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ خولقاندنی فلانە دەق یا کتێب یا بەرهەمی بدرێتە پاڵ، بەڵام بەئاسانی دەکرێ ببینین کەلەسیستمی گوتاردا، دەشێ کەسێك خولقێنەری زێتر لەکتێبێك، یان خولقێنەری تیۆرێك یانەرێتێك یا رشتەیەك بێ کە کتێبی ترو خولقێنەرانی تر تیایدا شوێنێك بدۆزنەوە. ئەو خولقێنەرانە لەپێگەیەك "موقعیت"دان کە بەو "پێگەیە" دەڵێن "سەروی گوتاری"[37]. ئەو دیاردەیە، بێگومان، بەکۆنی شارستانیەتی ئێمە هەیەو لەسەر یەك دووبارە دەبێتەوە. هۆمێرۆ و ئەرستۆو باوکانی کڵێساو یەکەمین ماتماتیکزان و بنیاتنەرانی مەکتەبی هیپوکراتیس هەموویان ڕۆڵێکی وایان وازی کردوە.

سەرباری ئەوە، لەسەدەی نۆزدەهەمدا جۆرێکی نائاسییتر و دیکەی خولقێنەر دەرکەوت کەنابێ لەگەڵ خولقێنەرە "گەورە" ئەدەبیەکان یا خولقێنەرانی دەقە مەزهەبیەکان یا بنیاتنەرانی زانستەکان تێکەڵ بکرێن. ئەو کەسانەی کەپەیوەندیان بەو گروپەوە هەیە ناویان دەنێین "بنیاتنەرانی خەسڵەتی گوتاری"[38]. ئەو کەسانە لەو ڕووەوە تایبەتن کە تەنیا خولقێنەری بەرهەمەکانی خۆیان نین، بەڵکو شتی دیکەشیان هێناوەتە کایە، واتە ئەفرێنەری ئیمکانات و ڕێسای فۆرمەلەبونی دەقی دیکەش بوون، و بەو مانایەی (بۆ نمونە) زۆر لەگەڵ ڕۆمانسنوس جیاوازیان هەیە کەتەنیا ئەو دەقەی پەیوەستە بەخۆی دەیخولقێنێ. فرۆید بەتەنیا خولقێنەری "تەعبیری خەون"[29] یا "ناسکبێژی و پەیوەندی

بەویژدانی ناخود ئاگایی"[40] یەوە نییە، یان مارکس بەتەنیا خولقێنەری "مانیفێستی کۆمۆنیست"[41] یان "سەرمایە"[42] نییە، بەڵکو هەردوکیان ئیمکاناتی بێکۆتاییان بۆ گوتار هێناوەتە بوون.

بێگومان، کێشە هێنانەوە ئاسانە. لەوانەیە، وتنی ئەو قسەیە راست نەبێ کەخولقێنەری رۆمان تەنیا خولقێنەری دەقی پەیوەست بەخۆیەتی، لەبەرئەوەی بەیەك مانا ئەویش "گرنگی"و دەقەری فەرمانرەوایی کردن و نفوذ پەیدادەکات. نمونەی زۆر سادەی ئەوکارە، خانم "ئان رێد کلیف"[43] کە نەك بەتەنیا نووسەری کۆشکەکانی ئاثلین و دانبی [44] و چەند رۆمانێکی دیکە بوو، بەڵکو رێگای بۆ دەرکەوتنی رۆمانی ترسناکی "گوتیك"[45] لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا کردوەو، بەپێی ئەوە، رۆڵی خولقێنەر سەبارەت بەو، لەو روەوە، لەئاستی بەرهەمەکانی خۆی زێتر دەڕوات، بەڵام پێموایە دەکرێ وەڵامێك بۆ ئەم کێشەیە هەبێت. بنیاتنەرانی خەسڵەتی گوتاری (لەبەرئەوەی مارکس و فرۆید یەکەمین و گرنگترین کەسانی ئەو گروپە بون وەك نمونە ناوم هێنان) ئیمکانی دەرکەوتنی شتێك فەراهەم دەکەن یەکسەر غەیری ئەو شتەی کەرۆماننوسان رێی بۆخۆش دەکەن. دەقەکانی خاتو رێدکلیف رێگایان بەڕوی هەندێ لێکچون و هاوچەشنی کردەوە کەنمونە یا دەسپێکی ئەوانە لەنێو خودی بەرهەمەکانی ئەوەو بەشێك لەنیشانەو سیماو پەیوەندیو بونیادە نەوعیەکان دەگرێتەوە کەدەتوانن ببنە جێ سودی دووبارەی ئەوانیتر. بەدەربڕینێکیتر، وتنی ئەوەی کەخاتو رێدکلیف دامەزرێنەری رۆمانی ترسناکی گوتیك بوە یەکسانە بەوەی کەبڵێین لەرۆمانی گوتیکی سەدەی نۆزدەهەمیشدا وەك کارەکانی خاتو رێدکلیف، ئەوەی هەمیشە روبەڕوی دەبینەوە ژنە پاڵەوانی پاك و بێ خەتایە کە کەوتۆتە داوەوە، قەلایەکی شاراوە، و پاڵەوانێکی رەشپێست کەنەفرەتی لێکراوەو بەڵێنی داوە جیهان پاداشتی (کەفارەتی) ئەو ستەمەی بداتەوە کەدەرهەق بەو کردویەتی، وباقی مەسەلەکانی دی.

بەڵام کاتێ دەڵێین مارکس و فرۆید بنیاتنەری خەسڵەتی گوتاری بوون، مەبەست ئەوەیە کەئەوان نەك تەنیا بەشێك لێکچونەکان، بەڵکو هەندێك لەجیاوازیەکاینشیان بەهەمان پلەی گرنگیەوە ئیمکان ئامێزە. ئیمکانێکیان داهێناوە بۆ شتێك کە لەگەڵ ئەوەی جیاوازە لەگەڵ گوتاری خۆیان، پەیوەستیشە بەوانەی کەدامەزرێنەریان بوە. وتنی ئەوەی فرۆید بنیاتنەری شیکردنەوەی دەرونی بوە (بەتەنیا) بەو مانایە نییە کەچەمکی لەبیدۆ[46] یا هونەری شیکردنەوەی خەون لەبەرهەمەکانی کارل ئەبراهام[47] ملانی کلاین[48] یش دەبینرێن. بەڵکو سەرباری ئەوە ئەو مانایەش دەبەخشێ کەفرۆید هەندێ لەجیاوازیەکانی (سەبارەت بەدەق و چەمك و گریمانەکانی خۆی) ئیمکان ئامێز کردوە کەهەمویان لەگوتاری شیکردنەوەی دەرونیەوە سەرچاوە دەگرن.

بەڵام قسەکردن بەو مانایە بەرواڵەت کێشەیەکی تازە دێنێتە پێشەوە. دەشێ بڵێین: مەگەر ئەوەی وترا لەمەڕ بنیاتنەری هەر زانستێك، یان هەر کەسێکی کە گۆڕانکاری گرنگی هێناوەتە نێو فلانە زانستەوە، راست نییە؟ گالیلۆ[49] رێی نەك تەنیا بۆ ئەو گوتارانە خۆشکرد کە دووبارەی یاساکانی خودی ئەوبون، بەڵکو بۆ ئەو وتانەش کەزۆر جیاوازبون لەوتەکانی خۆی. ئەگەر دەڵێین کوڤیە[50] بنیاتنەری بایۆلۆژی یان سوسێر[51] دامەزرێنەری زمانناسی بوە، بەهۆی لاسایی کردنەوەی خەڵکانیتر نیە لەوان یان قبوڵکردنی چەمکی ئۆرگانیزم[52] یان نیشانە[53] لەو ماوەیەدا

لەلایەن خەڵکەوە؛ بەو سۆنگەیەیە کەکۆڤیە (بەلای کەمی تا ئاستێك) ڕێگە خۆشکەری تیۆرێك بوو لەبابەت پەرەسەندنەوە لەجەمسەری دژی باوەڕەکانی خۆی بە {ثبات گەرایی}، سوسێر دەستوری {grammaire generative}ی ئیمکان ئامێز کرد کە لەڕەگوڕیشەوە لەگەڵ شیکردنەوە بونیادیەکانی خۆی جیاوازی هەبوو. بەپێی ئەوە، بەڕوکەش وا دەردەکەوێ کە هێنانی شێوە گوتاریە تازەکان وەك دامەزراندنی زانست وایە.

لەگەڵ هەمو ئەمانەدا جیاوازیەك – و جیاوازیەکی سەرنجکێش – بوونی هەیە. ئەگەر یەك لەزانستەکان لەبەرچاو بگرین، ئەوکارەی کەدەبێتە هۆی دامەزراندنی لەگەڵ گۆڕانەکانی داهاتوی لەیەك پلەدایەو دەبێتە بەشێك لەو گۆڕانکاریانەی کە ئەو زانستە ئیمکان ئامێز دەکەن. هەڵبەتە پەیوەستی ئەو کارە بەگۆڕانکاری ناوبراو، دەشێ شێوەی جۆراوجۆری هەبێ. لەپێگەیشتنی دوایی هەریەك لەزانستەکاندا، دەشێ کاری دامەزراندن تەنیا بەیەکێك لە (مصادیقەکانی) دیاردەیەکی گشتی کە لەڕەوتی وەرچەرخانی زانستەکەدا دەردەکەوێ حسێب بکرێ. هەروەها دەشێ بەهۆی مەیلی غەریزی یان ئەزمونکاری لەکەدار بێ و ناچاربین سەر لەنوێوە شێوەبەندی بکەینەوەو هەندێ کاری تەواوکەری تیۆری لەسەر ئەنجام بدەین تاکو وەدەسهێنانی بەوردەکاریەکی زێترەوە مەیسەر بێ، تا دوایی. و سەرئەنجام، دەشێ وابنبینرێ کە لە بەگشتیکردنیدا پەلەکراوەو سنوری هێزو بەهاکەی دەبێ سەرلەنوێ دیاری بکرێتەوە. بەدەربڕینێکی دی کاری دامەزراندنی هەر زانستێك دەشێ سەرلەنوێ بێتەوە نێو دەزگای ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەو دەکەونەوە.

بەپێچەوانەوە، بناغەدارێژی فلانە شێوەی گوتار لەگەڵ گۆڕانەکانی دواییدا ناسازگارە. فراوان بونەوەی دامەنەی فلانە بەشی خەسڵەتی گوتاری – وەك شیکردنەوەی دەرونی لەسەرەتای دامەزراندندا بەدەستی فرۆید – بەمانای پشکداریکردنی نییە لەگشتگیریەکدا کە لەسەرەتادا ئیمکان ئامێز نەبوە؛ بەمانای فەراهەم کردنی ئیمکانی بەکارهێنانی زێتری ئەوە. ئەو کەسەی کەبەشێکی تایبەت لەگوتاری وەك شیکردنەوەی دەرونی جیادەکاتەوە لەڕاستیدا دەکۆشێ ژمارەیەکی سنوردار لەدەربڕینەکان، گوتەکان لەکاری دامەزراندن جیابکاتەوە کەتەنیا ئەمان بەسودمەند دەزانێ لەبەهای دامەزرانداو بەشێکیتر لەو چەمكو تیۆرانەی کەلەلایەن فرۆیدەوە قبوڵکراون سەبارەت بەمان بەپلە دوو و لاوەکی دادەنێ. سەرباری ئەوە، کەسێك ناڵێ هەندێ لەدەربڕینو مەسەلەکان لەبەرهەمەکانی ئەو جۆرە بنیاتنەرانە هەڵەن {درۆن} بەڵکو ئەو کاتەی کەخەریکی دۆزینەوەی کاری دامەزراندن دەبێ، هەندێ لەگوتەکان، لەبەرئەوەی بەسەرەکیان دانانێ یان بە "پێش مێژوویی" و وەرگیراو لەبەشێکی تری گوتاریان دەزانێ، بەناوی ئەوەی کەلەدەرەوەی بابەتدان وەلایان دەنێ. بەدەربڕینێکی تر، بەپێچەوانەی دامەزراندنی یەك لەزانستەکان، سەرەتای شێوەیەکی تایبەت لەگوتار لەگۆڕانەکانی دواییدا دەخالەت ناکات.

ئیدی، بەهای تیۆری مەسەلە پەیوەستەکان بەبنیاتنەرانی جێباسی ئێمە بەڕوانینە بەرهەمەکانیان دیاری دەکەین؛ بەڵام لەمەڕ کەسانێکی وەك گالیلۆ و نیوتن، بەهای هەر مەسەلەیەکی کە ئەوان خستۆیانەتە ڕو بەلەبەرچاوگرتنی ئەوکارە دیاریدەکرێ کەفیزیك یان جیهانناسی لەڕوی بونیادی ذاتیو خەسڵەتی ڕەواییەکەی چیە. بەدەربڕینێکی زۆر کورت،

جێگای بەرهەمەکانی دامەزرێنەرانی خەسڵەتی گوتاری لەفەزای دیاریکراودا بەهۆی زانستەوە نیە، بەپێچەوانەوە، زانست یان خەسڵەتی گوتاری دەگەڕێتەوە بۆ بەرهەمەکانی ئەوان بەناونیشانی پسپۆریە بەراییەکان.

زەرورەتی حەتمی "گەڕانەوە بۆ بنەچە" لەبوارەکانی گوتاری جێ باسی ئێمەدا، بەڕەوچاکردنی ئەو مەسەلەیە دەرك دەکرێت[55].

ئەو گەڕانەوەیە کەخۆی بەشێکە لەبواری گوتار، هەرگیز لەلادان و چاککردنی ئەو ناوەستێ. گەڕانەوە بۆ بنەچە تەواوکەرێکی مێژوویی نییە کەبەگوتارەوە بلکێنرێ و یان دیکۆرێکی غەیرە زاتی، بەپێچەوانەوە یەکێکە لەکارە زەروریە کاریگەرەکان لەگۆڕانکاری و تەبدیلی خودی شێوەی گوتاردا.

لێکۆڵینەوەی دووبارەی دەقێك کە لەقەڵەمی گالیلۆوە چکاوەتەوە، دەشێ ناسینی ئێمە سەبارەت بەزانستی میکانیکەوە بگۆڕێت، بەڵام خودی زانستی میکانیك هەرگیز ناگۆڕێت. بەڵام لێکۆڵینەوەیەکی تازەی دەقی بەرهەمەکانی فرۆید یا مارکس، دەشێ خودی شیکردنەوەی دەرونی یان مارکسیزم بخاتە بەردەم گۆڕانەوە[56].

ئەو کورتەیەی کە دەربارەی شێوەی گوتاری باسمکرد[58] – بەتایبەت لەمەڕ ململانێی لەگەڵ دامەزراندنی زانست – لەوپەڕی کورتیدا بوو، هەڵوەشاندنەوەی ئەو دوانە لەیەکتر هەمیشە ئاسان نییەو، بێجگە لەوە، بەڵگەیەك نییە بۆ سەلماندنی بوونی بەربەستی کۆبونەوەی ئەوانە. ئەوەی کەمن هەوڵی هەڵوەشانەوەیانم داوە تەنیا بە ئاڕاستەی ئەو خاڵە بوە کە گەرچی لەکاتی دیاریکردنی رۆڵی خولقێنەر لەمەڕ هەندێ کتێب و دەق کەلەیەك قەڵەمەوە چکاونەتەوە دژوارە، بەڵام کاتێ خەریکی کاری شیکردنەوە دەبین لەو یەکانەی کە گەورەترن، وەك گروپە جیاجیاکانی بەرهەم یان تەواوی رشتەیەك، دیسانەوە هۆکاری دیاریکەری زێتر دەگرێتە خۆی.

*

لەکۆتاییدا ئارەزومە بەسەر ئەوەدا بچمەوە کەبەچ بەڵگەیەکەوە بۆ ئەو شتەی وتم گرنگی دادەنێم.

یەکەم،

هەندێ بەڵگەی تیۆری هەیە لەلایەکەوە، شیکردنەوە لەو روەوەی کەبەکورتی ئاماژەم بۆ کرد، دەشێ رێگە بۆ گەیشتن بەبەشێکی نمونەناسی[59] گوتار خۆشبکات. بەتێڕوانینی من، بەلای کەمی لەنیگای یەکەمدا، ناتوانین ئەو شێوە نمونەناسییە بەتەنیا لەسەر بناغەی تایبەتمەندیە دەستوری و بونیادە وێنەیی و ئامانجەکانی گوتار بینا بکەن، لەبەرئەوەی بەئیحتمالێکی بەهێزتر هەندێ خەسڵەت یا پەیوەندی تایبەت بەگوتار بونیان هەیە کەبۆ بنەماکانی دەستوری زمان و لۆژیك قابیلی گواستنەوە نین و بۆ هەڵوەشاندنەوەی ریزە گشتییەکانی گوتار[60] دەبێ سودیان لێوەربگیرێ. پەیوەندی (یا نەبونی پەیوەندی) بەخولقێنەرەوە، و ئەو شێوە جیاجیایانەی کە ئەو پەیوەندیە بەخۆیەوە دەگرێت، یەکێ لەو خاسیەتانەیە کەزۆریش سەرنج راکێشەرە.

لەلایەکی ترەوە، بەباوەڕی من، لێرەوە دەتوانین دەروازەیەك بۆ شیکردنەوەی مێژویی گوتار بکەینەوە. رەنگە کاتی ئەوە هاتبێ کەگوتارەکان نەك تەنیا لەسەر پایەی بەهای دەربرین (بیانی) یا گۆڕانە وێنەییەکانیان بەڵکو بەگوێرەی سیماکانی بونیشیان بخەینە بەردەم لێکۆڵینەوە. سیماکانی بڵاوبونەوەو هەڵسەنگاندن و خستنەپاڵ و خاوەنداری گوتارەکان لەهەر کولتورێکدا بەشێوەیەکی ترەو لەچوارچێوەی ئەودا دەگۆڕێت. بەباوەڕی من ئیمکانی تێگەیشتنی راستەوخۆی شێوە گونجانی

ئـــەم ســـیمایانە بـــەگوێرەی پەیوەندیـــە کۆمەڵایەتیەکان، بەسـەرنجدانە ڕۆڵـی خولقێنـەرو گۆڕانکاریـەکانی ئاسـانتر دەرك دەکـرێ تـاکو لەسەر بنەمای ئەو بابەتو چەمکانـەی کـە گوتـار یارمەتیان دەدات بۆ باوبونیان.

لەوانەیـە هـەتا لەسـەر بنچینـەی ئـەو جـۆرە شـیکردنەوانە بتوانـین دووبـارە لەجیاوازیـە تایبەتیـەکانی بکـەر یا ناسێنەر[61] بکۆڵینـەوە. هەڵبەتـە ئاگـادارم کاتـێ کەدەچینـە نێـو شـیکردنەوەی دەرونـیو بینـایی بەرهەمـەوە (بەگشتی لەدەقە ئەدەبی یا سیستمە فەلسـەفی یـان بەرهەمـە زانسـتیەکاندا)و گەڕانـەوە بـۆ ژیاننامـەو هۆکـارە دەرونیـەکان دەخەینـە کەنارەوە، خەسڵەتی ڕەهـاو ڕۆڵـی دامەزرێنـەریی ناسـێنەر دەخەینـە بـەردەم گومانـەوە. بـەڵام لەوانەیـە پێویسـت بکـات بـۆ ئـەم مەسـەلەیە بگەڕێینـەوە: هەڵبەتـە نـەك بەمەبەسـتی پایـەدارکردنی سـەرلەنوێی ناسـێنەری پـەیدایی بـەخش، بـەڵکو بـۆ پـەیبردن بەخاڵـەکانی هاتنـە نـاوەوەو سـیماکانی کـارکردو سیسـتمی وابەستەگیەکانی ئەو. ئەو کارە یەکسان دەبێ کە ئاوەژوکردنـەوەی کێشـەی هەمیشـەیی لـەو زەمینـەدا، ئیـدی لـەجێی ئـەوەی کەبپرسـین: "ناسێنەری ئـازاد چـۆن دەتوانـێ بچێتـە نێـو گەوهەری کاروبارەکانەوەو مانایان پێببەخشێ؟ چۆن دەتوانێ ڕێساکانی زمان لەدەرونەوە بخاتـە کـارەوەو مەبەستە تایبەتیـەکانی خـۆی بێنێتـە پێشـەوە؟" دەپرسـین: "کـەچۆنو لـەژێر چ هەلومـەرجێکداو بـەچ شـێوەیەك دەشـێ شـتێك بەناوی ناسێنەر لەسیستمی گوتاردا دەرکەوێ؟ چ جێگایەکی لە هـەر نمونەیـەکی گوتـاردا هەیـەو چ ڕۆڵێـك، لـەئاکامدا پـەیرەوی لـەچ ڕێسـایەك دەکـات؟" مەسـەلەکە بەشـێوەیەکی پوخـت، مەسەلەی بێبەریکردنی ناسینەوە (یا جێگرەوەی ئەو) لە ڕۆڵـی پـەیدایی بەخشـیو، لـەبری ئـەوە، شـیکردنەوەی ئـەوە بەناونیشـانی کـارکردێکی گۆڕاو (متغیر)و ئاڵۆزی گوتار.

دووەم؛ ئـەو بەڵگـە پەیوەندیدارانەیـە بـەباری "ئایدۆلۆژی" خولقێنەر. مەسەلەکە بـەم شێوەیە دەردەکەوێت: "خەتەرێکی گـەورە (یـان داستان {fiction}) هەڕەشـە لەجیهانی ئێمـە دەکـات، چۆن دەتوانین لـەو خەتـەرەی کەمبکەینـەوە؟" وەڵام ئەوەیـە کـە کەمکردنـەوەی ئـەوە بـەهۆی خولقێنەرەوە ئیمکان دەبێ. خولقێنـەر ئیمکـانی سنوردارکردنی ڕوانو زۆربونی بەرهەمهێنانـەوەی شـێرپەنجاوی {سـەرەطاناوی} و خەتـەرناکی دەلالـەتـەکان لەجیهانێکدا دەدات کەئێمە تیـایدا نـەك لەمـەڕ سـەرچاوەو سـەروەتەکانمان، بـەڵکو لەمـەڕ گوتارەکانیشـمانو دەلالەتـەکانی گوتـار ئیقتیصـادی دەکـەین. خولقێنـەر بنچینـەی ئیقتیصـادی کردنـە لـەڕەوتی ڕوانو زیـادبوونی بەرهەمهێنانـەوەی ماناکاندا، ئیـدی دەبـێ ئـەو تێگەیشتنە تەقلیدیە پێچەوانە بکەینەوە کەلەمەڕ خولقێنـەرەوە هەیـە، هـەروەك پێشـتر بینیمـان، ئێمە ڕاهاتوین بڵێین خولقێنەر داهێنەری بلیمەتی بەرهەمـەو لەگەنجینـەی سـەروەتو بەخشـندەیی بێبڕانەوەی خۆی، جیهانێکی بێ کۆتایی لەقاڵبی نوسراو دادەهێنێت. ڕاهاتوین بڵێین کەخولقێنـەر لەگـەڵ ئـەوانیتر جیـاوازی هەیـەو ئـاوا لـە هـەمو زمانـەکان بـاڵاترە هـەر کەبەقسـە دێت، ماناکـان بەشـێوەیەکی بێسنور دەس بـەڕوان و زۆربـون دەکەن.

بـەڵام ڕاسـتیەکەی پێچەوانـەی ئەوەیـە. خولقێنەر سەرچاوەی بێسـنوری ئـەو دەلالەتانە نییـە کەبەرهـەم لێیـان کـەیل دەبێت؛ خولقێنـەر لەپێشـەوەی بەرهـەم نایـەت؛ دەسـپێکێکە بـەکارکردی دیاریکراوەوە کەلـەکولتوری ئێمـەدا کـاری دیـاریکردنو لادانو هـەڵبژاردن بـەهۆی ئـەوەوە بەئـەنجام دەگـات،و بڵاوبونـەوەو دەسکاریو پۆلبەندیو بەشبەشکردنو پۆلبەندی

دوبارەی چیرۆك بەشێوەیەكی ئازادانە، لەودا رووبەڕووی بەربەست دەبێتەوە. لەڕاستیدا، كە راهاتوین خولقێنەر بەبلیمەت و كوانووی بەرهەمهێنەری داهێنان و دەسپێشخەری نیشانبدەین هۆی ئەوەیە كەوای لێدەكەین بەشێوەیەكی پێچەوانە رۆڵی خۆی وازیبكات. دەتوانین بڵێین خولقێنەر بەرهەمێكی ئایدۆلۆژیە، لەبەرئەوەی لەخاڵی دژ بەرۆڵی مێژوویی و واقیعی خۆی نیشان دەدرێ. (كاتی رۆڵێكی مێژوویی دیاریكراو لەقاڵبی كەسایەتیەكدا دەردەكەوێت كەئەو رۆڵە پێچەوانە دەكاتەوە، ئەوەی كەروبەڕوی دەبینەوە بەرهەمێكی ئایدۆلۆژیە). بەپێی ئەوە، خولقێنەر كەسایەتیەكی ئایدۆلۆژیەو بەهۆی ئەوەوە ترسی خۆمان لەزیادبونی (تكثیر) مانا نیشان دەدەین.

لەوانەیە وا دەركەوێت كەمن بەم قسەیە، خوازیاری فۆرمێك لەكولتور بووم كەچیرۆك تیایدا بەكەسایەتی خولقێنەر دیاری(محدود) نەكرێت. بەلام بینینی كولتورێك كەكاری چیرۆك تیایدا بەگشتی ئازادانە كاربكاو چیرۆكەكە بەبێ رابوردن لەپالاوگەی كەسایەتیەكی زەروری یا سنوردار بكەوێتە بەردەم ئیختیاری هەموانەوە، شتێك نییە جگە لەرۆمانتیزمێكی روت. لەسەدەی هەژدەهەمەوە تا ئێستا، خولقێنەر رۆڵی رێكخەری كاری چیرۆكی (داستانی) وازی كردوە كەرۆڵێكی تایبەتی چەرخی پیشەسازی و كۆمەڵگای بورژوازیی ئێمەو باوەڕ بەفەردگەرایی و خاوەنداری تایبەتیە. لەگەڵ هەمو ئەمانە، بەسەرنجدانە ئەوگۆڕانە مێژووییانەی لەحاڵی روودان دان، زەروری نایەتە بەرچاو كەرۆڵی خولقێنەر هەروەك لەڕوی فۆرم و ئالۆزی و هەتا لەڕوی بونەوە، بەنەگۆڕی بمێنێتەوە. من پێموایە پلە بەپلە كە كۆمەڵگای ئێمە گۆڕانكاری بەسەردا دێ،و بەتایبەت لەساتی گۆڕانكاریدا، رۆڵی خولقێنەریش لەبەین دەچێ، بەشێوەیەك لەبەین دەچێ كەچیرۆك و دەقە چەند مانابیەكانی بەشێوەیەكیتر كاردەكەن، دیسانەوە لەنێو سیستمێكی سنوردارکەردا، سیستمێك كەئیدی پەیوەندی بەخولقێنەرەوە نییە، بەلام دەبێ لەئایندە دیاری بكرێ و لەوانەیە تاقیبكرێتەوە.

ئەوكات، هەر گوتارێك، بەگوێنەدانە پێگەو فۆرم و بەهاكەی و بەگوێنەدانە ئەوەی چ رەفتارێك دەیگرێتەوە، لەگومناوی یەك زەمزەمەدا دەكرێتەوەو دەپشكوێ. ئیدی ئەو پرسیارەی ئەوەندە دووبارە بۆتەوە نابیسین كە: "لەڕاستیدا چ كەسێ بوو قسەی كرد؟ لەڕاستیدا ئەو بوو یا كەسێكیتر؟ و بە چ نوێگەری و رەسەنایەتیەكەوە؟ لەگوتارەكەیدا، چ بەشێكی قولایی بونی خۆی بەیانكردوە؟" لەبری ئەوە، پرسیاری دیكە دەبێ، لەبابەتی ئەوەی كە: "سیماكانی بونی ئەو گوتارە چیە؟ لەكوێ بەكارهاتوە؟ چۆن بلاوبۆتەوە؟ چ كەسێك دەشێ ببێتە خاوەنی؟ لەكوێیدا شوێنی بۆ ناسێنەرانەی ئیحتمالی هەیە؟ چ كەسێك دەتوانێ ئەو رۆڵە جیاوازانەی ناسێنەریی لەئەستۆ بگرێت؟" و ئیدی لەپشتی هەمو ئەو پرسیارانە، شتێك بێجگە لەو نەبونی جیاوازیە بەرگوێمان ناكەوێت: "چ جیاوازیەكی هەیەكە چ كەسێك قسە دەكات؟".

پەراوێزو سەرچاوەكان:

* سەرەتا ئەم وتارەمان لەم سەرچاوە فارسیە وەرگێڕابو "پدید آورنده چیست" میشیل فوكو، ترجمە عزت الله فولادوند، فصلنامە هنر [25] تابستان(1373)، ص (361–376) كە ئەمیش لەم سەرچاوە ئینگلیزیە وەرگیردراوە:

Michel foucult, “What is an Author?” tr.j.v. Harari, in textual strategies: Perspectives in post-Structuralist Criticism, wd.j. Harari, Methuen, pp.141- 160.

دوایی لەگەڵ ئەم دەقە فارسیەشی بەراوردمان كرد "میشیل فوكو، نوسینده چیست؟ برگردان: بهروزشیدا،

افسانه، شماره سوم، بهار1371، ص 54-77" بەڵام دواجار ئەم دەقە فارسیەشمان دەسکەوت "میشیل فوکو، مؤلف چیست؟ برگردان: افشین جهاندیده، لە کتێبی: سرگشتگی نشانەها، نمونەهایی از نقد پسامدرن، گزینش و ویراش: مانی حقیقی، 1374، ص 190-214" کەد وا وەرگێڕانی فارسی ئەو دەقەیەو کاملترینیانە، هەروەها راستەوخۆ لە دەقە فەرەنسیەکە وەرگێڕدراوەو لەگەڵ دەقە ئینگلیزیەکەی بەراوردکراوەو لێکدراوە. لەبەرئەوەی خودی وەرگێڕانە ئینگلیزیەکە لەژێر چاودێری خودی فۆکۆ بەئەنجام گەیەندراوە، ئەگەرچی لەوەرگێڕانە ئینگلیزیەکەدا نزیکەی دوو لاپەڕە لابراوەو هەندێ پەرەگراف زیادکراوە (وەك ئاماژەی بۆ کراوە لەوەرگێڕانە فارسیەکەدا).

دەقە فەرەنسیەکە:

Michel Foucault, "Qu'est-ce qu'un auteur?" ,Bulletin de la societe Fran casie de philosophie, No,63 (1969), pp. 73-104.

وەرگێڕانە ئینگلیزیەکە:

Michel Foucault, "What is an author? In the Foucault reader, (ed,Paul Rabinow), Newyork: Panthean press, 1984, pp. 101-121.

ئێمە لەکاری خۆماندا، سودمان لەهەرسێ وەرگێڕانە فارسیەکە بینیوە، بەڵام سەرمەشقی یەکەمینمان وەرگێڕانەکەی "عزت الله فولادوند" بوە هەروەها لەگەڵ وەرگێڕانەکەی "افشینی جهاندیده" بەراوردمان کردوەو هەر کەموکوریەك هەبوبێ لەودا تەواومان کردوە، بەتایبەت ئەو دوو لاپەڕەیەی کەلەدەقە ئینگلیزیەکەشدا لابراوە. ئێمە لە پەراوێزی ئەم وتارەدا ئاماژەمان پێکردوە وە وەرمانگێڕاوە، بۆ مەسەلەی پەراوێزەکانیش لەهەرسێ وەرگێڕانو هەندێ سەرچاوەی تر سودبینراوە.

(1) {author}، ئێمە لەبەرامبەر "پدید آورنده" بەکارمانهێناوە، بەڵام لەوەرگێڕانەکەی بهروزشیدا "نویسنده" بەکارهاتوە، واتە نوسەر، لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیده "مؤلف" بەکارهاتووە کە دەبێتە دانەر، هەروەها سەیری وەرگێڕانە سویدیەکەشمان کرد {forfattare} بەکارهاتووە. کەمانای نووسەر یان دانەر دەگەیەنێ. ئێمە بەچاکی دەزانین خولقێنەر یان دانەر بەکاربرێ، لەبەرئەوەی لەتوێی دەقەکەدا ئاماژە بۆ نەشیانی بەکارهێنانی نووسەر هەیە.

(2) اثر، تەنیا کاری ئەدەبی ناگرێتەوە.

(3) Beckett.

(4) Writing subject

(5) Sade

(6) Nietzche

(7) {Clement of Alexandria}، رۆحانیو قسەکەرێکی مەسیحی سەدەی دووەمی زاینیە، کە کۆپڵەکانی {Miscellaines Stromata} خوێندنەوەیەکە بۆ مێژووی فەلسەفە

(8) {Diogenes Laertius}، لەسەدەی دووەمی زاینیدا ژیاوە نووسەرەوەی باوەڕەکانی خەڵکی دورگەی سیسیل بوە، ژیانی فەیلسوفان {Live of the philosophers} کتێبێکی ئەوە لەدوو بەرگدا، سەرچاوەیەکی گرنگە دەربارەی تێڕوانینی فەیلەسوفە کۆنەکان.

(9) theological affirmation

(10) {S. Mallarme} (1842-1898) شاعیری سیمبولیستی فەرەنسی.

(11) John Searle, Speech Acts: An Essay in the Philosophy of Languge, Cambridge: Cambridge University Press, 1969, pp. 74-162.

(12) reference

(13)Aristotle

(14) {A.Rimbaud} (1854-1891) شاعیری سیمبولیستی فەرەنسی

(15) شیعری {La Chasse Spirituelle} گوماندەکرا کەیەکێك لەبەرهەمە نادیارەکانی ئارتۆر رامبۆ بێ، بەڵام کاتێ لەژمارە (19، مای 1949)ی رۆژنامەی کومبای فەرەنسی چاپکرا، دەرکەوت کەلاسایکردنەوەیەکە لەشیعرەکانی رامبۆو دوو کەس هۆنیویانەتەوە بەم ناوانە: ئاکاکیا ڤیالا و نیکۆلا باتای. لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیده بە"شکاری مەعنەوی" تەرجەمەکراوە.

(16) Pierre Dupont

(17) Skakes Peare

(18) Bacon

(19) {Organon}، ئامێرێکی مۆزیکییە لەپیانۆ دەچێ، دەڵێن ئەفلاتون دایهێناوە.

(20) Homer

(21) {Hermes Trismegistus}، نووسەری بەناوبانگی کتێبێکی مێژووییە لەبارەی عەقڵی شێوە رەمزی، مانای وشە بەوشەی ناوەکەی بەلاتینی دەبێتە (هێرمسی سێجار گەورە) کەنازناوی شانازیە بۆ "ثوث" خوای دانایی لەمیسری کۆن، ئەو کتێبانەی لەبارەی زانستە شاراوەکانەوە نووسراون دەدرێنە پاڵ ئەو، تیایاندا کاریگەری عیرفانیو رواقی بەرچاودەکەوێت، وەرگێڕانی هەندێکیان بەلاتینیو عەرەبی لەبەردەستدان.

(22) Jacques Durand

(23) Stendahl

(24) {Henri Beyle}، ناوی حەقیقەی ستاندالە، ڕۆماننووسی ناوداری فەرەنسی.

(25) {Bourbaki} ناوێکی کۆمەڵەیی و خوازراوی گروپێکی ماتماتیك زانانی فەرەنسییە لەچلەکانی ئەم سەدەیەدا.

(26) ناوەکان یەك لەدوای یەك:

Victor Eremita, Climacus, Anticlimacus, Frater Taciturnus, Constantine Constantius.

هەموویان ناوی خوازراوی فەیلەسوفی دانیمارکی کیرکیگارد {Kierkegaard}ن لەبەرهەمە جیاجیاکانیدا.

(27) لەبەرامبەر "مسند الیه ومسند" بەکارمانهێناوە. بەڵام لەوەرگێڕانە فارسیەکەی‌تر لەبری ئەو زاراوانە "فاعل و مفعول" بەکارهاتوە.

(28) {Hipocrates}} پزیشکی یۆنانی سەدەی پێنجەم کەبەناوی باوکی زانستی پزیشکی ناسراوە، بەڵام ژیان و کارەکانی بەتەواوی ڕۆشن نیە.

(29) Balzac

(30) {(pliny) Caius Plinius Secundus} سروشتناسی ڕۆمی سەدەی یەکەمی زاینی و نووسەری کتێبێکە لەشێوەی دائیرەتولمەعاریف بەناوی مێژووی سروشتی.

(31) لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیدە ئەمەی ناو کەوانەکان بەم شێوەیە (هەڵبەتە دەبێ بڵێم کەدەمێکە ڕەخنەی بەرهەم لەسەر بنەمای شێواز و جۆری بەرهەمەکە ئەنجامدەدرێ، و هەروەها لەسەر بنەمای ئەو ڕەگەزە دووبارەبووانەی کەئامادەن تیایداو ئەو گۆڕانکاریانەی دەوروبەری ڕەگەزێکی نەگۆڕ کەئیدی تاکە ئەفرێنەر نیە. بەم شێوەیە ئەگەر لەماتماتیکدا، ئیدی ئەوەندە بۆ دانەر (خولقێنەر) ناگەڕێنەوە، مەگەر تەنیا بۆ ناونانی هەندێ بیردۆزە یا کۆمەڵێ گوزارە، ڕۆڵێکی تەواو جیاوازی هەیە ئاماژەکردن بۆ دانەرو مێژووی کارەکەی لەبایۆلۆژی و پزیشکیدا. بەدەربڕینێکی تر، ئەم ئاماژەیە تەنیا شێوەیەك نییە بۆ ناسینەوەی سەرچاوە بەڵکە شێوەیەکە بۆئەوەی کەجیاکەرەوەیەکی (شاخص) دیاریکراو نیشانبدرێت لەمەڕ ئەو تەکنیك و کەرەسە تاقیکاریانەی کە بەکارهاتون لەو سەردەمو لەتاقیگەدا).

(32) {Saint Jerome} (340-420زاینی). قسەکەر و لێکۆڵەرەوەی مەسیحی، وەرگێڕی ئینجیلەکان بۆ لاتینی، و نووسەری کۆمەڵێ بەرهەم بوە لەمەڕ تەفسیری کتێبی پیرۆزو مێژووی کڵێساوە.

(33) لەدەقە فارسیەکەی تر نووسراوە "موجود خیالی" {De vifis illustribus}.

(34) alter ego

(35) لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیدە لەبری "چیرۆك"، "خەیاڵ" بەکارهاتوە.

(36) Subigect

(37) transdiscursive

(38) Founders of discursivitiy

(39) The Interpretion of Dreams. (freud)

(40) Jokes and their Relation to the Unconscious. (freud)

(41) The Communist manufesto (Marx)

(42) The Capital. (Marx)

(43) {Anne Radcliffe} (1823-1764) ڕۆماننووسی ڕۆمانتیکی ئینگلیزی.

(44) The Castles of Athlin and Dunbaye.

(45) Gothic horror novel

(46) لەشیکردنەوەی دەرونیدا، ئارەزوی بزوان، یا وزەی ژیانە کە لەهەندێ بواردا پەیوەستی ویستی سێکسی دەبێ.

(47) Karl Abraham

(48) Melanie Klein

(49) Galileo

(50) {G.L.C.F.D. Cuvier} (1832-1769) سروشتناسی فەرەنسی، بنیاتنەری قالبناسی (ئاناتۆمی) پراکتیکی و ئارکیۆلۆژی.

(51) {F.Sanssure} (1913-1857) زانای سویسی و بنیاتنەری زمانناسی نوێ.

(52) organisme

(53) sign

(54) normativite

(55) لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیدەدا ئەم چەند پەرەگرافە زیادە هەیە: دیسانەوە دەبێ ئەو "گەڕانەوە بۆ.." یە لەدیاردەکانی "دۆزینەوە" و"بەدەستهێنانەوەی دووبارە" جیابکەینەوە. ئەم دوو دیاردەیە لەنێو زانستدا زۆر باون. مەبەست لە"دۆزینەوە: ئەو بەرهەمە وەك یەك یان هاوشێوانەن کەلەڕێی شێوە تازەکانی زانستەوە، تێگەیشتن یان بەدەستهێنانی ئەو وێنەیە ئێمکان ئامێز دەکەن کە لەکەدار یان ون بوە. بۆ نمونە، چۆمسکی لەو کتێبەیدا لەمەڕ دەستوری زمانی دیکارتی، وێنەیەکی لەزانست (مەعریفە) دۆزیوەتەوە لەکوردموی تا هومبولت درێژەی هەیە؛ لەڕاستیدا ئەم وێنەیە، تەنیا لەڕێی دەستوری {grammare generative}ەوە دەشێ فۆرمۆلە بێ، لەبەرئەوەی ئەم دەستورە یاسای بونیادەکەی لەبەردەستدایە، لەڕاستیدا ئامانجی ڕەمزاندنی {Codification} بۆ دواوەڕوانینی تێڕوانینی مێژوویە، مەبەست لە"بەدەستهێنانەوەی دووبارە"

شتێکی تره، بەدەربڕینێك هێنانە ناوەوەی دووبارەی گوتارێکە لەنێو قەڵەمڕەوێکی تازەی بەگشتیکردن و بەکارهێنانو گۆڕاندا. مێژووی ماتماتیك پڕە لەو شێوە دیاردانە (بڕوانە لێکۆڵینەوەی میشێل سێر لەبارەی مێژووەکانی ماتماتیك). بەڵام مەبەست لە"گەڕانەوە بۆ" چیە؟ بەباوەڕی من "گەڕانەوە بۆ" جوڵەیەکە تایبەتمەندی خۆی هەیەو بەوردی خەسڵەتی بنیاتنانی شێوەی گوتاری دەخاتەڕو. بۆئەوەی گەڕانەوە بێ، یەکەمجار دەبێ فەرامۆشی بێ، فەرامۆشیەك نەك بەڕێکەوت یان داپۆشراو بەهۆی تێنەگەیشتنەوە، بەڵکە فەرامۆشیەکی ذاتیو بونیادی. کاری بنیاتنان، هەتا لەخودی خۆیدا، شێوەیەکە ناشێ فەرامۆش بکرێ. ئەو شتەی ئەم کارە ئاشکرا دەکا و لێی جیادەبێتەوە، شتێکە کەلێی دوردەکوێتەوەو گۆڕانی بەسەردا دێنێ. دەبێ لەسەر ئەو فەرامۆشیەی کەبەڕێکەوت نییە بەوردی کاربکرێت، تابتوانرێ جێگاکەی دیاریبکرێو شیبکرێتەوەو لەگەڵ ئەو گەڕانەوەیە بۆ کاری بنیاتنان، کەمبکرێتەوە. قوفڵی فەرامۆشی لەدەرەوە زیاد نەکراوە، بەڵکە بەشێکە لەشێوەی گوتاری جێ باسی ئێمەو ئەمیشە کەقانونەکانی دیاریدەکات؛ بنیاتنانی شێوەی گوتاری بەشێوەیەك فەرامۆش بوە، کە هەم بەڵگەی بونی قوفڵەو هەم کلیلێك کەئیمکانی کردنەوەی قوفڵەکەیە، بەشێوەیەك کەفەرامۆشی و ڕێگری گەڕانەوە تەنیا بەگەڕانەوە وەلا دەنرێن. هەروەها، ئەم گەڕانەوەیە بەم شتەدا دەچێتەوە کە لەدەقدا ئامادەیە، بەدەربڕینێکی وردتر، بۆ خود دەق دەگەڕێتەوە، بۆ خودی دەق لەحاڵەتی روتیدا، لەهەمان باردا بۆ ئەو شتە دەگەڕێتەوە کەلەتوێی دەقدا بەچاڵو ونبونو جێگای خاڵیەوە نیشاندەدرێت. بۆ بۆشاییەك دەگەڕێتەوە کەفەرامۆشی بەسەر خۆیدا کردویەتیەوە یان شاردویەتیەوەو بەتەواوی ساختەییو ناڕێکی داپۆشیوەو گەڕانەوە دەبێ دووبارە ئەم جێگا خاڵی و ونبوە ئاشکرا بکاتەوە؛ لێرەوە گەمەیەکی بەردەوام دەسپێدەکا کە تایبەتمەندی گەڕانەوەکان بۆ بنیاتنانی شێوەی گوتاری دەخاتەڕوو، گەمەیەك کەلەلایەکەوە بریتیە لەوتنی ئەوەی کەئەو شوێنە بوو خوێندنەوە کافی بو، هەموشتێ لەو شوێنەدا پەیدادەبێو دەبوا چاوانو گوێچکەکان دابخرێن تا نەیبینین؛ و بەپێچەوانەوە لەلایەکی ترەوە بریتیە لەوتنی ئەوەی نا، بەهیچ شێوەیەك لەم یان لەو وشەیەدا نییەو هیچ یەکێ لەو وشانەی قابیلی بینینو خوێندنەوەن، ئەو شتەی کەئێستا جێی مەبەستە ناڵێنو زێتر بریتیە لەو شتەی کەلەتوێی وشەکانو لەنێو ئەو ماوەو دوریەی کەئەمان لێکجیادەکاتەوە، دەوترێ).

(56) هەروەها لێرەشەوە ئەم پەرەگرافە لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیدەدا زیادە: (بەڵام دەبێ تایبەتمەندیەکی دیکەش بۆ ئەم تایبەتمەندیانەی گەڕانەوە زیادبکرێو گەڕانەوەکانیش بەئاڕاستەی جۆرە پەیوەندیەکی لوغزاوی نێوان بەرهەمو دانەر شێوە دەگرێ. لەڕاستیدا، لەو شوێنەی کەدەق، دەقی دانەرو بەهۆی هەمان دانەرەوە بەهای دامەزراندن "بنیاتنان"ی هەیە، دەق دەبێ بۆ دانەر بگەڕێتەوە. دۆزینەوەی دەقێکی نەناسراوی نیوتن یان کانتۆر ناتوانێ جیهانناسی کلاسیك یات تیۆرەی کۆمەڵەکان بەم شێوەیەی کەگەشەیان کردوە، بگۆڕێت "ئەوە تەنیا ڕۆخی گۆڕە کەدەتوانێ ناسینی مێژوییمان لەمەڕ پەیدابوونی ئەوانەوە بگۆڕێت". بەپێچەوانەوە، لێکۆڵینەوەیەکی دووبارەی دەقێکی فرۆید بۆ نمونە سەرمەشقەکان "تەنیا وەك دەقێکی فرۆید" هەمیشە ئەو خەتەرەی هەیە کەنەك ناسینی مێژوویی لەمەڕ شیکردنەوەی دەرونیەوە، بەڵکو قەڵەمڕەوە تیۆریەکەشی بگۆڕێت "گریمان بەجێگۆڕکێ پێکردنی شتە تەئکیدلێکراوەکانو چەقی قورساییەکەی". بەم گەڕانەوانەی کەبەشێکن لەتانوپۆی قەڵەمڕەوەکانی شێوە گوتاری، ئەم قەڵەمڕەوانە پەیوەندیەکیان بەدانەری "بنەمایی"و بەواسطەی (57) {mediat} خۆیانەوە هەیە کەجیاوازە لەگەڵ پەیوەندی هەر دەقێك بەدانەرە بێ واسطە {immediat} کەی خۆی.

(57) مەبەست ئەوەیە کە لەو نێوانەدا کاربکاو میانچی نێوان پەیوەندیەکان بێ. بەڵام ئێمە وشەیەکمان بۆ ئەمە نەدۆزیەوە.

(58) "شێوەی گوتاری"و"خەسڵەتی گوتاری" لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیدەدا لەبەرامبەر یەك شت بەکارهاتون. هەروەها "بنیاتنان"و "دامەزراندن"یشن کەواتە ئەمانە یەك شتن.

(59) typologie

(60) لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیدە نووسراوە: بۆ جیاکردنەوەی گوتە بنچینەییەکان گوتار دەبێ سودیان لێوە ببینرێ.

(61) لەوەرگێڕانەکەی افشین جهاندیدە لەبری {subject} بەکارهاتوە.

(62) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (35).

تێبینی: ئەم دوو وەرگێڕانە فارسیە "پدید آورندە چیست"و"نویسندە چیست"، هاوڕێم ڕێبوار سیوەیلی خستیە بەردەستم، لێرەوە خۆشەویستیو سوپاسی بێپایانم بۆی هەیە.

# پیر فۆجیرۆلاس و تاریکخوازیی هاوچەرخ

■ ئا/ د. عبدالعلیم محمد

● و/ کامل محمد قەرەداخی

سەرەڕای ئەوەی مرۆڤ و کۆمەڵگە هەرلە چاخە دێرینەکانەوە لە هەوڵێکی بەردەوامدابوون بۆ پەیبردن بە ناوەڕۆك و میکانیزمی بزاوتی مێژوویی، کەچی ئەم بابەتە لەمرۆدا وەك چۆن لە دوێنێ و سبەیش هەر مایەی بیر لێکردنەوەی نوێ و خوێندنەوەی جۆراوجۆر بووەو دەبێ. چونکە چ مرۆڤ و، چ کۆمەڵگە هەردووکیان دیاردەی زۆر گرێچن و جۆراو جۆرن، ناتوانین لە شیکردنەوەو تاوتوێکردنیاندا وەك هاوکێشەیەکی بیرکاری بەئەنجام بگەین. بەڵکو دەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوە لە پەیوەندیی کۆمەڵگە بە مرۆڤەوە دەدرێنە پاڵ کۆمەڵە فاکتەرێکی جۆراوجۆری وەها کە ئەو دەرەنجامە ناوەندی و راستیە رێژەییانەی کە پێی دەگەن دەبن بە قەدەری ئەو تیموگروپە مرۆییانەی کە بڕوایان پێ دەهێنن.

هەرچەندە کە هەوڵی شیکردنەوەو خوێندنەوەی ئەو دیاردەیە بەدرێژایی هەموو مێژوی مرۆڤایەتی درێژە. و هەر لەئەفلاتون و ئەرستۆوە هەتا مارکس و کۆنت و دۆرکاریم بەردەوامبوە، کەچی هێشتا توێژینەوە لە کۆمەڵە سیستمێکی فکریی نوێ بۆ خوێندنەوەی وردو درشت و ئاڵۆزی ئەو دیاردەیە سەرچاوەی بەپیتە بۆ تێرامان و نوێگەرایی.

بێگومان پەرەسەندنی ئەزمونی مرۆڤایەتی و هەمیشە نوێبوونەوەی خودی ئەو ئەزموونە



لەرێگەی کۆمەڵە وەرچەرخانێکی قەبەوە بوە کە رەگیان لەناو کۆمەڵگە نوێیەکاندا داکوتیوە، بێگومان ئەم پەرەسەندنانەن کە ئەگەری بابەتیانەی نوێبوونەوەی پرۆسەی بیرکردنەوەو تێرامانی کۆمەڵگە ساز و ئامادە دەکەن.

لە رەوتی پەرەسەندنی ئەم پرۆسە مێژووییەدا، لە زۆر قۆناغی جیاجیادا زۆر سیستم بۆ پەیبردن بە سروشتی ئەو بزوتنەوە کۆمەڵایەتی و مێژووییانە دارێژراون کە لە سەردەمێکدا باوبوون و کاریان پێکراوە، یان تا ئێستا باون و کاریان پێدەکرێ. بەڵام ئەم سی ساڵەی ئەم دواییە لەسەر ئاستی بونیادی کۆمەڵگای نوێ و لە سەرئاستی سیستمی نێودەوڵەتی و پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا پەرەسەندنی زۆر گەورە و گرنگی بەخۆیەوە بینیوە. ئەوەتا جەنگی جیهانی دووەم بە بنەبڕکردنی رەوتی فاشیزم و نازیزم کۆتایی هاتووەو سەرباری شەڕی سارد نیمچە ئاسایشێك هەیەو، دیاردەی "دوو جەمسەریی جیهان" سەری هەڵداو پنتەکانی هێز لە جیهاندا بەسەر هەریەکە لە یەکێتی شورەویی و بلۆکی رۆژهەڵات، لەلایەك و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لەلایەکی دیکەدا دابەش بوون.

هەرئەو سەردەمە وڵاتانی جیهانی دووەم سەریان هەڵدا ئەم جیهانەش وڵاتانی بەشدارن لە شۆڕشی زانست و تەکنەلۆژیا کە هێزو گروپە فەرمانڕەواکانیان لەبارێکی ئاسایشیی ئارامدان.

سەرباری ئەمانەش، یان بڵێین لەسەروی هەموو ئەمانەوە، ئەم سی ساڵەی دوایی گەڵاڵەبوونی کۆمەڵێك ئاراستەی فکریی وای بەخۆیەوە بینی کە لە چەند روویەکەوە لە ئاراستە فیکرییەکانی پێش خۆیان جیاوازن و خۆیان وەك هەوڵی پەیبردن و شیکردنەوەی کۆمەڵگای نوێ و پەرەسەندنی کۆمەڵگا و میکانیزمی پەرەسەندنەکە دەنوێنن. ئەوەتا لەبەرامبەر ئەو رەوتە پێشکەوتنخوازییەی سەدەی نۆزدەدا کە لەسەردەستی هێربەرت سپێنسەر تەکانێکی بە مێژوو ئابووری و کۆمەڵ دا و ئەوکاتە سپێنسەر لە میانەی ئەو پێشکەوتنخوازییەوە پێشبینی ئەوەی کردبوو کە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان چارەنووسی کۆمەڵگە داوکەوتووەکانن، واتە ئەوانیش بەم چارەنوسە (پێشکەوتن) دەگەن. ئەوکاتە روحێك هەبوو بە (ناوەندچێتی رۆژئاوا) گەشبین بوو، بەڵام سەدەی بیستەم بە گۆڕانی ئاراستەکانی توێژینەوە لە کۆمەڵگەو لە مرۆڤ، بەهۆی تێرامانەکانی نیتشەو شپلینجەرەوە جیادەکرێتەوە. (وەزیفەیی) ش لە سەر دەستی مالینۆفسکی گەڵاڵە بوو، ئەو بووکە جاری ئەوەی دا هەر رۆشنبیرییەك کەلتورێکی یەکگرتووەو سەیرورەی تایبەت بەخۆیی هەیەو گونجاو و هاوسەنگە و هەموو ئەو دیاردانەشی کە پەیوەستن بەو کەلتوورەوە لەناو

کەلتوورەکەدا ئەرك و وەزیفەی دیاریکراو و نێو خۆییان هەیە.

هەرچەندە ئەم رەوتە لەسەر دەستی میرتۆن و بارسۆنز پێشکەوتنی باشی بەخۆیەوە بینی کەچی هێشتا بە چاوپۆشی کردنی لەناکۆکییە ناوەکیەکانی ناو کەلتورە یەکگرتوەکەو تێروانینی ئیستاتیکیانەی بۆ بزوتنەوەی کۆمەڵگە، جیادەکرێتەوە. چونکە ئەو خاڵی سەرەتایەی کە ئەم رەوتە پشتی پێ دەبەستێ ئەوەیە کە هەرلایەك لە لاکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ روبەڕووبونەوەی (ژیانی کۆمەڵایەتی) بە گشتی وەزیفەی دیاریکراو و پێویستی خۆیی هەیە.

ئەمجا ئەوانە بیانەوێت و نەیانەوێت (وەزیفەیی) بەکاری میرتۆن و بارسۆنز لە بەرامبەر مارکسیزمدا لە گۆڕەپانی ململانەدا بینییەوە.

چونکە مارکسیزم لەژێر کاریگەری چەمکی پێکهاتەیی ئابوریی کۆمەڵایەتیدا وەك شتێکی کۆگیری سەیری کۆمەڵگە دەکات، بەلام ئەو کۆگیرییە تەنها رواڵەتەو ناوەڕۆکەکەشی لە ئەو ناکۆکیەدا خۆی مەلاس داوە کە لەنێوان گروپ و هێزە کۆمەڵایەتیە جۆراوجۆرەکاندا هەیە. کەچی کۆمەڵگاو کەلتور لەڕوانگەی وەزیفیەتدا بەیەکەوە کۆگیرکێن لەسەر بنەمای دامالینی کەلتور لە ناکۆکیە ئەندامیەکانی دروست دەبن.

لە بەرامبەر ئەو رەخنە توندانەدا کە لەلایەن ئیکۆنۆمیست و سۆسیۆلۆژیست و ئەنترۆپۆلۆژیستەکانەوە لە وەزیفیەت گیرا، لەم سالانەی دواییدا توێژەران چاویان خستە سەر دەستکەوت و داهێنانەکانی ئەم سالانەی دوایی زانستە سروشتیەکان بەتایبەتیش لەو بوارانەدا کە پەیوەندییان بە پەرەسەندنی سیبرنێتیك Sybernetique وە هەیە.

ئێستا رویان لەوەیە کە سوود لە دەستکەوتەکانی ئەم زانستە وەربگرن و هەوڵ بدەن مۆرکێکی "زانستی" بدەن بە ئەو توێژینەوانەی کە تاوتوێی رەوشەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگە دەکەن. پراکتیزەکردنی سیبرنێتیك لە بواری کۆمەڵگە و مرۆڤدا کارێکی وای لێکەوتەوە کە مل بەو گوتارە بدرێت کە بە رواڵەت گەلالەبوونی پرۆسە کۆمەلایەتیەکان لەرێگەی بونی چەند سیستمێکەوە، یان چەند سیستمێکی لاوەکیەوە رێك دەخرێن کە لە ناوەوە یەکگرتنێکیان تێدا هەیە بێ ناکۆکی و ناتەبایی، ئەمە گوتاری وەزیفییە تەوەرییەکانە. لە پێگەی ئەمەشەوە تێڕوانینێکی نوێی دیکە بەرجەستە بوو کە ئەویش هەر درێژبوونەوەی وەزیفەییە، بەلام پێی دەوترێت (سیستمیزم – نەزمیەت – Systemisme) و بەوە جیادەکرێتەوە کە پرۆسەی کۆمەلایەتی بنبەست دەکات، لە راستیشدا سیستمیزم کاریگەریی لەسەر چەند زانایەکی سۆسیۆلۆژی و سیاسی پتر بەو لاوە دانەناو لەناوەندە زانستی و کەلتوریەکاندا کاریگەریی زۆریی دانەنا.

سیستمیزم لە توێژینەوەی خۆیدا کاتێك لەسەر بنەمای تیۆری و پەیڕەوی تاوتوێی کۆمەڵگە و مرۆڤ دەکات، ئەمەش بەپێچەوانەی شیکردنەوەی بونیادگەری، یان بلێین رێبازی بونیادگەرییە، کە بە رواڵەت پشت بە زانستەکانی کۆمەڵگە و مرۆڤ، یان بە خەسڵەتێکی تایبەتی تری زمانەوانیی بونیادگەری دەبەستێ. کاتی خۆی فەردیناند دیسۆسیر بەدەر لەو بابەتانەی کە واقعیەتی بابەتی باسیان دەکات لێکۆڵینەوەی لەسەر پەیوەندیی ئەو هێمایانە کردوە، ئەمجا ئیتر بابەتی زمانەوانی بەتەنها لێکۆڵینەوەی پەیوەندیی نێوان (دال و مەدلول) ەوە نەوەستا بەڵکو کەوتە لێکۆڵینەوەو تاوتوێکردنی هێماکان و پەیوەندیە ناوەکیەکانیان لەناو سیستمی زمانەوانیدا.

لە پێگەی دەستهاتەکانی زمانەوانیی نوێوە (بونیاد گەری) وەك ڕێبازێك و شێوازێکی ناو زانستە کۆمەڵایەتیە نوێیەکان بەرجەستەبوو. ئەم بونیادگەرییە دەڵێ پێویستە دیاردەو پرۆسە کۆمەڵایەتیەکان لەو وتارەوە شیکار بکەین کە ڕەوانی مرۆیی بەشێوەیەکی نەستی و نادیار پەیوەست دەبێ بە ئەو پەیوەندیە ڕواڵەتیانەوەی کە زمانە جیا جیاکان پێك دەهێنن. پاشان ئەمەش سیستمی خزمایەتی و شێوازە جۆراوجۆرەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی هێنایە بەرهەم.ئەمجا ئیتر پەیوەندیی ناوخۆیی نێوان دەنگەکان و ئیشارەتەکان بۆ شیکردنەوەی پرۆسە کۆمەڵایەتیەکان لەبەرچاو گیرا. شایانی باسە بونیادگەریش وەك وەزیفەیی و سیستماتیکی لە سەرەتاوە (واقع) بە کۆگیری هەست پێ دەکات بەڵام بەپێی پایەی تەوەرەیی بونیادی زمان و نەبوونی ناکۆکی لەناو کۆگیرییەکەدا.

تا ئێرە توانیمان لە ناوەڕۆکی ئەو فیکرانە تێبگەین کە لە ئەم چەند لاپەڕەیەی (پیێر فۆجێروڵاس) ی بیریاری فەرەنسی و پرۆفیسۆری زانکۆی حەوتەمی پاریس دا باسی دەکەین و لە کتێبی تاریکخوازیی هاوچەرخمان وەرگرتووە.

وڵاس، لەم کتێبەیدا لە سەرەتاوە وەزیفەیەت و سیستماتیك ناداتە بەر ڕەخنەی زانستی، لەبەرئەوەی ئەم دوانە کاریگەرییان لە ناوەندە زانستی و ئەکادیمی و کەلتورییەکاندا سست و لاوازە، بەڵکو هەموو هەوڵی خۆی بۆ ڕەخنەگرتن لە (بونیادگەری) چ لە شێوە ڕەسەنەکەیدا وەك ئەوەی کە لیڤی شتراوس بەرجەستە و گەڵاڵەی کردوە، چ لە شێوە مارکسیستیەکەیدا کە لویس ئالتۆسێر گەڵاڵەی کردوە، خستۆتە گەڕ. بەڵام پێش بەرچاوخستنی ناوەڕۆکی فکرەکانی وڵاس، وا باشە خوێنەران لەم چەند تێبینیە ئاگادارکەینەوە، کە ڕەنگە لە تێگەشتنی ناوەڕۆکی فکرەکاندا یارمەتییان بدات.

1) نوسەر لەڕێگەی دەزگای بڵاوکردنەوەی ساڤێلی savelli یەوە لە ساڵانی کۆتایی حەفتاکاندا ئەم بۆچونانەی لە کتێبێکدا بڵاوکردەوە ناوی (لە دژی لیڤی شتراوس و لاکان و ئالتۆسێر) بوو، ئەوکاتەش کە بونیادگەری شێری بێهاوتای ناوگۆڕەپان بوو، ئەم کتێبە نیگەرانیەکی لەناو ناوەندە تایبەتمەندەکاندا دروست کرد.

2) لەبەرئەوەی کە بەپێی لۆژیکی نومایشکردن و پێشچاوخستنی فکری خەڵکانی دیکە هەموو پێشکەشکردن و نمایشکردنێکی فکر - بەشێوەیەکی گشتی- بێ توندوتیژی و دڵتۆراندن و بگرە بێ خۆخۆیی کردن نابێ، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك:-

1- ئەم بیریارە خۆی، تەنها لە کێشەیەکی دیاریکراو، یان لاوەکی نادات، بەڵکو بەپێی حوکم و سروشتی بابەتەکەی چەندان تێڕوانینی شیکردنەوەی دیاردەی کۆمەڵایەتیەکان دەداتە بەر باس، یان بەدەربڕینێکی دیکە بڵێین ڕەخنە لە کۆمەڵە سیستمێکی فکری و لۆژیکی دەگرێ کە دەیانەوێ بابەتەکەی بەتەواوی ئامبازی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان بێن.

ئەم سیستمانە بەپێی سروشتی ئاڕاستەکانیان خەسڵەتی شمولی و کۆگیری وەردەگرن و خۆیان لە شیکردنەوەی گەردونی دەدەن و چەند بابەتێکی جۆراوجۆر، وەك ڕەگەزی پێکهێنەری تێڕوانینەکەیان دەگرنەوە کە ئەوانیش کۆمەڵگەو ئابوری و کەلتوورو هەست و چینایەتین.

2- لەم ڕووەوە نوسەر بەئەم ڕێبازانە ناکۆکەو لە ئاستێکی فکریو ڕێبازیی جیاوازی واوە ڕەخنەیان لێدەگرێت کە ئەویش شمولی و کۆگیرە و مەیلیەتی شێوازێکی جیهانی بۆ خوێندنەوەی بون و کۆمەڵگەو پەیبردن بە دینامیزمە جیاوازەکانیان گەڵاڵە بکات ئەمەش

پرۆسەی ئەم پێشچاوخستنە و تێگەشتنیشی هەندێك گران دەكات.

3- نوسەر ئەوە نیە كە سەبارەت بە رەوشێكی لاوەكی رەخنە لە تاكە نوسەرێك بگرێت. بەڵكو هاتووە سێ نوسەری داوەتە بەر رەخنە، ئەگەرچی هەرسێكیان لەسەر یەك رەوتن بەڵام هەریەكەیان بەپێی بوارو بابەتی خۆی جیاوازەو بونیادێكی تایبەتی چەمك و گوتاری هەیە.

4- ئەستەمیی دۆزینەوەی زاراوەی كوردیی هاوماناو بەرامبەر بە ئەو زاراوانەی كە تایبەتن بە كەسە رەخنە لێگیراوەكانەوە، یان نوسەر بۆ وەڵام دانەوە بە ئەوان بەكاری هێناوە، ئەمەش وای لێكردین كە هەندێك لە زاراوەكان بەشێوە فەرەنسیەكەی، یان عەرەبیەكەی بەكار بهێنینەوە، بۆئەوەی لەكێشەی ئەو ئەستەمیەش دەربازبین.

## ليڤی شتراوس و ئاوابونی خۆری فكری بۆرژوازی

فۆجێر ولاس بە رەخنەگرتن لەو كارانەی ليڤی شتراوس دەستی پێ كردووە كە لەژێر كاریگەری ئەوانداو لە سەدەی نۆزدەدا زانستە مرۆییەكان خەسڵەتی پێشكەوتنخوازییان بەخۆیانەوە وەرگرت و ئەو شتەی رەنگ رێژ كرد كە لە بیست ساڵی رابوردووەوە تا ئێستا بە بونیادگەری ناسراوە و رۆڵێكی گرنگی لە بواری زانستە كۆمەڵایەتیەكان و لە بازاڕی فكریی كۆمەڵگە رۆژئاواییەكاندا بینیوە.

## سروشت و رۆشنبیری

پەیوەندی نێوان سروشت و رۆشنبیری و وەرچەرخان لە یەكەمیانەوە بۆ دووەمیان كرۆكی ئەو كێشەیە بووە كە لە چاخە دێرینەكانەوە هەتا ئەمڕۆ تەوەرەی تێرامانە فەلسەفیەكان بووە.


شتراوس

پەرەسەندن و باڵا بوونی مرۆڤ دەرەنجامێكی ئەم پەیوەندییەیە. گۆڕانی مرۆڤ لە بارێكی سروشتی ئاژەڵیەوە بۆ بارێكی مرۆیی رۆشنبیری كرۆك و تەوەری ئەم پەیوەندیەیە بووە. دیارە ئەم پەیوەندیەش لە پێشەنگی ئەو رەوشانەدا بووە كە ليڤی شتراوس لە كتێبی (بونیادە سەرەتاییەكانی پەیوەندییەكانی خزم خواهی) دا باسی كردوە.

لە تێڕوانینی ئەمدا سروشتی واقیعی بایۆلۆژی و ئاژەڵی مرۆڤەو رۆشنبیریش واقیعە كۆمەڵایەتیەكەیەتی، ئەمەش نەك بەتەنها لەبەرئەوەی كە رۆشنبیری شتێكی بەدەر لە مرۆڤە بەڵكو لەبەرئەوەی كە رۆشنبیری لەناو ناخی مرۆڤ خۆیدایە و خەسڵەتێك كە مرۆڤ بەوەرچەرخانی بەكۆمەڵێ لە سروشتەوە بۆ رۆشنبیری لەڕێگای بەكۆمەڵایەتیی بوونەوە وەری دەگرێت. شتراوس ئەم ناتەباییە (ترسناكە) لەنێوان ئەو دووشتەدا هەڵدەهێنجێ كە خۆی

ناویـان دەنێـت (گـەلانی سروشـت) و (گـەلانی ڕۆشنبیری) و جـەخت لەسـەرئەوە دەكـات كـە گەلێك نیـەو نـەبووەو نابێ كـە ڕۆشـنبیرییەكی دیاریكراوی نـەبێ. فۆجـێر ولاس لەگـەڵ ئـەم بۆچوونەی شتراوسدا كۆكە، بـەڵام ناكۆكیەكـەیان لـە سروشـتی تێڕوانینەكەیاندایـە بـۆ كێشـەكە. چونكە مرۆڤ سـەرباری ئـەوەی كـە بونـەوەرێكی بـایۆلۆژی خـاوەنی ڕواڵــەتی فـیزیۆنۆمیی دیاریكراوی خۆیەتی، توانیویەتی شێوازێكی نـوێ بۆ پەیوەندیـیەكانی نێوانی خۆی و سروشـت، یان دەوروبەر بدۆزێتەوە، كە لە ڕوی ناوەڕۆكـەوە جیـاوازە لـە پەیوەندییـەكانی نێـوان ئـاژەڵ و سروشــت و دەوروبــەر، لــێرەوە مــرۆڤ وەك بونـەوەرێكی بـایۆلۆژی شانشـینی بونـەوەرە ئاژەڵیـە زیندوەكـانی بـەجێ هێشـت بۆئـەوەی كـەیانێكی نـوێ وەرگرێ كـە ئـەویش كـەیانێكی كۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییە..

لاوازی فەلسـەفە لـە تـێڕوانینی دا بـۆ مــرۆڤ لەوەدایــە كــە وەك كــرۆك، یــان بڵێــین وەك سروشـتێكی مرۆیـی بەخشـراو سـەیری مـرۆڤ دەكات، ئیتر ئەو تێڕوانینەی ئـەو بـۆ مرۆڤ یـان بەرجەسـتەبونێكی ڕۆحـە یـان بەشـێكی تـەم و مژاوی و ناڕونی مادەیە.

ئێسـتا لـەپاش توێژینــەوەكانی مــاركس و فرۆیدەوە ئەوە شـتێكی ڕونـە كـە شـتێك نـەماوە ناوی (سروشـتی مرۆیــی) بــێ، چونكــە مـرۆڤ خــەڵاتێكی سروشــت نیــە، بــەڵكو بەرهــەمی پرۆسـەیەكی ڕەگكوتـانی (تجذر) خۆییـە كـە لــە بەرەبـەیانی مرۆڤایەتیـەوە هـەتا ئـەمڕۆ لــەنێوان مرۆڤ و دەوروبەرەكەیدا بەردەوامـە. مـاركس لـە (ئایدیۆلۆژیـای ئـەڵمانی) یەكـەیدا ئــەوەی ڕون كردۆتـەوە كـە مـرۆڤ بـەهۆی بونـی هەسـت و ئاینەوە لە ئاژەڵ جیادەكرێتەوە. و مـرۆڤ خـۆی لــە شانشــینی ئــاژەڵان، دوركەوتۆتــەوەو لەوكاتەوەی كە ئامرازەكانی ژیان و بونـی خۆیـی هێناوەتـە بەرهـەم، چۆتـە نـاو كەشـكەڵانی مرۆڤـەوە. لـەكاتی بەرهـەم هێنـانی ئـەم ئامرازانـەدا، بەشـێوەیەكی ناڕاسـتەوخۆ ژیـانی مـادیی خۆیشی هێناوەتـە بەرهـەم، بـەڵام هاتنـە بەرهەمەكـەی خـۆی لـەچێوەی كۆمـەڵێك پەیوەندیی كۆمەڵایەتیدایە كە هەریەك لـە كۆمـەڵ و تاكەكەسەكانیش دەگرێتەوە.

لەسـەر بنـەمای ئەمانـە پـەیوەندیی نێـوان سروشــت و ڕۆشـنبیری بــۆ یەكــەمین جـار وا نەمایـەوە كـە مەسـەلەیەكی تیـۆری بێـتو پەیوەندیـەكی بـە واقعـەوە نـەبێ، بـەڵكو بـو بـە ڕەوشـتێك كــە پــەیوەندیی بــە مومارەســەو پیـادەكردنی پراكتیكیــەوە هــەبێ، یــان بــە دەربڕینێكــی دیكــە بڵێــین پــەیوەندیی بــە مومارەســەی بەرهــەم هێنــان و خۆبەرهــەم هێنانـەوەی مرۆڤایەتیـەوە هـەبێ، لەمـەوە ئیـتر ڕەوشــەكە وانەمایــەوە كــە نهێنییــەكی لــە ئاشكرابوون نەهاتووبێ، چونكە سروشـت خۆشـی و لەمیانەی مرۆڤەوە و بە پرۆسەیەكی ڕەگكوتانی خۆیی و بەكاری بەكۆمەڵ دەبێ بە ڕۆشنبیری.

ئەوەشـی كـە پـەیوەندیی بـە بەشـداریەكەی فرۆیدەوە هەبێ لە ئاشكراكردن و ڕون كردنەوەی تــەمومژەكانی دەوری (سروشــتی مرۆیــی) دا ئەوەیـە كـە فرۆیـد جـەختی لەسـەر بـارودۆخ و كاریگەرییە دەرەكیەكان لە پێكـهاتنی تاكەكـەس و كەسێتیی تاكە كەس كردوە و ڕۆڵی ئـەناتۆمیی فیسیولۆژیشـی لـە دروسـت كردنـی كەسـێتیدا فەرامۆش نەكردوە. ئەمجا گرنگیەكی باشیشی بە مەرج و پرسە بایۆگرافیەكان داوە لە پێكـهێنانی كەسێتی مرۆڤدا، چونكـە مـرۆڤ لـە ڕوانگـەی فرۆیدەوە وەك پێكهاتەیەكی سایكۆلۆژی، لەكاتی لـەدایك بوونیـەوە دەسـتهاتێكی بـایۆلۆژی نیـە، بـەڵكو بەپێچەوانـەوە، كەسـێتیەكەی بـەپێی مـیراتی بـایۆلۆژی ڕەگ دەكوتێـت و لەمیانـەی پەیوەندیی نێوان (من – لە قۆناغی گەلاڵـەبونیدا)

و کەشی مرۆیی دەوروبەری خود و خێزانەوە پەرەدەسەنێت.

لێڤی شتراوس لە باسی رەوشی سروشت و رۆشنبریدا زۆر دوربوو لە خوێندنەوە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی مارکس و پرسە بایۆگرافیەکانی پێکهاتنی کەسێتی لای فرۆیدەوە. ئەمجا نە وەك خەسڵەتە ئەسنۆلۆژیەکەی و نە وەك ئەثنۆگراف و نەوەك ئەنترۆپۆلۆجییەك، نوێکەرەوەی ئەو بەشدارییە گرنگانەی ئەوان نەبوە، یان درێژەپێدەریان نەبووە، بۆیە نەیتوانیوە هەڵوێستی خۆی بە بەراورد لەگەڵ ئەواندا پیشان بدات. بەڵكو بەپێچەوانەوە، ئەم لە روانگەیەکی میکانیکی و میتافیزیکیی نوێوە سەیری پەیوەندیی نێوان سروشت و رۆشنبیری دەکات، بەکورتی، ئەم لەدابڕانی پەیوەندیی نێوان سروشت و رۆشنبیری دەکۆڵێتەوەو پەیوەندیە دیالەکتیکیە زیندوەکەی نێوانیان فەرامۆش دەکات. و بەڕوونی دەڵێت (هیچ شیکردنەوەیەکی واقعی نیە، بتوانێت بواری تێگەیشتن و هەست پێکردنی خاڵی وەرچەرخان لە واقعێکی سروشتیەوە بۆ واقعێکی رۆشنبیری ومیکانیزمی بەیەکەوە گرێدانیان تێبگات و هەست پێبکات.)

ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئەم خاڵە بۆخۆی ناوەندێکە لە نێوان کارە بەرهەمهێنەرە کۆمەڵایەتیەکەی کۆمەڵگاکانی لای مارکس و ژیانە سێکسی و سایکۆلۆژیەکەی تاکەکەسەکانی لای فرۆیدە.

ئەم تێڕوانینە، لیڤی شتراوسی بەرەو گەڕان بەدوای سەرچاوەی رێکخەر و پێکهێنەری چالاکیی مرۆڤ و مرۆڤایەتیدا برد، ئەوەتا دۆزییەوە (زمان) ە، چونکە کاتێك کە بڕیار دەدات بەبێ بەشداری کردنی (زمان) رۆشنبیری هەست پێناکرێ. ئەمە مانای وایە کە بەدوای شێوازێکدا بگەڕێین (بە دیهی) بێت. ئەو پرسیارەی کەفێجەر ولاس لێرەدا دەیپرسێ ئەوەیە ئەو دەستەواژە بەیەکەوە گرێدراوانەی کە بەشێوەیەکی بەکۆمەڵ بەرهەم هێنراون و ئەستونی زمان پێکدەهێنن لە کوێوە هاتوون؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا فێجەر ولاس سەرەتا هەموو بانگەشە غەریزەیی و راستەوخۆییە هاوبەشەکان (سروشتی کراو و ناسروشتی کراوەکان) وەلا دەنێت و لەلایەکی دیکەوە جەخت لەسەر ئەوەدەکات کە هەر مانایەك بدرێتە پاڵ هەرکردارێك یان وشەیەك چ لای مرۆڤ بێت، یان لای ئاژەڵ، ناکرێ لەبەرهەمهێنانی ئامرازە مادیەکانی ژیان جیابکرێتەوە، لێرەوە – بەڕاستی – ئەو – رەمزییەت – ەی کە نائومێدانە بیری لیڤی شتراوس و ئەوانی دیکەی قاڵ و گەرم کردوە لایەکی دابڕاو نابێ لە ئەو چالاکیە هۆشیاریەی کە پەیوەستە بە چالاکیی بەرهەمهێنانەوە.

خوێندنەوەی ئەم (رەمزیەت) ە ئەوەیە کە رۆڵێکی ناوەند لەنێوان بونەوەری زیندو و کەشە (دەوروبەرە) سروشتیەکەیدا دەگێڕێ. بەم (ناوەند) یەو لەمیانەیەوە (رەمزیەت) وەك گوزارەکردنێکی فیعلی چالاکیە واقیعیەکان گەلاڵە دەبێ.

گرنگی زمان بە هاوکوفیی لەگەڵ کاردا دەردەکەوێ، چونکە مرۆڤ بەهۆی کاری بەکۆمەڵەوە پەرەی سەندوەو (کار) بوە بە ناوەند لەنێوان مرۆڤ و سروشتدا و ئەمجا بوە بە داینەمۆی رۆشنبیری بە مانا فراوانەکەیەوە. فەرامۆش کردن و ئینکارکردنی ئەم واقیعە وای لە شتراوس کردوە کە بەدوای کۆمەڵە رەگەزێکی پێکهێنەردا بگەڕێت کە کەڵکی ئەوەیان هەبێ وەك بنەمایەك بۆ شیکردنەوەی ئەم پەیوەندیەی نێوان سروشت و رۆشنبیری بەکاربێن، ئەو بنەماو ئەو رەگەزانەش وەك ئیشارەتمان پێدا (زمان) ە.

بۆیە کاتێك کە لیڤی شتراوس ئەم راستیە بنەڕەتییانە فەرامۆش دەکات ئیتر ئەوە شتێکی

سەیرو سەرسوڕهێنەر نابێ کە بکەوێتە ناو داوی هەڵاواردن کردن لەنێوان سروشت وەك ئەوەی کە شتێکی گەردونی و خۆبەخۆیەو ڕۆشنبیری کە تایبەتیە و لەمیانەی نەریتەکانەوە گەڵاڵە دەبێ، لە پێودانگی ئەم دابەش کردنەوە شتراوس دەگاتە ئەو بڕیاردانەی کە حەرام کردنی پەیوەندی بەستنی سێکسی لەگەڵ خزمدا — Prohibition de Linceste تاکە واقعێکی مرۆییە کە گوزارە لە ئەو هەڵاواردنە بکات کە باسمان کرد.

نوسەر لەوەدا لەگەڵ شتراوسدا کۆکە کە ئەم دیاردەیە ئەوە دەهێنێت تۆژە هاوچەرخەکان ، بەتایبەتیش ئەنترۆپۆلۆجیەکان گرنگیی پێ بدەن، بەڵام لەهەمان کاتیشدا تەشەر لەو شێوازە دەگرێ کە شتراوس دەیەوێ لەڕێگەیەوە ئەم دیاردەیە بخاتە ناو چێوەی پەیوەندییەکانی نێوان سروشت و ڕۆشنبیرییەوە. و ئەگەر بیویستبا ئەم حەرامکردنی پەیوەندیی سێکسی و زەماوەندکردنی نێوان خزمانی بەشێو-یەکی جیاواز وەردەگرت.

بەهەرحاڵ، لێڤی شتراوس بڕیاردەدات کە حەرامکردنی پەیوەندیە سێکسیەکان و زەماوەندکردن لەگەڵ خزمدا لە شیکردنەوەیەك بەولاوە چیدیکە نیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەم حەرامکردنە نە بەتەواوی دەچێتە سەر رەچەڵەکێکی سروشتی و نە دەچێتەوە سەر بنەمایەکی ڕۆشنبیری، ئەمجا هەر ئەو حەرامکردنە ئەو ئاڕاستە سەرەکیەیە کە بەهۆیەوە و لەمیانەی ئەوەوە، وەرچەرخانەکە لە سروشتەوە بۆ ڕۆشنبیری رویداوە، واتە بەکورتی ئەو پرۆسەیەیە کە بەهۆیەوە سروشت خۆی تێدەپەڕێنێت و بونیادێکی نوێی ئاڵۆزتر دەخاتە سەر بونیادە سەتحیەکانی ژیانی دەرونی.

ئەم شیکردنەوەیە لێرەدا ئاڕاستەیەکی پێچەوانە وەردەگرێ، واتە هۆکارەکان بەدەرەنجامەکان شیدەکرێنەوە، ئەوەشی کە لیڤی شتراوس لەم گوتارەیدا جەختی لێکردوە بڕیار دەدات کە بۆئەوەی کۆمەڵگا نەبێ، هەر دەبێ پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ خزمە نزیکەکاندا حەرام بکرێ، ئەمجا ئەو دێت بەمەبەستە ناهوشیارانەکەی خۆی (واتە پەرەدان بە ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ) ئەم دیاردەیە لەڕێگەی شوێنەوارە دیارو بەرچاوەکانیەوە شیدەکاتەوە.

بێگومان ئەم کارەی لیڤی شتراوس کە نەزمی خزمایەتی وەك کرۆکی نەزمی گەردونی دادەنێ بەرەو دواوەو بۆ پاش دۆرکایم و پاش مۆرگان مان دەگەڕێنێتەوە، چونکە ئێمە دەبێ ئەو چالاکیە نەستیەی رەوانی مرۆڤایەتی کە ویستویەتی ڕۆشنبیری پێش سروشت و جیهانی کۆمەڵایەتی پێش جیهانی ئاژەڵی بخات، وەك ڕێبازێك بۆ شیکردنەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان وەربگرین.

### ئەو کۆمەڵگایانەی ناونراون "بەرایی"

نوسەر (مەبەست لە فۆجێر ولاسە) رەخنە لە شێوازی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە لەلایەن شتراوسەوە دەگرێ، گوایە بۆ ناساندنی ئەو گەلە نائەوروپیانە بەکاری هێناون کە بواری کاری ئەنترۆپۆلۆژین، ئەمە سەرباری ئەوەش کە شتراوس راست و رەوان دانی بە ورد نەبونی ئەم زاراوەیە و راست نەبونی ئەو رەخنانە داناوە کە ئاڕاستەی زاراوەکە کراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاتوە لە کۆتاییدا سەرباری ناوردیەکەشی وەك یەکەیەکی جێگیر لە شیکاریەکانیدا بەکاریهێناوە. لێرەدا نوسەر بۆ پتەوکردنی رەخنەکانی لە شتراوس چەند بەڵگەیەکی هێناوەتەوە، وەك:—

یەکەم:

چەمکی (بەرایی) بۆ پێناسەکردنی ئەو کۆمەڵگایانە بەکاردێت کە پێش کۆمەڵگاکانی

دیکە دەرکەوتون، یان زوو پەیدابوون، خەسڵەتی پێشینەیی و رەسەنایەتییان هەیە، ئەمەش خەسڵەتێکە کە لەگەڵ کۆمەڵگا بچوکەکانی دەوری دەریالوشەکان ئەمریکای هیندیەکاندا، کە بواری گرنگیپێدانی ئەنترۆپۆلۆژیی نوێن نایەتەوە، رەنگە ئەمەش ئەو هۆیە بێ کەشتراوس وەك پاشکەوتە نێگەتیڤیەکەی ناونانەکە پیشانمان دەدات و ئاگادارمان دەکاتەوە.


سۆسێر

دووەم:

بەکارهێنانی ئەم ناونانە بۆ ناساندنی گەلانێك کە لە کۆمەڵگا سەرمایەداریە رۆژئاواییە نوێیەکان جیاوازن، زیندوکردنەوەی دەمارگیرییەکەی (چەقبەندیی ئەوروپایە لە دەوری خۆی) و وروژاندنی ناکۆکیەکەی نێوان (جیهانی شارستانی) و جیهانەکەی دیکەیە.

سێیەم:

ئەو پارێزکاری و رەخنانەی کە لیڤی شتراوس لەسەر چەمکی گەلە بەراییەکان دایڕشتون، خەسڵەتێکی ناوەندیو رواڵەتیانەیان هەبوە، ئەگەر ئەو رەخنانە راستەقینە بوبان، ئەوا دەیانتوانی چەمکی زۆر ئیجابیانەو زانستیانە تر لەم چەمکە، وەك کۆمەڵگە تەقلیدیەکان، کۆموونەکان، یان ئەو کۆمەڵگا لادێییانەی کە پشت بە کشتوکاڵ دەبەستن، بەکاربهێن.

سەرباری ئەو تەحەفوزانەش کە هەیبون هێشتا شتراوس دەستی لە چەمکی (گەلە بەراییەکان) بەرنەداوە، لە راستیدا مێژوو دەچێتە پای سازدانی گوتاری "گەلە بەراییەکان" ەوە، ئەوەتا زۆربەی گەلە دەریالوشی و هیندیە ئەمریکیی و ئاسیایی و ئەفریقیەکان کە لەلایەن ئەنترۆپۆلۆژیستە رۆژئاواییەکانەوە "بەرایی" یان پێ دەگوترێ نەیانتوانیوە لە بەرامبەر داگیرکەرە ئەوروپیەکان، یان بە رەچەڵەك ئەوروپیەکاندا پارێزگاری لە مۆرکە ئابوریە کۆمەڵایەتیە رۆشنبیریە دێرینەکەی خۆیان بکەن. و نەشیان ویستوە بەزۆرە ملێیی و لەژێر فشاری کۆمەڵگە ئەوروپیەکان، واتە سەرمایەداریە نوێیەکاندا بچنە پرۆسەی پوکانەوەی خۆیانەوە.

لەبری ئەوەی کە ئەنترۆپۆلۆژیستەکان ئەو باری دواکەوتنە هەست پێبکەن کە لە ئەنجامی داگیرکردنی بێگانەوە بەسەر ئەم گەلانەدا سەپێنراوە، دێن دەست لەو خەونە بەرنادەن کە (بەرەبەیان) و (ئسوڵیەت) ی مرۆڤایەتی بدۆزنەوە، بەڵام دیارە ئەم کۆمەڵگایانە ئەو (بارە، یان، توێژ) ەیان لەدەست داوە کە ئەنترۆپۆلۆژیستەکان ئومێدیان بوو لە رێگەی زاڵ بوون و فراوانخوازیی ئیمپریالیستەکانەوە بیدۆزنەوە هەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و گەشتنی سەرمایەداری ئەوروپی بەقۆناغی ئیمپریالیستی. ئەم ئیمپریالیزمە کەوتە تاڵانکردنی وڵاتانی ئەم کیشوەرانەو سەرمایە مادی و مرۆییەکانیان. بۆیە تاوانی ئەوباری دواکەوتنەی کە سەپێنراوە بەسەریاندا دەکەوێتە ئەستۆی وڵاتانی سەرمایەداریی رۆژئاواو وڵاتە یەککرتوەکانی ئەمریکاوە.

هەرچەندە کە لیڤی شتراوس دەیتوانی پەی بەو پرۆسە مێژووییە بەرێ کە بە هۆیەوە ئەو گەلانە بە هەرەشەی تاڵان و وێران کردنی ئابوری و رۆشنبیری و هەوارە سروشتیەکەیان کەوتن، بەڵام نەهاتوەتە ئەو ئاستەی کە دەرەنجامە لۆژیکیەکانی ئەم پرۆسەیە لە واقعەکە هەڵێنجێت و ئەوە پیشان بدات کە لەسەر هەموو ئەم گۆی

زەویەدا گەلانی (بەرایی) نەماونەتەوە، چونکە کۆلۆنیالیستی و بەتایبەتیش ئیمپریالیزم پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکانی ئەم گەلانەی سەرکوتکردوە و شێواندوە و بگرە هەندێکیشیانی بە زەبری چەك و توند و تیژی قەڵاچۆ کردوە، لەوەولاتریش ئەو گەلانەی بەشێوەیەك هەڵگەڕاندۆتەوە کە وەڵام بە میکانیزمی ئابوری سەرمایەداری وڵاتانی میتۆپۆلیتانی بدەنەوەو بەدەر لە پەرەسەندنی ئازادی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیان شێوازێکی دیکەی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی بەسەردا سەپاندوون.

لەم ڕووەوە لیڤی شتراوس ئەوە دەخاتە بەر سەنج کە ئەو کۆمەڵگایانەی ئێستا ناو نراون (دواکەوتوو) دواکەوتن چارەنوسی مسۆگەریان نەبوە، یان بەشێوەیەکی ئەندامی پەیوەندی بەباری پێشکەوتنیانەوە هەبوە، بۆیە هەڵە دەبێ ئەگەر بەجیا لە پێشکەوتنی ڕۆژئاوا سەیری ئەو دواکەوتنە بکەین، چونکە تێکشکاندنی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی ئەم کۆمەڵگایانە لەسەدەکانی شانزەو حەڤدەدا هەلی پێشکەوتنی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانی ڕەخساندوە.

سەرباری ئەم سەرنجدانەش کە نوسەر لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا کۆکە، لیڤی شتراوس باسەکەی بە ئاڕاستەی دروستی خۆیدا نەبردوە، بۆئەوەی شتێکی دیکە لە (گەلەبەراییەکان) ببینێت.

نوسەر لە ڕەخنەگرتن لەم لۆژیکەوە دەگاتە دۆزینەوەو ئاشکراکردنی مۆرکی ئەوەی کە پێی دەوترێ زانستی ئەتنۆلۆژی، کە دوو پێشەکیی هەیە و پشتیان پێ دەبەستێ، ئەو دوو پێشەکییە لەبەردەم شیکردنەوەی زانستیدا خۆیان ڕاناگرن، ئەتنۆلۆژیاکەی لیڤی شتراوسیش لەم یاسایە بەدەرنییە. چونکە لەلایەکەوە پشت بەچەند گروپێکی وردی دانیشتوان و چەند کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو دەبەستێ کە کۆمەڵە مەرجێکی ناڕەواو لەرزۆکیان تێدایەو دەشڵێ کە ئەوە بەدوای (مرۆڤایەتیە ڕەسەنەکە) دا دەگەڕێ، یان ئەو مرۆڤایەتیەی کە نۆبەرەی کەوتنە بەرباسی لەم توێژینەوەی ئەودا بوە، هەڵە گەورەکە لێرەدا ئەوەیە کە ئەو (پاشماوانە) وەك (بەرایی) وەربگرێ. ئەمەش وادەکات کە دواکەوتنی ئەم بەشەی گەلان بلکێنێت بە شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتییانەوە، بەڵام خۆی لە ڕاستیدا تەنها دیاردەیەکە بەهۆی هێزە دەرەکیە دوور، یان نزیکەکانەوە هاتۆتە ئاراوە بەسەریاندا سەپێنراوە.

لەلایەکی دیکەوە هەرهەمان ئەم ئەتنۆلۆژیە کە ناویان لێناوە ئەنترۆپۆلۆژی، خۆی وادادەنێ گوایە بە بابەتێکی تایبەتی لە زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیەکان جیانابێتەوە بەڵکو لەڕووی بۆچونیەوە بۆ دیاردە کۆمەڵایەتیەکان لەوان جیا دەبێتەوە. چونکە ئەم لە ناو هەموو کۆمەڵگە بەرقەرارەکاندا بەدوای ئەو شتانەدا دەگەڕێ کە تەقلیدی و دێرین و ڕەسەن خۆیانی پیشان دەدەن و لە هەوڵی ئەوەشدا پێچ لێبدات و پوشی هێلانەکردنی بابەتی توێژینەوەکەی خۆی بباتە ناو هەندێك لە گەلانەوە. بۆیە ئەنترۆپۆلۆژیا لە چێوەی حوکمەکانیدا دەچێتەوە ڕیزی ئەو پێشەنگانەی خۆی کە لە ئەفسانەی بەراییە چاکەکە (البدائی الحسن – Bon Sauvage) دا هاتوون.

لە بەرامبەر ئەم گرفتە ئەبستمۆلۆژی و ڕێبازیانەدا لیڤی شتراوس هەوڵ دەدات دەست لەسەر تاکە پرەنسیپێك، یان تاکە هێمایەك، یان ئەگەر بمانەوێ وردتربین دەڵێین سیستمێکی یەکگرتوی کۆمەڵێك هێمادا بێ کە خۆی ناوی ناوە (بیرکردنەوەی کێوییانە Le pensee sauvage) ئەم هەوڵەش لەلای شتراوس وەڵام بە دوو پێویستیی سەرەکی دەداتەوە، گەر بەدوای بنکەیەکدا بۆ چەقبەستنی واقعی کۆمەڵایەتی وەك کۆمەڵێك گۆڕانکاریی بزوێنەری

سیستەمەکان کە گرنگترین و زانستی ترینیان پرۆسەی سیستمی خزمایەتییە، هەروەها گەڕان بەدوای بنکەیەکدا بۆ یەکخستنی ڕەگەزی مرۆیی لەمیانەی جوراو جۆریی کەلتووریانەوە.

لەمڕووەوە لیڤی شتراوس خۆی لەو باسە نادات کە لیڤی پرۆڵ سەبارەت بە عەقڵیەتی لۆژیکی و پێش لۆژیکی پێی گەیشتووە، کە لۆژیکییەکەیان پەیوەندی بەشارستانیەکانەوە هەیەو لەلایەن پرۆسەی ناتەباییەوە بەڕێوەدەچێ و ئەوی دیکەشیان تایبەتە بە ناشارستانیەکانەوە (بەراییەکان) و لەسەر پرەنسیپی (بەشداری) یە بەڵکو ڕەخنەش لەم بۆچوونەی لیڤی پرۆڵ دەگرێت و بەپێچەوانەی ئەوەوە دەڵێ بیرکردنەوەی کێوییانە، یان بەرایی لە ڕێگەی لۆژیك و عەقڵەوە دێ ، نەك لە ڕێگەی هەست و سۆزەوە، پشت بەهەڵاواردن و نەیاریش دەبەستێ، نەك نزیك کەوتنەوەو بەشداریکردنی یەکدی، و دەگاتە ئەوەی کە هەڵاواردنێکیش لەنێوان دوو نمونەی بیرکردنەوەی زانستی، یان دوو ئاستی ستراتیژیی بیرکردنەوەی زانستیدا بکات، لەوەدا کە سروشت وەك بابەتێك خۆی دەداتە دەست ئەبستمۆلۆژیای زانستی.

نوسەر لێرەدا دەگاتە ئەو ئاستەی کە وەك دوو ئایدۆلۆژیا پێناسەی ئەم دوو شێوازە بیرکردنەوەی زانستی بکات، و وا دادەنێ کە لەبەرئەوەی لیڤی شتراوس هەست کردنی مادیانەی ژیانی کۆمەڵایەتیی لە بازنەی بیرکردنەوەی خۆی دوورخستۆتەوە، کەواتە حوکمی بەسەر خۆیدا داوە کە هەمیشە بکەوێتە پای دووفاقیەکی بێکۆتاییەوەو ئەمەش تەنها تەمومژێك لە دەوری چەمکەکانی گرد دەکاتەوە و هیچی دی، وەك (سروشت و ڕۆشنبیری) (بەرایی و شاری) (بیرکردنەوەی نوێ و بیرکردنەوەی کێوییانە) کە ئەمانە هەموو کۆمەڵە دابەش کردنێکن، نەك هەر دیالێکتیکی نین، بەڵکو دژی دیالێکتیکیشن. بۆیە ئەمانە داهێنانی شەخشی نین، بەڵکو گوزارە کردنن لە قەیران و ئاوابونی هەتاوی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوایی لە قۆناغی ئیمپریالیستیدا.

### ئەنترۆپۆلۆژیای بونیادگەری و زانستە کۆمەڵایەتیەکان.

خەون و خواستی سەرەکیی لیڤی شتراوس لە دامەزراندنی ئەبستمۆلۆژیایەکی کۆگیری مرۆڤ و کۆمەڵگەدایە، ئەبستمۆلۆژیایەك کە دەیەوێ زانستی بێ، تاوتوێ کردنی سیستمی خزمایەتی و کۆمەڵگە بەراییەکان و بیرکردنەوەی کێویش لە چەند وێستگەیەکی هەولی دامەزراندنی ئەو مەعریفەیە بەولاوە چیدیکە نەبون. ئەم خەون و خواستەش ڕەوان، بەڵام پرسیار لەوەدایە کە ئایا لیڤی شتراوس لە ئاستێکی تیۆری و ڕێبازیی وادایە کە بتوانێت ئەو ئامانجەی بپێکێت؟

ماوەی زەمەنیی پێکانی ئەو مەبەست و ئامانجە بە سێ وێستگە، یان سێ لق دەبێ کە هەرسێکیان لەناوخۆیاندا یەکتری تەواودەکەن، ئەوانیش ئەتنۆلۆژیا و ئەتنۆگرافیاو ئەنترۆپۆلۆژیان. ئەم سێ ساتەش لە کۆتایدا (پێکهاتە) کە دەخەملێنن، واتە پێکهاتەی شمولیی ئەو ئەبستمۆلۆژیایەی کە مەبەستە. ئەوەی دواییشیان (واتە ئەنترۆپۆلۆژیاکە) وەك ئەوەی شتراوس تەرحی دەکات هەردووانەکەی دیکەی تێدایە.

لەڕاستیشدا ئەم هەولە، واتە هەولی دامەزراندنی زانستێکی کۆگیری مرۆڤ و کۆمەڵگە شتێکی نوێ نیە، بەڵکو پێش ئەوەش هەر لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەو لەگەڵ باڵادەست بونی بۆرژوازیی ئەورووپیدا هەولی دیکەی زۆری لەو بابەتە هەبوون، لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەشدا فەرهەنگیە مەوسوعییەکان هەولیان دا ئەتنۆگرافیای تەقلیدی لە ئاین و میتافیزیکیا

دابڕن، بۆئەوەی تەواوی ئەبستمۆلۆژیای بابەتی گەڵاڵەبکەن و دابڕێژن. (دیدرۆ و رۆسۆ و کانت و سان سیمۆن) یش هەمان هەوڵیان هەبوو لەگەڵ دورکایم ی دامەزرێنەری قوتابخانەی کۆمەڵناسی فەرەنسی کە هەوڵیدا دیاردە مرۆییەکان لەمیانەی یەکخستن و سازدانی لقە عەقڵانیە جۆراو جۆرەکانی لەژێر ناوی (کۆمەڵ) دا یەکخات. بەڵام هەوڵەکانی هەموو ئەمانە بەرسەنگی لایەنگرییە تیۆری‌و ئایدیۆلۆژیەکان کەوتن، بۆیە سەرکەوتو نەبون. بەڵام لە پرۆسەی دامەزراندنی (زانستێکی بەرفراوانی مرۆڤ) دا نوسەر بە پلەی یەکەم مارکس بەسەرکەوتو دەزانێ و فرۆیدیش هەندێك لەو کەمتر. لە پاش ئەوانیشەوە ئەکادیمیستەکانمان نزیکەی سەدساڵ (وەك نوسەر دەڵێ) بە دەست یاسای زەینیی دابەشکردنی کارەوە کە وەڵام بە پێویستی و بەرژەوەندیەکانی چین بەرقەرار دەداتەوە ناڵاندویانە.

لیڤی شتراوس لەوێوە دەست پێدەکات کە بڕیاردەدات، هەتا ئێستا زانستی کۆمەڵناسی نەیتوانیوە زانستی زانستە کۆمەلایەتیەکان، یان نمونەیەك لەوە Corpus یان زانستێکی کۆگیری زانستە کۆمەڵایەتیەکان بێ، وەك ئەوەی کە پێشەنگ و دامەزرێنەرانی خەونیان پێوە دەبینی.

بێگومان نوسەر سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەم دەرەئەنجامە لەگەڵ شتراوسدا رێکە، بەڵام لە دیاریکردنی هۆکارەکانیدا لەگەڵیدا نایەتەوە، چونکە نوسەر پێی وایە کە ئەگەر زانستی کۆمەڵناسی نەیتوانیبێت لەسەر دەستی کۆنت و سپێنسەر و دۆرکایم و پارسۆنز و ریمۆن ئارۆندا ئەو ئەرکە ئەنجام بدات، لەبەرئەوە بوە کە هێشتا هەر شتێکی ئایدۆلۆژی بوە، واتە چەند خەملاندنێکی عەقڵانیی ژیانی کۆمەڵایەتی بوەو لە رازەی بەرژەوەندیەکانی چینە باڵادەستەکاندا بووە.

ئەگەر دورکایم هەوڵی دابێ لەمیانەی یەکخستنی سیستمە مەعریفیە جۆراوجۆرەکانەوەو لە رێگەی کۆمەڵگەوە زانستێکی فراوان بۆ لێکۆڵینەوەی مرۆڤ و کۆمەڵگە بێنێتە کایەوە، ئەوا لیڤی شتراوس سەرمەستی زانستی زمانەوانی بوو، و بەلای ئەوەوە دەکرێ ئەم زانستە بە ناوکی سەرەکیی پەرەپێدانی زانستێکی فراوانی سەبارەت مرۆڤ و کۆمەڵگە دابنرێ. زانستی زمانەوانیش رەهابوونە مەزنەکەی خۆیی لەسەر دەستی دی سۆسۆربینی، ئەو توانی ئەو زانستە لە پەیوەستەکانی نێوان هێما و هێما بۆکراو دەرباز بکات و پەیوەندی هێماکان تەنها بە پەیوەندیی‌یەکی ناوخۆیی لەگەل هێما بۆکراوەکاندا بهێڵێتەوە.

ئەگەرچی لیڤی شتراوس رەملی بۆ فۆنۆلۆژیا Phonologie لێدابوو کە دەتوانێ رۆڵێکی وەك رۆڵی فیزیای ئەتۆمی لەناو زانستە سروشتیەکاندا لەسەر ئاستی بەلگە و هێما کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان ببینێت. فۆنۆلۆژیا توێژینەوەی زمان لەسەر ئاستی بەلگەو هێماو کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی ناکات، بەڵکو لە گۆشەی ئەو پەیوەندیە ناوەکیانەوە وەری دەگرێ کە فۆنیمەکان بەیەکەوە گرێ دەدات. و تەنها لەم چێوەیەدا، واتە لە چێوەی دورخستنەوەی ناوەڕۆکی هێما بۆکراوەکان بەهۆی رێکخستنی تایبەتیی دەنگەکانەوە، ئەم زانستە توانیویەتی پێشکەوتنێکی بەرچاو بەرەوپێش بچێت و لەو پێشکەوتنەش بەشی هەموو زانستە کۆمەڵایەتیەکان لەم بارەی ئێستایاندا بدات و شایانی ئەوە بووە کە نازناوی (زانست) ی پێ بدرێ، بەڵام ئەو پرسیارەی کە لێرەدا قوت دەبێتەوە ئەوەیە کە ئایا بەچ مانایەك ئەم

بەشەی توێژینەوە زمانەوانیەکان نازناوی زانستی وەرگرتووە؟ نهێنی وەڵامی ئەم پرسیارە لەوەدایە کەزانستی فۆنۆلۆژیا وەك زانستێکی سروشتی شایانی ئەو نازناوە بوە نەك وەك زانستێکی کۆمەڵایەتی. گەواهیی ئەمەش ئەو پێشکەوتنەیە کە دەیان ساڵە لە ڕێگەی بیستن و بینینەوە لە فێربوونی زمانە بێگانەکاندا هاتۆتە کایە، کەسیش ناتوانێت گومان لەو پێشکەوتنە نوێیەی زمانەوانی و کەڵکە قەبەکانی ئەو پێشکەوتنە بکات، لێرەدا نوسەر پرسیارێکی تەوەرەیی دەوروژێنێ، ئەویش ئەوەی کە ئایا ئەوە ڕەوایە بۆ بەرپاکردنی پێشکەوتنێکی شێوە یەکلاکەرەوە لە بواری زانستی مرۆڤناسیدا پشت بە فۆنۆلۆژیا ببەستین؟

لە وەڵامی ئەم پریسیارەدا لیڤی شتراوس بە پشت بەستن بە وتارێکی تروبتزکیی کە لە ساڵی 1933 دا نوسراوە چوار تەوەری سەرەکی بۆ زانستی فۆنۆلۆژیا دیاری دەکات کە بە ڕای خۆی ئەم چوار تەوەرە دەتوانن مۆرکێکی ڕەهای پێبدەن و کەڵکی ئەنجامدانی ئەو ئەرکە، واتە دامەزراندنی زانستێکی کۆگیری مرۆڤناسی دەخۆن، ئەو تەوەرانەش ئەمانەن:–

1) فۆنۆلۆژیا بە تۆژینەوەیی دیاردە زمانەوانیە هەستیەکان دەست پێدەکاتە و بە توێژینەوەی بنەما نەستیەکانی کۆتایی پێ دێ.

2) چارەسەرکردنی چەمك و زاراوەکان وەك یەکەی سەربەخۆ، ڕەتدەکاتەوە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوەوە هەر ئەو دەبێتە خاڵی دەستپێك لە تاوتوێکردنی پەیوەندیەکانی نێوان چەمکەکاندا.

3) چەمکی ڕژێم – سیستم – Systeme بەکاردەهێنێت.

4) چ بە ڕێگەی دەرەنجام بێ، یان بەخوێندنەوەی لۆرژیکیانە، ئەو بەدوای ئاشکراکردن و دۆزینەوەی یاسای گشتیدا دەگەڕێ.

5) ئەمەش مانای وایە (بەلای نوسەرەوە) کە گەلانی پێش مێژوو لەنێوان دەنگە زۆر و جۆراوجۆرەکان و پەیوەندیە ناکۆتاییەکانیدا چەند دەنگێك و چەند شێوازێکی ڕێکخستنی ئەم دەنگانەیان هێشتۆتەوە، ئەوانەش کە هێشتنیانەوە بونە ڕەچەڵەکی ئەم زمانانەی کە ئەمرۆ قسەیان پێدەکرێ. یان لە ڕۆژێکدا ئامرازێکی گفتوگۆکردن بوون. لێرەدا ئەو هۆکارانە ون دەبن کە لە پێناویاندا ئەم پەیوەست و دەنگانە مانەوەی خۆیانیان پاراستوە و هەتا هەتایە تێگەیشتن لەو هۆکارانە فەراهەم نابێ.

لێرەدا نوسەر دەگەڕێتەوە بۆلای مارکس، چونکە مارکس پێش ماوەیەکی دوور تێبینی مۆرکە نەستیەکەی ژێرخانی کۆمەڵگەو مۆرکە هەستیە شێواو و پێچەوانە بوەوەکەی پرۆسە دامەزراوەیی و ئایدۆلۆژیەکانی سەرخانی کردبوو خستبونیە بەراوردی مۆرکە نەستی و هەستیەکانی دیاردە زمانەوانیەکانی دیدگای لیڤی شتراوسەوە.

لیڤی شتراوس لەوەدا بە ئامانجی خۆی دەگات کە بونیاد و سیستم و یاسا گشتیەکان بونیاد بنێ، ئەمەش لەبەرئەوەی کە زمانەوانی وای لێهاتووە لەسەرکەوتنەکەیدا قەرزاری فۆنۆلۆژیایە، بوە بە بونیادگەری. ئەنترۆپۆلۆژیاش پێویستە بونیادگەری بێ، بۆئەوەی ببێ بە زانست.

لێرەدا نوسەر ئەو مەرزانە دەست نیشان دەکات کە هەوڵەکانی هەریەکە لە مارکس و فرۆید و لیڤی شتراوس لە یەکتری جیادەکاتەوە. مەرزەکانیش لەوەدا حەشاردراون کە هەریەکە لە دامەزرێنەری مەتریالیستی مێژویی و قوتابخانەی شیکاریی دەرونی بەشێوازی خۆی

یەکلاکردنەوەی چەمکی سروشتی مرۆییان رەتکردۆتەوەو رەخنەیان لێگرتووە، بەلام لیڤی شتراوس هەر پەیوەست بوە پێوەی. دیارە ئەویش بۆیە ئەمەی کردوە، تەنها لەبەرئەوەی پەیوەست بوە بە ئایدۆلۆژیای باوی سەردەمی خۆیەوە.

پێویستە هەولی دامەزراندنی زانستێکی کۆگیری کۆمەل و مرۆڤناسی لە دورەپەرێز خستنی ئەم پەرتبونەی ئێستای ئەبستمۆلۆژیای کۆمەلایەتیەوە دەست پێبکات کە ناهێلێت یاسا گشتیەکانی زانست Corpus دابمەزرێن و گرفت بە هەند وەربگیرێ کە مارکس و هەندێکیش فرۆید خۆیان لێداوە و سروشت و یاسا بنەرەتیە کاریگەرەکانی بزوتنەوەی بەرهەمهێنان لە کۆمەلگە نوێیەکاندا بدۆزرێتەوە.

## بونیاد – سیستم – نمونە.

لێرەوە چەمکی (بونیاد) لە دیدگای لیڤی شتراوسەوە لە چەمکی (هەمویی) وەزیفیەکان دەگۆرێ و ئەم ئەو لایەنە تایبەتیەی (هەمویی) وەردەگرێ کە تیایدا پەیوەست بونی لایەنە تێکهەلکێش بووەکان، بەیەکەوە پێویستەو ئەمجا هەمو یەکەیەکی کۆمەلایەتی چەند (بونیاد) و سیستمێك ی تێدایە و لە کتێبی (خەمە ئیستیواییەکان) دا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە داب ونەریتەکانی هەر گەلێك هەمیشە مۆرك و شێوازێکی تایبەتیان هەیە کە (سیستم) ێك پێك دێنێت.

نوسەر پلاری ئەوە لە شتراوس و ئەنترۆپۆلۆژیای بونیادگەری ناگرێ، کە هەر یەکەیان بابەتێکی دیاریکراو بۆ خۆی دەستنیشان بکات و هەولی دۆزینەوەی یاساکانی بدات، چونکە ئەوە خواست و خەونی هەر زانستێکە، بەلکو پلاری ئەوە لە ئەنترۆپۆلۆژی بونیادگەری دەگرێ کە مومارەسەیەکی زمانەوانیەو، بواری شیکاری و بەرهەم هێنانی کاری کۆمەلایەتی نیە.

ناکرێ رۆلی زمان فەرامۆش بکرێ، هەروەها رۆلی رەمزیەتیش زۆر گرنگە، چونکە زۆربەی چالاکیە مرۆییەکان پەردەپۆش دەکات، بەلام ئەو گرفتەی لێرەدا خۆیمان لێ قوت دەکاتەوە ئەوەیە کە ئایا پێویستە دیاردە کۆمەلایەتیەکان لەسەر بنەمای خودی مومارەسە کۆمەلایەتیە بەرهەم هێنەکە تاوتوێ بکەین کە مرۆڤ بەو مومارەسانە و لە پرۆسەیەکی گرێچندا ئامرازەکانی ژیان و بونی خۆی وەك بونەوەرێکی کۆمەلایەتی بەرهەم دەهێنێت؟ یان پێویستە (وەك ئەوەی کە بونیادگەری دەخوازێ) هەر لە مومارەسە زمانەوانیە بەرقەرارەکەوە بکەوینە تاوتوێ کردنی ئەو دیاردانە؟

کارەکانی شتراوسیش وەك کارەکانی واسبەر و دۆرکایم ی هاوشێوەی خۆی جەخت لەسەر (دامەزراوەکان، خزمایەتی، سیستمی زمان، سیستمی داب) دەکات کەچی خۆی لە راستیدا ئەمانە هەموو چەند شکلێکی جۆراوجۆری یەك بنەمای مادین کە ئەو بریاردەری مانەوەو وەرچەرخانیانە.

بەلام دەزانین کە لیڤی شتراوس پشت بە گیانی نەستیی مرۆڤ، یان سیستمە نەستیەکانی گیانی دەبەستێ کە خۆیان لە پشتی پەیوەندیە بونیادگەریەکانەوە حەشار دەدەن و لە پێشەنگی رەوتی درێژەدان بە ژیانی کۆمەلایەتیدان.

بەرای نوسەر مەسەلە سەرەکیەکە سەبارەت بە رەملێدانە زەینیە کۆمەلایەتیەکان لە ئاستی پەیوەندیی نێوان هەست و نەستدا نیە، بەلکو مەسەلەی سەرەکی پەیوەندیەکانی نێوان ئەم رەملێدانەو دامەزراوەکانی و شێوازی پەیوەندیە کۆمەلایەتیە بەرقەرارەکانەسەبارەت بە مارکسیزم، تێروانینەکەی ئەمیش بۆ ئادیۆلۆژیا بواری تێگەیشتن لە شێوازی خستنە گەری ئەم پەیوەندیانە دەدات و بێگومان، دەیبەستێ بە خەملاندنە عەقلیە شێواو و هەلگەراوەکانی

کلاسیکی ببڕی.

لە پشت ئەم تێبینیانەشەوە دەستەواژە ناودارەکەی بونیادگەری هەیە سەبارەت بە، مومارەسەو کۆك بونی بونیادی بیرکردنەوەی مرۆیی و بابەتی بیرکردنەوە کە وادیارە ئەم گوتارە لە سیستمی شتراوسدا زۆر گرنگە، چونکە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە (داهێنانی) بونیاد بەهۆی ئەنترۆپۆلۆژیاوە لە راستیدا دۆزینەوەیەك، داهێنانێك بوە. هەروەها دەڵێ کە بونیاد لە قۆناغی یەکەمیدا بەشێوەی ئەبستراکت لە رێگەی رەوانی تۆژەرەوە دێ و پاش ئەوە دەکەوێتە پێکهێنان و گەڵاڵەکردنی ئەو بابەتەی کە لەرێگەی ئەنتۆگرافیاوە پێشکەشی دەکرێ. بەڵام لەکاتێکی دیکەی پاشتردا کە شەرعیەتی ئەم بونیادە وەك سیستمێکی بابەتی جێگیر دەبێ و توانای وەرگێڕانە سەر زمانەکانی دیکە پەیدا دەکات، ئەوکاتە دەتوانین دڵنیا بین کە ئەم (بونیاد)ە پەیوەستە بەخودی تۆژەرەوە و پەیوەستیشە بە بابەتەوە.

لێرەدا نوسەر دەگاتە ناو کرۆکی فەلسەفەی شتراوس. و بەتایبەتیش سەبارەت بەم رەوشە روبەروبونەوەیەکی مێژوویی درێژ هەیە و مەتریالیزمی مێژووییش ئەگەر وەك نوسەر دەڵێ بەتایبەتی مەتریالزمی مێژوویی ئەگەر یەکلایی شی نەکردبێتەوە، ئەوا رۆڵێکی گرنگی تیادا گێڕاوە، ئەویش روبەڕوبونەوەی نێوان مەتریالیزم و ئایدیالیزمە. بەهەرحاڵ نوسەر لێرەدا لیڤی شتراوس و ئەنترۆپۆلۆژیای شتراوسی لە سەر ئاستی سۆسیۆلۆژی و مێژوویی لە خانەی ئایدیالیستی هاوچەرخدا دادەنێ.

ئەمجا دەچێ بەراوردێك لەنێوان بەکارهێنانی چەمکی (بونیاد) و (سیستم) ی مارکس و سەرمایەدارییە بە هەموو ئەو پەیوەندیانەوەی کە بەلایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیەوەی دەبەستنەوە. سیستم لەلای مارکس واتە پەیوەندیە ئەندامیە دیالێکتیکیەکەی نێوان ژێرخانی مادی و سەرخانی ئایدۆلۆژی، بەڵام کرۆك و ناوەڕۆکی ئەم سیستمە سەرەکیە و سیستمە لاوەکیەکانیش، ناکۆکی نێوان رەگەزە پێکهێنەرەکانیەتی. بۆ نمونە کارکردن پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتیی نێوان چینی کرێکارو چینی بۆرژوایە، و لەناوەڕۆکەوە ناکۆکن. هەموو ئەو توێژە کۆگیریانەش کە مارکس بەکاری هێناون، چ بیناو چ سیستم ناوەڕۆکەکەیان ناکۆکیە.

بەڵام بەکارهێنانەکەی شتراوس بۆ هەمان ئەم چەمکانە (واتە بونیاد و سیستم) بەپێی رێسایەکە کە هیچ ناکۆکیی ناوخۆیی تێدا نیە، لەبەرئەم هۆیەش ناتوانێت تێگەیشتنێکی روونمان لەسەر ئەو سەیرورەیە پێبدات کە وەستانی بۆ نیەو هەموو کۆمەڵگەکان تۆپن دەچنە گۆڵەکەی ئەوەوە.

### ئەفسانەو ژیانی کۆمەڵایەتی.

لە ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکاندا لیڤی شتراوس بەشێکی زۆری هەوڵەکانی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەفسانەی کۆمەڵگە (بەرایییەکان) تەرخانکردبوو، ئەم بابەتەشی لە چوار بەشی تایبەت بە ئەفسانەکانی ئەم گەلانە، بەتایبەتیش هیندیە ئەمریکیەکان تاوتوێ و چارەسەر کردبوو.

لێرەدا نوسەر هەندێك پارێز لە رەوشی زمانی گێڕانەوەو تاوتوێ کردنی ئەم ئەفسانانە دەکەن، و دەپرسێ ئایا بەڕاستی دەکرێ هێندە بە زمانی ئەو کۆمەڵگایانە ئاشنابی کە لە شەپۆلدانی

وشەکان و هزرەکان و ئەو گەمەی ئاخاوتنە تێبگەی کە ئەفسانەکەی لەسەر بونیاد دەنرێ؟ خۆ ئەگەر زاڵ بون بەسەر قورسیی زمانەکەدا شتێکی ئاسان بێ، ئەوا قورسیەکی دیکە هەیە زاڵ بون بەسەریدا ئاسان نیە، بەتایبەتیش لە ئەفریقادا کە مەعریفەی ئەدەبی کورتی هێناوە و هەڵهێنان و خوێندنەوەی هێماکانی ئەفسانەکان چەند کەسێکی کەم دەیزانن کە ئەوانیش لەنێوان خۆیاندا سیستم و ناوەندێکی داخراویان پێکهێناوە.

بەڵام ئەم باری سەرنجانە پەیوەندییان بە ناوەڕۆکی هزری سەرەکیی شتراوسەوە نیە لە خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی ئەفسانەکان دا، با ئەوەش لەولاوە بوەستێ کە شتراوس خۆشی هەستی بەو کێشانە کردووەو بگرە بەروونیش باسی کردوون. بیرۆکەی سەرەکی بەلای ئەوەوە ئەوەیە کە دەلالەتی ئەفسانە لە پەیوەندی نێوان ناوەڕۆکی بابەتەکانی ناوی و ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیەی لە پشتیەوە رادەوەستێت دەست نیشان ناکرێ، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەوەوە دەلالەتەکە لە ریزبەندیەکی ناوەکیدایە کە بوونی سیستمێك دەردەخات. بۆیە دەبێت کەسی ئەتنۆلۆگ لە سیستمی خزمایەتی و سیستمی ئابووری کۆمەڵگەدا بەدوای ئەو شتەدا بگەڕێ کە لە گەڵێك دا کۆك دێتەوە، چونکە ئەفسانە لەو مەدلولە کۆمەڵایەتیە دابڕاوە کە ئاماژەی بۆدەکات.

فۆجێر ولاس لە تێڕوانینی خۆیەوە بۆ ئەفسانە، رەخنە لەم تێڕوانینە دەگرێ. بەلای ولاسەوە ئەفسانە بەشێکە لە ئایدۆلۆژیای کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداری، لەم رووەوە هەموو ئەفسانەکان لە شیکردنەوەی جیهان و رەچەڵەکی بوون دا بەیەك دەگەن.

جگە لەوە ئەفسانەکان گوزارە لێکردنێکی پێچەوانەو شێوای ژیانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوەو پەیوەندیی مرۆڤ بە مرۆڤەوەیە لەچوارچێوەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا. ئەرکەکانی ئەفسانەش کورت دەبێتەوە بۆ پاراستنی سیستمی کۆمەڵایەتی و رەوایەتی بەخشین بە پەیوەندیەکانی دەسەڵات لە ناو کۆمەڵگەدا کورت دەبێتەوە. هەرتاو توێکردنێکی مێژوویی کۆمەڵایەتی ئەفسانە پێویستە لە پەیوەندیەکی دیالەکتیکی دا لەگەڵ پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان دا بخوێنرێتەوە، نەك لە پەیوەندییەکی میکانیکیانەی رووکەش دا.

هەروەها شتراوس باسی چەمکی ئەفسانەی لای فرۆید کردووە، بە رای ئەو ئەفسانە لای فرۆید بەشێوەیەکی پێچەوانە و شێواو گوزارە لە ژیانی سێکسی تاکە کەسەکان دەکات، بەمانای ئەو پرۆسەیەی کە لە رێگەیەوە کەسێتی تاکەکانی فۆرمەلە دەبێ، بیرکردنەوەی ئەفسانەییش روونی دەکاتەوە کە دەکرێ بەهۆی لایەنە دیارەکانەوە ئەو پاڵنەرە سست و شاردراوانە بدۆزینەوە، کە ئەفسانە لە هەمان کات دا دەریان دەخات و دەیان شارێتەوە.

سەرچاوە/

- گۆڤاری (المنار) ژمارە (34) ساڵی 1989.
- درێژەی ئەم بابەتە رەخنەگرتنی فۆجێر ولاسە لە هزری جاك لاکان و لوی ئاڵتۆسێر، لە ئایندەدا بڵاودەکرێتەوە.. "وەرگێڕ".

# "محەمەد ئەرگۆن" و بیریارانی ئەوروپا:

## (میشیل فۆکۆ، ژاك دریدا، یۆرگن هابرماز، پۆل ریکۆر)

• و: شوان ئەحمەد

**(بەشێکی تایبەتی گفتوگۆیەکی درێژی نێوان هاشم سالح و محەمەد ئەرگۆنە لە کتێبی - الفکر الاسلامی ، نقد واجتهاد - دا)**

**هاشم سالح: رات چی‌یە بەو هێرشەی کرایە سەر میشیل فۆکۆ لە پێنج ساڵی رابردوودا دوای مردنی و، بەوە تاوانبار کرا کە ئەو نیچەوی‌و، ناعەقڵانی و، دژ بەهیومانستیەتی ئەوروپیە؟ ئەگەر لەم بارەیەوە شتێکت هەیە بیڵێیت ئەوا پێی دڵخۆش دەبم لەبەرئەوەی بابەتێکی وا جێگەی بایەخی منە. پاشان کتێبی گەورەی یەکەمینت بۆ لیکۆڵینەوەی "مرۆگەری عەرەبی لە سەدەی چوارەمی هیجری" دا تەرخان کرد بوو، لەوانەیە بتوانین دوای ئەوە بچینە سەر بەراوردکردنێك لە نێوانیان دا.**

محەمەد ئەرگۆن: بەڵێ، شتم هەیە بیڵێم. بەگازندەو گلەیش دەست پێ دەکەم. کاتێك سەرنج لە کایەی فەلسەفەی هاوچەرخی فەرەنسی دەدەم لە دیدگای ئەو بوارەوە کە خۆم پسپۆرم تێیدا (مێژووی بیری عەرەبی - ئیسلامی) ئەوا هەمیشە هەست بە نائومێدی دەکەم.

لەبەرئەوەی ئەو فەیلەسوفانەی زۆربوێرترن و لەڕیزی پێشەوەدان لە رەخنەگرتن لە عەقڵانیەتی ناوەندچێتی ئەوروپی وەك فۆکۆ و دێریدا و کەسانی تر بەداخراوی لەناو چوارچێوەکانی کەلەپووری ئەوروپی‌دا دەمێننەوە، ئەوانە هەرگیز لە دیوارەکانی ئەم کەلەپورە ناچنە دەرێ.

**هاشم سالح: ئەمە سەرەڕای شۆڕشکردن و یاخی بوونیان لەو شێوازی هەیمەنەو پاشکۆیایەتیەی خۆرئاوا لەڕابردوودا لەبەرامبەر رۆشنبیریەکانی دیکەدا پەیرەوی کردبوو...**

محەمەد ئەرگۆن: بەڵێ سەرەڕای ئەوەی ئەوان لە رۆژگارێك دا دەژین کە خەڵکی تیایدا

قسە لە تەواوی رۆشنبیریەکان دەکەن بەهۆی پەیوەندی داریتی تازەو خێرا لەنێوان چوارکوچکەی جیهان داو، سەرەڕای ئەوەی ئیسلام ئامادەگیەکی بەهێزی لە فەرەنساو ئەوروپادا هەیە بەهۆی بوونی ئەو ملیۆنەها موسوڵمانە لەوێدا، کەچی ئەمە سەرنجی هیچ یەك لەو رۆشنبیرانە بەلای خۆیدا راناکێشێت. کاتێکیش میشیل فۆکۆ گرنگی دا بە شۆڕشی ئێرانی جگە لە شتی بێ سەروبەرە هیچی نەوت و، هیچ لەوەش حاڵی نەبوو کە رووی‌دا، بریا بێ‌دەنگ بوایە و هیچی نەکردبایە..

کاتێك مارسیل غۆشێ (Gouchet) کتێبێکی فکری گرنگی لەمەڕ (نائومێدی جیهان) (Le desnchante ment du monde) دانا، ئەوا لەم کارەیدا تەواو وەك ئەوروپییەك و خۆرئاواییەك مایەوە. لەم کتێبەدا بەقوڵی باس لە رۆڵی ئایین و سروشتی ئایین و چۆن چۆنی ئایین لە ئەوروپا جیا بۆوە و هەموو مەسەلە هەڵپەسێردراوەکان (المسائل العالقە) و... هتد، دەکات. هەمو کتێبەکە تەرخانە بۆ ئەم مەسەلانە بەڵام تەنها لەرێی ئەزموونی (مەسیحیەت یان یەهودیەتی ئەوروپیەوە) کاتێکیش سەرپێیانە بە رستەیەك یان دوو رستە باس لە ئیسلام دەکات ئەوا جگە لە شتی بێ سەروبەرە هیچ ناڵێت و، نەزانین و بێ ئاگاداری خۆی لەم رووەوە نیشان دەدات. ئەمە لەکاتێکدا هەڵوێستی من تەواو پێچەوانەی هەڵوێستی ئەوانە. من بۆخۆم گرنگیەکی بەرز دەدەمە هزری ئەوروپی بەرادەیەك کە ئیسلامیەکان بە پاشکۆیایەتی بۆ خۆرئاوا تاوانبارم دەکەن! من بایەخ بە هەموو ئەوانە دەدەم کە لە خۆرئاوادا روودەدەن، هەروەها زۆر لە روناکبیرانی عەرەب و موسڵمانیش وادەکەن، سەرەڕای ئەوەی سەرجەم توێژینەوەکانی من تایبەتن بە مەسەلەکانی فکری عەرەبی ئیسلامی نەوەك خۆرئاوایی ئەوروپی. بۆ ئەمە نمونەیەکی تر دێنمەوە: یورگن هابرمازی ئەڵمانی، ئەویش هەمان شت دەکات. بەم دواییە وەك دەزانیت کتێبێکی قەوارە گەورەو گرنگی بڵاوکردەوە ئەویش: (گوتاری فەلسەفی نوێگەری) یە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك قەرەی ئایین ناکەوێت و، هیچ باسێکیشی تێدا نییە لەمەڕ بەشداری کردنی عەرەب – موسڵمانان لە کەلەپوری جیهانی و هزری مرۆڤایەتی دا. لەناو ئەو هەموو بەرگە گەورانەی نوسیونی بێهودەیە بەدوای وشەی ئیسلامدا (تەنانەت هەروەك ناوهێنانیش) بگەڕێیت.

ئەمە بەبێ ئەوەی باس لە پشت گوێ خستنی ئایینە ئاسیاوی و رۆشنبیریە ئاسیاویەکانی ئەو بکەین. بەڵام دەشێ چاوپۆشی لەم گوێ پێنەدانە بکەین، چونکە ئەو رۆشنبیریانە دورن و سەربە هەرێمێکی جیاوازن.

بەڵام ئیسلام (مەبەستم لە ئیسلام وەك شارستانیەت و رۆشنبیریە) ئەوا لە رووی مێژووییەوە بەشێکە لە جیهانی ناوەڕاستی و جیهانی خۆرئاواو، نابێت خۆرئاواییەکان سەرلەبەر پشت گوێی بخەن یاخود بازی بەسەردا بدەن، لێرەوە بەڕاستی سەرم سوڕدەمێنێ لە ونبونی ئەم رەهەندە لە گرنگی‌دانی ئەو فەیلەسوفە فەرەنسیانەدا کە زۆر پێشکەوتنخواز و پسپۆڕن.

ئەمە مانای وایە کە ئەو بیریارانە سەرەڕای رەخنەگرتنەکانیان لە نەژادپەرستی ناوەندچێتی ئەوروپیی دیلی ناو ئەو چوارچێوەیەن کە رەخنەی ئاراستە دەکەن. تەنها فەیلەسووفێکی فەرەنسی کە پەی بە گرفتەکە بەرێت، بەڵام بێ ئەوەی راستەوخۆ ناوی ئیسلام بێنێت: پۆل ریکۆرە هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەو ئیماندارێکی پرۆتستانتی‌یە و، لێرەوە هەستیارە بەرامبەر بەم رەهەندە ئایینیی‌یە، ئەگەرچی ئەو وەك فەیلەسوفێك تاوتوێی دەکات نەك وەك ئیماندارێکی عەقائیدی. گرنگی و لێکۆڵینەوەکانیشی تایبەتە بەسەردەمی کۆن و نوێ.. کاتێکیش وەك فەیلەسووفێکی زۆر زیرەك و زۆر کراوە دەکەوێتە باسکردنیان ئەوا شتی وا دەڵێت کە لەوپەڕی گرنگی دایە، بەڕادەیەك ئەوەی ئەو لە بارەی سەردەمی کۆن و نوێوە دەیڵێت هاوکات بەسەر ئیسلامیش دا دەچەسپێت. بەڵام دەربارەی ئیسلام وەك خۆی







شتێك ناڵێت. پێویسته ئەم قسانه بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا بگات بە خوێنەران.

**هاشم ساڵح:** ئەمە ئەو شتەیە کە رۆشنبیرانی ئێمە بەهەموو باڵەکانەوە باسی دەکەن کاتێك نارەحەت دەبن و نارەزایی دەردەبڕن لە بەسووك سەیرکردنی خۆرئاوا بۆ رۆشنبیری عەرەبی بەشێوەیەکی گشتی..

محەمەد ئەرگۆن: من نەمووت (بە سووك سەیرکردن)، من دەڵێم فەرامۆشکردن و پشت گوێ خستن. کەواتە ئەوەی من تاوانباری دەکەم، ئەو کەم و کورپیە رۆشنبیری و عەقڵیەیەی تیۆر یا فەلسەفیە گەورەکانە، بەبێ ئەوەی ئەزموونی مێژووی ئیسلام لەبەرچاو بگرێت وەك یەکێك لەئەزموونە جیهانیە گەورەکان.

دووهەم سەرنجی رەخنەگرانەم کە پەیوەندی بە میشیل فۆکۆ و، یۆرگن هاپرماز و، ژاك دێریداو .. هتد هەیە، ئەمەیە: من تێبینی ئەوە ناکەم ئەوان هیچ بایەخ و گرنگیەك بە مێژووی ئاینەکان بدەن بەشێوەیەکی گشتی، نەك تەنها بە ئیسلام. بێگومان ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی لە ئەورووپادا پێی دەڵێن بە عەلمانیکردنی فیکر (Lasecularisation delapen see)

ئەوان لەناو چوارچێوەی عەقلانیەتێکدا بیردەکەنەوە و کاردەکەن کە هەموو پەیوەندیەکی خۆی لەگەڵ رەهەندی ئاینیدا پچراندووە. وتم رەهەندی ئاینی و، نەموت باوەڕ، یاخود ئیمانی ئاینی. ئەمانە دوو شتی لێك جیاوازن. ئێمە دەمانەوێت رەهەندی ئاینی بێنینەوە ناو شیکردنەوە و لێکدانەوەو لەبەرچاوی بگرین.

ئێمە دەمانەوێت لە تەواوی سستەمە تیۆلۆژی و لاهوتیەکان بکۆڵینەوە کە مرۆڤایەتی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە رابردوودا لەسەری ژیاوە. دەمانەوێت وەك بەشێك لە کەلەپوری فکری سەرانسەری لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەین و، دەمانەوێت بەراوردێك لەنێوان ئەم و/ ئەقڵی بەعەلمانیکراودا بکەین. پێموایە ئەم پرۆسەی بەراوردکاریەش یەکێکە لە گرنگترین ئەو ئەرکانەی لەمرۆدا رووبەرووومان دەبێتەوە. ئەمەش ئەرکێکی گرنگ و مەترسیدارەو شایستەی مشتومڕو لێکۆڵینەوەیە لەلایەن گەورە بیریاران و فەیلەسوفەکانەوە.

بە واتایەکی دی، بیریارانی ئەورووپا گەر بەردەوامبن لە کارکردن و بیرکردنەوە لە ناو چوارچێوەی بیرێکی بە عەلمانیکراوی سەرانسەری داو، سەرلەبەر هەموو ئەوەی پەیوەندی بە رەهەندی ئاینییەوە هەیەو بەرهەمی کۆمەڵگا مرۆییەکانە وەلاوە بنێین و دووری بخەنەوە، ئەوا کارێکی نارەوا و زۆرە ملێیانەی نالۆژیکی و نائەقلانیانە دەکەن.

من نازانم لە بەراوردکاریەکی وەها چی دەکەوێتەوە، رەنگە شتێکی گرنگی

لێبکەوێتەوەو لەوانەشە هیچی وای لێ نەکەوێتەوە کەشایەنی باسکردن بێت. بەهەرحاڵ من داوای ئەوە ناکەم سەرلەنوێ بایەخ بۆ کەلەپوری ئایینی بگێڕدرێتەوە بەشێوەیەکی دروستکراو یاخود بە خولیایەکی رابردوو خوازانەوە. من بۆ خۆم فەندە مەنتالیزمێکی رابردوو خوازنیم و، باوەڕیشم بە ئەگەری سەرلەنوێ گێڕانەوەی رابردوو و سەردەمە خەیاڵیەکان نییە. ئەو شتەی دەمەوێت دامەزراندنی بەراوردکاریەکی دروست و توند و تۆڵی بێ ئەندازەیە لەنێوان رەهەندی ئاینی بە هەموو ئەو مانا رۆحیانەوە کە هەیەتی بۆ مرۆڤ و ئەو دەستکەوتانەی عەقڵی عەلمانی لە ئەورووپادا بەدەستی هێناون، کە پێویستە ئەو دەستکەوتانە ئافەرۆز نەکرێت یان بە هیچ جۆرێك دەست بەرداری نەبین. بەراوردکاریەکی لەمجۆرە تا ئەمڕۆکە لە هیچ ژینگەیەکی زانستی خۆرئاوادا ئەوەندەی من ئاگام لێی بێت ئەنجام نەدراوە. ئەوەی تا ئێستا رووی‌داوە لێك دوورکەوتنەوەو مشتومڕی توند و تیژ بووە لەنێوان هەر دوولایەنەکەدا: ئایینی و عەلمانی. هەریەك لەوان شانازی بەسەرکەوتنی بەسەر ئەوی دی دا دەکات...

بۆماوەی چەندین سەدە عەقڵی ئاینی حوکمی خەڵکانی ئەورووپی دەکرد و جەختی لەباڵادەستیو ئەولەویەتی خۆیو خواستو ئارەزوومەندی بە دەستگرتنی بەسەر هەموو چالاکیەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگادا دەکردەوە، هەر لەسەر بێشکەوە تا ناو گۆڕ. بەڵام لە ساتەوەختی مارکسەوە شتەکان پێچەوانە بوونەوەو تەرازووی هێز لەنێوان هەردوو عەقڵی ئایینی و زانستیدا دەستی بە گۆڕان کرد. لێرەوە عەقڵی پۆزتفستی و عەلمانی نوێ هەوڵی دەدا بۆئەوەی بەتەواوەتی دەست بەسەر عەقڵی ئایینیدا بگرێت و، بگرە تێکی بشکێنێ و بیسڕێتەوە.

ئەمەش ئەوە بوو کە لە مێژووی ئەورووپیدا بە درێژایی دوو سەدەی رابردوو رووی‌دا. ئەمێستا هیچ زانکۆیەك یان پەیمانگایەکی زانستی نییە تیایدا وتووێژێکی ئازاد و جدی لەنێوان هەردوو فیکری ئاینی و عەلمانی‌دا ئەنجام بدرێت. مێژووی ئایینەکان و خوێندنی فرێدرانە دەرەوەی زانکۆی رەسمیەکانەوە (سۆر بۆن) و تەنها خرانە ناو هەندێك پەیمانگای تایبەتمەندی وەك بەشی پێنجەم لە قوتابخانەی خوێندنی باڵا (کۆلێژی زانستی ئایینی). بەڵام تەنانەت لەم بەشەدا جگە لە جۆرێك لە کۆکردنەوەو، کەڵەکەکردنی زانیاری سەبارەت بە سەرجەم ئایینەکان بەبێ هیچ هەستێکی شیکاری رەخنەیی کەبیەوێت بەراوردی بکات بەوەی عەقڵی زانستی و فەلسەفی لە بەشەکانی دیکەی زانکۆی فەرەنسی‌دا دەیکات، هیچی دیکە نابینین. لێك جیابوونەوەیەکی تەواو هەیە لەنێوان هەردوو کۆلێژو پەیمانگاکەدا. عەقڵی فەلسەفی یاخود زانستی باو لە هەموو زانکۆکانی فەرەنسادا بێئاگایە یاخود بێئاگایی خۆی نیشان دەدات لەوەی ئەم پەیمانگاو کۆلێژە تایبەتانە لەبارەی مێژووی ئایینەکانەوە بەرهەمی دێنن (من نەمووتووە ئەو پەیمانگا ئایینیانەی کە خەڵکی فێری ئیمان و سروشتی ئایین و ڕێو رەسمەکانی دەکات، بەڵکو وتم ئەو پەیمانگایانەی کە لە دیدگای عەقڵی مۆدێرن و بە شێوازەکانی ئەو لە پشکنین و توێژینەوە لە مێژووی ئایینەکان دەکۆڵێتەوە). بەڵام پێموایە ئایین لەئەمڕۆکەدا رەهەندێکی گرنگ پێکدێنێ و ناشێت پشت گوێ بخرێت. ئەمە ئەگەر لەبەر هیچیش نەبێت تەنها لەبەرئەو ژمارە زۆرەی خەڵکی کە باوەڕیان پێی هەیە.

**هاشم سالح: بەڵام ژمارەی باوەڕداران بە مانا تەقلیدیە باوەکەی ئەم وشەیە بەو گەورەییە نی‌یە لە ئەورووپادا.. ئەوانە بوونەتە کەمینەیەك کە بەرەو نەمان و لەناوچوون دەچن.**

محەمەد ئەرگۆن: کێ وای پێ وتی؟ مەسیحیەکان هەتا ئێستاش لە ئەورووپادا هەن و لەناو نەچوون، وەك ئەو بۆچوونە باوەی لە وڵاتانی ئیسلامیدا هەیە و دەیەوێ دەربارەی خۆرئاوای (مولحید) و (کافر) وامان تێبگەیەنێت! ئەوانەی باوەڕیان بە ئایینی مەسیحیی هەیە لە

کۆمەڵگا ئەوروپییەکان دا بوونیان هەیە ئەگەر چی بەرێژەیەکی جیاوازیش بێت.

بەڵام راستە توێژو چینێکی بەرفراوانی کۆمەڵگە بە عەلمانیکرا. ئەڵبەت، پێویستە جۆری ئەو ئیمانە لای ئەو مەسیحیە ئەوروپییانە بپشکنین، لەوەش بپێچینەوە کە ئیمان بەلای ئەوانەوە چی دەگەیەنێت. رەنگە وەها ئیمانێك جیاوازبێت لەو ئیمانە تەقلیدیەی لە سەدەکانی رابردوودا باو بووە. گومانی تێدا نییە کە حەساسیەتی ئایینی بۆ نمونە لە کۆمەڵگەیەکی پیشەسازی پێشکەوتوودا، هەمان ئەو حەساسیەتە ئایینییە نییە کە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا هەبووە! مەگەر تەنها لای ژمارەیەکی کەمی دەمارگیرە توندڕەوەکان نەبێت کە بیری رابردوو دەکەن و خەون بەوەوە دەبینن سەرلەنوێ وەکو خۆی دووبارەی بکەنەوە. (بۆ نمونە وەك گروپی قەشە لۆفیڤەر کە بەم دواییە رۆما لە کلێسادا دەری کرد).

ئەو پرسیارەی پێشووت دەتخاتە هەمان ئەو هەڵەوە کە هەموو عەرەب و موسوڵمانەکان تێی دەکەون کاتێك دەربارەی خۆرئاوا قسە دەکەن و وادەزانن کە بێ ئایینە. تێڕوانینێکی وا سەبارەت بە خۆرئاوا ناڕاستەو لە قوڵاییە مێژووییەکەی بێ ئاگایە.

ئەم هەڵەیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خۆرئاوا خۆیشی لەم مەسەلەیە ناکۆڵێتەوە وەك پێشتر باسم کرد: واتە مەسەلەی بەراوردکاری و رووبەڕووبونەوە لەنێوان شوناسە کۆنەکەی (مەسیحیەت) و / شوناسە تازەکەیدا (واتە عەلمانیەتی رۆحی). لەبەرئەم هۆیە دەڵێم کاتێك فۆکۆ لە کۆتایی کتێبی "وشەکان و شتەکان" دا رایدەگەیەنێت کە مرۆڤ مردووە، ئەوا دوور دەڕوات، ئێجگار دوور: واتا زیاد لە پێویست. بەڕای من ئەم دروشمە بریتییە لە دروشمێکی ئایدیۆلۆژی و گوتارێکی دەسەڵاتخواز، نەك گوتارێکی مەعریفی. ئەگەرچی فۆکۆ هەوڵی زۆریدا لەپێناو رەخنەگرتن لە گوتاری دەسەڵاتخواز، بەڵام بۆخۆی هەمان شت گوتارێکی دەسەڵاتخوازانەی هێنایە بەرهەم. من لێرەشدا رەخنەی ئاراستە دەکەم و، لەم رووەی کارەکەشی رازی نیم.. کاتێك دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەم دواکتێبەی هابرماز "گوتاری فەلسەفی نوێگەری" و رۆچووم لە خوێندنەوەیدا هەستم بە نائومێدی و وەڕسی کرد. چونکە ئەم پیاوەی کە خاوەن فکرێکی بەهێزو ئەقڵێکی بە توانایە لە هیچ جێگایەکی ئەم کتێبەیدا قەرەی مەسەلەیەکی گرنگی لەمجۆرە ناکەوێت کە رووبەڕووی ئەم رۆژگار و سەردەمەمان دەبێتەوە.

**هاشم سالح: ئەو قەرەی مەسەلی ئایین ناکەوێت لە کتێبەکەیدا...**

محەمەد ئەرگۆن: هەرگیز! بە هیچ جۆرێکیش ناوی فیکری ئایینی ناهێنێت. هابرماز کتێبێکی فیکری ئاست بەرز دادەنێت لەمەڕ چوار سەدە لە تازەگەری فیکری و فەلسەفی بەبێئەوەی خۆی بدات لەوەها مەسەلەیەك، ئەگەرچی بەتەنها ئاماژە بۆ کردنێك بێت بۆ فکری ئایینی مەسیحی یان ئایینەکانی دیکە. فۆکۆش هەمان شت دەکات.

**هاشم سالح: رەنگە وایان دانابێت کە مەسەلەی بیری ئایینی یان رەهەندی ئایینی تەواو بووبێت و بەیەکجاری تێپەڕێندرابێت؟**

محەمەد ئەرگۆن: ئەڵبەتە، پێیان وایە مەسەلەیەکی وا کۆتایی هاتووەو یەکلاییبۆتەوە.

سەرچاوە:
محمد اركون: الفكر الأسلامي (نقد واجتهاد) — ترجمة وتعليق: هاشم صالح — دار الساقي، بيروت — الطبعة الثالثة، 1998.

# رەخنەو تۆژینەوە

- بنەماکانی بنەماخوازی



- جیهانی کافکایی

- راوەدوونانی خۆر

# چەمکە بنەڕەتیەکانی بنەماخوازی

■ ژان پیاژە

● و: کۆزاد

1-پێناسەکان:

وا باوە پێناسەکردنی بنەماخوازی کارێکی ئەستەمە، چونکە ئەم زاراوەیە هێندە شێوەی جیاوازو فرەچەشنی لەخۆگرتوە، دۆزینەوەی لایەنێکی هاوبەش لەنێوانیاندا کارێکی دژوارە؛ بەواتاییێکی دیکە هەتا پێی ئەچێ (بنەماخوان)انی جۆراوجۆر زاراوەی بنەما بەواتاگەلی جۆراوجۆرتر دەهێننەوە، سەرەڕای هەموو ئەمانەش، بەلێکۆڵینەوەو پێك گرتنی ئەو واتا جۆر بەجۆرانەی کەلەزانستەکانداو بەداخەوە لەمیوانیە (کۆکتێڵ)ە، کانیشدا دراونەتە پاڵ ئەم زاراوەیە رەنگە بکرێ واتاییێکی هاوبەش لە نێوانیاندا ببیندرێتەوە. بەڵام ئەم کارە تەنیا بەمەرجی جیاکردنەوەی دوو شت سەرئەگرێ، ئەویش ئەگەرچی هەمیشە بەیەکەوە سەرهەڵ ئەدەن بەڵام لەڕاستیدا جیاوازن: یەکەمیان ئەوەیە؛ چیەتی ئامانجی جێگرتە لە چەمکی بنەما (خۆی)دا دەست نیشان بکەین. (مەبەست) ئەو ئامانجەیە لەسەرکەوتنو ئاواتەکانی هەرکام لەقۆناغەکانی بنەماخوازیدا دەبیندرێ. دووهەمیش مەبەستی رەخنەیی نادیار لەدیارکران و فراوان بوونی هەرکام لەجۆرەکانی بنەماخوازیدا شیبکەینەوە.

جیاکردنەوەی ئەم دووشتە لەڕاستیدا بەواتای پێمل بوون بۆ ئەو راستیەیە کەتێکڕای بنەماخوازەکان بەڕاستی بروایان بەئامانجێکی شیاوی تێگەیین هەیە؛ یان لانی کەم ئارەزووی ئەوەیان لەسەردایە، ئەگەرچی مەبەستە رەخنەییەکانیشیان زۆر جیاوازن. ریازی زانەکان پێیان وایە بنەماخوازی دژ بەچەند پەل بوونەوە

(Compartmentalism)ی ریـــــــــــازی وێستاوەتەوە. چونکە مەبەست لەبنـەماخوازی (لـەریازیدا) ئەوەیـە، کـە بەکـــەڵك وەرگرتـــن لەهاوچەشنایەتی (Isomorphisms) بـەرچاو لەنێوان پەلـە جیاجیاکـانی ریـازیدا یەکیـەتی دابمـەزرێنێ. لەروانگـەی چـــەندین وەچـــەی زماناسـەوە، بنـەما خـوازی بەگشتی بریتیـە لـە دوورکەوتنـەوە لـە لێکۆڵینـــەوەی ناهاوکـــاتیی (Diachronic) دیـاردە لێك دابڕاوەکـانی زمـان ناسیی، کەلەسەدەی نۆزدەهەمدا بـرەوی هـەبوو. هەروەها بـەرەو پـیرچوونی لێکۆڵینـەوە لەبابـەت سیستەمە زمانیـە یەکدەستەکان، کەبەشـێوەی هاوکـاتی کـار دەکـەن. بنـەماخوازی لـەدەروون ناسیدا، لەزووەوە لەگەڵ شـێوەگەلی ئاتمیستی، کـە گشـت دابـەش ئـەکات بەپارچـە پارچـە (پێکهێنـەرە) پێشـینەکانی، دژایـەتی نوانـدوە. لـەئاکامدا لەباسـەکانی ئێسـتای فەلسـەفەدا، بنـــەماخوازی لەبەرامبـــەر مێژووچیـــەتی، کارکردخوازیو هێندێ جاریش لەبەرامبـەر گشت ئەو بۆچوونانەی کەخۆیان خستۆتە پاڵ بکەر یان (سوبژە)ی بەشەری، راوەستاوە. کەوابوو ئەگـەر بنەماخوازی لەڕووی دژایەتی کردنی لەگەڵ ڕێبازو روانگەکانی دیکەوە پێناسـە بکـەین، واتـە هـەوڵ بدەین بنـەماخوازی لەڕوانگەی پووچەڵکردنـەوە بناسێنینو بەتەنیایی لێی نەکۆڵینەوە، ئاشکراشە جگـە لەدژایـەتیو کۆمـەڵێ بیروڕای جیـاواز، کـە لەگـەڵ هەڵسوکەوتـە ڕێکەوتـەکانی مێـژووی زانستو ئەندێشەدا پێکەوە گـرێ دراون، شـتێکی دیکـەمان چنـگ ناکـەوێ. لـەلایێکی دیکەشـەوە کاتێ سەیری لایەنە باشـەکەی نـاواخنی پێکهاتـە ئەکەین، بەلانی کەمەوە دوو لایەنی هاوبەش لەناو هـەموو جۆرەکـانی بنـەماخوازیدا دەبینینـەوە. یەکەم: ئامانجی (رەنگە ئاواتی) شیاوی تێگـەیین بوونـی سروشـــتی (پێکهاتـــە)یـە، کەئـەویش بەپاڵپشـتی ئـەم گریمانەیـە کـە؛ پێکهاتـەکان سەربەخۆن (یان با بڵێین بـەخۆوە، بژیـن)و دەرك کردنیـان پێویستی بەگەڕانـەوەو پشـت بەسـتن بـەتوخمو شـایەتی جۆراوجـۆری دەرەکـی نیـە. دووەهـەم؛ بوونـی هێنـدێ راستیو روانگـە؛ واتـە بەلێکۆڵینـەوەی تیۆریانـەی ئـەو پێکهاتانـەی کەلەڕاســتیدا روون بوونەتـــەوە، بۆمـــان دەردەکـەوێ پێکهاتـــەکان ســەرەڕای فـرە چەشنایەتیان، خـاوەنی کۆمـەڵێ تایبەتمـەندی هاوبەشو رەنگە پێویستیشن.

لەبـەردا بەشـێوەیێکی گۆترەیـی پێکهاتـە وەکـوو سیسـتەمێکی (پێکـهاتوو) لەگۆڕانـەکان (Transformations) پێناسە ئەکەین. چونکە پێکهاتە سیستەمە، نەك بەتەنیا کۆمەڵێك توخـمو تایبەتمەندیەکانی توخم، ئـەم گۆڕانانـە لـەزنجیرە یاسـایێك پـەیڕەوی ئەکـەن؛ هەڵسوکـەوتی ئـەو یاسایانەی زاڵن بەسەر گۆڕانـەکاندا دەبێتـە هـۆی هـێزو مانـەوەی سیسـتەمو قـەت ئاکامـەکانی لەدەرەوەی چوارچێوەی کاری سیستەم دا نینو قەتیش لەتوخمـەکانی دەرەوەی سیسـتەم کـەڵك وەرناگرێ. بـەکورتی (تصـور)ی پێکهاتـە لەسـەر بناغەی سێ چەمك دامەزراوە: چەمکی گشتیەتی، چەمکی گۆڕان، چـەمکی خۆرێکخـەری (Self-regulation).

دۆزینـــەوەی پێکهاتـــە، درەنـــگ یـــان زوو، بەفۆرمۆڵـــەبوون (Formalization) کۆتـــایی پێدێت، بەڵام ئەم کارە هەمیشە خولقاوی زەینی تیۆرکارە، لەحاڵێکدا خودی پێکهاتـە، سـەربەخۆ (و دوور) لـەزەینی تیۆرکـــار وجـــوودی هەیـــە. فۆرمۆڵەکردن هێندێ جار راسـتەوخۆ بەتێرشـتنی واتـا لـەقاڵبی هاوکێشـەی مـەنتیقیو ریـازی سـاز دەبێو هێنـدێ جـاریش لـەقۆناغی (بەینابـەینی) سازکردنی نموونەی سایبرنتیکی تێئەپـەڕێ، کـە لەم حاڵەتـەدا پلـەی فۆرمۆڵەبوون بەهـەڵبژاردنی تیۆرکـارەوە پـەیوەندی هەیـە. بـەڵام پێویسـت بەدووپات کردنەوەیە کە شـێوازی ئەو بنەمایـەی

کە تیۆرکار دۆزیویەتیەوە دەبێ بەشێوەیێکی ئاشکراو بەپێی کۆک بوون لەگەڵ هەر لێکۆڵینەوەیێکی تایبەت دا دەست نیشان ببێت.

چەمکی گۆڕان یارمەتیمان دەدا پێناسەی مەبەستەکەمان لەقۆناغی سەرەتاییدا تەسکتر بکەینەوە، چونکە ئەگەر بڕیار بوایە فۆرمالیزممان بەهەر واتاییکی شیاو لە چوارچێوەی چەمکی پێکهاتەدا جێگەبکردایەوە، هەموو ئەو تیۆریە فەلسەفیانەش کە لەڕاستیدا ئەزموون خواز (Empricist) نین جارێکی دیکە سەریان قوت ئەکردەوە بۆ نموونە ئەو تیۆریانەی لەژێر کاریگەری نموونەکانی ئەفلاتوون (مثل افلاطونی) یان سروشتەکانی هۆسرێل (ذوات هوسرلی)و یان فۆرمالیزمی کانتیدان؛ هەروەها زۆربەی جۆرەکانی بۆچوونی ئەزموون خواز (وەك پۆزیتیویزمی مەنتیقی ئالقەی ڤیەن کە لەباسە مەنتیقیەکاندا (پتر) لەسەر شێوەی خوێندنو واتاناسی پێداگری ئەکات). بەڵام لەو پێناسەکردنە بەر تەسکەدا کەئێستاکە لەبەردەممانداییە، بۆچوونی باو لەچوارچێوەی مەنتیق دا کەبەتوندی سەربە ئاتمیزمی وشكو رەقو تەقە، زۆر بەکەمی گوێی بە(پێکهاتەکان) داوە و تازە وا خەریکە لەگەڵ ئەم باسەدا ئاشنا دەبێ.

لەم رووەوە، لەم کتێبەدا لێکۆڵینەوەکەمان تەنیا بۆ ئەو چەشنە بنەماخوازیانە دابین ئەکەین، ئەزموونیەکاندا خۆیان نواندوە. ئەمەش بۆ خۆی ئەرکێکی گەلێ دژوارو گەورەیە. لەکۆتاییدا لەهێندێ لەو بزوتنەوە فەلسەفیانە دەکۆڵینەوە. کە کاریگەری شێوە جۆربەجۆرەکانی بنەماخوازیی زانستە کۆمەڵایەتیەکانیان پێوە دیارە. بەڵام لەبەردا پێویستە لەمەڕ ئەو پێناسەی بۆ بنەماخوازی پێشنیارمان کردوە. زۆرتر بدوێین. چونکە لەپێچەوانەدا ئەم تێگەیینە ئەستەمە؛ کە بۆچی چەمکێکی (انتزاعی) لەپێکهاتە، واتە سیستەمی گۆڕانەکان" تا ئەم رادەیە لەهەموو بوارەکانی لێکۆڵینەوەدا سەرچاوەی ئامانجی گەورە گەورە بووە.

## 2- گشتیەتی:

قسەی تیانیە گشتیەتی ئاشکراترین نیشانەی پێکهاتەیە، چونکە هەموو بنەماخوازەکان - ریازی زانەکان، زمان ناسەکان، دەروون ناسەکانو... هتد، هاوبیروڕان کە لەنێوان پێکهاتەکانو کۆمەڵەکان (Aggregates)دا جیاوازیێکی پتەو هەیە: پێکهاتە بریتیە لە"گشت" بەڵام کۆمەڵ بریتیە لەتەرکیباتێك کەتوخمە پێکهێنەرەکانی لەناو تەرکیبەکەدا سەربەخۆن. پێداگری لەسەر ئەم جیاوازییە ئەوە ناگەیێنێ کەپێکهاتەکان لەتوخمو پێك نەهاتوون، بەڵکو ئەوە ئەگەیێنێ کەتوخمەکانی هەر پێکهاتەیێك لەیاساکانی خۆی پەیرەوی ئەکاتو لەسەر بنچینەی ئەم یاسایانەشە کەپێکهاتە بەواتای گشت، یان سیستەم پێناسە دەکرێ. هەروەها ئەو یاسایانەی زاڵن بەسەر تەرکیبی پێکهاتەدا ناکرێ بەپەیوەندی کەڵەکەبووی یەك بەیەك (Cumulative one - b - one association-)ی نێوان توخمەکان کورت بکرێتەوە، چونکە ئەم یاسایانە کۆمەڵێ تایبەتمەندی گشتی بەخودی گشت نیسبەت ئەبەخشن جیاواز لەتایبەتمەندیەکانی یەکەیەکەی توخمەکاندا. نموونەیێکی ناسیاو دەهێنینەوە: ژمارەکان (اعداد صحیح مثبت). شتێکی سەربەخۆ نین، ئەمانە یەکە یەکە بەرێکەوت نەدۆزراونەتەوە تاکوو گشتێکیان لێ‌پێکهاتبێ. ئەم ژمارانە بوونیان بۆنیە، مەگین بەشێوەیێکی رێكوپێك. رێكوپێکی (نظم) ئەم ژمارانەش لەهێندێ تایبەتمەندی پێکهاتەیی‌یەوەیە (وەکوو ئەو

تایبەتمەندیانەی لەگروپو مەیدانو ئاڵقەکانو... دەبینــدرێ). کـــە بەتـــەواوەتی لەتـــەك تایبەتمەندیـــەکانی یەکەیەکـــەی ژمـــارەی راستەقینەی یەکـەم (اول) یـان نایەکـەم، جـووت یان تاکو ئەم جۆرە شتانەدا جیاوازی هەیە.

بەهەرحاڵ، واتای گشتیەتی کۆمەڵـە باسێکی زۆرمـــان لـــێکۆڵەکاتەوە. کـــەلێرەدا تـــەنیا بەدوانیانـــەوە خـــەریك ئـــەبین: یـــەکیان چیـــەتی (ماهیـــەت) گشـــتیەتی‌یەو ئـــەوی‌دیش شـــێوەی گەلاڵەبوون (یان لەبەردا گەلاڵـەبوو)یـەتی، ئەگـەر پێمان وابێت کەلەهەموو بوارەکاندا، گشت روانگە زانست ناسیەکان لەدوو روانگەدا کۆدەبنەوە ئـەوا تووشی هەڵەبووین: یان بـەهێزکردنی بوونـی ئـەو گشـتانەی کەبـەپێی یاسای پێکهاتـەیی. خۆیـان پێناسە دەکرێن، یاخود هـەر بەتـەنیا باڵدان بـەو تەرکیبە ئاتمیستی‌یانەی کەپێکـهاتوون لـەتوخمی سـەرەکی (سـەربەخۆو مـەوجود). کاتـێ سـەیری مێژووی ئەندێشەکان ئەکـەین بۆمـان دەرئەکـەوێ کـە لەهـەموو رسـتەکانی زانسـتدا، چ پێکهاتـە ئیدراکیەکانی دەروون ناسـانی رێبـازی گێشـتاڵن، یان ئەو گشتە کۆمەڵایەتیانەی جێگـەی سـەرنجی کۆمـەڵ ناسـانو مـرۆڤ ناسـانە (چـین یـان کۆمەڵەکان)، لەجێی ئاتمیزم نەك هـەر روانگـەیێك بـەڵکوو دوو روانگـەمان لەبەردایە کـە بـەبیروڕای ئێمە تەنیا یەکێکیان لەگەڵ رۆحـی بنـەماخوازیو مۆدێرنیدا تەبایە.

روانگـەی یەکـەم پێچەوانـە بوونـەوەی ئـەو دیدەیـە کەبـەرو دوایـی سروشـتی بـەجووڵان لەسـاکارییەوە بـەرەو ئاڵۆزبوونـەوە دائـەنێ (لەکارتێکـەری هەسـتەوە بـەرەو تـۆڕە ئاڵۆزاوەکـانی تێگـەیین، لـە کەسـەکانەوە بـەرەو چینە کۆمەڵایەتیەکانو ...). ئەو گشتەی کە لەم تاقمە رەخنەگرانەی ئاتمیزم لەبەردا باسی ئەکەن بەشێوەی یاساییو بنـەڕەتی بەرهـەمی جـۆرێ سەرهەڵدانو خولقانە، کەبەشێوەیێکی نائاشکرا یـەکێ لەیاسـاکانی سروشـت بەئـەژمار دێـت، کـە ئیدی پێویستیەکی بەوردکردنەوەو شـیکردنەوەی زیـاتر نیـە. بـەم شـێوەیە کاتـێ "کۆنـت" هـەوڵ ئەدات مرۆڤ بەپێی بەشەرایەتی راڤە بکات، نـەك بەشەرایەتی بەپێی مـرۆڤ، یـان کاتـێ (دورکیـم) پێـی وایـە گشـتی کۆمـەڵ (Social whole) تێکەڵێکـە لەکەسـەکان، وەك چـۆن مۆلکۆلێـك تێکەڵێکـە لەئەتۆمـەکان، یـان کاتـێ دەروون ناسـانی رێبـازی گێشـتاڵت ئـەڵێن: دەتوانـن لەتێگـەیینی سـەرەتاییدا کۆمـەڵێ گشـتی سـەربەخۆ ببیننـەوە کـە لەگـەڵ کـارتێکردنی مـەیدانی ئەلـەکترۆموگناتیس دا شـیاوی هەڵسـەنگاندنە، هـەموویان لەڕاسـتیدا ئـەم نوکتەیەمان بەگوێدا ئەدەنەوە کە گشت، تـەنیا تێکەڵێك لـەماکی (موجود)و لەبەردەستان نیـە، ئێمەش لەبابەت ئەم تێبینیەوە ئـەبێ سوپاسـیان بکـەین؛ لەهـەمان کـاتدا، کاتـێ ئەوانـە گشـت لەبەرامبەر پارچەکان دا لەپێشتر دائەنێن، یـاخود بـەواتای "نزیکایـەتی" پارچـەکانی دائـەنێن، لەڕاسـتیدا کێشـەکان هێنـدە سـادە ئەکەنـەوە، کـەدوور نیـە هـەموو پرسـیارە سـەرەکیەکان چاوپۆشـیان لـێبکرێ - کۆمـەڵێ پرسـیار سـەبارەت سروشـتی یاسـاکانی تێکـەڵکرد کەزاڵـە بەسەر گشت دا.

جگە لەنەخشە ئاتمیستیەکانو هـەروەها ئـەو نەخشـانەی باسـی خولقـانی گشـتیەتی دەکـەن، نەخشـەی سێهەمیش لەگۆڕێدایەو پێـی دەڵێـن بنەماخوازی (عملیاتی). ئەم نەخشەیە لەدەلاقەی نیسـبەتەکانەوە دەڕوانێتـە پێکهاتـەکان. واتـە ئەوەی شیاوی گـوێ پێدانو سـەرنجە نیسـبەتی نێوان پارچەکانـە، نـەك توخمـەکانو نـەك ئـەو گشـتەی کـەنازانین چۆن دەخولقـێ. بـەواتایێکی دیکـە. ئـەو تەرتیبانـە مەنتیقیـە یـان ئـەو رەوتـە سروشـتیانەی پێکهێنـەری گشـتن بـەر لەهـەموو شتێك جێگەی سەرنجن، نـەك ئـەو پارچانـە، یـان

گشتەکە خۆی، کەبەپەیڕەوکردنی یاساکانی دروست بوون و تێکەڵ بوونی سیستەم پێك دێت.

ئێستاش دەگەینە کێشەی دووهەم، کێشەیەکی زۆر جیددیو لە راستیدا گرنگترین کێشەی ئەم گشتە تێکەڵ بوانە لەسەرەتاوەو هەمیشەش هەر تێکەڵ بوون؟ ئەم بارودۆخە چۆن دەرەخسێ؟ ئاخۆ کەسێك پارچەکانی (بەشێوە گشتێگ) تێکەڵکرد کردوە؟ یان رەنگە پارچەکان لەهەمان سەرەتاوە لەپرۆسەی تێکەڵکرد دا هەبوون (و ئەم پرۆسەیە وەك خۆی بەردەوامە)؟ ئاخۆ پێکهاتەکان لەرووی پێویستەوە نیازیان بەگەلاڵەبوون هەیە، یاخود دەکرێ لەبابەت ئەوانەوە بەشێوەیەك پێملی چەشنێ گەلاڵەبوونی پێشینی (Performation) ئەزەلیو ئەبەدی ببین؟

لەوەئەچێ کەبنەماخوازی بەپێویستی بزانێ لەنێوان سەرهەڵدانو خولقانی بێبنەما لەلایەکەوەو هەروەها گشتەکان یان شێوە دانەمەزراوەکان لەلایەکی دیکە یەکێکیان هەڵبژێرێ. باری یەکەمیان بەواتەی گەڕانەوەیە بەرەو پێوەندیە ئاتمیستیەکان کەلەڕوانینی ئەزموون خوازانەوە خوومان پێگرتوە. لەباری دووهەمیشەوە بەردەوام ئەم مەترسیە لەرێدایە کەبنەماخوازی لە دەرگا تیۆریەکانی سروشتە هۆسرێلیەکان، یان نموونە ئەفلاتونیەکانداو یان لەشکڵە پێشینەکانی تێکەڵکردی کانتیدا، گرفتار ببێت. لەڕاستیدا هەر دووبارەکەی بەرەو لاڕێمان دەبات، مەگین رێگەیەکی دیکە بگرینە بەر.

وەك چاوەڕوان دەکرا، ئەم کێشەیە قرمو قاڵێکی زۆری سازکرد، تا ئەو جێگەیەی کەهێندێ لەرەخنەگران گەیشتنە ئەو ئاکامەی (بڵێن) چونکە سروشتی پێکهاتەکان نازەمەنی (Nontemporal) ن و ناکرێ رێو شوێنێك لەبابەت خۆڵقانیانەوە دەست نیشان بکەین (ئەڵێی ئەم ئیدیعایە لەخۆیدا رێگە چارەیەکی تایبەت نیە، واتە هەمان رێگەی روون کردنەوەی سەرچاوەی بنەماکان لەسەر بناغەی واتای گەلاڵە بوونی پێشین). لەڕاستیدا مەسەلەی باسەکەی ئێمە، واتای گشتیەتی، خۆیەتی، لەگەڵ روونکردنەوەی، دووهەمین تایبەتمەندی پێکهاتەکان دا ئەم واتایەمان بۆ روونتر ئەبێتەوە، واتە پێکهاتە وەکوو سیستمێ لەگۆڕانەکان نەك شێوە گەلێکی بێ جمە.

### 3- گۆڕانەکان:

ئەگەر پێملی ئەوە بین کەتایبەتمەندی گشتە خاوەن پێکهاتەکان پەیڕەوی یاسای تێکەڵکردەکەیانە، کەواتە ئەم یاسایانە دەبێ بەشێوەیەکی سروشتی پێکهاتەدەر بن؛ لەڕاستیدا تایبەتمەندی سروشتی دوو لایەنە یان دوو تەوەرەی یاساکانی پێکهاتە، واتە تایبەتمەندی پێکهاتەدەری (Strutucring) و خاوەن پێکهاتەبوونی 0(being structured) بەردەوامو هاوکاتی یاساکانی پێکهاتەیە کەبواری بەکارهێنانی سەرکەوتوانەی ناوەڕۆکی یاسای لەلایەن بنەماخوازەکانەوە دەستەبەرکردوە. یاساکانی تێکەڵکردی پێکهاتەش وەکوو (نظم)ی کۆرنۆت (چەشنێ پێکهاتەی تایبەتە کە لەجەبری نوێدا بەکاردێ)، بەشێوەی (ضمني) پێناسە دەکرێن واتە وەکوو یاساگەلی زاڵ بەسەر گۆڕانەکاندا لەسیستەمێکدا کەپێکهاتەکەی لەم یاسایانەوە هەڵقوڵاوە.

کاتێ لەزمان ناسیو دەروون ناسیدا سەیری مێژووی بنەماخوازی ئەکەین، رەنگە بەم وتەیەی دوایی نەختێك سەرسام ببین: لەزمان ناسیدا، بنەماخوازی لەداهێنانەکانی سوسێرە، کە

(ئەمەش) ئیدیعاکەی ئێمە پتەو ناکات؛ سەرەڕای ئەمەش، سوسێر وشەی (سیستەم)ی هەم بەواتای یاساگەلی هاوکاتی دژایەتی (Synchronic opposition) هەمیش بەواتای یاساگەلی هاوکاتی یەکسانی بەکاردەبرد.

لەدەروون ناسی گێشتالت دا ئەو شێوە ئیدراکیانەی کەخاوەنی تایبەتمەندی گێشتالتی بەئەژمار دێن بەگشتی بێجەمەن. بەلام ئەقل نایبڕێ کە بۆ لێکۆڵینەوەی رەوتێکی فیکری تەنیا بەسەرچاوەیەکەوە بنووسێینو چاوپۆشی لەڕەوتی خولقانی بکەین. جگە لەمەش، زمان ناسیو دەروون ناسی بنەماخواز، هەردووک لەسەرەتاوە لەگەڵ سەرهەڵدانی واتای گۆڕان دا پێوەندیان هەبووە. سیستەمە زمانییە هاوکاتیەکان. نەگۆڕو بێبزوەنین؛ ئەمانە هێندێ جار داهێنانی نوێ ساز دەکەنو هێندێ جاریش خۆی لێدەبوێرن (ئەم وەرگرتن یان رەت کردنەوەی داهێنانی نوێیە پەیڕەوی باروودۆخی سیستەمە، کە ئەمەش بەش بەحاڵی خۆی لەیاساکانی دژایەتیو نزیکایەتی سیستەم پەیڕەوی دەکات). زۆری پێنەچوو کە بۆچوونەکانی سوسێر لەبابەت چەشنێ، یەکسانێ بدۆز، بەهیمەتی بالّی (Bally) بەوردی بەیانو فراوانو کرایەوەو بووە تیۆریەک لەبابەت شێوازەوە. راستەکە ئێمە تا ئێرە خۆمان لەقەرەی تیۆری "رێزمانی گۆڕانیی" (Transformationalgrammer) چامسکی نەداوە، بەلام تیۆری بالّی لەبابەت شێوازەوە، لەراستایی (دۆزینەوەو وردکردنەوەی) واتا یان بڕوای گۆڕاندا دەچێتە بەرەوە - یان بەلانی کەمەوە بەرەو واتای "ڤاریاسیون گەلی تاکی" کەجۆرێکی نادیارو کەم رەنگ تری هەمان بڕوای گۆڕانە. لەبابەت "گشتیەتیەکان"ی (Gestalten) دەروونی (و دەروون ناسی گێشتالت)یش دەبێ بلێین کەدامەزرێنەرەکانی لەسەرەتاوە لەیاساکانی رێخراوە ئەدوان. کەبەیارمەتی ئەوانە دراوە هەستینەکان (دادەهای حسی) دەگۆڕێن.

هەروەها ئەو شیکاریانەی لەسەر بناغەی تیۆری (احتمالات)، کەئەمڕۆکە لەم جۆرە یاسایانەی هەلدەگۆزین، ئەم لایەنی گۆڕانی تێگەینە روونتر دەکاتەوە.

لەڕاستیدا، هەموو پێکهاتە ناسراوەکان _ لەگروپە ریازیەکانەوە بگرە تاکوو سیستەمە خزمایەتیەکان بەبێ هەلاواردە. سیستەمگەلی بگۆڕن، بەلام گۆڕان بەشێوەیەکی پێویست پرۆسەیەکی خاوەن کات نیە: 1+1 (ئەبێتە) 3،2 "بەبێ مەودا دوابەدوای 2" دێت: بێگومان لەم نموونانەدا "بوون (شدن)"و"لەدوای ژمارەیەك هاتن" پرۆسە گەلێکی خاوەن کات نین، لەلایەکی دیکەشەوە، گۆڕان دەتوانێ پرۆسەیەکی خاوەن کات بێت، بۆ نموونە شووکردنو ژن هێنان (ازدواج کردن) "کات دەبا" ئەگەر واتای گۆڕان لەگۆڕێدا نەبێ پێکهاتەکان بایەخو برشتی بەیانگەریی خۆیان لەکیس دەدەنو لەئاکامدا تاکوو سنووری شێوەگەلێکی بێجمە دائەبەزن. بایەخی واتای گۆڕان بەشێوەیەکی پێویست کێشەی دابین کردنی خالّی سەرەتا، واتە نیسبەتی نێوان گۆڕانو سازبوون (گۆڕانو گەلالە بوون) دێنێتە بەرەوە. هەڵبەت دەبێ لەنێوان توخمەکانی پێکهاتەیەکداو ئەو یاسای گۆڕانانەی چاودێری ئەکەن جیاوازی یەك دابنێین لەو رووەوە کەتوخمو پارچەکانی پێکهاتەکان ئالّوگۆڕیان بەسەردادێ، دەکرێ بەئاسانی بلێین؛ کە خودی یاساکانی گۆڕان، نەگۆڕنو وەك خۆیان دەمێننەوە. تەنانەت لەو چەشنە بنەماخوازیانەدا

کەپڕ بەپێستی وشەکە شێوەیی نەبوون، کۆمەڵی توێژکاری بەرجەستە دەبینینەوە، کە (پرسیاری) سەرچاوەگەلی دەروونی لەلایان هێندە بێبایەخە کە لەنەگۆڕ بوونی یاساکانی گۆڕانەوە دەگەنە (ئاکامی) سروشتی بوونیان. لەم بارەیەوە، بۆچوونەکانی نوام چامسکی نموونەیەکی باشن؛ بەبڕوای ئەو، ڕێزمانە خولقێنەر (زایشی Generative)ەکان بریتین لەچوار چێوەگەلی خوێندنەوەی سروشتیو (فطری)؛ ئەڵێی نەگۆڕ بوون بەپێی میکانیزم گەلی یەکسان بوون بەیان ناکرێن، ئەڵێی پەنابردنەبەر ژین ناسی کە بۆ خۆی ئاکامی ناوەکی گریمانەی (فطرت)ی سروشتیە، لەباری گەڵاڵە بوونەوە، گیروگرفتی تایبەت بەخۆی پێك نەهێناوە، (مەبەست ئەو) گیروگرفتانەیە کەبەلانی کەمەوە بەقەدەر ئەو پرسیارانەی لەبابەت بەیان کردنی دەروون ناسیەوەن ئاڵۆزو نادیارن.

ئێستاکە وادیارە تیۆری گەلی بنەماخوازی دژ بەمێژوویيو دژ بەخولقان (Anti - Genetic) بەشێوەیەکی (ضمنی) هیوادارن لەئەنجامدا بناغەیەکی ریازی، یان مەنتیقی بەتایبەتمەندی ناخاوەن کاتیەوە بۆ بنەما دەستەبەر ببێت. (لەڕاستیدا چامسکی ئەو دابو دەستوورە زمانیانەی لەبەرچاوی گرتبوون هەتا ڕادەی پێکهاتەیەکی شێوەیی (لەسەر بناغەی مەنتیقی جەبر) "دوانە – Monoid" دایبەزاندن). بەڵام ئەگەر ئامانج، داهێنانی تیۆریەکی گشتیە لەبابەت پێکهاتەوە کەبەپێی یاسا دەبێ وەڵامدەرەوەی داواکاریەکانی زانست ناسی نێوان رستەیی بێت، ئەوا کاتێ ئاوقای سیستەمگەلێکی ناخاوەن کاتی وەك گروپێکی ریازی یان کۆمەڵەیەك لەژێر کۆمەڵەکان (زیر مجموعەها) دەبینەوە بەڕاستی ئەبێ بپرسین کەئەم سیستەمانە چۆن پێك هاتوونو چۆن سەلمێندراون، مەگەر بمانەوێ لەمەلەکووتی (ترانساندانتالیزم)دا بمێنینەوە. دەشێ کەسانێك چەند رەگەزێك بەڕاست دابنێن وەکوو سیستەمگەلی پابەند بە (اصول موضوعة) – بەڵام لەڕوانگەی زانست ناسیەوە لەڕاستیدا ئەوانە فروفێڵێکی رندانەو ماقوولانە بەکاردەهێنن. واتە لەسەر شانی ئەو کەسانە رادەوەستن کە لەرابووردوودا سیستەمێکی تێگەیینیان دامەزراندوە. مەبەست ئەو سیستەمەیە کەبەبێ دامەزراندنی هەرچەشنە رەگەزگەلێکی بابەتیی دوور لەکرانە. هەڵبەت گودل (Godel) لەبابەت "بەهێزی"و"کەم هێزی" ڕێژەیی بنەماوە واتایەك بەدەستەوە دەدات کە بەخۆوەگری سەرچاوەی هاوبەشی پێکهاتەکانەو هەروەها شێوازێك پێشکەش دەکات کەگیروگرفتی زانست ناسیەکەی زۆر کەمترە. بەڵام هەر کە ئەم بابەتەمان هەڵبژاردبێ، ناچار ئاوقای کۆمەڵێ کێشەی گەورە ئەبینەوە نەك کێشەی لەبابەت مێژوو، و خولقانی دەروونی پێکهاتەکان، بەڵکو لەبابەت ساختمانەکانیانەوەو پێوەندی نێوان بنەماخوازیو سازکردن خوازی (Constructivism) ئەمەش لەو بابەتانەیە کەدەبێ پێیانەوە خەریك بین.

### 3– خۆڕێکخەری:

وەك لەبەردا گوتمان، سێهەمین تایبەتمەندی سەرەکی پێکهاتەکان خۆڕێکخەریيە، کەپێداویستیەکانی بریتین لەخۆڕاگیریی (Self-Maintenance) و پەیوەندی (بستار: بستگی، تقارب "Closure"). ئەم باسە بەدوان لەمەڕ ئەم دوو تایبەتمەندیيە دەست پێئەکەین. ئەم دووە وادیاری دەدەن کە گۆڕانە ناوەکیو سەربەخۆکانی پێکهاتەیەك قەت لەسنووری

سیستەم تێناپەڕن، بەڵکوو بەستراوەتەوە بەو توخمانەوە کەپێوەندیان بەسیستەمەوە هەیەو لەیاساکانی پەیڕەوی ئەکەن. بۆ روون بوونەوەی بابەتەکە نمونەیەکی دیکە دێنینەوە، لەکۆکردنەوەی هەر جووتە ژمارەیەکی راستەقینە (صحیح) ژمارەیەکی راستەقینەی دیکە پێك دێت. (واتە) ژمارەیەك کەلەیاساکانی "گروپی زیادەیی" ژمارە راستەقینەکان پەیڕەوی دەکات لەم چەمکەدا، دەتوانین پێکهاتە ناوبنێین (سیستەمێکی) داخراو. ئەو چەمکەی لەگەڵ (تصور)ی ئێمە لەبابەت ژێربنەماوە، واتە لەبەرچاوگرتنی پێکهاتەیەك بەناوی ئەندامێك لەپێکهاتەیەکی گەورەتر بەتەواوەتی یەك دەکەوێ؛ بەڵام کاتێ پێکهاتەیەك وەکوو ژێر بنەمایەك کەلەبەرچاو دەگیرێ سنوورەکانی لەناودەچێ، واتە بنەما گەورەکە ژێر بنەماکە ناکاتە بەشێك لەخۆی؛ لە راستیدا (لەیەکانگیر بوونی ئەوانە) کۆنفێد راسیۆنێك پێك دێت کەتیایدا یاساکانی ژێر بنەما هەروەکوو خۆی دەمێنێتەوەو ئەو ئاڵوگۆڕەی کەپێك دێت ئەم یاسایانە بەهێزترو پتەوتر دەکات نەك لاوازتر.

ئەم تایبەتمەندیانە کەچاوەدێری کەری (یاساکان)ن، لەگەڵ جێگرکردنی سنوورەکان ئەگەرچی مادەگەلێکی لەڕادەبەرو نوێساز دەکەن – لەسەر خۆڕێکخەڕی پێکهاتەکان دەلالەت دەکەن. بێگومان هەر ئەم واتایەی دواییە کە تا ئەم رادەیە گرینگی داوە بەئەندێشەی پێکهاتەو ئامانج گەلێکی زۆری لەبوارە جۆراو جۆرەکانی لێکلۆینەوەدا سازکردووە: کاتێ بوارێکی زانست بەرەو سیستەم یا پێکهاتەیەکی خۆڕێکخەر دابکشێ، کتوپڕ مرۆڤ وا هەست ئەکا کە ئەنجام توانیویەتی لەحەقیقەتو ناوەڕۆکی ئەو زانستە (و نهێنی سۆراغکەری ئەو زانستە) بگات. بەڵام خۆڕێکخەری بەشێوەگەلی جۆراوجۆر پێك دێت کەدەتوانین بەپێی پلەی ئاڵۆزی رێكو پێکیان کەین؛ بەم چەشنە ئەگەڕێینەوە بۆ ئەو پرسیارەی لەسەرەتای باسەکەدا لەبابەت پێکهاتەی سیستەم، یان لەدوایین شیکردنەوەی تەرکیبی سیستەم دا هێنامانە گۆڕێ.

لەبالاترین ئاستی (ئاڵۆزی)یەوە دەست پێئەکەین. (هەرچەند بۆی هەیە ئەو شتەی کە ئێمە بەسەری هەرەمی دائەنێین بەبۆچوونی کەسانێکی دیکە بەپانتایی بنەوەی "قاعدە" دابندرێ). لەم ئاستەدا، خۆڕێکخەری لەئەنجامی بەکاربردنی تەواو ئاشکرای ئەو دابو دەستووره پێك دێت کەپێکهاتەی بەرچاوگرتە بەیانو پێناسە ئەکات. وێدەچێ رەخنەمان لێبگیرێ کەباس کردنی خۆڕێکخەری کارێکی بێهودەیە چونکە مەبەست لەخۆڕێکخەری واتا یان یاساگەلی زاڵ بەسەر پێکهاتەی بەرچاوگرتەیە، ئاشکراشە کە ئەم یاسایانە پێکهاتە "رێكو پێك" دەکەن. یاخود مەبەست لەمە، ئەو کەسە ریازی زانە یاخود مەنتیق زانەیە کەلەسەر توخمەکانی سیستەم "کاردەکا" هەروەها ئاشکراشە کەناوبراو لەبارودۆخی ئاساییدا دروست کاردەکا. تەنانەت گریمان هەموو ئەمانە راست بوون، هێشتا پرسیارێك هەردەمێنێتەوە، ئەویش ئەمەیە کە لە بنەمایەکدا مەبەست لە"کارکردن" چیە؟ لەڕوانگەی سایبرنتیکیەوە کارکردن بریتیە لەڕێکوپێکی "تەواو". ئەمە بەم واتایەیە کەلەسیستەمێکی (عملیاتی)دا. هەڵەو چەوتیەکان بەر لەڕوودان دەبیندرێنەوە لادەبرێن چونکە لەو سیستەمەدا لەبری هەر کارێك پێچەوانەکەشی هەیە (بۆ نموونە، کەمکردنەوە پێچەوانەی کۆکردنەوەیە(+n-n=0)، یان بەواتایەکی دیکە

لــەو رووەوە کــە هـــەر کـــارێك دەکـــرێ بەپێچەوانەشەوە ئەنجام بدرێ، کەواتە ئاشـكرایە کـە "ئاکامی هەڵە" نابێ پارچەیەکی سیسـتەم بیت. (ئەگەر n#0-n+#0). کەواتە n#0).

هەڵبەت دەستەیەکی گەورەی پێکهاتـەکان بەتەواوەتی مەنتیقی. یان ریازی نین، بەم واتایـە کە کاری گۆڕان لـەناو ئەوانـەدا بـەپێی زەمـان جێگیر دەبێ، بۆ نموونـەش دەتوانین ئامـاژە بۆ پێکهاتـە زمـان ناسـیەکان، کۆمـەڵ ناسـیەکانو دەروون ناسیەکان بکەین. ئەم گۆڕانانە پـەیڕەوی لەیاسـاگەلێك (یــان لــە "دابو دەســتوورە"، بەواتایـەکی زۆر دروســـت، ســایبرێنتیکیەکەی) دەکات کە بەواتای دروسـتی وشـە نـاکرێ ناویـان بنێین "عملیات". چونکە لەبابەت ئەمانەوە کاری پێچەوانە (بەهەمان ئەو واتایەی کە کاری دابـەش کــردن پێچەوانـــەی کـــاری کۆکردنەوەیـــە) بەتــەواوەتی ناگونجــێ. ئــەو گۆڕانانـــەی لـــەم چەشـنەن بەسـتراونەتەوە بەمامەڵەکردنی نێـوان پێش بینیو راست کردنەوەی (پسخورد).

لەکۆتاییشـــدا، بەواتایـــەکی ســـاکار، دابو دەسـتوورو سیسـتەم گـەلێك هـــەن کەلەســـەر میکانیزم گەلی بنەمایی ساکارترو میکانیزم گـەلی نۆبـەییو ریتمیك دامـەزراون. وەك ئـەو شـتانەی لـەژین ناسـیو ژیـانی مرۆڤـا لەئاسـتی جیاجیـادا بـەدی دەکـرێ. ریتـــم یـــان نۆبـــەش لـــەباری نزیکایـــەتیو دوو پاتەکانـــەوە، خۆڕێکخـــەرن. گـەرچی ئـەم چەشـنە خۆڕێکخەریـە لـە چـاو جۆرەکـانی دیکـەوە سـادەو سـەرەتاییە، بـەڵام خــۆ بەلگــەمان بەدەســتەوە نیــە بۆئــەوەی سیستەمگەلی ریتمێك لـەچوارچێوەی پێکهاتـەکان دەربهاوێین.

ریتـم و رێكوپێـك کـردنو (عملیـات) ســێ چەشـنی گـەورەی خۆڕێکخـەریو خۆڕاگـــرین، ئەگـەر دڵتـان پێوەیە دەتـوان ئەمانـە بەقۆناغـە "راستەقینە"کانی پێك هاتنی پێکهاتەیەك دابنێن هەرچـەند دەشـکرێ ئـەم تـەرتیبی بەرودواییـەش هـەڵ بگێڕینـەوە. واتـە بناغەکـە لەسـەر چەشـنە میکـانیزمێکی (عملیـاتی) شـێوە ئـــەفلاتوونیو ناخـاوەن کـاتی دابمـەزرێ. لـەم "بنچینەیـە"ش بەشەکانی دیکە "هەڵگۆزتە" بکرێ.

پەراوێزەکان:

- ئەو وشانەی لەناو دەقـە کوردیەکـەدا خراونەتـە نـاو کەوانـەوە. هێندێکیـان لەلایـەن وەرگـێڕی کوردیەوەنو زۆر بەشـی لەلایـەن وەرگـێڕی فارسیەوە کراوە.
- ئەم گوتارە لەبنـەڕەتدا بەشی یەکـەمی کتێبـێ "بنەماخوازی"، نووسینی "ژان پیاژە" یە.

*هێنـدێ پـەراوێزو سـەرچاوە لەدەقـە فارسـیەکەدا هـەبوون لەبـەر ئینگلیزی بوونـی سـەرچاوەکانو دەسـت نەکەوتنیان لەکۆتایی دەقەکەدا نەمهێنانەوە.

ناونیشانی سەرچاوە: (مفاهیم بنیانی ساختگرایی) ارغنـون – فصلنامـەی فلسـفی – ادبـی – فرهنگـی – سال اول/ زمستان 1373 شمارەی 4، مترجم مقالە بە فارسی: علی مرتضویان.

# جیهانی کافکایی

میلان کۆندرا

و: عەتا نەهایی

زۆر نووسەر و رەخنەگری بەناوبانگ لەسەر رۆمانەکانی کافکاو جیهانی کافکاییان نووسیوەو هەرکامە لەروانگەیەکی تایبەت بەخۆیانەوە، بەرهەمەکانی ئەو مەزنە نووسەرەیان هەڵسەنگاندووەو نرخاندووە. بەڵام لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی (میلان کۆندرا) نووسەری بەناوبانگی چەك و خاوەنی کتێب گەلی (نەمری) (باری بوون)(پێکەنین و فەرامۆشی) (شۆخی)، (هونەری رۆمان)و.. بەلای منەوە بەپێزترین نووسین لەسەر کافکاو جیهانە ئاڵۆزەکەیەتی. کۆندرا لەم نوسینەدا (کەنموونەی شێوە نوسین و دارشتنی رۆمانەکانیشیەتی) بەبەڵگەهێنانەوە لەژیانی مرۆڤەکان لەکۆمەڵگەی تووتالیتردا، دەڵێ: ((کافکا پەردەی لەسەر میکانیسم گەلیك لەژیانی تایبەتی و کردەوەی مرۆڤ هەڵدایەوە. بۆئەوەیی زانیبێتی لەداهاتوودا، ئەم میکانیسمانە لەشانۆی گەورەی مێژوودا دەوری سەرەکی دەبینن.. کەواتە جیهانی کافکا ئاوێنەی یەکێ لەشیاویە (قابلیت) سەرەتاییەکانی مرۆڤ و جیهانەکەیەتی.))

جیهانی کافکایی وەرگێڕاوی بەشێکی زۆرە لەوتاری (جێیەك لەو قەراغ و قوژبنانە) لەکتێبی (کڵاوی کلەمینتس).

شاعیران داهێنەری شیعر نین، شیعر لەو قەراغ و قوژبنانەدایە، لەدەمێکەوە لەوێدا بووە، شاعیران تەنیا دەیدۆزنەوە.

(یان ئسکاسێل)

1

هاوڕێم (جۆزێف ئسکڤۆرسکی) لەکتێبێکیدا چیرۆکی رووداوێك دەگێڕێتەوە: چەند ساڵێك

دادەچڵەکێ: (ئەوە گەڕاویتەوە؟ دیوتە چیان لەسەر نووسیوی؟)

ئەندازیار ترس لەچاوی سکرتێرەکەیدا دەبینێ. چی لەدەست دێ؟ گورجێ بەرەو نووسینگەی رۆژنامەی (رودە پراڤۆ) دەچێو رۆژنامەگەرەکە دەبینێتەوە. ئەویش خۆی لێگێل دەکاو دەڵێ؛ بەڵێ، بەڕاستی هەڵەیەکی قورسە. بەڵام ئەو تاوانبار نیەو هەواڵەکەیان راستەوخۆ لەوەزارەتی ناوخۆوە پێگەیشتووە. ناچار ئەندازیار بۆ وەزارەتخانە دەچێ. لەوێش پێی دەڵێن کەراستە هەواڵی وا هەیە، بەڵام هیچ پێوەندیەکی بەئەوانو وەزارەتخانەکەیانەوە نیە. ئەو راپۆرتە لەسەرویی راگەیاندنی باڵوێزخانەی لەندنەوە بەوان گەیشتووە. ئەندازیار داوایان لێدەکا بەدرۆی بخەنەوە. پێی دەڵێن؛ ئەوەیان پێناکرێ. بەڵام دڵنیای دەکەن هیچ سەرئێشەیەکی تووش نابێو پێویست ناکا کۆڵی پێوە هەڵگرێ. ئەندازیار بەو حاڵەش نیگەرانە. زۆر ناخایەنێ کەتێدەگا لەنزیکەوە چاودێری دەکەن. گوێ لەتەلەفوونەکەی دەگرنو لەشەقامەکاندا وەدووی دەکەون. خەوی لێحەرام دەبێ. هەموو شەوێ خەونی ناخۆش دەبینێ. تا ئەوەی حەجمینی لێدەبڕێو هەوڵ دەدا بەقاچاغی وڵات بەجێبێڵێ. بەو شێوە دەبێتە راکردوویەکی راستەقینە.

2

ئەم چیرۆکە (کە بۆ هەموو ئەو کەسانەی ئیمڕۆ لەپراگدا دەژین ئاساییە) چیرۆکێکە دەکرێ پێی بگوترێ (کافکایی). ئەم زاراوە لەبەرهەمی هونەریو شێوازو وێنەگەلی رۆمان نووسێك وەرگیراوەو تەنیا پێناسەیەکە بۆ ئەو بارودۆخە (راستەقینە، یان چیرۆکیە) کەهیچ وشەیەکی تر توانای دەربڕینی نیە.


کافکا

لەمەوبەر ئەندازیارێکی پراگی بۆ بەشداری کردن لەکۆنفرانسێك بۆ لەندەن داوەت دەکرێ. کابرا دەچێو لەدانیشتنەکاندا بەشداری دەکاو دەگەڕێتەوە. چەند سەعاتێك دوای گەڕانەوە لەژووری کارەکەی چاوی بە(رودە پراڤۆ) - رۆژنامەی رەسمی حیزبی چەك - دەکەوێو ئەم هەواڵە دەخوێنێتەوە.

(ئەندازیارێکی چەکی کە بۆ بەشداریکردن لەکۆنفرانسێك چۆتە لەندەن، لەنێو رۆژنامەگەراندا دژ بەنیشتمانی سوشیالیستی دواوەو بریاری داوە لەرۆژاوا بمێنێتەوە.)

کۆچی دژی یاسایی بۆدەرەوەی وڵاتو دەربڕینی بیروڕای دژی سوشیالیستی گاڵتەی پێناکرێ. نزیکەی 30 ساڵ زیندانی بەدواوەیە. ئەندازیارە گۆڕین لەپێشدا پێیوایە بەهەڵە چووە. بەڵام نووسراوەکە دەربارەی ئەوە. کاتێ سکرتێرەکەی دێتە ژوورو چاوی پێیدەکەوێ،

زانستی سیاسیو کۆمەڵایەتیو دەروون ناسی بۆ کردنەوەی دەرکەی ئەو بارودۆخە هیچ کلیلێک بەدەستەوە نادا. ئەی (کافکایی) چیە؟ هەوڵ ئەدەم هێندێک لایەنی ئەم دیاردەیە شی بکەمەوە. یەک - ئەندازیاری ئەم چیرۆکە لەبەرامبەر دەسەڵاتێکدایە کەزیاتر لە (لابیرنت) یان هەزار ژوورێکی بێکۆتایی دەچێ. ئەو هەرگیز ناگاتە کۆتایی ئەو هۆڵانەو ئەو کەسە نابینێتەوە کەحوکمەکەی دەرکردووە. بۆیە دەکەوێتە ئەو بارودۆخەوە کە(جۆزف ک) لەحاست دادگا، یان (زەویپێو-ک) (مەساح-ک) لەحاست کۆشک تێی کەوتوون. هەرسێکیان لەجیهانێکدان. لەداموو دەزگایەکی لابیرنتی گەورەدا، کەنەدەتوانن تێیبگەنو نەدەتوانن لەبەری هەڵێن.

نووسەرانی پێش لەکافکا گەلێ جار ئەم داموودەزگایەیان بەمەیدانی کێشەیەک زانیوە کە لەوێدا دژایەتی نێوان بەرژەوەندی جۆراوجۆری تاکەکەسو بەرژەوەندی گشتی خۆی دەنوێنێ. بەڵام لای کافکا ئەو داموو دەزگایە میکانیسمێکە یاسا گەلی تایبەت بەخۆی پەیڕەو دەکا. یاسا گەلێک کە کەس نازانێ کەیو، لەلایەن کێوە دامەزراون. ئەم یاسا گەلە هیچ پێوەندیەکیان بەبەرژەوەندی مرۆڤەوە نیەو کەس تێیان ناگا.

دوو - لەبەشی پێنجەمی (کۆشک)دا، کوێخا مێژووی دوورو درێژی دۆسیەکە بۆ (ک) شی دەکاتەوە. بەکورتی، نزیکەی دەساڵ لەوەپێش نوێنەرێکی ئاوایی پێشنیاری دامەزراندنی زەوی پێوێک (مەساحێک) بەکۆشک دەدا. بەڵام زوو دەردەکەوێ ئەم داخوازیە نابەجێبووەو داخوازیەکیتر لەکۆشک، ئەو پێشنیارەی بەتاڵ کردۆتەوە. بەڵام بەداخەوە دۆسیەی پێشنیاری دووهەم لەشوێنێکی دایەرەکاندا ون بووە، و ساڵانێک لەوەدوا، لەوکاتەدا کە(ک) حوکمی چوونە سەر کارەکەی پێدەگا، دەدۆزرێتەوە. کەواتە (ک) بەهەڵە هاتووە بۆ ئاوایی. جگە لەوەش، ئەگەر پێمان وابێ (کۆشک)و ئاوایی لەچوارچێوەی مەنتیقی ڕۆمانەکەدا تەنیا جیهانی مەبالات پێکراون، بوونی (ک) بەتەواوی هەڵەیە.

لەجیهانی کافکاییدا دۆسیە دەوری نموونەی ئەفلاتوونی دەبینێ. نوێنەری کەسایەتیەکی راستەقینەیە. کەواتە بوونی زیندووی مرۆڤ تەنیا سێبەرێکی وەهمیە. (زەوی پێو-ک)و ئەندازیاری پراگی لەراستیدا سێبەرگەلی دۆسیەکانیانن‌و بگرە لەوەش کەمتر، سێبەرگەلی هەڵەیەکن لەدۆسیەکانیاندا. سێبەرگەلێ کە وەک سێبەریش مافی بوونیان نیە.

بەڵام ئەگەر ژیانی مرۆڤ تەنیا سێبەر بێو راستەقینە لەشوێنێکی دیکە، لەشوێنێکی دوورە دەست، یان نامرۆڤانە بێ، یان تەنانەت بەرزتر لەشوێنی تایبەت بەمرۆڤیش بێ، ئێمە راستەوخۆ پێمان ناوەتە جیهانی ئیلاهیاتەوە. یەکەم رەخنەگرانی کافکا، وەک تەمسیلێکی ئایینی لەرۆمانەکانی دەدوێن.

بەرای من ئەم بۆچوونە هەڵەیە. (راستە هەر کاتێ کافکا باسی بارودۆخی ژیانی مرۆڤ دەکا تەمسیل دەبینێ) بەڵام ئاشکرایە دەسەڵات، هەرکاتێ خوا ئاسایی سەیری خۆی بکا، ئیلاهیاتی تایبەت بەخۆی دادەهێنێ. هەرکاتێ وەک خوا بجووڵێتەوە هەستی ئایینی بەرەو خۆی رادەکێشێ‌و، تەنیا بەزاراوە گەلی ئایین ناسی ئەم جیهانە شی دەکرێتەوە.

کافکا تەمسیلی ئایینی نەنووسیوە. بەڵام هەموو ئەو شتانە کەکافکایین (چ لەچیرۆکداو چ لەژیانی راستەقیندا) لەلایەنی ئایین ناسی - یان رەنگە شێوە ئایین ناسی - جوێ ناکرێتەوە.

سێ - راسکۆلنیکۆڤ، پاڵەوانەکەی داستایۆفسکی توانای هەڵگرتنی باری تاوانەکەی نیەو بۆ گەیشتن بەئاسوودەیی، سزادانی خۆی هەڵدەبژێرێ. ئەمە هەمان بارودۆخی ناسراو بەگەرانی تاوانبار لەشوێن سزای تاوانەکەیەتی.

لای کافکا ئەم مەنتیق و بۆچوونە ئاوەژوو بۆتەوە. سزادراو بەتاوانەکەی خۆی نازانێ. هیچ و پووچی سزاکە هێندەگرانە کەگومان لێکراو بۆگەیشتن بەئاسوودەیی و هێمن بوونەوە دەبێ تاوانێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە. واتە سزادراو لەشوێن تاوانەکەی دەگەڕێ.

ئەندازیاری پڕاگی بەپشکنین و چاودێری کردنی پۆلیس تەمێ دەبێ. ئەم سزایە تاوانی نەکراو دەخوازێ. بۆیە ئەندازیار کەگومانی هەڵاتنی لێکراوە، لەئەنجامدا لەوڵات هەڵدێ. سزا لەئاکاما تاوان دەبینێتەوە.

لەبەشی حەوتەمی رۆمانی (دادوەریدا)، (ك) بێئەوەی بەتاوانەکەی بزانێ، بڕیار دەدا بەهەموو ژیانیدا بچێتەوە. میکانیسمی (خۆ تاوانبارکردن) واتە ئەو میکانیسمە دەروون ناسیە کەهەست بەتاوان کردن لەدەروونی کەسێکی بێتاواندا دەژیەنێتەوە، کەوتۆتە گەڕ. بۆ ئەم میکانیسمە زاراوەی (تاوان وەرگرتن) بەپەسەند دەزانم. گومان لێکراو لەتاوانەکەی دەگەڕێ.

لەرۆمانی (کۆشك)دا، رۆژێك (ئامالیا) نامەیەکی پڕ لەدژوێنی لەپیاوێکی کۆشکەوە پێدەگا. لەتووڕەییان نامەکە دەدڕێنێ. کۆشك تەنانەت بەپێویست نازانێ رەخنە لە کردەوەی (ئامالیا) بگرێ. ترس (هەمان ترس کە ئەندازیار لەچاوی سکرتێرەکەیدا دەیبینی) دەکەوێتە کار. بێئەوەی ئەمرێك لەکۆشکەوە دەرکرابێ، هەموو کەس، خۆ لەهاتوچۆی بنەماڵەی (ئامالیا) دەشارنەوە. وەها کەتووشی نەخۆشی تاعوون بووبێتن. باوکی (ئامالیا) دەیەوێ لەسەر بنەماڵەکەی هەڵقرێ، بەڵام تووشی کێشەو گرفت دەبێ داوەر دەست ناکەوێ. تەنانەت داوەری کردن لەئارادا نیە. بۆ خۆپەراندنەوە، بۆ پاکانەو داوای لێخۆشبوون کردن، دەبێ لەپێشدا مەحکووم کرێ. باوکی بەپارانەوەوە داوا لەکۆشك دەکا تاوانەکەیان پێراگەیەنێ. ئەم کردەوە لەڕاستیدا گەڕانی گومان لێکراوێکە لەشوێن تاوانەکەی. لەم جیهانە شێوە ئایین ناسیەدا، سزا دراوەکان دەیانەوێ پەی بەتاوانەکانیان بەرن.

لەم رۆژانەدا، زۆرجار لەبراگ، کەسێکی پشت گوێخراو ناتوانێ پیشەیەکی هەرە بچووك بدۆزێتەوە. کەواتە حەزدەکا بەرگەیەکی بدەنێ کەتیایدا نووسرابێ، تاوانبارەو نابێ هیچ پیشەیەکی بدرێتێ. بەڵام بێسوودەو دادڕەسێك نادۆزێتەوە. لەبەرئەوەی لەپڕاگدا کارکردن ئەرکێکە یاسا لەئەستۆی هەموو کەسێکی ناوە، ئەو کەسە بەبێکارەیی (تەوەزەلی) تاوانبار دەکرێ واتە تاوانی خۆ لە کار دزینەوەی دەدرێتە پاڵ. سزا پەی بەتاوان دەبا.

چوار - چیرۆکی ئەندازیاری پڕاگی لەچیرۆکێکی تەنز (تەوس) دەچێ. لەگەمەیەك بۆ پێکەنین. دووکەسی ئاسایی (نە دووپشکێنەر، وەك هێندێك وەرگێڕ دەڵێن) بەیانیەك دەچنە گیان (جۆزف ك)و، لەکاتێکدا کەهێشتا لەنێو جێدایە پێی رادەگەیەنن بۆ گرتنی هاتوون و تەنانەت ناشتاکەشی دەخۆن. "ك" مووچە خۆرێکی رێك و پێکە. لەبری ئەوەی دەریان بکا، بەجل وبەرگی نووستنەوە هەوڵ دەدا بەوتارێکی دوورو درێژ خۆی بپەڕێنێتەوە. ئەوکاتەی کافکا بەشی یەکەمی (دادوەری) بۆ دۆستانی خوێندۆتەوە، هەموویان پێکەنیون.

"فیلیپ راس" فیلمێکی سینەمایی - خەیاڵی، لەکۆشك سازکردووە. لەم فیلمەدا "گروچۆمارکس" دەوری "زەوی پێوك" و، "چیکۆ"و"هارپۆ" دەوری بەردەستەکانی دەبینن. بەڕاستی چاکی بۆچووە. کۆمێدی لەجەوهەری هونەری کافکایی جوێ ناکرێتەوە.

بەڵام چارەی دەردی ئەندازیار لەوەدا نیە کەتێبگا چیرۆکەکەی پێکەنین هێنەرە. ئەو وەك ماسیەکی لەداو کەوتوو لەگەمەی ژیانی خۆیدا

گرفتار بووەو ئەم بارودۆخە بەپێکەنین هێنەر نازانن. تەنیا ئەوانەی لەدەرەوەی داوەکەن بەگەمەی تێدەگەن. ئەوەی بۆ ناخی کارەساتەکەمان دەبا، هونەری کافکاییە. ئەو هونەرەیە کە کاکڵەی گەمەکەمان بۆ دەردەخا. مەترسی کۆمێدی.

لەجیهانی کافکاییدا، بەپێچەوانەی جیهانی شکسپێر، کۆمێدی لەبەرامبەر تراژیدی نیە. بەڵکو هەر لەسەرەتادا تراژیدی دەخنکێنێ و، قوربانیەکەی لەتاکە دڵخۆشی ئەو ئاواتە، — دڵخۆشیەك کە لەشکۆی تراژیدی وەگیر دەکەوێ — بێبەش دەکا. ئەندازیار نیشتمانەکەی دەدۆڕێنێ و خەڵك پێی پێدەکەنن.

3

لەمێژووی هاوچەرخدا سەردەمانێك هەیە کەژیان لەرۆمانەکانی کافکا دەچێ. هەر لەوکاتەدا (کارۆڵ کۆسیك)ی فەیلەسووف تاوانی تەقەلای دژی شۆڕشی درایە پاڵ و لەزانکۆی (چارلز) دەرکرا، ژنە گەنجە لایەنگرەکانی دەستە دەستە لەمەیدانی کۆشك، لەدەوری ئاپارتمانە بچووکەکەی خڕبوونەوە. کۆسیك (کەهاوڕێکانی پێی دەڵێن پرۆفیسۆر ك.ك.) هەرگیز پیاوێکی ژن پەسەند، یان مێباز نەبوو. ئەم گۆڕانکاریە سەیرە لەژیانی سێکسیداو، دوا هێرشی رووسەکان، وای لێکردم لەئافرەتێکی رازێنەر کەحەزی لێدەکرد، پرسیار بکەم. ژنە بەشێوەیەکی نیوە گاڵتەجاڕی و، نیوە جیدی پێی گوتم: (هەموو ئەوانەی وا تاوانیان دەدرێتە پاڵ، سەرنج راکێشن.)

ئەمە ئاماژەیەکی وشیارانەیە بۆ (لێنی) لەرۆمانی (دادوەری)دا. ئەویش لە پارسەنگی سەرنجی سێکسی خۆیدا بۆ مشتەریەکانی پارێزەر هۆڵد، ئەم وشانەی بەکاردەهێنا. (ماکس برۆود) بۆ پێداگرتن لەسەر بۆچوونی ئایینی لەبەرهەمەکانی کافکا ئەم بەشە دەگێڕێتەوە: (ك. جوانتر دەبێ، چونکە وردە وردە پەی بەتاوانەکەی دەبا. پەشیمان بوونەوە جوانی دەکا.) ئەگەر ئەم بۆچوونەم بەڕازێنەرەکە گوتبایە پێدەکەنی. (پرۆفیسۆر ك.ك. بێ بچووکترین پەشیمانیەك جوان بوو.)

لێرەدا من خۆشەویسترین هاوڕێم بەشایەت هێناوەتەوە تاڕادەی تێکەڵی وێنەکان، بارودۆخەکان و تەنانەت رستەکانی رۆمانەکانی کافکا لەگەڵ ژیان لەپراگدا بنوێنم.

رەنگە هێندێ کەس بڵێن زیندوویی وێنەکانی کافکا لەپراگدا، بەهۆی ئەو پێشگۆییانەوەیە کەدەربارەی کۆمەڵگەی تووتالیتر کردوویەتی. بەڵام ئەم رایەش پێویستی بەساغ کردنەوە هەیە. بۆچوونی کافکا، بۆچوونێکی کۆمەڵناسی یان سیاسی نیە. زۆر کەس هەوڵیان داوە بەرهەمەکانی کافکا وەك رەخنەیەك لەسەر کۆمەڵگەی پیشەسازی، چەوساندنەوەو لەخۆ بێگانەبوون، رەخنەیەك لەسەر ئەخلاقی بۆرژوازی و کاپیتالیسم، شیبکەنەوە. بەڵام لەجیهانی کافکادا هیچ دیاردەیەکی سەرمایەداری بەدی ناکرێ. پارە ونە. هەروەها دەسەڵاتی پارە، کاسبی، کرێکارانی رۆژمزد، خاوەن مڵکی و کیشەگەلی چینایەتی نابیندرێ.

جیهانی کافکا لەتەك هیچ پێناسەیەك لەکۆمەڵگەی تووتالیتریشدا یەك ناگرێتەوە. حیزب، ئیدئۆلۆژی و سیاسەت، پۆلیس و سوپا، لەبەرهەمەکانی کافکادا نین. کەواتە واچاکە بڵێین جیهانی کافکایی نوێنەری یەکێك لەشیاویەکانی (قابلیت) سەرەتایی مرۆڤ و جیهانەکەیەتی، شیاویەك کەپێوەندی بەقەدەری مێژووییەوە نیەو، کەم و زۆرو، بەشێوەیەکی هەتا هەتایی لەتەك مرۆڤدایە. بەڵام ئەم راست کردنەوانە وەڵامی ئەو پرسیارەیان پێنادرێتەوە کەبۆچی رۆمانەکانی کافکا لەپراگ، لەتەك ژیانی

راستەقینە تێکەڵ بوون و، بۆچی ژنە رازێنەرەکە بۆ مانا بەخشین بەخواستی خۆی چەند رستەیەك لە(دادوەری) دەڵێتەوە؟ ئەوەش لەکاتێکدایە کە لەپاریس ئەو رۆمانانە بەدەربڕینێکی رەمزی جیهان بینی زەینی نووسەرەکەی دەزانن. بڵێی ئەوە بگەیەنێ کەقابیلیەتی مرۆڤ و جیهانەکەی، هەر ئەو شتە واپێی دەڵێن کافکایی، لەپراگ زیاتر هەستی پێدەکرێ تا لەپاریس؟

لەمێژووی هاوچەرخدا مەیلگەلێك هەیە کەجیهانی کافکایی لەچوارچێوەی بەربڵاوتری کۆمەڵگە پێك دێنێ. کۆبوونەوەی رۆژ لەدوارۆژی دەسەڵات، گۆرانی هەموو دام و دەزگاکان بەلابیرنتێکی بێکۆتایی کە لەئەنجامی خۆیدا مرۆڤایەتی لەمرۆڤ بوون دادەماڵێ. حکوومەتە توتالیترەکان، بەشێوەی خرکردنەوەی بەتەماعانەی ئەم مەیل گەلە، پێوەندیەکی نزیکیان لەنێوان رۆمانەکانی کافکاو ژیانی راستەقینە سازکردووە. بەلام ئەگەر لەرۆژاوا ئەم پێوەندیانە بەئاسانی نابیندرێن، لەبەر ئەوەنیە کەکۆمەڵگەی مەردوم سالاری ئیمرۆ کەمتر لەپراگ کافکاییە. بەڵکو بەبڕوای من لەبەرئەوەیە کەهەست بە راستەقینەکردن لێرە بەناچاری ون بووە.

کۆمەڵگەی مەردوم سالاریش بەکردەوە، لەتەك تەقەلای نامرۆڤانەکردن و دیوان سالار کردنا ئاشنان. ئێستا جیهانی ئێمە پێشانگەی ئەم هەوڵ و گۆرانکاریەیە کەرۆمانەکانی کافکا بەشێوەیەکی وەهمی و خەون ئاسا دەینوێنن. بەلام حکوومەتە تووتالیترەکان، وەك زێدەرەویەکەی هەست پێکراوو ئاسایی نیشانی دەدەن.

بەلام بۆچی کافکا یەکەم رۆمان نووسێك بوو کە ئەو رەگ و ریشاڵانەی دۆزیەوە کەدوا مردنی بەشێوەیەکی زەق و دیار لەگەڵ رەوتی مێژوودا یەکیان گرتەوە؟

## 4

هیچ نیشانەیەکی راست لەحەزە سیاسیەکانی کافکا بەدەستەوە نیە. کەواتە حیسابی ئەو لەهەموو دۆستانی پراگی جودایە. لەمارکس بروود، فرانتس و یرڤل، ئیکون ئێرڤین و، هەموو بزاڤە ئاوانگاردیەکان کەبەنێوی ناسینی مێژوو، روخساری داهاتوویان رەسم دەکرد.

ئەی بۆ لەبری بەرهەمەکانی ئەوان، بەرهەمی کافکای تەنیاو (دەروون گرا) کە هەر لەبیری ژیان و هونەرەکەیدا بوو، ئیمرۆ بەنێوی پێشگۆییەکی سیاسی، کۆمەڵایەتی لەزۆر جێی ئەم دنیایە قەدەغەیە؟

رۆژێکیان ئەم رازەم هاتەوە یاد کە لەماڵی کۆنە هاورێیەکم شایەتی رووداوێکی نێو بنەماڵە بووم. هاورێکەم لەساڵی 1951دا، لەدوا مەحکەمەیەکی ئیستالینی لەپراگ گیرابوو. کۆمەڵێ تاوانی درابووە پاڵ کە نەیکردبوو. لەو سەردەمەدا سەدان کۆمۆنیست لەوەها حاڵ و رۆژێکدا بوون. لەهەموو ژیانیاندا وەك حیزبی ناسرابوون، بەلام ئێستا حیزب مەحکەمەی دەکردن. ئەوانیش وەك (جۆزف ك.) بەژیانیاندا دەچوونەوە تاپەی بەتاوانە نادیارەکانیان بەرن و لەئەنجاما پێی لێبنێن. هاورێکەی من توانیبووی خۆی لەمردن رزگاربکا. چونکە ئەو ئازایەتیە سەرسوورهێنەری بوو، کە مل بە(گەران لەشوێن تاوانەکەی) نەدا. دوای پێمل نەبوون بەهاوکاری کردنیان، ئیتر بەکەڵکی مەحکەمەی نمایشی نەدەهات. بۆیە لەبری ئەوەی لەدار بدرێ، زیندانی ئەبەدی بۆ دەرچوو. دوای پانزە ساڵ دانیان بەبێتاوانیەکەیدا ناو، بەریان دا. ئەم ژنە کاتی مەحکەمە منداڵێکی یەك ساڵانەی بوو. دوای ئازادبوون کورێکی شانزە ساڵانەی لەباوەش گرت. لەو کاتەوە هەموو دڵخۆشیەکەی ئەوەبوو لەگەڵ کورەکەیدا بژی. رۆژێك کە بۆ سەردانیان

چووبووم، کوڕەکەی بیستو شەش ساڵانە بوو. دایکی تووڕەو ڕەنجاوبوو، دەگریا. بۆم دەرکەوت کوڕەکەی لەکاتی خۆیدا هەڵنەستاوە. لەدایکیم پرسی: (ئەم گشتە تووڕەییە بۆ مەسەلەیەکی ئەوەندە بێبایەخ؟ ئەمە بۆ گریان دەبێ؟ پێت وانیە زێدەڕۆی دەکەی؟) کوڕەکە لەبری دایکی وەڵامی دامەوە: (نا، دایکم زێدەڕۆی ناکا. دایکم ژنێکی ئازاو بلیمەتە. ئەوکاتەی هەموو بەزین، ئەو خۆڕاگربوو. ئێستا ئەو دەیەوێ کەمن ببمە پیاوێکی تەواو. ڕاستە من لەکاتی خۆمدا هەڵنەستاوم. بەڵام دایکم بۆ شتێکی گرنگتر بەسەرمدا دێ. بۆ چۆن بیرکردنەوەم لەژیان. بۆیە منیش هەوڵ دەدەم ببمە پیاوێك کەدایکم پێی خۆش بێ. ئێوە بەشایەت دەگرمو بەڵێنی دەدەمێ بەدڵی ئەو بکەم.)

ئەوەی حیزب نەیتوانیبوو لەگەڵ دایکی بیکا، دایکە لەگەڵ کوڕەکەی کردبووی. پێملی کردبوو کەپێ لەتاوانێکی هیچو پووچ بنێ. (لەتاوانەکەی گەڕێ)و، لەبەرچاوی خەڵکدا بیسەلمێنێ. من بەسەرسووڕمانەوە سەیری ئەو مەحکەمە بچووکە ئیستالینیەم دەکرد. لەپڕ تێگەیشتم کەمیکانیسم گەلی دەروون ناسیو لەڕاستیدا، مێژوویی (کەبەڕواڵەت نامرۆڤانەنو جێی باوەڕنین) هە مان میکانیسم گەلن کەرێکوپێکی بەبارودۆخی بنەماڵە دەبەخشن.

5

بەئاوڕدانەوە لەنامە بەناوبانگەکەی کافکا بۆ باوکی - کەهەرگیز بۆی نەنارد - زۆر چاك دەردەکەوێ، هەموو ئاگاداریەکانی لەمەڕ سەنعەتی تاوان لەئەستۆنان (القاء جرم)، کەناوەڕۆکی زۆربەی بەرهەمە چیرۆکیەکانیەتی، لەبنەماڵە، لەپێوەندی نێوان فرزەندو دەسەڵاتی شێوە ئایینی دایكو باوك، وەرگرتووە. لەکورتە چیرۆکی (دادوەری) کەپێوەندیەکی نزیکی بەئەزموونی نێو بنەماڵەیی نووسەرەوە هەیە، باوك کوڕەکەی تاوانبار دەکاو ئەمری پێدەکا خۆی بخنکێنێ، کوڕە مل بەتاوانە هەڵبەستە کە دەداو خۆی دەم ئاوی چەم دەدا. یان لەبەرهەمی دوایی، (جۆزف ك.) کە لەلایەن ڕێکخراوەیەکی نەناسراوەوە مەحکووم دەکرێو مل بەسەر بڕینی خۆی دەدا. لەیەك چوونی دوو تاوانی هەڵبەست، دوو شێوە مل دانو دوو ئیعدام.. ئەو هەودا نەپساوەیە کە لەتوتالیتاریسی نێومالّو بنەماڵەی کافکاوە، تا بۆچوونی وردی کۆمەڵایەتی درێژەی هەیە.

کۆمەڵگەی تووتالیتر دەیەوێ سنووری نێوان ناوچەی تایبەتی تاکە کەسو گشتی بسڕێتەوە. هەرچی دەسەڵات تۆختر ڕەشتربێ، حەزدەکا ژیانی دانیشتوانی ئاشکراترو لەبەرچاوتر بێ. ئامانجی ژیانی بێڕازو پەنهان کاری بەئامانجی بنەماڵەی نموونەوە بەستراوەتەوە. هاووڵاتیان بۆیان نیە هیچ لەحیزبو حکوومەت بشارنەوە هەروا کەمنداڵ نابێ هیچ لەدایكو باوکی بشارنەوە کۆمەڵەی توتالیتر لەپڕۆپاگەندەکانیدا بزەیەکی ئاواتەخوازی نیشان جەماوەردا: (دەیانەوێ بە - بنەماڵەیەکی گەورە - بژمێردرێن.)

زۆرجار دەڵێن ڕۆمانەکانی کافکا لەحەزێکی ئاگرین بۆ یەك بوونو پێوەندی پتەوی نێو مرۆڤەکان دەدوێن. تاکە ئامانجی بوونەوەرێکی بێڕەگ و ریشەی وەك (ك) بەڕواڵەت ئەوەیە بەسەر نەفرەتی بەتەنیا مانەوەدا زاڵ بێ. ئەم بۆچوونە جگە لەوەی ڕواڵەتیو ناتەواوە، تێگەیشتن لە ڕۆمانەکەش ئاوەژوو دەکاتەوە. (زەویپێو-ك.) هەرگیز لەبەخۆشەویستی گەیشتنی مرۆڤەکان ناگەڕێ. خۆشەویستی نەگەرەکەو نایەوێ وەك (ئۆرستە)ی سارتر (مرۆڤێك بێ لەنێو مرۆڤەکاندا) بەڵکو دەیەوێ دامو دەزگایەك - نەك کۆمەڵگە - وەری بگرێ. ئەم وەرگرتنەش زۆری تێدەچێ. دەبێ تەنیایی

خۆی رەفز بکاتەوە. ئەمەش لەئاکاما بۆی دەبێتە دۆزەخ: (هەرگیز بەتەنیا نیەو دوو بەردەست کە لەکۆشکەوە نێردراون، هەمیشە لەگەڵیدان. کاتێ بۆ یەکەم جار لەگەڵ "فریدا" ئاشقێنی دەکا، ئەو دووپیاوە لەوێن. لەسەر بانێژەی رستوورانەکە دانیشتوونو سەیریان دەکەن. لەوکاتەوە بۆ ساتێکیش لەشوێنی خەوتنیان جودا نابنەوە.)

دالغەی زەینی کافکا، نەفرەتی بەتەنیا مانەوەنیە، بەڵکو هەڵکوتانە بۆسەر ناوچەی تەنیایی. (کارۆڵ روسیمەن) هەمیشە لەلایەن خەڵکەوە دەست درێژی پێدەکرێ. جلوبەرگەکەی دەفرۆشن. تاقە رەسمی دایکو باوکی دەدزن. لەخەوگەی کوڕان، لای قەرەوێڵەکەی، لەگەڵ یەکتر بەشەڕ دێنو جاروبار بەسەریدا دەکەوون دوو بەرەلا، واتە (رابینسۆن)(دێلارۆ)ش پێملی دەکەن لەگەڵیاندا بژی. بۆئەوەی (برۆنێلدا)ی زەبەلاح بەپرخە پرخی شەوانەی وەڕس کا.

چیرۆکی (جۆزف- ك)ش، بەوە دەست پێدەکا کەدەیانەوێ دەست درێژی بۆ ناوچەی ژیانی شەخسی بکەن: (دوو پیاوی نەناسراو دێنو دەیگرن. لەو رۆژەوە هەرگیز هەست بەتەنیایی ناکا. مەحکەمە بەشوێنیەوەیەو چاوەدێری دەکاو لەگەڵیدا دەدوێ.)

ژیانی تاکە کەسی وردە وردە لەنێو دەچێ هەرئەو رێکخراوە پڕ رەمزو رازە کەبەشوێنیەوەیەتی قووتی دەدا. ئەو مێشکە شاعیر پیشانە کە دەیانەوێ بەبالای نەهێشتنی شتە شاردراوەکانی ژیانی تایبەتیدا هەڵبلێن، نازانن ئەو پرۆسە هەوسار پسێنە. خاڵی سەرەتای دەستپێکردنی تووتالیتاریانیسم لەسەرەتای (دادوەری) دەچێ: (بێ پرس سەربەژووری خەوتنی مرۆڤدا دەکەن، بەهەمان شێوە کەرۆژێ لەرۆژان دایکو باوك سەریان بەژووری خەوتنی منداڵەکەیاندا کردووە.)

خەڵك زۆرجار دەیانەوێ بزانن، ئایا رۆمانەکانی کافکا رەنگدانەوەی شەخسی ترینو تایبەتی‌ترین دژ خوازیەکانی دەروونی نووسەران، یان ناشنامە بۆ (ماشێنێکی کۆمەڵایەتی) بەرهەست؟ ئەوەی وا کافکاییە، تەنیا یەکێك لەو دوو بازنەیە (تایبەتی یان گشتی) نیە. بەڵکو هەردووکیانە. گشتی ئاوێنەی تایبەتیەو، تایبەتی گشتی دەنوێنێ.

6

ئەو کاتە وا ئاماژە بۆ وردەکاریەکانی ئەو کۆمەڵگەیە کەپێك هێنەری روانگەی کافکاییە، دەکەم. جگە لە بنەماڵە، بیر لەو رێکخراوەش دەکەمەوە کە کافکای لاو، ساڵەها تێیدا ژیاوە. واتە ئیدارە زۆرجار پاڵەوانەکانی کافکا بەدەنگو رەنگدانەوەی تەمسیلیی رووناکبیران دەزانن. بەڵام لە "گریگۆرساما"دا هیچ شتێك رووناکبیرانە نیە. ئەوکاتەی وا لەخەو هەڵدەستێو خۆی بە قالۆنچە دەزانێ، تەنیا نیگەرانیەکەی - لەشێوەی تازەشیدا - ئەوەیە کەچۆن لەکاتی دیاریکراودا بگاتە فەرمانگە (دایرە). ئەو جگە لەو نەزمو یاسایە کەپیشەکەی پێ بەخشیوە، بیر لەهیچی‌تر ناکاتەوە. ئەو کاربەدەستێکە. سکرتێرێك. مووچە خۆرێك وەك هەموو کەسایەتیەکانی‌تری رۆمانەکانی کافکا. کەدەڵێم مووچەخۆر، مەبەستم یەکێك لەجۆرەکانی کۆمەڵناسی نیە. (وەك کەسایەتیەکانی زۆلا) بەڵکو وەك شایستەییەکی مرۆڤانە. وەك چەشنێك بیرکردنەوە شێوەیەك بۆ لەژیان گەیشتن.

لەم جیهانە دیوانسالارەدا هیچ داهێنانو تازەگەریەك لەئارادا نیە. ئازادی کردار نیە. تەنیا یاساو ئەمرکردن هەیە. ئەمە جیهانی پەیرەو کردنە.

سکرتێری دیوانسالار ئەندامێکی هەرە بچووکە لەبەڕێوەبەرایەتی فەرمانگەیەکی گەورەتر. کە

ناتوانێ ئاسۆو ئامانجی ئەو فەرمانگەیە ببینێ. ئەمە ئەو جیهانەیە کەهەڵس و کەوتەکان لەوێدا میکانیکین.و، خەڵك لەکردەوەی خۆشیان ناگەن.

لەئەنجامدا سکێرتێری دیوان سالار تەنیا سەروکاری لەگەڵ خەڵکانی بێناو، یان دۆسیەکانیاندایە. ئەمە جیهانی تەجریدە. لەم جیهانە میکانیکیو تەجریدیو پەیڕەوکردنەدا، کەتاکە رووداوی مرۆڤانە چوون لەفەرمانگەیەکەوە بۆ فەرمانگەیەکی ترە، رۆمان دژ بەجەوهەری شیعری حەماس وە بەرچاو دەکەوێ. کەواتە ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە، کافکا چۆن توانیویەتی بەم کەرەسە رەشو، دژ شیعریانە، چیرۆکی سیحراوی بخوڵقێنێ؟ کافکا لەنامەیەکدا کە بۆ (میلنا)ی نووسیوە، ئاوا وەڵام دەداتەوە: "فەرمانگە (دایرە) رێکخراوەیەکی گێلانە نیە. بەڵکو زیاتر لەچوارچێوەی وەهمدایە تا گێلیەتی." ئەم رستە هەڵگری یەکێ لەرازە گەورەکانی کافکایە. ئەو شتێکی دیوە کە کەسیتر توانای دیتنی نەبووە. جگە لە هەموو بەهای دیاردەی دیوانسالاری بۆ مرۆڤ، بۆ بارودۆخو داهاتووی مرۆڤ.

کەواتە رستەی (دیوان سالاری سەر بەناوچەی وەهمە) چ مانایەك دەگەیەنێ؟

ئەندازیاری پراگی دەزانێ هەڵەیەك لەدۆسیەکەیدا، وەك بەردی نێو قۆچەقانی فڕێی داوەتە لەندەن. بۆیە وەك تاپۆیەك، لەکەلێنو قوژبنەکانی شاری پڕاگدا، لە لەشە ون بووەکەی دەگەڕێ. ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەو فەرمانگانە وا ئەو سەری پێداکردوون، وەك لابیرنتێکی بێکۆتایی ئەفسانەکانن.

کافکا بەتێگەیشتن لەو وەهمە کەلەجیهانی دیوانسالاردا بوو، کارێکی کرد کە لەوەپێش کەس بیریشی لێنەکردبۆوە: ئەو کەسە گەلێکی دژ شاعیرانەی لەکۆمەڵگەیەکی دیوانسالاردا کرد بەرۆمان، کە گەورەترین شیعرە. ئەو لەچیرۆکی پیاوێکی ئاسایی کەپیشەی وادە پێدراوی نادەنێ، (ئەمە هەموو چیرۆکی کۆشکە)، ئەفسانە، شیعر، جوانیەکی نەناسراو دەخوڵقێنێ.

کافکا بەبڵاوکردنەوەی زەمینەیەکی دیوان سالار لەهەموو جیهاندا، وێنەیەکی خوڵقاند کەبەشێوەیەکی ئەفسووناوی لەکۆمەڵگەی پراگ – کەپێشتر نەیدەناسی – دەچوو.

هەموو حکوومەتە تووتالیترەکان لەڕاستیدا دایرەیەکی گەورەنو هەموو پیشەکان لەواندا نەتەوەیین. واتە هەموو خاوەن پیشەکان مووچەخۆرن. واتە لە حکوومەتێکی وەهادا هەموو کەس، لەهەر پیشەیەکدا موچەخۆرە. کرێکار، کرێکار نیە. حاکم، حاکم نیە. دووکاندار، دووکاندارنیە. قەشە، قەشەنیە. هەموویان مووچەخۆری حکوومەتن. لەکڵێسەی کۆمەڵگەدا قەشە بە(جۆزف) دەڵێ: (من بەدادگاوە بەستراومەوە.) پارێزەرانی رۆمانەکانی کافکاش کار بۆ دادگا دەکەن. لەپڕاگدا کەس سەری لەمە سوورنامێنێ. کەس پارێزەرێك، چاکتر لەپارێزەرەکەی (ك.) نادۆزێتەوە. چونکە لەپراگ پارێزەران هەوڵ بۆ تاوانباران نادەن. ئەوان پیاوی دادگان.

# راوەدوونانی خۆر

## لێکۆڵینەوەیەکی ئەتنۆلۆجی‌یە دەربارەی قەرەج لە جیهاندا

■ ئالەین راینێر*

● و: تۆفیق عەبدول

قەرەجەکان ریشەیەکی قووڵو پتەویان هەیە لە حەوزی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دا. ئیسپانی‌یەکان وایان ئەزانی یۆنانی - ینو ئەلزاسی‌یەکانی فەرەنسا وایان ئەزانی میسرین، گەلانی ناوەڕاستی ئەورووپاش وایان دائەنا سیخوڕی تورکیان. قەرەج بەزۆریی لەناوچەکانی باشووردا کەمتر بینراون.

ئەمانە گروپێکی رەگەز (Ethnic) یی سەربەخۆن کە سەرچاوەیان ئەگەڕێتەوە بۆ باکووری خۆرئاوای هندستان. هەندێکیان بە چاکی لەناو کۆمەڵگاکاندا تواونەتەوە، وەکو سەماکەرانی فلامینکۆ لە ئەندەلوسو شوتی فرۆشەکان لە یۆنان. بەڵام لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا لە قەراغ شارەکانو گەڕەکە رەشۆکیەکان ئەژین کە لە لایەن خەڵکەوە دژایەتی‌و تەنگەتاو ئەکرێنو جێی گومانن.

### □ راکردن بەدوای خۆردا

کەس نازانێت مێژووی قەرەج لەکەیەوە دەست پێ ئەکات، ئەو فەرهەنگەی دەماو دەم لەناو خۆیاندا ئەیگێڕنەوە نە هیچ شتێك دەربارەی بنەچەیان ئەڵێتو نەهیچ رووداوێکی مێژوویی ئەکاتە پاڵپشتی هەڵکەندنو دەربەدەربوون لە خاکێکی دیاریکراوی باو باوباپیرانیان دا. زمانەکەیان زۆر لە سانسکریتی‌و ئەو زمانانەی ترەوە نزیکە کە لە دەوروبەری

سەدەی دەیەمی پێش زاین دا لەناوچەکانی باکووری هندستاندا قسەیان پێکراوەو کۆمەڵێك وشەی تێدایە کە نیشانەی گەلێکی نیشتە جێی جێگیرن وەك: (ئۆخەر: خانوو، ئۆبار: کیلگە، ئۆفو: زەوی) لە پاڵ هەندێ وشەی تردا دەربارەی پیشەو کارکردن لە بازرگانی دا وەك: (شیناف: ئەکرم، بیکرۆڤا: ئەفرۆشم، پارۆڤاف: ئەگۆڕمەوە - کالاّبە کالاّ) یان لەبواری مۆسیقاو سەمادا وەك: (جیلی: گۆرانی، باشاف: گۆرانی ئەڵێم، خیلاڤ: سەما ئەکەم).

ئەگەر بەوردی تێبینی بکەین ئەبینین ئاسنگەرە گەڕۆکەکانی باکووری هندستان و قەرەجەکانی ئەوروپا کە هەمان پیشە ئەکەن، هەمان شێوازیان هەیەو هەمان کەرەستەی یەکتری بەکاردێنن.

داستانەکانی سەدەی پێنجەم کە لە کتێبی (مێژووی پاشاکانی فارس) ی مێژوونووسی عەرەب حەمزەی ئەسفەهانی و (شانامە) ی فیردەوسیدا هاتون ئاماژە بۆئەوە ئەکەن شەنکال (Shankal) پاشای شانشینێکی بچووك لەدۆڵی گەنج (Gange) لە هندستان کە خەزوری شا بەهرامی چوارەمی پاشای فارس بووە، دە هەزار تا دوانزە هەزار مۆسیقاژەنی بەدیاریی بۆ ناردووە، ئەم هونەرمەندانە لە وڵاتدا سوڕاونەتەوەو مۆسیقایان ژەندووە بەرامبەر، مانگا، و بزنو کەر و گەنمو جۆ بۆئەوەی جێگیر بنو خوو بدەنە کشتوکاڵ، بەڵام وەك ئەگێڕنەوە لەکۆتایی ساڵدا دەرکەوتووە هەرچییان دەست کەوتوە خواردویانەو یەك مشت تۆویان نەکردوە، بۆیە پاشای فارس لێیان رەنجاوەو فەرمانی داوە ژیانیان تەنیا بەگەڕۆکیو مۆسیقاژەنی ببەنەسەر.

زۆر لە بەرهەمەکانی مێژوونووسە عەرەبەکان باس لە کۆچێکی بەکۆمەڵ ئەکەن لە باکووری هندستانەوە بەرەو وڵاتی فارس لەنێوان سەدەکانی پێنجەم تا حەوتەمی زاینی و ئەڵێن چەند تیرەیەکی کۆچەریی کە (بەکرێ گیراو Mercenaries) ی ئیمپراتۆریەتی ساسانی بوون لە زۆنگاوەکانی دیجلە و فورات لە باشووری عێراقدا جێگیر بوون.

لە دەوروبەری ساڵی 670 دا، مواڤیا Moavia یەکەم خەلیفەی ویلایەتی عومەیاد Omayyad، ژمارەیەکی زۆر خێزانی هیندی دورخستۆتەوە بۆ ئەنتاکیەو بەندەرەکانی تری سوریا. چەند جارێکی تریش دورخستنەوەی فراوانی لەو جۆرە رویداوە بۆ هێمن کردنەوەی ئاژاوەکانی دۆڵی ئیندەس Indus و چڕکردنەوەی ژمارەی دانیشتوان لەسەر سنوری ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی لە باکوری سوریا.

بەڵام نەسەلمێنراوە کە ئەو هیندیانە قەرەج بوون، زۆر رێی تێئەچێت قەرەجەکان لە ئەنجامی پەیوەندیکردن بە شەپۆلەکانی سوپای ئیسلام یان مۆسیقاژەندنی گەڕۆکەوە وردە وردە بەرەو خۆرئاوا بلاّوەیان کردبێو هەڵوەریبن و مابنەوە. بەهەرحاڵ لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان ئەوە ئەسەلمێنن ژمارەیەکی زۆر زاراوەی ئێرانی لەناو زمانی قەرەجەکاندا جێگیر بووەو تا ئێستاش بە ژمارەیەکی زۆر لە خێڵەکانیان ئەوترێ (دۆم Dom). وشەی (رۆم Rom) کە لە لایەن ژمارەیەکی زۆری خێڵە قەرەجەکانی ئەوروپاوە بۆ پیاوی خاوەن ژنو ماڵ یان ناوی خێڵەکە بەکاردێت لەوانەیە لە وشەی - دۆم - وە وەرگیرابێت، جگە لەوەش هەموو دیالیکتەکانی قەرەج کۆمەڵێك وشەیان تیایە کە لە زمانی فارسیەوە وەرگیراون وەك (بەخت. Vesh: دارستان، Kangeri: کەنیسە).

بەلێکدانەوەی ئەو داوە زمانەوانیانە، دو هێڵی سەرەکی کۆچو بلاّوبونەوەی قەرەجمان لادروست ئەبێ، دوای ئەوەی ئێرانیان بەجێ هێشتوە:

هێڵی یەکەمیان بەرەو باکووری سوریایان ئەبات و لەوێوە بۆ فەلەستین و دوایش وردە وردە بەرەو میسرو لەوێوە بۆ سوودان. شارێگای پێشبینی کراوی دووەم قەرەجەکان بە قەوقازو ئەرمینیاو ئیمپراتۆریەتی بێزەنتیدا بەرەو ئەوروپا بڵاوە پێئەکات.

## قەرەج لەخۆرهەڵاتی نزیك دا

لێکۆڵینەوەی تەواونەکراوە دەربارەی ئەو قەرەجانەی لەم ناوچەیەدا ئەژین. لە سوریا پێیان ئەڵێن: کوربات، Kurbat، دەربەردەر، لە فەلەستین و لوبنان پێیان ئەڵێن نەوار Nawar، وشەیەکە ریشەیەکی زمانەوانی دیاریی نیە بەڵام هاو واتایە لەگەڵ وشەی دز لە عێراقیش پێیان ئەڵێن دۆمان Doman یان کاولی Kauli.

لە میسریش چەند گروپێکیان لێ ئەژی کە یەکێکیان (غەجەر)ە، رەنگە لە وشەی (کاچۆر catchor) ی تورکیەوە بە واتای کۆچەر وەرگیرابێت. غەجەریەکانی میسر لە بەشی باکووری وڵاتدا ئەژین و زۆربەیان خەریکی رستن و چنینن. تیرەیەکی تریان Halab و خەریکی ئاسنگەری و جامبازی و بەخت گرتنەوەن، لەو ناوچانەی نێوان دەلتای نیل و سودان ئەژین، هەروەها هەندێ نەواریش لە میسر ئەژین.

سەماکەرانیش کەپێیان ئەوترێ (غەواسی Ghawasi) ئەگەڕێنەوە سەر نەوارەکان. (بەهلەوانات Bahlawanat) کە گروپێك هونەرمەندو ئاهەنگ گێڕو گۆرانی بێژی گەڕۆکن لەناوەڕاستی میسری سەروو نزیك هۆزی (لەخور laxor) ئەژین.

قەرەجەکانی خۆرهەڵاتی نزیك کە زۆربەیان موسڵمانن لەگەڵ (البدو) ی عەرەبدا لە دوو رووەوە لەیەك ئەچن: یەکەم هەردوولایان بەردەوام کۆچەرین و بەهیچ جۆرێك نیشتەجێ نابن دووەمیش هەردوولایان هەرچی فەرهەنگو یاساو سەرکەوتن و سەروەرییانە هەیە لە قاڵبێکی شیعریدا دایان رشتووە دەماودەم بەدەنگەوە ئەیڵێنەوە بەتایبەتیش چیرۆکە شیعری (هیلالی Hilali) کە باس لە کۆچ کردنی خێڵەکانی بەدو ئەکات بەرەو خۆرئاوا، لە سەدەی دەیەمی زایینیدا.

زۆربەداخەوە، قەرەج لەلایەن دراوسێ عەرەبەکانیانەوە لەبەر چەند بیانویەکی نابەجێ رێزیان لێ نەگیراوە و ئازاریان داون و زیانیان پێ گەیاندوون، لەوانە: قەرەج بەدرێژی ژیانیان کۆچەری بوون و بەپێی خۆیان چونەتە ناو ناحەزانیان، یان بەهۆی جۆری پیشەکانیان وەکو: مۆسیقاژەنی، کە لای عەرەب پیشەیەکی نەنگو ناشیرینە، سوکە ئاسنگەریی، کە جێگای تێڕامان و گومانە، لەگەڵ سەماکردن کە نیشانەی سووکی و بێ ئابڕوییە.

قەرەجی یەکانی تورکیا یەك توخم و رەگەز نین، قەرەجی کە لە وشەی – قەرە – ی تورکیەوە وەرگیراوە بەواتای رەش لە ئازەربایجان و ئێران و عێراقیش هەن و زۆر نزیکن لە قەرەجەکانی عەرەبەوەو گوزەرانیان لەسەر هەمان کارو پیشەیە وەك مۆسیقاژەنی و عەرەبانچێتی و بێژنگ Sieve دروست کردن و سەبەتە چنین و تەنەکەچێتی Tinsmith و دانسازی، ژمارە یەکیشیان کرێکاری ئەکەن بە تایبەتی لە بواری بیناسازیدا.

قەرەج زۆربەیان موسڵمانی سوننی – ین و لە قەرەجەکانی هۆزی مطرب Motrip کە وشەیەکی عەرەبی یە بەواتای ئاهەنگساز کەمتر ئەگەڕێن و لەگەڵ کوردەکان دا چاك بەیەکەوە ئەسازێن و ئارەزوی تێکەڵ بوونی یەکتری یان هەیە و لە زمانی کوردی ئەگەن و قسەی پێ ئەکەن.

پوشا Posha یان بوشا Boshaلە ئەرمینیاو قەفقاس و چنجنلەری Cingenleri

بەزاری تورکی، بەزۆریی لە بەشی باکووری تورکیا لەسەر سنوری قەوقاس ئەژین. زمانەکەیان لەسەر رێزمانی ئەوروپا وشەکانیان هندیيە. شێوازی گوزەران لای پوشا هەمە چەشنە، هەندێکیان لە شارەکاندا نیشتەجێن‌و خەریکی پینەچێتین‌و بەشێکی تریان لە بازارەکاندا خەریکی بۆیاخچێتی‌و مۆسیقا لێدانن، هەندێکی تریان مامۆستاو ئەندازیارن، ژمارەیەکیان بۆ کرێکاریی وەرزیی وەکو سەپانی‌و چاڕنین رووئەکەنە کەنارەکانی دەریای رەش‌و بەشێکیان لەسەر ژیانی کۆچەری خۆیان بەردەوامن.

پوشاکانی ئەرمینیا مەسیحین، بەڵام پوشاکانی وڵاتانی تر موسڵمانن.

نزیکەی 300،000 تا 500،000قەرەج لە تورکیا هەیە، بەڵام تا ئێستا بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو دەربارەی ژمارەیان لە ئەوروپا لەبەردەستدانیە.

**ئیجیپشیان – Eygeption– ەکانی ئەوروپا. ****

قەرەجی یەکەم جار کە رویان کردە ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی تەنیا لەبەرئەوە نەبو کە خاکەکەیان داگیرکراو بەڵکو لەبەر ئەوەش کە هەر بە سروشت کۆچەریبوون.

بەڵگەی تۆمارکراو هەیە ساڵی 1150. ز لە شاری قسطنطینیة هەبوون. دوسەد ساڵ دوای ئەوە لەو ناوچانەدا کە بەزمانی یۆنانی قسەیان کردووە، بینراون. لە ساڵی 1322 ی ز هەندێ گەڕۆکی خۆرئاوایی باسیان کردووە، لە دورگەی (کریت) بینویانن هەندێ گەڕیدەی تریش بەچاوی خۆیان لە (کۆرفۆ Corfu) و چەند شوێنێکی تری ( پیلۆپۆنیس – Peloponnese) بینیویانن بەتایبەتیش لە (میثونی Methoni) لە شوێنێك کە پێی ئەڵێن (جیپ Gippe یان جیپت Gepte یان لیتل ئیجپت Little Eygept) واتە ریشەکانی وشەی (میسر) یان راستەوخۆ میسری بچوك لەبەرئەوەی خاکەکەی بەپیتە.

یۆنانیەکان پێیان ئەڵێن (ئەستینگانی Astingani) کە وشەیەکە لە بنەڕەتدا ناوی هۆزێکی جادووگەرو بەخت گرەوەی ئاسیای بچوکە. قەرەجەکان زۆر پەیوەستن بە یۆنانەوە.

لە سەرەتای سەدەی پانزەهەمدا، مازاریس Mazaris ی نوسەری بێزەنتی بە یەکێك لە حەوت گروپە سەرەکیەکەی دانیشتوانی ئەو وڵاتەی داناون. زمانەکەیان تا ئێستا کۆمەڵێك وشەی یۆنانی سەدەکانی ناوەڕاستی تیا ماوە کە نیشانەی دێرینی مانەوەیانە لەو وڵاتەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا بە رواڵەت قەرەجەکان جێگیرن، بەڵام تا ئێستا هەندێ گروپیان لە ئەوروپادا هەر کۆچەرین. لە ناوەڕاستی سەدەی سیانزەدا هەندێ خێزانیان لە بولگاریاو هەنگاریا ژیاون.

سووکە ئاسنگەرو زێن دروی قەرەج ساڵی 1348 لە سربیا و ساڵی 1362 لە دوبرۆڤنیك باسیان کراوە. هەمان سەردەم ژمارەیەك قەرەج کۆیلەی میری (والاچیا Wallachia) بون، بەڵگەیەك هەیە لەسەر کۆچێکی گەورەتر بۆ شاری کرۆنستاد، – کە ئێستا لە رۆمانیا بە براسۆف ئەناسرێ – لە ساڵی 1416 ی ز جگە لەوەی هەمان ساڵ سەد قەرەجی مۆلداڤی رویان کردە ئەو شارە. ساڵی دواتریش چەند کۆمەڵێکی تریان پەڕینەوە هەنگاریاو بۆهیمیا، دواتریش بۆمەڵبەندە بازرگانیەکان‌و شارەکانی ناوەڕاستی ئەڵمانیا، تا ساڵی 1419 کە پەڕینەوە بۆ فەرەنسا سێ ساڵ دوای ئەوە لە رێگای بۆڵۆگناوە چونە رۆما، قەرەجە میسریەکان ساڵی 1447 لە بەرشلۆنە هەبون، بەڵام وەکو هەموو خێڵە قەرەجەکانی تر. لە وڵاتی میسری ئەفریقاوە نەهاتون، بەڵکو سەرچاوەیان

ئەگەڕێتەوە بۆ میسری بچوك لەیۆنان. وشەی ئیجپشیان وەكو وشەی بۆهیمیان – واتە بۆهیمیەكان بوە بە نازناو و ناسنامەیان‌و تازە لێیان نابێتەوە – هەر ئەم وشەیەیە گۆڕاوە بۆ (ئیجیتانۆ Eygitano و دواتر بۆ (جیتانۆ Gitano لە ئیسپانیاو (جیتان Gitan) لە فەرەنسا و (جیپسی Gypsy) لەبەریتانیا.

لەسەرەتای سەدەی شانزەدا قەرەج لە هەموو شوێنێكی ئەوروپادا هەبون، چالاكی‌و هونەری‌و بازرگانی بەردەوام‌و بەربلاویان هەبوە، بەتایبەتی لەولاتەكانی بەلقاندا بەخێرایی‌و فراوانی جێگیربون، بەتایبەتی تریشی لەمەسەدۆنیاو (Thrace). هەندێكی تریان لە ئیسپانیا خۆیان دروست كرد، لەكاتێكدا لە ساڵی 1499 وە مەلیكە كاسۆلیكەكان ئەیانویست ناچاریان بكەن لە ناوكۆمەڵگا ناوخۆییەكاندا بتوێنەوە.

كۆتایی هاتنی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و داگیركردنی ئەورووپای ناوەڕاست لەلایەن سوپای توركەوە بوە هۆی رامالینی قەرەج‌و جێگیربوونیان بە ژمارەی زۆر لەسەر پشتێنەی سنوریی لە كراواتیاوە بۆ ئۆكراین‌و لەدروست كردنی سەنگەرو قەلاو پیشەسازی‌و خزمەتگوزاریی سەربازیدا دەستیان كرد بە كاركردن. هەندێكیان لە لادێكاندا لەناو خێزانە جوتیارەكاندا توانەوە. هەندێكی تریان رێگایان پێدرا لە هەنگاریاو شارە سلۆڤاكیەكاندا دوكانی ئاسنگەری دابنێن.

هەندێ لە مۆسیقاژەنەكان دەستیان كرد بە كاركردن لە سوپا مەسیحی‌یەكاندا. لەسەر بانگهێشتی هەنگاریەكان‌و دواتریش دەسەلاتدارانی نەمسا ژمارەیەك قەرەج لە ترانسلڤانیا جێگیربون، خەریكی شۆردنەوەی ئاڵتون بون لە لاپالەكانی بەشی باكوری چیاكانی Carpath و دەستكەوتێكی باشیان ئەبوو.لە سەدەی شانزەدا زۆر لە خێزانە قەرەجەكان لە میرنشینەكانی مۆلداڤیا و والاچیا جێگیر بوون، لەكاتێكدا بازرگانی كۆیلایەتی لە لوتكەی توندوتیژی‌و برەودا بوو. زۆری تریشیان بەرەو ناوچە گەمارۆدراوەكان هەلاتن. لەژێر سایەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا قەرەجەكان پلەو پایەیەكی كۆمەلایەتی باشیان هەبوو، لەبەرئەوەی باج نەدەن وەكو گروپێكی رەگەزیی (عرقي) تۆمار كرابوون، نەك گروپێكی ئاینی.

لە بۆسنی قەرەجەكان كە لە كانەكانی ئاسندا كاریان ئەكرد لەلایەن سولتان سەلیمی دوەمەوە باجیان لەسەر هەلگیرابوو. لە ئەستەموڵ قەرەجەكان بونە ئەندامی دەزگای فرۆشتنی ئەسپ‌و ولاخی بەرزەیان بۆ هێزی سوارەی سوپای تورك دابین ئەكرد.

لە Skopje قەرەجەكان لە كانەكانی خوێ بەردین Saltper (واتە نەتراتی پۆتاسیۆم یان سۆدیۆم. ت.ع) كاریان ئەكرد كە بۆ دروست كردنی باروود بەكاردێت.

لەگەڵ ئەوەشدا گەرۆكیی خێلەكان بەربەست نەكراوە بەلام توركەكان هەولی زۆریان داوە لەلادێكاندا ئۆردوگایان بۆ بكەنەوەو جێگیریان كەن‌و لە شارەكانیشدا گەرەكی تایبەتی (Mahalet) یان بەپێی هۆزو ئاین بۆجیا بكەنەوە.

قەرەجەكان بەتایبەتی زۆرینە موسلمانەكەیان زۆر پۆستیان گرتۆتە دەست‌و بەشداری بنیات نانی كەلتوری گەلانیان كردوە بەتایبەتی لەبواری مۆسیقادا، هەندێكی تریشیان چالاكی ئابوری‌یان بووەو كارامە بوون تیایدا بەهۆی ئەوەی ئامادەیی‌یەكی خۆرسكیان هەبووە لەكوێ كارو بازرگانی هەبێ بە دوایدا بگەڕێن‌و بۆی بچن.

بارودۆخی گوزەرانی قەرەج لە ئەورووپای خۆرئاوادا لەسەرەتای سەدەی شانزەدا دەستی كرد بە ئالۆزبوون‌و شێوان لەكاتێكدا دەسەلاتدارانی ناوخۆ بریاری ئەوەیان دا كۆیان

بکەنەوەو ناچاریـان بکـەن جێگیربن. ئـەو هەوڵـە نابـەجێو پاکتاوکردنـە لەسـەدەکانی دواتریشـدا بەردەوام بون.

لـە سـاڵی 1539 دا فرانسـزی یەکـەم (Francis 1) قەدەغـەی کـرد بۆهیمییـەکان لـە فەرەنسادا بمێننەوە. لە ساڵی 1647 دا، لویسی چواردە (LouisXIV) رایگەیاند کەس بـۆی نیـە بۆهیمی بێتو ئەوە تاوانی مەزنە و بـەپێی یاسا سزا ئـەدرێت. لـە ئیسپانیا هـەوڵ درا ناسنامەی قـەرەج بسـڕێتەوەو لـە سـاڵی 1633 دا ئـەو هەڵمەتە گەیشتە لوتکە.

لـە سـەرەتای سـەدەی هـەژدەدا زۆربـەی قەرەجـەکانی ئیسـپانیا دەسـت بەسـەرکران‌و لـە ماڵەکانی خۆیاندا بەند کران. تـەنیا بۆیـان هـەبوو خۆبـەخۆی خۆیـان لـە کێڵگـەکاندا کاربکـەن‌و رێگایـان پـێ نەئـەدرا لەگـەڵ خـەڵکدا یـەکتری ببینن‌و تێکەڵ ببن.

لـە سـاڵی 1749 دا چـەند شـاڵاوێکی دەسـگیرکردنی قەرەجـەکان جێبـەجێ کـراو ژمارەیـەکی زۆریـان لـێ گـیراو راپێچـی جبەخانـەکانی هـێزی دەریـایی کـران‌و حوکمـی (هەتا مردن کار کـردن) یـان بەسـەردا سـەپاندن، کە بوە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان رەو بکەن بەرەو مـەراکش و ئـەوانی تریش لـەژێر گوشاری خەڵك و دەسەڵاتدارانی ناوچەییدا ئازادکران دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت هونەری مۆسیقای میللی لە فەوتاندایە.

لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدە بـەدواوە ماریا تیریزای شاژنی نەمسا سیاسەتێکی (پاتێرنالیست - Paternalist)، واتـە (خۆبـە بـاوکی میللـەت زانـین) انـەی گرتـە بـەر بـۆ پاکتـاوکردنی قـەرەج بـەوەی ناچاریـان بکـات: نیشـتەجێ بـبن، مناڵـەکانیان دوور لـە خێزانـەکانیان بخرێتـە بـەر خوێنـدن، قەدەغـەکردنی بـەکارهێنانی هـەر رواڵـەتێکی کـەلتوری وەك زمـان‌و جـل‌و بـەرگ‌و مۆسیقاو هەموو ئەو پیشانەی پێی ناسراون.

ئـەم سیاسـەتانە لەسـەردەمی جوزێـف ی دوەمی کوڕی شاژنە ماریادا هەر بەردەوام بوو.

زۆر لـە قەرەجـەکان کـە پـێیـان ئـەوتن (هەنگاریە نوێیەکان) روویان کـردە ترانسلڤانیاو باشووری سلۆڤاکیاو لـەوێ بـوون بـە خزمـەتکارو کارەکـەرو هـاوڵاتی پلـە دووی دانیشـتوانی ناوچەکە.

## شەپۆلی نوێی کۆچ کردن

قەرەجەکان لە سەدەی نـۆزدەدا جارێکی تـر دەستیان کـردەوە بـە جـم‌و جـوڵ و کـۆچ کـردن، جامبازەکـانی ئـاژەڵ و برێنگچـی – مـەڕبڕەو (Sheep sheaers) ەکـانی هـەرێمی کـەتالۆنیای ئیسـپانیا رویـان کـردە باشـووری فەرەنسا.

ژمارەیەك لـە خێڵـی (Sinti) یش بـە هـەمان شێوە پیرمۆنت و دۆق نشینی ساڤۆی یان بـەجێ هێشت، وردە وردە قەرەجەکانی ئەلزاس‌و لۆریـن – یش دوایان کـەوتن‌و رویـان کـردە هۆڵـەنداو ئیتالیا. چەند خێڵێکی تر گەڕانەوە بۆ فەرەنسا و لـەوێوە لـە ئیسـپانیا پەڕینـەوە و کردیـان بـە رێگایەکی سەرەکی بۆ ئەرجەنتین.

هـەندێ لـە قەرەجـە ئەندەلوسـیەکان دوای قەرەجـەکانی ئیسپانیا کـەوتن بـەرەو جـەزائیرو فەرەنسـیەکان لەناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـاندا داڵدەیـان دان. هـەندێك لەقەرەجـە موسـڵمانەکان لەئـەنجامی شـڵەژانی بـارودۆخ‌و هەڵگەڕانـەوەی سـربەکان لـە دژی تورکـەکان، هـەڵاتن‌و لـە هـەندێ ناوچـەی تـر گیرسـانەوە کـە هێشتا لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا بوون.

گـەورەترین شـەپۆلی کـۆچ کـردن ئـەو کاتـە دەستی پێکرد کە سیستمی کۆیلایەتی لە رۆمانیا هەڵوەشێنرا. پرۆسـەی ئـازادکردن لـە کۆتـایی سەدەی هەژدەدا لـە هـەرێمی (Constantine Mavrocordat) ەوە دەسـتی پێکـردوە لـە ساڵی 1856 دا کۆتایی هات.

دوای ســاڵی 1830 ژمارەیــەکی زۆر لــە قەرەجە (بێگاری‌یەکان ئەوانەی بە نانەسکی کار ئەکەن بەبێ بەرامبەر) رویان کردە سربیا.

زۆری تریش لە هەمان سـەردەمدا ترانسلڤانیا و بولگاریایـان بـەجی هێشـت. یەکـەم هـۆزی قەرەجی رۆمانی (مس گەر Copper Smith) و جامبـازی ئەسـپ لـە خۆرئـاوا سـاڵی 1886 بینرلەولی جـەنگی نێـوان پروسـیا- نەمسا- هەنگاریا خێڵە کۆچەرییەکانی تریش بـەرە بـەرە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیان بەجێهێشتو بەهـەمان ئاراستە بڵاوەیان کرد.

خواروژوور خولانەوەی خێڵە کۆچەریـەکان لـە ئـەوروپا هێزەکـانی حکومەتـەکانیان ناچار کـرد رێبازەکانی توندوتیژیی بـۆ کۆنـترۆڵ کردنیـان بگرنەبەر. لـە سـاڵی 1888 دا وەزیـری نـاوخۆی نەمسا فـەرمانی دەرکـرد سـوپا چارەســەری کێشەی (هەڕەشەی قەرەج) بکات.

لە فەرەنسا لـە ئـازاری 1895 دا گـەورەترین سـەرژمێری بۆهیمیـیـەکان کـرا، بەمەبەسـتی رێکخسـتن‌و جلـەوکردنیان ژمارەیـەکی زۆر لـــە ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی پێشنیاریان کـرد رێ‌و شـوێنی تونـدو تیژتـر بگیرێتـە بـەر بـۆ خۆپاراستن لەمەترسیی قەرەج.

لە ساڵی 1912 یاسایەکیان دارشت سەبارەت بــە دیــاریکردنی رواڵەتــە سروشــتی‌یەکانی ناسینەوەی قەرەج و پۆلێن کردنیـان بـەگوێرەی لەیەک چوونی ئەو رواڵەتانە.

لە زۆر وڵاتدا قەرەجەکان راو ئەکران‌و بـە دزو خۆپەرسـت و درنـدەو ناکۆمەڵایـەتی لەقەڵـەم ئەدران. نازی‌یەکان وایان تێ ئەڕوانین کە قـەرەج بەخۆرسك درندەن‌و پێش ئەوەی بڕیـاری کۆتـایی چارەنووسـیان بـدەن لیسـتی رەشـیان بـۆ نـاو و ناونیشان‌و سیفاتە بایۆلۆجی‌یەکانیان ئامادەکرد.

لـە جـەنگی جیـهانیی دووەمـدا نزیکـەی 500،000 تا 600،000 قەرەج لەسەردەسـتی ئەڵمانەکان‌و هاوپەیمانان دا تیاچوون.

ئوسـتاش (Ustashe) ە کراوتیـەکان لــەو جەنگەدا بنەبڕ بون، بەتایبەتی ئەوانەی لە کەمپی یاسینۆڤاك - ی نزیك شاری زەگریب دا گـیرابوون قەرەجـە سربیەکانی ناوچەکانی ژێر دەسـەڵاتی نازیەکان تووشی هەمان چارەنووس هاتن، چـەند هـەزار منداڵێکیـان لەکـەمپی زیمۆن دا کە زۆر لـە بـەلگرادەوە دورنیـە، قڕکـران. لـە کۆسـۆڤۆش ئەلبانیـەکانی پـەیڕەوانی نـازیزم کەوتنـە رەشەکوژی قەرەجەکان.

ژمارەیەکی زۆر لە قەرەجە رۆمانەکان لەلایەن رژێمی ئەنتۆنیسکۆ ی فاشستەوە گوێزرانـەوە بۆ Transdniestaria و لـەوێ 36 هـــەزاریان مردن.

لەگـەڵ ئـەو هـەموو شـاڵاوی لـەناوبردن‌و تۆقاندنـەدا، قەرەجـەکانی بولگاریـا لەلایـەن حوکمەتەوە لە راگوێزان و ئیبادەکردن پارێزران.

** نـەمانووت قەرەجـە میسـریەکان، چونکـە ئـەو وشەیە ناوی تری لێ‌وەرگیراوە پەیوەندی بە ئاوازی وشە ئینگلیزیەکەوە هەیە. ت ع

* Alain Reyniers، رەگـەزناس (Ethnologist) و بەڕێوەبەری ئیدارەی گۆڤـاری Etudes Tsiganesو مامۆستای زانکۆ ی - Louvain – La- Neuveە.

سەرچاوە:

Chasing After the Sun PP 82 –88، ژمارە 3 ی گۆڤـاری Rive ی سـاڵی 1997، کـە گۆڤـارێکی وەرزی یـە دەربـارەی کـەلتورو سیاسـەتی خۆرهـەڵاتی ناوەڕاست، لە زانکۆی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ئیتالیا بە زمانەکانی فەرەنسی‌و ئیتالی‌و ئینگلیزی دەرئـەچێت. ئـەم بابەتە بەشی یەکەمە لە لێکۆڵینەوەیەك لەو ناونیشانە. لە گۆڤارەکەدا هاتووە بەشی دووەمی لە ژمـارەی داهـاتوودا بڵاوئەکرێتەوە، بەڵام بەداخەوە من لـەم ژمارەیـە زیـاتری ئەو گۆڤارەم نەدیوە. ئەگینا هەردوو بەشەکەی بەیەکەوە ئەکرد بە کوردی.

# لەئەدەبی گەلانەوە

- باوکم لەتاریکاییدا دادەنیشێ

- چەپکێ شیعری سوێدی

# باوکم لە تاریکاییدا دادەنیشێ[7]

■ جیرۆم ویدمەن

• و: عەبدولخالق یەعقووبی

"باوکم لە تاریکاییدا دادەنیشێ" ناوی یەکەمین کورتە چیرۆکی "جیرۆم ویدمەن"ە (Jerome Weidman)، کە دواتر بوو بەناوی کۆمەڵە چیرۆکێکی چاپکراوی. وەختی خۆی ئەم چیرۆکە لە گۆڤاری Story(چیرۆک)، نوامبری 1934، ئەوکاتەی نووسەر 31 ساڵان بوو، بڵاوبۆوە. جیرۆم ویدمەن لەم تەمەنەدا بە رۆژ کارو کاسبی دەکرد و بە شەویش دەچوو بۆ پۆلی شەوانەی زانستگای نیۆیۆرك.

ویدمەن 4 ی ئاگوستی 1913 لە نیۆیۆرك لەدایكبوو. لە سەرەتاوە تا کۆتایی کاری نووسینیشی هەوڵی داوە زەمینە و هەوێنی نووسراوەکانی شاری نیۆیۆرك بێ. ساڵی 1943 پاش ماوەیەك بە رەبەنی ژیان، لەگەڵ "پێگی رایت" – peggy Wright – ژیانی هاوبەشی پێك هێنا. هێندێك لە ئاسەواری ویدمەن بریتین لە: "بۆ من چی تێدایە؟" ،" چیتر ناچم بۆ ئەوێ" ، "چراکانی دەوری کەنار" ،" زۆر درەنگە بۆ وتن" ، "بە بری کاپیتان" (کورتە چیرۆك)، "نرخەکەی راستە" ، "دەستی راوچییەکە" ،"فریشتەی سێهەم" "کچەکەت ئیرس" و "ئۆردووگای دوژمن".

جیرۆم ویدمەن کە بەرەگەز جووە و لە ئامریکا نیشتەجێیە زۆرتر لە بارودۆخی رۆحیی جووە پەنابەرەکانی ئامریکا و دژوازی (paradox) فەرهەنگی ئەم نەوەیە دەکۆڵێتەوە. لە شێوازی ئەدەبی ویدمەن دا تێڕوانینی کومێدی (Comic) تێکەڵ بە راستەقینەکانی ژیان دەبێ. لەم چیرۆکەش دا هەڵسوکەوتی بە رواڵەت سەیرو و سەمەرەی پیاوێك بۆ کورەکەی دەبێتە رازێکی سەرسوورهێنەر، ئەو پیاوەی زەینی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منالی و وڵاتی پێشووی خۆی و ئاسوودەیی ئێستای بەپێی خووخدەی رابردووی دابین دەکرێ و...

-وەرگێڕ- رەشەمەی 1377
مارس 1999

باوکم خووخدەی تایبەت بەخۆی هەیە. پێیخۆشە بە تاقی تەنێ لە تاریکایی‌دا دانیشێ. جاری وایە من درەنگ دێمەوە ماڵێ، ئەودەمەی ناوماڵ تاریك وتنۆکە. بە هێوری و لە سەرەخۆ وەژوور دەکەوم. دەڵێم بەشکم خەوی دایکم نەزڕێنم، ئاخر دایکم زۆر خەو سووکە. بە ئەسپایی دەچمە ژوورەکەم و لە تاریکایی دا کراس و پانتۆلەکەم دادەکەنم. دەچم بۆ ئاشپەزخانە لێوانێك ئاو بخۆمەوە. بەپێی پەتی و بێدەنگ و هەرا. هەرکە دەگەمە بەر دەرگای ئاشپەزخانە لاقم لە لاقی باوکم دەنگێوێ و بەعەرز دادەکەوم. باوکم لەسەر کورسییەکی ئاشپەزخانە دانیشتووە و ژێر کراسەکەی لەبەردایە و سەبیلەکەشی بەدەستەوەیە.

من دەڵێم: "بابە سڵاوت لێبێ."

"سڵاو کوڕم"

"ئەوە بۆ ناچی بخەوی بابە؟"

وەڵام دەداتەوە: (دەچم).

هەر لەوێ دەمێنێتەوە. تەنانەت زۆر پاش ئەوەیکە من خەوم لێدەکەوێ، دەتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم هەر لەوێ دەمێنێتەوە و جگەرە دەکێشێ.

زۆرجار لە ژوورەکەم دا خەریکی خوێندنەوەم. گوێم لە دەنگی دایکم دەبێ ئێوارە تاریکانێ دێتەوە ماڵ. گوێم لە دەنگی براچکۆلەکەم دەبێ کە دەچێ بخەوێ. ئاگام لە خوشکم دەبێ دەچێ بۆ ژوورەکەی خۆی. ئەوەندە خۆی بەشانەو ئاوێنەکەیەوە خەریك دەکا تا بێدەنگ دەبێ. ئەوسا دەزانم خەوی لێکەوتووە. دوای چەند ساتێك گوێم لە دەنگی دایکم دەبێ شەو خۆش بە باوکم دەڵێ و دەچێ دەخەوێ. درێژە بە خوێندنەوەکەم دەدەم. پاشان تینووم دەبێ. (من ئاو زۆر دەخۆمەوە.) دەچم بۆ ئاشپەزخانە لێوانێك ئاو بخۆمەوە. دیسان لاقم لە لاقی باوکم هەڵدەکەوێ و بەعەرزدا دەکەوم. زۆرجار یەك بەخۆم هەڵدەبەزمەوە. هەر لەبیرم نابێ باوکم لەوێیە. ئەوە باوکم لەوێ جگەرە دەکێشێ، دادەنیشێ و بیردەکاتەوە.

"ئەوە بۆ ناچی بخەوی بابە؟".

"دەچم کوڕم".

بەڵام ناچێ. هەر لەوێ دادەنیشێ و جگەرە دەکێشێ و بیردەکاتەوە. زۆری بۆ بە پەرۆشم. لە ریس و گوریس ناگەم. بڵێی بیر لە چی بکاتەوە؟ جارێکیان لێم پرسی:

"بیر لە چی دەکەیتەوە بابە؟"

وتی: "هیچ"

جارێکی هەر لەوێ جێم هێشت و چووم خەوتم. چەند سەعات دواتر خەبەرم بۆوە. تینووم بوو. چووم بۆ ئاشپەزخانە. هەر لەوێ بوو. سەبیلەکەی کووژابۆوە. بەڵام هەرلەوێ دانیشتبوو.

چاوی لە گۆشەیەکی ژوورەکە بڕیبوو. پاش ماوەیەك چاوم بە تاریکایی راهات. ئاوەکەم خواردەوە.

باوکم هەر لەوێ دانیشتبوو، چاوی بڕیبووە ئەو سووچە. چاوی نەدەتروکاند. پێم وا هەر بە منی نەزانیبوو. ترس لە دڵم رۆنیشت.

"ئەوە بۆ ناچی بخەوی بابە؟

وتی: "دەچم کوڕم. چاوەڕێی من مەبە" وتم: "ئاخر ئەوە تۆ چەند سەعاتە لێرە دانیشتووی. چ قەوماوە؟ بیر لە چی دەکەیتەوە؟"

"هیچ کوڕم. هیچ نیە. ئاوا دەحەسێمەوە. هیچی تر."

بەجۆرێك ئەمەی پێ دەگوتم رازی دەبووم. بە رواڵەت خەمبار نەبوو. لەبز خۆش و قسە جوان بوو. هەمیشەش وایە. بەڵام لەم ریس و گوریسەی ناگەم. چۆن دەتوانێ ئاوا بحەسێتەوە، ئەویش بەتاقی تەنێ و لەسەر کورسیەکی نالەبار و ناخۆش و لە تاریکایی شەو و نیوەشەودا؟ ئەوە دەبێ چبێ؟

بیر لە هەموو لایەنێکی دەکەمەوە. خۆ نابێ لەسەر پوول و پارەبێ. خۆم دەزانم. دیارە پوولمان زۆر نیە، بەڵام وەختێك پەرۆشی بێ پوولی بێ زوو دەیدرکێنێ. نابێ نەخۆشیش بێ. بێت و نەخۆش بێ دەنگ دەکا. خۆ کەسیش لە بنەماڵەمان دا ناساغ نیە. هێندێك دەس کورتین، بەڵام هەموومان ساغ و سلامەتین. (دایکم پێمان دەڵێ شوولکی تەڕ). ئەی دەبێ هی چبێ. بەداخەوە سەری لێدەرناکەم. بەڵام ئەم پێنەزانینەم لە خەم و خەیاڵم کەم ناکاتەوە.

رەنگە بیر لە براکانی بکاتەوە لەو وڵاتە کۆنە، یان دایکی و دوو زڕدایکەکەی، یان باوکی، باشە خۆ ئەوان هەموویان مردوون. ئیتر بۆ دەبێ ئاوا بۆیان بەپەرۆش بێ، وتم بە پەرۆش، کەچی ئەوەی راستی بێ وانیە. ئەو بەپەرۆش نیە، تەنانەت وێدەچێ هەر بیر لە هیچ نەکاتەوە. زۆر هێدی و هێمن دەنوێنێ. رەنگە زۆر بەکەیف نەبێ، بەڵام ئەوەندە ئارام و لەسەرەخۆیە پیاو ناتوانێ بڵێ بەپەرۆشە. شایەد هەر وابێ بۆخۆی باسی دەکا، رەنگە ئاوا بحەسێتەوە. بەڵام شتی وا هەر نابێ. زۆری بۆ پەرۆشم.

بریا ئەوەندەم زانیبا بیر لە چی دەکاتەوە. خۆزگە زانیبام بڵێی هەر بیر بکاتەوە. رەنگە نەتوانم بارێکی لێسووك کەم. شایەد هەر پێویستیشی بە یارمەتی من نەبێ لەوانەیە هەروابێ خۆی باسی دەکا. رەنگە ئاوا بحەسێتەوە. بەڵام شتی وا هەرنابێ. زۆری بۆ پەرۆشم.

باشە بۆ دەبێ راست لەوێ دانیشێ؟ لەو تاریکاییەدا. بڵێی نەخەرەفابێ؟ نا، جا چۆن شتی وا دەبێ، تازە پێی ناوەتە تەمەنی پەنجاوسێساڵی، وەك هەمیشەش زەین و مێشکی باش کار دەکا. راستت دەوێ لە هەموو بارێکەوە ساغ و سەلیمە. هێشتاکەش سوپی چەوەندەری پێخۆشە. ئێستاش هەر هەوەڵ جار بەشی دووهەمی رۆژنامەی تایمز (Times) دەخوێنێتەوە. ئەلعانیش هەر کراسی یەخە حەوت لەبەردەکا. هێشتاکانەش پێی وایە دێبس (Debs) دەیتوانی نیشتمان رزگار بکا و T.R کەرەستەیەك بوو بۆ ئەو هۆگرییانەی پێوەندیان بە پوولەوە هەبوو. لە هەرلایەکەوە لێکی دەیەوە هەر ئەو پیاوەی ساڵانە. کورە لە چاو پێنج ساڵ لەوەپێشیش پیر نەبووە! هەموو کەس دان بەمەدا دەنێ. پێیدەڵێن خۆراگر. کەچی بەتەنیایی لەتاریکاییدا دادەنیشێ. جگەرە دەکێشێ، چاو راست لەپێش خۆی دەبڕێ و بە درێژایی شەو چاوی ناتروکێنێ.

ئەگەر ئەو جۆرەیە خۆی باسی دەکا، ئەگەر ئاوا دەحەسێتەوە، دەیجا خۆ من پێمخۆشە هەر وابێ، باشە ئەوە دنیایە، هات و وانەبێ. ئەوەهات و شتێکیکە لەگۆڕێ دابێ و من سەری لێدەرنەکەم، رەنگە پێویستی بە یارمەتی بێ، بۆ قسە ناکا؟ بۆ نە ئەوەیە نێوچاوانی تاڵ کاوبگری، نە ئەوەیە پێبکەنێ؟

بۆ هیچ ناکا؟ باشە بۆ هەر دەبێ راست لەوێ دانیشێ؟

رقم چاك هەستاوە. هەر دەبێ بەهۆی ئەم خوردبوونەوە تایبەتیم بێ، لەوانەشە تۆزێك دڵ پەرۆش بم. هەرشتێك بێ رقم هەستاوە.

"بابە! شتێك بووە و پێم ناڵێی؟"

"نا هیچ نەبووە کورم. هیچ نەبووە.؟"

بەڵام ئەمجارەیان بڕیارم داوە دەس لە سەری هەڵنەگرم. رقم هەستاوە.

"باشە بۆ لێرە ئاوا بە تاقی تەنێ دادەنیشێ و تا درەنگانێ بیر دەکەیتەوە؟"

"ئاوا دەحەسێمەوە کورم. ئاوام پێخۆشە."

سەری لێدەرناکەم. سبەی شەو دیسان لەوێ دادەنیشێتەوە. گێژو وڕ دەبم. زۆری بۆ بە پەرۆشم.

نا دەس بەرداری نابم. رقم چاك هەستاوە.

"باشە بابە گیان بیر لە چی دەکەیتەوە؟ بۆ هەر لەوێ دادەنیشی؟ پەرۆشی چیی؟ بیر لە چی دەکەیتەوە؟"

"پەرۆشی هیچ نیم کورم. راستت پێ دەڵێم. هەر ئەوەندە نەبێ ئاوا دەحەسێمەوە، تەواو براوە، برۆ بخەوە کورم."

کەف و کوڵی توورەییم هێندێک نیشتەوە، بەڵام هێشتا هەر نەختێك بە پەرۆشم، دەبێ لێم رون کاتەوە. لەوانەیە ئەم قسانەم زۆر شێتانە بێ، باشە بۆ نابێ پێم بڵێ؟ ئەو هەستە سەیرە لە گیانم دا چەکەرەی کردووە، بێت و بۆم روون نەبێتەوە هەر بینا شێت بووم، کورە سەیرە لەسەر قسەی خۆم سوورم.

"دەی باشە بابەگیان! بیر لەچی دەکەیتەوە، چیبووە؟"

"هیچ کورم. هەر شتێکی بەبیرم دابێ، بیر لە شتێکی تایبەت ناکەمەوە. هەر شتێکی بە بیرم دابێ." نا وادیارە نایدرکێنێ.

شەو درەنگانە، شەقام بێدەنگ و ناو ماڵ تاریك و تنۆك. بە ئارامی لە پلیکانەکان سەردەکەوم. بۆئەوەی جیڕەی کەوشەکانم نەبیسن بەسپایی بە سەریاندا باز دەدەم. بە کلیل درگا دەکەمەوە و وەژووردەکەوم. بەسەری پەنجە خۆم بە ژوورەکەم دا دەکەم و جل و بەرگ دادەکەنم.

دێتەوە بیرم دیسان تینوومە، بە پێخاوسی دەچم بۆ ئاشپەزخانە، بەرلەوەی بگەمە ئاشپەزخانە دەزانم لەوێیە. رواڵەتە کوورو چەمیوەکەی لەنێو ئەو تاریکاییە چرەدا دەبینم. هەر لەسەر هەمان کورسیلە دانیشتووە و ئانشیکی هەر دوو دەستی لەسەر کەشك ئەژنۆی لاقی داناوە، سەبیلە کووژاوەکەی بەدەمەوەیە، چاوە بێ ترووسکەکانی راست لەبەر پێی خۆی بڕیوە. پێم وانیە زانیبێتی من لەوێم. ئەوکاتەی من هاتمە ژووری، گوێی لە هیچ نەبوو. بێدەنگ لەبەردرگاکە رادەوەستم و سەیری دەکەم.

هەموو شتێك لە جووڵە کەوتووە و بێدەنگە، بەڵام شەو پڕە لە دەنگە دەنگی چکۆلەو هێور. هەروا کە لەوێ بێ جووڵە راوەستاوم، سەرنجیان دەدەمێ. چرکەی کاتژمێری قورمیشداری سەر یەغدانەکە، هارەهاری نزمی ئەو ماشێنەی چەند شەقام دوورتر تێدەپەڕێ. خشە خشی ئەو قاقەزانەی با بەنێو کۆڵان و شەقام دا بڵاویان دەکاتەوە. سرتەسرتی بڵند و نزمبوونەوەی دەنگێك وەك هەناسەی ئارام و لەسەرەخۆ. ئەو دەنگانەم عەجایب پێخۆشە.

وە بیرم دێتەوە گەرووم وشکە. چوست و چالاك خۆم بە ئاشپەزخانەدا دەکەم. دەڵێم: "سڵاو بابە."

وەڵام دەداتەوە: "سڵاو کورم." دەنگی نزم و خەواڵووە. نە جێگاکەی دەگۆڕێ لە چاویشی لەو جێیەی وا تێبڕیوە دەتروکێنێ.

شێرە ئاوەکەم بۆ نادۆزرێتەوە. سێبەری کزی گڵۆپەکەی شەقام، رووناکاییەك بە پەنجەرەکەوە دەنێرێتە ژووریٚ و ژوورەکەی تاریکتر کردووە. خۆم دەگەیەنمە نێوەڕاستی ژوورەکە و چراکە هەڵدەکەم.

لەناکاو بە تەکانێك قرچەپێ هەڵدەستێ، وەك بڵێی سمتەکۆڵەیەکیان لەسەری دابێ. دەپرسم:

"ئەوە چیە بابە؟"

بە توندوتیژی جوابم دەداتەوە: "هیچ، جێی روناکیم پێخۆش نیە."

گڵۆپەکە دەکوژێنمەوە. لەسەرەخۆ ئاوەکەم دەخۆمەوە، لە دڵی خۆمدا دەڵێم نابێ لە خۆمی گەورە کەمەوە، دەبێ لە بنج و بناوانی بکۆڵمەوە.

"بۆ ناچی بخەوی بابە؟ بۆ لەم تاریکاییەداو تا درەنگانێ لێرە دادەنیشی؟"

لەجوابدا دەڵێ: "ئاوام پێخۆشە. ناتوانم خـوو بە چرابگرم. ئەو دەمانەی من لـە ئـەورووپا منـاڵ بووم چرا و گڵۆپ و شتی وامان نەبوو."

بـۆ سـاتێك دڵـم لـەلێدان رادەوەسـتێ و بـە خۆشییەوە هەناسەم رادەگرم. وردە وردە وای بۆ دەچم لە بنی کوولەکەم دابێ. چیرۆکی دەورانـی منـاڵی بـاوکم لـە وڵاتـی ئۆتریـش دێتـەوە بـیر. زرِدایکی بـاوکم بابـە گـەورەم لـە پشـت مـێزی قاوەخانە دێتە بەرچاو. درەنگ وەختە، مشـتەری نەماون و ئەو خەریکە خەو دەیباتەوە. چاوم لەو پۆلـووە سـوورانەیە کـە پاشمـاوەی ئـاورێکی بەتینن، ناو ژوورەکە تاوێکەو تاریکاییـەکی زیـاتر بەسـەریدا دەکشـێ. کورێکـی بچکۆلـە دەبینـم لەسـەر کۆمایـەك شـووڵی تـەڕ. لەوبـەری سـۆبە گەورەکـەوە هەڵترووشـکاوەو چـاوی پـڕ لــە تروسـکەی برِیوەتـە پاشمـاوەی بـێگڕ و هـێزی پشکۆی کزی ئاورەکە. ئەو کورە باوکی منە.

چێژ و خۆشی ئەو چەند چرکەسـاتەم دێتـەوە بیر کرِوکپ لەبەردرگاکە راوەستابووم و چـاوم لـە باوکم دەکرد.

"مەبەستت ئەوەیە شتێك لەگۆڕێدانیە؟ بۆیە لە تاریکاییدا دادەنیشی چونکـی پێتخۆشـە، هـا! بابە؟"

پێـم وانیـە بتـوانم دەنـگ هەڵنـەبرِم و هـاواری خۆشیم بشارمەوە.

وەڵام دەداتـەوە: "دڵنیابـە هەروایـە. ئەگـەر وڵات روون بێ ناتوانم بیربکەمەوە"

لێوانەکـە لـەجێی خـۆی دادەنێمـەوە و دەگەرِێمەوە بۆ ژوورەکەی خۆم. دەڵێم: "شـەوت خـۆش بابـە" پاشـان شـتێکم وەبیردێتـەوە، دەگەرِێمەوە، دەپرسم: "بیر لـە چـی دەکەیتـەوە بابە؟" دەنگی دەڵێی لە شوێنێکی دوورەوە دێ،

دیسان هەروا کپ و یەك هەوایە. بە هێوری دەڵێ: "هیچ. بیر لە شتێکی تایبەت ناکەمەوە."

سەرچاوە:

Firsts of the famous
Edited by Whit Burnett
Ballantine Books – New York, 1961, pp 219-223

# چەپکێ شیعری سوێدی

• و: حەمەسەعید حەسەن

### کچە بەدەستی سوورەوە

کچە بەدەستی سوورەوە
لەجێژووان گەڕایەوە
دایکی پرسی:
- کچم بەچی دەستت سووربوو؟
- دایە گوڵەباخم چنی
دڕکەکانی بەدەستما چوون.

کچە بەلێوی سوورەوە
لەجێژووان گەڕایەوە
دایکی پرسی:
- کچم بەچی لێوت سووربوو؟
- تووتڕکم خوارد
ئاوەکەی لێوی ڕەنگکردم.

کچە بەڕەنگی زەردەوە
لەجێژووان گەڕایەوە
دایکی پرسی:
- کچم بەچی ڕەنگت وا زەرد هەڵگەڕاوە؟
- دایە گۆڕێ هەڵبکەنەو
لەناویدا بمشارەوەو
لەسەر کێلەکەی بنووسە:
کاتێ بەدەستی سوورەوە گەڕایەوە
دەستی لەناو دەستی دڵدارەکەیدا سوور هەڵگەڕابوو،
کاتێ بەلێوی سوورەوە گەڕایەوە
لێوی لەژێر لێوی دڵدارەکەیدا سوور هەڵگەڕابوو
کە بەڕووخساری زەردەوە گەڕایەوە،
باوەڕی بەخۆشەویستەکەی نەمابوو.

یۆهان لودڤیك ڕۆنەبێری
1877-1804

### خەفەتو شادی

خەفەتو شادی لەماڵی دڵما

یەکی ژوورێکیان داگیرکردبوو،
دوژمنانە جیا لەیەکدی دەژیان،
ڕۆژ هاتو ڕۆیشت...
بۆ شکاندنی کۆتی تەنیایی
دەرگایان لەسەر یەکدی کردەوە
بەگەرمی دەستی یەکتریان گوشی
توند باوەشیان کرد بەیەکتریدا
یەکیان ڕامووسی،
ئیدی لەوساوە
شادیم بوو بەخەم
خەمیشەم شادی،

یۆهان لوڤیدک ڕۆنەبێری

## دەشێ دوو دەست

ڕێگەی بەهەشتی ئەوین دێرینە
بەڵام هەمیشە دەڵێی نەشکاوە.
دەشێ دوو دەست
لەژێر چەترێکدا لێکتر بئاڵێن
دەشێ دوو دەست
لەبەختیاریدا لێکتر بئاڵێن،
دەشێ دوو دەست
لەناخۆشیدا لێکتر بئاڵێن،
دەشێ دوو دەست
لەڕێی قازانجدا،
لەناو بازاڕی گەورەی جیهاندا لێکتر بئاڵێن،
دەشێ دوو دەست...

نیلس فێرلین
1961-1898

## هێزی ئەوین

ئەوین دێتو ئەوین دەڕوا
کەس ناتوانێ یاسای ئەوین لێکباتەوە.
من دەمەوێ زستان، بەهار،
هەموو ڕۆژانی ژیانم لەگەڵ تۆبم،
تۆ خاوەنی دڵی منی
منیش خاوەنی دڵی تۆ،
هەرگیز بوار نادەم دڵت بێتەوە لات،
خۆشبەختیی من شادی تۆیە
خۆشبەختیی تۆیش بەختیاریی من،
گریانیشت، گریانی من.
ئەوین ئەوەندە بەهێزە،
سەری بۆ هیچ نەویناکا.
گوڵ لەزەمینی سەختەوە سەر دەردێنێو
وەکوو هەتاو
شاباڵ بەسەر دەشتی تاریکدا دەکێشێ.
تۆ خاوەنی دڵی منی
منیش خاوەنی دڵی تۆ،
هەرگیز بوار نادەم دڵت بێتەوە لات،
خۆشبەختیی من شادیی تۆیە،
خۆشبەختیی تۆیش بەختیاریی من،
گریانیشت، گریانی من.

نیلس فێرلین

## شەوێکی درێژ

نازەنین:
لێگەڕێ بابڕین،
لێگەڕێ هەمیشە
سەرقاڵی ئەوین بین،
با قسەهێنانو بردنو
سەرسامیی نەیاران
بێبەها وەربگرین،
خۆر ئاوا دەبێتو
سەر لەنوێ دێتەوە،
باجارێ کەڕۆژی تەمەن کورت دوایی هات
پێکەوە شەوێکی بێ پایان ڕابوێرین،
ئەوساکە یەك هەزار ماچانم بدەیێو سەدی
کەیش،

دوای ئەوە یەك هەزار ماچی کەو سەدی کەیش،
هەمدیسان یەك هەزار ماچی کەو سەدی کەیش،
کە چەندین هەزار جار یەکدیمان ڕامووسی،
ئیدی بابیرمان لای ژماردن نەمێنێ،
تا هیچ کام لەوانەی چاوانیان
پێماندا هەڵنایە،
نەزانن چەند جارمان یەکتری راموسی.

کاتولوس*

*شاعیرێکی دێرینی رۆمانییە.

## کە با تێکەڵ قژی دەبێ

دەڕواتو با
تێکەڵ دەبێ لەگەڵ قژی،
ئای کەحەزم لەشێوازی رۆیینێتی،
ئای کەحەزم لەشێوازی رۆیینێتی
کە با تێکەڵ قژی دەبێ.
ئای کە حەزم لەو شێوازەیە با تێکەڵ قژی دەبێ،
ئای کە حەزم لەشێوازی بایە کاتێ
تێکەڵی قژەکەی دەبێ،
حەزم لێیەتی کە دەڕوا،
ئای کە حەزم لەشێوازی رۆیینێتی
کە با تێکەڵ قژی دەبێ
حەزم لەشێوازی بایە لەگەڵ قژی.
حەزم لەشێوازی بایە
کاتێ تێکەڵ قژی دەبێ.
حەزم لەباو حەزم لەوە،
کە دەڕواو با تێکەڵ دەبێ لەگەڵ قژی.
حەزم لەشێوازی ئەشقی
نێوانی باو قژی ئەوە،
حەزم لێیەتی کە دەڕواو
با تێکەڵی قژی دەبێ.

کلاس ئەنەرسون*
(1937- )
* وەزیری رۆشنبیری فینلاند

## خۆرنشین

چاوەکانی تۆ ئاگرن
گیانی منیش دارێکی وشك،
رووت وەرگێڕە
باگڕ نەگرم،
کەمانێکم..
هەرچی گۆرانی دنیایە،
لەناخمایە،
بەتەنیا تۆ،
دەتوانی بمهێنیتە گۆ.
رووت وەرگێڕە
با بتەزم،
رووتم تێکە
باگڕ بگرم.
من حەزم من تامەزرۆییم،
لەسەر سنووری نێوانی
بەهارو پاییزدا دەژیم.
لێم گەڕێ با
سەرخۆشانە ستران بڵێم،
لێم گەڕی با دوا گۆرانیم
تەرخان بێ بۆ
هەموو سالانی دلداریم.
رووتم تێکە،
رووت وەرگێڕە !
باوەکوو خۆرنشینێکی دەمەو پاییز
هەردووکمان گرمان تێبەربێ،
با بەشەماڵی بەختیاریی،
ئالای بەخوێن سوورهەڵگەڕاوی ئەوینمان
شەکاوە بێ،
باچاوم لەهەنگاوت بێ،
کاتێ لەناو خۆرنشیندا بزردەبێ،
ئەی ئەو شۆخەی لەسۆراخی گڕی جوانیتا
بزربووم.

ئێریك ئەکسل کارلفێڵدت
(1964-1931)

## لەدەست چوون

تاکوو ئێستا،
سێ دڵدارم لەدەست چووە،
یەکەمیان مرد،
دووەمیان: ناحەزی فێڵباز
فریوی‌دا،
سێیەمیان: بوو بەهاوسەرم.

ئانا ماریا لێنگرین
1817-1755

## یەکەم ماچ

هەرگیز دەریا
وەها درەوشاوە نەبووە،
هەرگیز بەستێن
وا ئازادیی نەبەخشیوە،
دەشتو مێرگو درەخت هەرگیز
وا جوان نەبوون،
گوڵیش هەرگیز بۆنی هێندە خۆش نەبووە
وەك ئەوکاتەی خۆرئاوابوون
رەشماڵی قژە لوولەکەت
داڵدەی دامو
چی خەمو ناسۆرم هەبوو
لەیەکەم ماچتا نوقم بوو.

ئێڤەرت تاوبە
1976-1890

## چوالەی گوڵکردوو

خۆشەویستەکەم
وەکوو دارچوالەی گوڵکردوو وایە
ئەی با بەنەرمی گۆرانی بڵێ
بۆ جوانیی باڵای.

خۆشەویستەکەم
وەکوو درەختێ چوالەی گوڵکردوو
رووناکەو بێگەرد.
بەتەنیا هەر تۆ ئەی شنەی بەیان،
دەزانی ئەو چەند دڵڕفێنەو جوان.

خۆشەویستەکەم
وەکوو دارچوالەی گوڵکردوو وایە،
کاتێ تاریکی چواردەروم دەگرێ،
هەر ئەو دەتوانێ
بەدەنگمەوە بێ.

پێر لاگەرکڤیست
1974-1891

# گفتوگۆ

■ فەلسەفەی سیاسی لای کلۆد لۆفۆر



# فەلسەفەی سیاسی لای (کلۆد لۆفۆر)

## Claude Lefort

• و: ڕەووف بێگەرد

• ئەشێ بەڕێزتان کورتە ڕوون کردنەوەیەك لەسەر پێشینەی بیروڕاتان و چۆنیەتی هاتنە ناو ژیانی سیاسی خۆتان باس بکەن .

– من ساڵی 1924 لە پاریس لە خێزانێکی هەژار هاتوومەتە دنیاوە، کەچی هەر ئەو دەوروبەرە پڕ لە هەژاری و دەست تەنگیە دەرفەتی بۆ ڕەخساندم کە لەگەڵ کۆمەڵێك دەوڵەمەندا تێکەڵ بم، چونکە یەك دوونەوەی پێشتری بنەماڵەکەمان تووشی نابوودی هاتبوون، دایکم و نەنکم فێری پەروەردە و خوێندنیان کردم، دایکم (مصممە) یەکی مۆدو لە نیگار کێشاندا بە زەوق و بەهرەمەند بوو، وا بەستەی خێزانێکی بۆرژوای لێکەوتو بوو، لە بەیانیەوە تا شەو کاری دەکرد، بە کەسانێکی ئاشنا کردین کە ئەوانیش زۆریان کار دەکرد و بەشێك بوون لە خەڵکانی ڕەش و رووت، کەسانێك کە ئەوسا هیچیان لەبارەی دابین کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی نەدەزانی و چ خەبەرێکیان لەوەنەبوو کە ئێمە ئەمڕۆ ناوی کۆمەك کاری لێ دەنێین. من هەر لە منداڵیەوە لە ناخۆشیژیانی ئەو خەڵکەوە نزیك بووم، ئەمەتان بۆیە بۆ باس دەکەم کە بزانن ئەو مەسەلەیە کاریگەریەکی زۆری لەسەر ژیانی من داناوە، دایکم نیوە جوولەکە بوو، لەبەر چەند هۆیەکی ئاڵۆز کە ئێرە جێگای وتنی نیە منیش ناوی دایکم هەڵگرتبوو کە سەد دەرسەد ناوێکی جوولەکانە بوو بە ناوی کوهێن، باوکم جوولەکە نەبوو، بۆیە لەباری یاساییو بە پێی دەستووری دەوڵەتی (پیتان) من بە جوو دانەدەنرام.

بە پێچەوانەوە دایکم بە جوو دەدرایە قەڵەم، دایکم بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە نازیەکان

فەرەنسایان داگیر کردبوو هەر لەو شوێنەی خۆی لە پاریس مایەوە، کە پێشان هەر لەوێ دەژیا و هەرگیز جێی نەهێشت، ئەگەر چی هەموو گەڕەك ئەویان بەناوە بچوکەکەیەوە دەناسی و ئەویش نەفرەتی خۆی لە ئەڵمانەکان نەدەشاردەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەراو زەنایەکی بچووکی لەناو قەساب و وردە فرۆشی گەڕەکدا بەرپا کردبوو. ئەمە باسێکی سەرنج ڕاکێشە، چونکە ئەوە دەردەخات کەلە کاتی داگیرکراوی فەرەنسادا کەسانێکی باش هەبوون کەسیان نەدەدایە دەست پۆلیس، بەڵام دایکم بە تایبەتی بۆیە مابوەوە کەهەرگیز قبووڵی ئەوەی نەکردبوو ((ئەستێرەی زەرد)) لە بەرۆکی خۆی بدات. چونکە ئەگەر وابوایە گیانی دەکەوتە مەترسیەوەو سەری تیادەچوو، من کەمێك پەروەردە و خوێندنی مەسیحیم هەبوو، لە هەمان کاتدا ئەو بیرەوەریانەی لە خێزانە جوولەکەکەم کە ماوەیەکی زۆر بوو لە فەرەنسادا نیشتەجێ بوون کاریگەریان لەسەرم هەبوو. بۆیە کە منداڵ بووم گوێم بۆچیرۆکی ئەشکەنجەو ئازاری جوولەکە و مەسەلەی دریفۆس تەکاندبوو. لەبەرئەوەی ناوەکەم جوولەکانە بوو، زۆر جاران لە قوتابخانە وەك جوولەکە مامەڵەیان لەگەڵما دەکرد، بۆیە لە نێوان دووشناسدا لە کێشمە کێشما بووم، کە ئەگەر بۆ هەندێك دوو شناس لایەنی چاکەی هەبوو بێت، بۆ من بە پێچەوانەوە گیروگرفتی پێش هێنا بووم، بۆیە لەم دۆخەدا ناچار بووم کەنار بگرم، چونکە بەرانبەر هاوڕێ جوولەکەکانم خۆم بە ناپاك دەزانی و، تێدەکۆشام ئەوە نەزانن کە من فێری کاسۆلیکیەت بووم، لەلایەکی ترەوە کاسۆلیکیەکانیش بە تاوانی ئەوەی کە جوولەکەم قەشمەریان پێدەکردم. هاوڕێیەکم کەنزیکەی حەوت ساڵ لە خۆم گەورەتر بوو، زۆر زوو چوە ناو دنیای سیاسەتەوە و، لە هەژدە ساڵیا سەرەتا هەوادارو پاشان بوە ئەندامی چالاکی سوشیالیست، هەرچەندە دەگەڕێمەوە بۆ ڕابوردوو یاداشتە سیاسیەکانی ئەو سەردەمانەم زیاتر بیردەکەونەوە کە زۆریان کار لێکردووم و زەینمیان داگیر کردوە، بۆ نموونە پیلانە فاشستیەکەی گروپی (خاچی ئاسن) دژی پارلەمانی ساڵی 1934 دێنمەوە یاد، یان وێنەی ئەو ڕۆژنامانەی کە مەیدانی کنکوردیان پیشان دەداو ئەو پۆلیسانەی لەگەڵ ئەسپەکانیاندا دەگلان. چونکە خەڵکەکە گوێزانی ڕیش تاشینیان ئەخستە ژێر سمیئەسپەکانیانەوە، بەم جۆرە هێشتا ئەو وێنانەم بە زیندویی لەبەرچاون، بە تایبەتی ساڵی 1936 کە تەمەنم دوانزە ساڵ بوو لەگەڵ براکەمدا بەشداری هەموو خۆپیشاندانەکانم دەکرد. زۆر چاکم لەبیرە ڕۆژێك بە سواری لۆریەکی پڕ لە کرێکار بەرەو مەیدانی ڕیپەبلێك ڕۆشتم، لەوێ گوێم بۆ قسەکانی تورزو بلووم و چەند کەسێکی تر گرت. ئەمەوێت بڵێم لە دوانزە ساڵیا تەواو ببومە سیاسی، بێگومان سیاسیەکی سادە، خوێندنم، وەك دەزانیت لە دواناوەندی کارنیف لە پاریس تەواو کرد. یەکێك لە مامۆستاکانم، لە کاتی داگیر کردنی فەرەنسادا ((مرلوپونتی)) بوو، وانەکانی گەرم و گوڕ و ئاپوورە بوون. هەندێك جار لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەست بە مەترسی دەکرا دەربارەیمەسەلە سیاسیەکان و مارکسیزم دەدوا، لە بیرمە لە ناوەڕاستی ئەو ساڵی خوێندنەدا چاکترین قوتابی مرلوپونتی بووم، ئەو لەگەڵ قوتابیەکاندا پەیوەندیەکی گیانی بە گیانی هەبوو، ڕۆژێك بانگهێشتی منی کرد بۆ کافتریای بەرانبەر قوتابخانەکەمان تا پێکەوە بیرە بخۆینەوە، لەوێ

پرسیاری بیروباوەڕی سیاسی خۆمی لیٚ کردم، منیش بیٚ کەمترین بەد گومانی لەبارەی بیروڕای سیاسیمەوە قسەم بۆ کرد. مرلوپونتی پرسی : ((هیچ کاتێك لەگەڵ تروتسکیەکاندا یەکانگیریت هەبوە؟)) وتم نا، بەلاّم تروتسکی دەناسم، بە تایبەت کە تەمەنم هەشت ساڵان بوو باوکی هاوڕێیەکی رووسیم هەندێك جار باسی شۆڕشی روسیاو تروتسکی بۆ دەکردین، مرلوپونتی وتی : ((ئەم پرسیارەم بۆیە کرد چونکە ئەو قسەیەی جارێك کردت لەتێڕوانینی تروتسکیەوە زۆر نزیك بوو)) وەك دەبینیت ئەمانە رووداوی کەم بایەخن، بەلاّم یادوەری ئەم قسانە ئەوەم بۆ دەسەلمێنێت کە من خۆم پیٚگەیاندوە، چونکە براکەم لە چالاکی سیاسیدا زۆر لە من میانەڕەوتر بوو، بۆیە بۆ خۆم فەرهەنگێکی بچووکی مارکسیەتم پەیدا کرد، لە حیزبی کۆمۆنیستی فەرمانڕەواو ستالینیزم زۆر بێزار بووم، ئیتر بەو ئەندازە توانایەی هەم بوو بیٚ ئەوەی بەخۆم بزانم بەرەو تروتسکیەت چووم. ڕێکەوت وای هێنا چەند مانگێکیش دوای ئەوە بوومە هاوڕێی تروتسکیەك کە لە نهێنیدا دەژیا، لە ساڵی 1934 دا بەڕێك و پێکی کەوتمە هات و چۆکردنی کۆمەڵێکی مارکسی. ساڵی 1944 هاوزەمان لەگەڵ دروست بوونەوەی حیزبی تروتسکیەکاندا وازم لە ژیانی نهێنی هێناو، کەمێك دوای ئەوە کۆمەڵێك مەیلی نویٚ لە منا دروست بوو کە هاوکات بوو لەگەڵ ئاشنا بوونم بە کورنلیوس کاستوریادیسدا کە تازە هاتبوە فەرەنسا. بە بۆچوونی ئێمە بەرگری کردن لە مارکسیزمی راستەقینە تەنیا کاتێك ئەنجام دەدرا کە رەخنەیەکی سەخت لە سیاسەتی حیزبە ئەوروپاییەکانی ڕۆژاوا بە تایبەت فەرەنسا و لە ڕژێمی بوروکراسی سوڤیەتیش بگیرێت .

● **کەواتە ئێوە هەر لەسەرەتاوە دژی ستالین بوون؟**

– بەڵیٚ، هەر لەو سەرەتایەوە دژی ستالین بووم، تەنانەت پێش ئەوەی ئاشنای تروتسکیەکان بم، بۆیە، کەچوومە حیزبی تروتسکیەوە، نیسبەت بە خودی مارکسیزم هەڵوێستی رەخنەگرانەم هەبوو، چونکە بەڕای من تێزی سەرەکی بوروکراسی قارچك ئاسا لە پێناوی ململانێی کوێریچینایەتیا بۆماوەیەك گەشەی دەکردو، چارەنووسی ئەوەبوو لەگەڵ بزوتنەوەی مێژوودا لە گۆڕەپانەکە بڕواتە دەریٚ، ئەم تێزە لایەنێکی نمایشی هەبوو، سیاسەتی پرولیتاریا تەنیا پەیڕەوی لە شێوەیەك دەکرد، ئەویش هەم ڕەخنەی بنچینەیی بوو لە دنیای ستالین و رەخنەیش لە دنیای سەرمایەداری.

● **ئەزمونی شەخسیتان وەك خەباتگێڕێکی سیاسی و فەیلەسوف لە نێوان ساڵانی 1948 – 1958 و لە نێو گروپی (سوسیالیزم یان وەحشی گەری) دا چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

– ئێمە گروپێکی بچووك بوین کە (سوسیالیزم یان وەحشی گەری) مان دروست کرد، لە ڕاستیا ئەزمونی ئەو ساڵانە بۆ من دەوڵەمەند بوو، لەلایەکەوە بەردەوام پەیوەندیم لەگەڵ کاری بە کۆمەڵدا پەیدا کرد، پەیوەندی بە باس و گفتو گۆیەك کە هەر کەس تیایدا دەیەوێت ئەوی دی قەناعەت پیٚ بکات. بەرای من ئەو باسانە زۆر پێویستن، لەگەڵ ئەوەیشدا، هەر لەو سەرەتایەدا لە لایەن گروپی (سوشیالیزم یان وەحشی گەری) تووشی گەلێك گومان و دوو دڵی هاتبووم، من بە هیوای ئەوە بووم گۆڤارێك دەربکەین کە ئامێزی کراوە بێت بۆ ئەو بزاوتانەی مەرج نیە لەگەڵ بیرو بۆچوونی ئێمەدا بگونجێت، من لەگەڵ دروست کردنی گروپێکی تازەو ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕیدا نەبووم. بە تەواوی دژی

دروست کردنی هەر جۆرە حیزبێکی تازە بووم، بە بڕوای من رەخنەی ئێمە لە بوروکراسی لەگەڵ بیری دروست کردنی حیزبی تازەدا پێچەوانەی یەکتری بوون، بێگومان ئەمە لە سادەیی دڵی منەوە بوو کەوام بیردەکردەوە بەرپا بوونی شۆڕشی پرۆلیتاری و بەگەڕ خستنەوەی ژیانی بزوتنەوەی کرێکاری مومکین نیە مەگەر بەکاری داهێنەرانەیخودی کرێکاران نەبێت، کارێك کە ئێمە، ئەو گروپە بچووك و کەم بایەخە دەمانتوانی بیکەین، بڵاوکردنەوەی بیرو کۆشش بوو بۆ دروست کردنی کەسانێکی شۆڕشگێڕ کە یەکتریان نەدەناسی. هەروەها بۆ بەدەست هێنانی توانای ئاڵ و گۆڕ کردنی بیرو ڕاو هاوکاری کردنیان بوو بۆ توێژینەوەی ئەزمونگەلێك کە خۆیان لە رەوتی ژیان و چالاکیەکاندا دەستیان دەکەوت. بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێك مانای ئەوە نەبوو توندوتیژیەکی تر بێتە کایە، بۆیە هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ کاستودیادیس دا رێك نەدەکەوتم، هەر ئەوەیش وای کرد کە دووسێ جار لە (سوسیالیزم یان وەحشی گەری) و هاوکاری کەسانێکی تر کە زۆریان کەڵك پێ گەیاندم وازبێنم. پەیوەندی هاوڕێیانەی ئێمە جار جار سەر لەنوێ دەستی پێ دەکردەوە، تا ئەوەی لە ساڵی 1958 دا بیری دروست کردنی رێکخراوێك بوە بابەتی باس کردن. زوربەی گروپی (سوسیالیزم یان وەحشی گەری) وایاندەزانی گەیشتنی دیگۆل بۆسەر حوکم و ئەو قەیرانەی بەرپای کرد بوو، کە ئاشبەتاڵی سەندیکاکانی لێ چاوەڕێ دەکرا کاتێکی گونجاو بوو بۆ دووبارە خۆسازدانەوە بۆ دروست کردنی رێکخراوێك، بەڵام لەبەرئەوەی کە من هەرگیز بڕوام بە ئاشبەتاڵی سەندیکاکان نەدەکرد، بڕوایشم بەوە نەبوو کە دیگۆل بیەوێت – هەروا بە ئاسانی – جۆرێك لە نیوفاشیزم بێنێتە گۆڕێ، لەبەرئەوەیش کە هەمیشە دژی گروپ بازی بووم، هەرئەوسا بە تەواوی لە گروپی (سوسیالیزم یان وەحشیگەری) چوومە دەرێ، جێی سەرنجە کە

بەو کارەم بۆ دووەمین جار هەستی تەواوم بە ئازادی کرد. یەکەمجاریان کە لە تروتسیکزم رزگارم بوو، دوەم جاریش کە لە (سوسیالیزم یان وەحشی گەری) دەرچووم کە نێوەندێکی زۆر پڕ بەرهەم تر بوو. بەڵام تەنانەت لێرەیشدا و لە نەستی خۆما هەستم بەوە دەکرد بۆ ئەوەی ئەوانی تر هەمیشە من بە شۆڕشگێڕێکی وەفادار بزانن کەوتبوومە سانسۆر کردنی خۆم. لە رێکخراودا هەمیشە ئەو مەترسیە هەیە کە تاوانی ناپاکیت بدەنە پاڵ، چونکە هەر ئەوەندەی وازت لە هەڵوێستی دەستەجەمعی هێنا کە پێی ناسراویت، هەر ئەوەندەی ئیتر هاوڕێیان نەبیت، هەرلەبەرئەوەی دەست بکەیتە پرسیار کردن. ئیتر دەگەڕێنەوە سەرت و پێت دەڵێن : ((تۆ ئیتر شۆڕشگێڕ نیت)) ((ئیتر ئەم مرۆڤە حسابی مارکسیەتی بۆ ناکرێت)) بۆیە راستیەکەی ئەمەیە هەر ئەوەندەی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکما کە دوو ساڵی تەواو پێکەوە بووین. لە (سوسیالیزم یان وەحشی گەری) وازم هێنا بە تەواوی هەستم بە بارسووکی کرد. چونکە پاشان تێگەیشتم دەبێت تێگەیشتنی ئێمە لە ستالینیزم چەمکێکی وردی سیاسی پەیدا بکات، چونکە مەسەلەی توتالیتاریزم لە مەسەلەی بوروکراسی گرنگتر بوو، ڕاستت دەوێت ئەم وەرچەرخانە لەوتارێکدا بەناوی ((توتالیتاریزمی بێ ستالین)) سەبارەت بە راپۆرتی خرۆشۆف بۆ کۆنگرەی بیست، کە ساڵی 1956 لە (سوسیالیزم یان وەحشی گەری)دا بڵاوم کردەوە دەردەکەوێت. بەڵام من ئەمجارە لەشیکردنەوەی ماهیەتی توتالیتاریزم دا زیاتر هەستم بە ئازادی خۆم دەکرد. هەر ئەو کاتە لەوەگەیشتم ئەو ڕژێمە دیموکراسیەی کە ئێمە تیا دەژین هەرگیز ناتوانێت سەرخانی سیاسی کۆمەڵگایەك بێت کە پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان سیمای جیاکەرەوەیەتی. ئەو جیاوازیە بنەڕەتیەش کەلە نێوان دیموکراسی وتوتالیتاریزما هەیە و هەموو لایەنەکانی تریان دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، لەو کاتەوە

سەبارەت بە دیموکراسی بەردەوام کەوتمە پیا چوونەوەو بەدوادا گەڕان، هەوڵمدا ئەوە دەربخەم کە دیموکراسی، ئەو دیموکراسیە ڕواڵەتیە نیە کە مارکس هەوڵی داوە ماهیەتی پێ ببەخشێت، هەرچەندە ئەوە ئاشکراو دیارە کە بەشێکی فراوانی ئازادی هەر بەڕواڵەت دەمێنێتەوە، چونکە تەنیا ژمارەیەکی کەم ئەیان توانی لەو دیموکراسیەتە کەڵك وەربگرن، ئەم ویست ئەوە دەربخەم کە مەرج نیە دیموکراسی بە دیموکراسیەتی بورژوا کۆتایی بێت و، هەر لەناو جەرگەی دیموکراسیەوەیە خەباتی چینایەتی تەواو پێدەگات. هەروەها ئەوەیش کە دیموکراسی هەنگاوێك نیە بەرەو کۆمەڵگای بێ چین، بەڵکوو شێوەی کۆمەڵگایەکە کە خەباتی چینایەتی تیایدا ڕێ پێدراوو ڕەوایە و دەشێت ئازاد بیرەکان لەگەڵ یەکتریدا پێك بگەن. یان سیستمێك بەسەر دیموکراسیەوە فەرمان ڕەوایە کە بیری پشت گیری کردن لە دەسەلات و زەوت کردن و بەرجەستە کردنی بەرەو شکست دەبات. ئەوەیش کە دەوڵەت نابێت بەم چەمکە لەگەڵ دەسەلاتە سیاسیەکەدا بەمانای تایبەتی وشە تێکەڵ بن. واتا دەسەلاتێکە بەردەوام بە دوای ئەوەدا دەگەڕێت کە ڕەوایەتی خۆی بەدەست بێنێت، کەواتە نەوەستاوە، بەڵکوو کۆمەڵگایەکی زیندوە، گفت و گۆ هەڵدەگرێو هەمە جۆرە، وایشمان لێ دەکات ڕەخنە لەو سیستمە بگرین کە لە دیدی ئێمەدا نا پەسەندە. ئەم قسانە بۆ ئەوە نیە دیموکراسیەت بکەینە بت وەك دەڵێن، بەڵکوو مەسەلەکە ئەوەیە کە دەتوانین لە ڕێی دیموکراسیەوە مەسەلە کۆمەلایەتیو ئابوری و ئەخلاقیەکان بخەینە ڕوو.

● **ئەو کاتەی وازتان لە (سوسیالیزم یان وەحشی گەری) هێنا لەگەڵ مارکسیزما پەیوەندیتان چۆن بوو ؟**

– کە وازم لە (سۆسیالیزم یان وەحشی گەری) هێنا هاوکات دەست بەردار بوونم لە بیری شۆڕش، بیروڕام لەسەر توتالیتاریزم، پیاچوونەوەم سەبارەت بە دیموکراسی و وازهێنانم لە مارکسیەت هەموو بە هێڵێکی تەریبدا پێکەوە دەڕۆیشتن. ئەوەی دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە کە دابڕانی تەواوم لە مارکسیەت لە کۆتایی دەیەی 1950 دا هەرگیز بەر پەرچ دانەوەی ئاسەواری مارکس نەبوو وەك هەندێکی تر دەیان کرد، هەمیشە من بڕوام وابوە و ئێستاش هەروام کە مارکس بیرمەندێکی دیارەو بەردەوام پێویستیمان بە خوێندنەوەو تێگەیشتنی بەرهەمەکانیەتی، من لە مارکسەوە فێری ئەوەبووم کە لە مارکسیزم دابڕێم، من ناتوانم هەرئاوا بە سادەیی مارکس بەرانبەر بە لینینزم و ستالینزم رابگرم، چونکە لە خودی مارکسدا مارکسیزمێك هەیە. بە جۆرێکی تری بڵێین لە مارکسیزما چەندان تیور هەیە سەبارەت بە کۆمەڵگای بێ چین، شۆڕش و هەڵپەی پڕ لە کارەساتی سەرمایەداری، بەلام من هەمیشە باوەڕم وابوە کە بێجگە لەم تیورانە، هەوڵی گەورەی مارکس بۆ تێگەیشتن و دەرکی کۆمەڵگای سەردەمی خۆی بوە.

● **ئێستا راتان دەربارەی بیری مارکسیزم چیە ؟**

– رای من هیچ فەرقی نەکردووە، وتارێکم دەربارەی مانیفێستی کۆمۆنیستی مارکس نوسیوە. وتارێکی زۆر ڕەخنە گرانە، چونکە مانیفێستی کۆمۆنیست خستنە ڕووی بیری تەواوی مارکسە، لەلایەکی ترەوە، خوێندنەوەیەکی درێژم لەسەر مارکس و سەرنجەکانی دەربارەی مێژوو نوسیوە، هەوڵمداوە ئەوە دەربخەم کە تا چ ئەندازەیەك بەرهەمەکانی مارکس بە تەمومژو ئازایانەن، چونکە لەگەڵ ئەوڕایانەشدا کە دەخرێنە ڕوو، جۆرێك لە کۆتایی هێنان بە مێژوو، جۆرێکیش دژایەتی لەناو هەناوی بەرهەمەکانی مارکسدا

هـەن، واتـا جۆرێـك لـە چـەمكێكی چـاوەڕوان نەكراوی یەكان گیری دیاردە ئابورییەكان و دیاردە سیاسییەكان .

● **بە ڕای ئێوە لە ئێستادا دەشێت كەڵكی تەواو لەبەرهـەمی مـاركس وەربگـیرێت، یـان بیروباوەڕەكانی ماركس كۆن بوون؟**

– بـەرای مـن دەشـێت هەمیشـە بەرهـەمی ماركس بخوێنرێتەوە .

● **ئایا لەبەر ئەمەیە كە كارەكـانی مـاركس لـە ڕووی چەمكی ئایدۆلۆژییەوە كاریگەریان لەسەر ئیش كردنت هەبوە؟**

– بەڵێ، من نكوڵی ئەوە ناكەم كاتێك لەبواری ئایدۆلۆژیا كارم دەكرد لە ژێر كاریگەری ماركسـدا بووم .

● **مادامـەكی باسـەكەمان لەسـەر ماركسـیزمە، ئەمەوێت بزانم هەرەسی كۆمۆنیزم لە سۆڤیەت و، پاشان ئاڵ و گۆڕە سیاسی و ئابوریـەكان لە وڵاتانی خۆرهەڵاتدا چۆن لێك دەدەیتەوە ؟**

– پێم وایە لە ناساندنی چەمكی توتالیتاریزما بەشێكم هەیـە، مەبەستم ئەوەیە كە بـەرای مـن هەرگیز كۆمەڵگای توتالیتر، ئەو كۆمەڵگایـەی كـە بەراستی دەیەوێت وا بێت یان ئەوەی ڕابەرەكانی دەیانویست وادەربچێت نەبوە. هیچ كـاتێك بـڕوام بـەوە نیـە كـە كۆمـەڵگای توتالیتر كۆمەڵگایـەكی گونجـاو بێـت، هیـچ كـات بـاوەڕ بەوەناكـەم كۆمەڵگایەك هەبوو بێت تیایدا سیاسەت و كۆمەڵ بـە واقیـع پـەیوەندیان لەگەڵیـەكترا بووبێت. بـە پێچەوانـەوە كۆششـی مـن بۆ دەرخسـتنی ئـەو ڕاسـتیەیە كـە ڕوانینـی توتالیـتر و نیشـانە سـەرەكیەكانی توتالیتـاریزم واقیعێكـن پـڕ لـە دژایـەتی، بۆیـە ئـەمڕۆ بەلامـەوە سـەیر نیـە كـە نیشانەی ئاشبەتاڵ كردنیـان بـە ئاشـكرا پێـوە دیارە. من وای بۆ دەچم شتێك كـە پێویسـت بـوو بزانرێت ئەوەبووكە ماوەیەكی زۆر نە لـە بولگاریـا و نەلەپۆڵـەندا هیـچ جـۆرە ئـاژاوەو داوای سـەربەخۆیی لەلایـەن چینـەكانی كۆمـەڵگای مەدەنیەوە دژی حیزبی كۆمۆنیست دەرنەكـەوت، تەنانەت لە ڕوسیایش لەلایەن چینی حوكمڕانـەوە ئـەم بزوتنەوەیـە بـەدی هـات. سـەر ئـەنجامیش كاری داهێنەرانەی سكرتێری گشتی بـوو كـە ئـەم وەرچەرخانـە ڕوویداو، هەرەسـی ئیمپراتۆریـەتی شـورەویو پاشـان ئاشـبەتاڵی ئـەوروپای خۆرهـەڵاتی لێ كەوتـەوە، مـن نـاڵێم بۆ قـەیرانی ناوبراو بەڵگەیەكی كۆمەڵناسی و سیاسی وجـودی نیە. ئەوەی ئاشكرایە كـە پروسـترویكا ئـەنجامی ناڕەزایی‌یـەك بـوو كـە ڕژێمـی كۆمۆنیسـتی لـە تەواوی ئاستەكانی كۆمەڵگای شورەویدا دروسـتی كرد بوو، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین كە لە هەناوی هـەمان حـیزبی فـەرمانڕەوادا بـوو كەمایەتیـەكی بچووك توانی ئەو كارە مەزنە لـە ڕەوتـی ئـازادیدا بە دەست بێنێت. بۆیە بەڕای‌من گۆرباتشۆف لـەم مەسـەلەیەدا دەوری سـەرەكی بینـی، نـاكرێت بـەڕوانینێكی سـادانەی هـەڵچوونی كۆمـەڵانی خەڵكی دەوری تاكە كـەس پـووچ بكەینـەوە یان كەم نرخی بكەین، بە بڕوای من ئێمـە ڕووبـەڕووی ڕابـەرێكی سیاسـی وا بوینەتـەوە كـە خـەیاڵ و ئازایەتیـەكی سیاسـی دەگمـەنی وای لـە خـۆی پیشـانداوە، كـە لـە چوارچێـوەی بوروكراسـی شورەویدا كەس چـاوەڕێی نـەبوە، مەبەسـتم لـەو ڕژێمەیە كە ئەندامەكانی لەژێر چاودێری یەكتردان و ژیانی خۆیان بۆ ئـەوە تـەرخان كـردوە كـە بـە پێچەوانـەی یـەكترەوە ڕەفتـار بكـەن، ئەنجامەكەشی سستی و داكەوتنە. ئـەو ڕۆژەی گورباتشوف بڕیـاری ئـازاد كردنـی سـاخارۆفیدا، بەردەوام هەستم بەوەدەكرد كـە وەرچـەرخانێكی نا ئاسایی لە گۆڕێدایە، چونكە ئەو ئازادیە كە لـە خـودی خۆیـدا لـە ڕووداوی مێـژووی وڵاتـدا چ

بایەخێکی نەبوو، کوت و پڕ مانایەکی رەمزی لە خۆ گرت، بوروکراسی لە خۆیەوە کە لاکەوت، دەزانیت لە دنیایەکی وەك دنیای توتالیترا هەمو شتێك لایەنی رەمزی هەیە. بۆیە ئازادی ساخاروف بەو مانایە نەبوو کە گۆڕینەوەیەتی بە جاسوسێك، ئەو کارەی کە لەگەڵ بوکوفسکیدا ئەنجامدرا، بەڵکو بەرەسمیەت ناساندنی رەوایەتی ئەو بوو لەنێو شورەویدا، ئەم رووداوە بچووکە بەمانای رەوایەتی بەخشین بوو بە یەکێکی تر، رەوایەتی بەخشین بە کەسێکی موخالیف، بەلادەرێك، بە رەخنەگرێك، رووداوەکانی تر تەنیا ئیمزای پاڵپشتی کردن بوون لە شتێکی زۆر سەیر کە وردە وردە لە توتالیتاریزما دەردەکەوت، واتا بەرەوایەتی دانانی جیاوازی بیروڕا، رەوایی دان بە هەمەچەشنی و فرە لایەنی کە لە سەرخۆ بەسەرهەمواندا دەسەپی .

بەڕاستی من هەموو ریفورمە هەنووکەییەکانم دەبینی، ئەوانەی کە تەم و مژاوی یان ئایندە نادیار بوون، بەڵام بە بۆچوونی من ئێمە لەگەورەترین رووداوەکانی کۆتایی سەدەی بیستەما دەژین. رووداوێك کە مەزنترین رووداوی ساڵی 1920 تا 1930، واتا پلانی رژێمە کۆمۆنیستەکان لەلایەك و رژێمە فاشستیەکانی لەلایەکی ترەوە ئاوەژوو کرد. ئێمە لە چرکە ساتێکی ئاوارتە (ئیستسنائی) داین.

- **لەگەڵ ئەمانەیشدا ئەمە مانای ئەوەنیە کە رژێمی توتالیتاریزم کۆتایی پێهاتوە، چونکە ئێمە نموونەی چین و کوبا و کۆریای باکورمان لەبەردەستایە کە ئەم جۆرە رژێمە فەرمانڕەوایەتیان تیا دەکەن .**

– هیچ گومان لەوەدا نیە کە توتالیتاریزم هەر لە قایم کردنی باروبنەی خۆیدایە، لەگەڵ ئەوەیشدا لە چین، بەو زانیاریە کەمەوە کە من هەمە، گروپێك لە پیران، لەوانە دنگ شیا ئوپینگ کە تاقە کەسێك نیە رابەری کارێکی لە دەست بێت، لە هەوڵی ئەوەدان بەشداری حوکمڕانی بکەن، حیزبێك پڕ بێت لە قەیران و دووچاری لێك هەڵوەشان بوو بێت ئیتر هیچ ئایدۆلۆژیەکی مارکسیستی ناتوانێت ببێتە هۆی پەیوەندی کردن بە حیزبەوە، بەڵکوو مەسەلەکە تەنیا بەرژەوەندی و هەڵوێستە لە دەسەلات، لە نێو کۆمەڵانی خەڵکیدا، لەوانەیە لەنێو گوندنشینەکاندا هەر چاوەڕوانی دەبینرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا کە نارەزاییەکی زۆر لەو هەڵوێست و رژێمە هەیە. بەڕای من ئەو حاڵەتەی لە چیندا هەیە چەند ساڵێك زیاتر بەردەوام نابێت، ئەمرۆ ئەڵمانیای خۆرهەڵات هاتۆتە لەرزە و سبەینێ نۆرەی کوبایە.

- **سەبارەت بە ئەورووپای خۆرهەڵات، مەسەلەی سەرەکی لەو وڵاتانەدا ئەوەیە کە دەسەڵات بە شێوەیەکی کردەیی مافی مرۆڤ رەت دەکاتەوە، لەم بارەیەوە رای ئێوە چۆنە ؟**

– بەڕای من سەرچاوەی ئەم مەسەلەیە دەگەرێتەوە بۆ رەت کردنەوەی کردەیی مافی مرۆڤ، چونکە رەت کردنەوەی کردەیی ئەو مافانەیە کەوا لە ئێمە دەکات بەرانبەر بە بایەخی ئەو مافانە هوشیاربین. لە کاتێکدا ئێمە لێرە ئەو مافانەمان دەست کەوتوە، ئەوەمان لەیاد چوە کە ئەم مافانە چەند گرنگ و چۆن بە تەواوی شێوەی ژیانمان رێك دەخەن، ئەمانە مافێکی بە دەست هێنراون، ئێمە ئەو مافانە پیادە دەکەین و وەك بەرهەمی پیشەسازی بەکاریان دێنین. لە وڵاتێکی وەك فەرەنسادا، گەورەترین گیروگرفتی ئێمە هەڵسەنگاندنی تەواوی داکەوتنی ئەو مافانەیە و وەك زیانێکی کۆمەڵایەتی لەبەرچاو دەگیرێت، مارکسیزم باس لە سەرخان و ژێر خان دەکات. چاکە، بە بۆچوونی من لەو وڵاتانەدا کە

ڕژێمی توتالیتاریزم فەرمانڕەوایە، ماف کە وەك دیاردەیەکی سەرخان تەماشا دەکەن. بە پێچەوانەوە تەنانەت دەیەوێت فۆرمەلەی ژیانی کۆمەڵایەتیش بکات.

● **بە وتەیەکی دی، بەرای من تۆ مافی مرۆڤ وەك ئەنتەرناتیڤێك بەرانبەر بە ئایدۆلۆژیا دادەنێیت – ئایدۆلۆژیا بە مانا دۆگماکەی – و لە هەمان کاتدا مافە سروشتیەکانی مرۆڤ ڕەت دەکەیتەوە .**

– من وادەزانم ئێمە ناتوانین لە چوارچێوەیەکی ڕووتی تیوری مافی سروشتیا یان چوارچێوەی ڕووتی مێژو گەرایدا باس لە مافی مرۆڤ بکەین، وادیارە لە چوارچێوەی تیوری مافی سروشتیا ئێمە هەرگیز بەو ئەنجامە ناگەین کە سەرهەڵدانی مێژوی مافی مرۆڤ لە چرکەساتێکی مێژویدا درك بکەین، هەرگیز پەی بە تایبەتمەندیەکانی ئەوجۆراو جۆری فەرهەنگانە نابەین کە لە سەرەتای مێژوی مرۆڤەوە تا ئێستا گەشەیان کردوە، باس کردن لە مافی سروشتی لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئەم مافە لە هەمو شوێنێکدا نەناسراو بوە سیستمێکی تەجریدی دەردەچێت، لەلایەکی ترەوە، من وا نازانم لە ڕێی لێکدانەوەی مێژو گەراییەوە بتوانین پەیدا بوونی مافی مرۆڤ روون بکەینەوە، چونکە لەو کاتەوەی دان بەو مافانە دا نراوە، وەك هانری برگسون دەڵێت جۆرێك لە (پاشە کشێیانەی حەقیقەت) هەبوە، جۆرێك لە کەشف کردنی ئەو شتەی کە ئایا مرۆڤ لە ڕێگای مێژووەوە دەبێت چۆن بێت، من وا مافی مرۆڤ لێك دەدەمەوە، مافی مرۆڤ مەسەلەیەکە بە دەست دێت و ناگەڕێتەوەدواوە، بۆیە مێژوو گەرایی جێگای قبوولّ کردن نیە، مافی مرۆڤ مەودایەکی جیهانی و ئەدگارێکی بێ مەرجی هەیە، بۆیە ئەوەی هەروا بمێنێتەوە پێویست ناکات بچێتە چوارچێوەی مافی سروشتیەوە .

● **بەرای تۆ ئەم مافانە مافێکی ئەبەدی و نەمرن یان دەتوانرێت و دەبێت هەوڵ بدرێت جارێ گەردونی تازە بۆ مافی مرۆڤ بکەینەوە ؟**

– بە بۆچوونی من بناغەی مافی مرۆڤ ئەوەیە کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدەوە جەختی لەسەرکراوە، بەرای من ریفۆرمی ئەم مافانە گورزێکی توند لە دیموکراسی ئەدەن، بێگومان لەسەر ئەم مافانەوە لەسەدەی نۆزدە و بیستا مافی تریش خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە، کە لەم بارەیەوە ئێمە بەرەو رووی باسێکی دژوار دەبینەوە، ئەویش ئەوەیە کە بزانین ئایا ئەم مافانە لە هەربارێکدا بن، ئەنجامی گەشەکردنێکی سروشتی، پێداویستەکانەو، یان خۆڵێ نەبان کردنی هەمان مافە سەرەتاییەکانە. یان ئەو مافانە لە راستیا چارشێوێکن بەرووی بەرژەوەندی تایبەتی و مەیل و ئەو وتەزا تایبەتیانەی کە دەشێ هەندێك جار چاك بێنە بەر چاو بەڵام نەتوانن ببنە هاوتای مافە بنەرەتیەکان. ئەمرۆ ئارەزوویەك بە درێژایی پێرستی مافەکان دەکەونە بەر چاو، کە بە بروای من زیان بەخش و دەستکردن، چونکە چەند بمانەوێت زیاتر ئەو مافانە بکەینە مافی کۆنکرێتی زیاتر دەیکەینە واقیع و زیاتر ئەو مەودا گەورەیە پیشان ئەدەین کە لە نێوان قبوولّ کردنی ئەو مافانەو جێبەجێ کردنیاندا هەیە، بەڕای من کاریگەریەکی ڕەمزی لەو مافە سەرەتاییانەدا هەیە کە لە ڕاستیا هەقی بەشداری کردن نموونەیەکە لەوە – کە تەواو لە نوختەیەکی بەرانبەر ئەودا، وەك هەقی منالّ بەسەر باوك و دایکیەوە ئەگەر لە یەکتریش جیا بووبێتنەوە – لەم حاڵەدا ئیتر نازانین لەبارەی چی ترەوە بدوێین، گیروگرفتی یاسا دانانمان هەیە یان گیرگرفتی ئەوەی کە چ شتێك ڕاستە و چی

ناڕاسته، ئەمانە ئەو مەسەلانەن کە لە تەواوی ڕژێمە سیاسیەکاندا و بە درێژایی مێژوی مرۆڤ وجوودیان هەبوە، شتی ڕاست و ناڕاست بەهۆیگۆڕانی داب و نەریتەوە بەردەوام وجودیان هەبوە، بەڵام ئەم گیروگرفتانە پەیوەندیان بە گیان و دینامیکیەتی مافەوە نیە .

● **سەبارەت بە ژیانی سیاسیتان، وەك چەپرەوێکی چالاك قسەمان کرد، حەز ئەکەم زیاتر دەربارەی پەیوەندیتان بە فەلسەفەو تیوری سیاسیەوە بدوێین، یەکەم پرسیارم ئەمەیە کە ئایا مرلوپونتی ئێوەی هێنایە نێو دنیای فەلسەفەوە؟**

– لەو سەردەمەدا، لە کۆتایی خوێندنا، کۆرسێکمان دەبڕی ئەگەر چی ناتوانین ئەو ناوەی لێ بنێین لە ڕاستیا دوا کۆرس بوو، لەوێدا یان ماتماتیکێکی سەرەتایمان دەخوێند یان فەلسەفە، من بێ سێ و دوو فەلسەفەم هەڵبژارد، چونکە زۆر پەرۆشی فێربوونی بووم، ئەتوانم بڵێم بۆ ئەو کاتە فەلسەفە شتێك بوو وەڵامی گەڕانە وردەکانی منی ئەدایەوە، ئەو کاتەی منداڵتر بووم خەونی نووسین و کاری شانۆم لەسەرا بوو، بەڵام لە شانزە ساڵیدا وردە وردە رووم کردە فەلسەفە، پێش ئەوەی بچمە دەورەی فەلسەفەوە دەستم کرد بە خوێندنەوەی گفت گۆکانی ئەفلاتۆن و پاشان پەیم بە ماناکانی برد، مامۆستای کۆرسی فەلسەفەکەمان مرلوپونتی بوو، پێشتر ناوبانگیم بیستبوو، هەڵبەت لەو کاتەدا ئەو زۆر بەناوبانگ نەبوو، مامۆستای دوا ناوەندی و زۆر گەنج بوو، تەمەنی سیو پێنج ساڵ بوو، بەڵام وەك مرۆیەکی گەلێك چالاك و زۆر هۆشیار دەردەکەوت. زۆر خاکیانە لەگەڵ قوتابیەکانیدا هەڵس و کەوتی دەکرد، ئەم جۆرە ڕەفتارە بۆ ئێستا زۆر ئاساییە، بەڵام بۆ ئەو کاتە ئاسایی نەبوو، مرلوپونتی لە دەرەوەی کۆرسەکاندا زۆر بە گەرمی قسەی لەگەڵ قوتابیەکاندا دەکرد، ئەو لە نەوەیەکی تر بوو، من دەم ویست بەهەر نرخێك بوە ئامادەی کۆرسەکانی بم و کردیشم، دەبێت بڵێم کە تامەزرۆیی نادیاری من بۆ فەلسەفە لەو دوو کۆرسەدا زۆر زوو دەرکەوت، من پەرۆشی وانەکانی مرلوپونتی بووم چونکە مامۆستایەکی تەواو هەڵکەوتو بوو، لەسەرخۆ ئەدواو وای لە گوێگر دەکرد کە لەگەڵ قسەکردندا بیریش بکاتەوە، ئەو شتەی کە زۆر ئاساییـنیە، من زوو بوومە چاکترین قوتابی ئەوو، ئەتوانم بڵێم کە لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرەتای کۆرسی دوەمدا، لەگەڵ ئەوەیشدا کە تەمەنمان جیاوازی هەبوو پەیوەندیەکی دۆستانە لە نێوانماندا دروست بوو، بە قووڵی کەوتمە ژێر کاریگەری بیروباوەڕەکانیەوە، ناتوانم بەتەواوی ئەوە بڵێم کە من چەندە قەرزاری مرلوپونتیم، بۆ نموونە بە هۆی ئەوەوە بوو کە من یەکسەر کەوتمە نێو دنیای دیاردەناسیەوە، هەر بەهۆی ئەوەوە بوو کە ڕاستەوخۆ لە مارکسیزم ئاگادار بوومەوە نەك بە قسەی کەسێکی دەمارگیر بەڵکوو وەك فەیلەسوفێك کە دەربارەی مارکسیزم قسەی لەسەر دەست نووسەکانی 1844 و مارکسی فەیلەسوف دەکرد. هەر ئەو کارەیش بوو بەڕاستی جڵەوی لە کەچ ڕەوی ئێمە گرت، لەپڕا لەگەڵ زیندوترین تیورەکانی فەلسەفی، یەعنی دیاردە ناسی و مارکسیزم ئاشنا بووم، کە وەك دەزانیت ئێستا زۆر دوورکەوتوومەتەوە، من ئیتر ئەسڵەن مارکسیست نیم، بەڵام فەیلەسوفانێك کە بە گوتەزای دیاردە ناسی و مارکسیزمەوە خەریك بوون. کەسانێك بوون کە سەرقاڵی مێژوو سیاسەت بوون. ئێمە ناتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە هوسریل سەلیقەی سیاسی هەبوە، بەڵام لەبری ئەوە گەلێك نیشانە ئەوە دەردەخەن کە لە ڕاکانی هوسرێلدا تێگەیشتنی تازە بۆ مێژوو هەیە، هەموو ئەم شتانە بۆ من زۆر بەنرخ بوون،

هـەر لەوکاتـەدا مرلوپونتـی بـۆ قوتابیـەکانی دواناوەندی وانەیەکی زۆر بەنرخی هەبوو، لەوە نە دەسڵەمیەوە کە لـەدوا قۆنـاغدا باسـی دیکـارت، کـانت، سـپینوزا و فەیلەسـوفانی گـەورەی دی بکـات، بۆیـە کـە چوومـە دوا سـاڵی قوتابخانـەی هینری چوارەمـــەوە بـەهۆی ئـەوەوە بـوو کـە پەروەردەیەکی تۆکمەو قایمم هـەبوو، مەسـەلەکە تەنیا پەروەردەی‌من نیـە، ئەمـەوێت جارێکی تـر ئەوە بڵێمەوە کـە مـن زۆر قـەرزاری مرلوپونتیـم، نەك لەبەرئـەوەی منی‌والێکرد بەتـەواوی بکەومـە دوای فەلسـەفە، فەلسـەفەیەکی زینـدو، بـەڵکوو لەبەرئـەوەی فـێری ئـەوەی کـردم کـە مـن چـۆن هـەقی ئـەوەم هەیـە ببمـە فەیلەسـوف ئـاوایش دەتوانم ببمە نووسـەر، واتـا ئـەو شتـەی‌کە خـۆم حەزم لێـی بـوو، خـودی مرلوپونتـی نووسـەرێکی دیار بوو، تەنانەت لە کتێبی دیـاردە ناسی دەرك کردنیشـدا هەسـت بـەوەدەکرێت کەمـەیلێکی تایبەتی بۆ نووسین هەیە. چونکە ئـەم کتێبـە بـە شێوەیەکی زۆر ئاکادیمیانـەو بەتـەرتیبی بابەتـە سەرەکیەکانی فەلسەفە نووسراوەو، بـەش بـەش کردنیشی قەرار دادێکە دەربارەی فەلسـەفە، ئـەو مەیلەی‌مرلوپونتی، لە نووسـینەکانی دواییداو لـە تـەواوی وتارەکانیشـیا هەسـت پـێ دەکرێـت، لەبەرهەمـەکانیا نـاتوانیت هونـەری پـەی بـردن، بابـەت، لەهونـەری دارشـتن جیـا بکەیتـەوە، دارشتنێك کە هەمیشە خـەونی پێوە دەدی، وەك چۆن ئێستا لـە خـەونی منیشدایە، ئەگـەر چـی رەنگە لە خەونێکی رووت زیاتر نەبێت، دارشتنێك کـە هەرکەسـێك بتوانێـت بیخوێنێتـــەوە، بـەو مەرجەی کە بەراسـتی خـۆی بیـەوێت، دارشـتنێك دوور لـەو لایەنـە نیمچە هونەریـەی کـە فەلسـەفە بگۆرێتـە رشـتەیەکی تـر، مـن خـۆم هەمیشـە ئەوەندەی توانیبێتم سوودم لەو چەمکانە بینیوە کە نەبێتـە دیـوار لـە نێوان خوێنـەری بلیمـەت – بەڵام نافەیلەسـوف – و نووسـەردا، سـەر ئـەنجام مرلوپونتـی بـە وێنـە سـازی و زەوقـی هونـەری جۆرێـك لـە رەوایـەتی بەخشـیە ئـارەزوە تایبەتیەکانم.

**• دوای ئـەوەی لـە کنکـوری پـەروەردەیی ماموستایاندا قبـووڵ کرایـت، پـەیوەندیتان لەگەڵ مرلوپونتیدا هەر بەردەوام بوو؟**

– بێگومان، تا دوا کۆچـی پـەیوەندیمان هـەر گـەرم بـوو، لەگـەڵ یـەکتریدا دەچووینـە سـەفەر، نەدەبوو پانزە رۆژ تێ‌پەرێ و نەی بینم، لە رووی باری سیاسیەوە کە من لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستا نارێك بووم قسەی زۆرمان پێکەوە دەکرد.

**• بەرای تۆ بەرهەمی مرلوپونتی تا ئێستا هـەر هەنووکەییە؟چونکە نووسەرێکە تا ئەندازەیەك کەم باسی لێوە دەکرێت، لەگەڵ ئەوەیشدا کە چەند نیشانەیەك هەیە بـۆ گەرانـەوە بـەرەو فەلسەفەکەی .**

– بەڵێ، منیـش وای بـۆ دەچـم، گـەلێك شـت ئاماژە بەوە دەکەن کە گەرانەوەیەك هەیە بـەرەو فەلسـەفەکەی، زۆر مامۆسـتای لاو هـەن لەسـەر مرلوپونتی کار دەکەن و دوای کەوتوون، ماوەیەك لەمەوبـەر لـە سـیمینارێکی گۆڤـاری ئەسـپیریدا لەگـەڵ هـەندێکیاندا یـەکتریمان ناسـی، چونکـە بەراسـتی ئـەو بـوو لەوانـەکانی سـۆر بـوون و دانشـگای لیوندا دەرگـای لەسـەر لێکۆڵینـەوەی زانستی مرۆڤایەتی کـردەوە، مرلوپونتـی بـوو کـە زانستی مرۆڤایەتی گەیاندە ئاستی ئەو زانستانەی کە شایستەی هزری فەلسەفین، ئەو بـوو کـەلێنی نێوانیـانی نەهێشـت،دەرون ناسـی منداڵ و زمـان ناسـی دەوتـــەوە، رشـتـەی مـرۆڤ ناسـی، لـەو سەردەمەدا کە لیڤی شتراوس هێنـد نەناسـرا بـوو زۆری سـەرنج راکێشـا. مرلوپونتـی لـەو لایەنـەوە دەوری بـەرچاوی گـێراو تـەواوی فەیلەسـوفە ناودارەکانی نـەوەی ئێمـە لـە فۆکـۆوە بیگـرە تـا دریدا لەوانە دەرسیەکانی ئەودا ئامـادە دەبوون. کەچی دوایی لە بارەیەوە زۆر بێدەنگ بوون، ئـەو رێکەوتـە نائاسـاییەی روویـدا ئـەوە بـوو

کەسەرکەوتنی فەلسەفەی پوست هایدگەر بوە هۆی ئەوە کە کاری مرلوپونتی و، ئەو ڕاستیەی کە ئەو لە پیشدا بە رەخنەی بابەت (بە ناونیشانی زاتی میتافیزیکی) دەستی دابوویە ڕوو لە بێدەنگی بکات، ئەو لە پێشدا رەخنەی لە جۆرێکی مرۆڤ گەرایی گرت کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد مرۆڤ لە چەقی هەموو شتێکدایە، هەروەها رەخنەی لە مێژوو دەگرت (لەو جۆرەیان کە لە چەمکی کۆتایی هیگڵی یان مارکسیستی دا مێژوو دەردەکەوێت) بۆ نموونە چەمکێك بە گرنگی چەمکی ((ئامادەگی – حضور)) بگرە بەر چاو، ئەوەندە بەسە بەرهەمی مرلوپونتی بخوێنیتەوە بۆ ئەوەی لەوە بگەیت کەتا چ ئەندازەیەك لەدوا نووسینەکانیا ئاماژە بەوە دەکات کە هەرگیز ئامادەگی بێ نەبوون و پەیدابوون بێ پەیدا نەبوون وجودی نیە. هەموو ئەمانە لای ئەوەی نوێ کە ئامادە نیە شتێك قەرزاری مرلوپونتی بێت لە بیرکراوە و، زۆر ئاسودە بەپاڵ گیروگرفتەکاندا تێ پەڕیوە، چونکە، لە دیدی مرلوپونتیەوە، ڕەخنەی ((مێژوو)) وەك مێژووی مرۆڤ – کە سەرەتاو کۆتایی هەیە – هەرگیز بەمانای ڕزگارکردنی خود نیە لە کۆتی مەسەلە مێژووییەکان، بەڵکوو بە پێچەوانەوە دەتوانین بەو هۆیەوە چاوێکی تر بگێڕینەوە بەوەدا کە ئەو ناوی (جەستەی مێژوو)ی لێ نابوو، واتا بەوەی کە پێی دەوترێت مێژوو. بەم جۆرە ئەمەوێت بڵێم رەخنە گرتنی مرلوپونتی لە بابەت بەو مانایە نیە کە بابەت وجودی نیە، مرلوپونتی ئەوەی بە شێوەی تێز خرابوە ڕوو، لەکاتێکدا کە ئەو تێزە دژە تێزی ئایدیالیزمی پێش شەڕ بوو خستیە قالبی پرسیارەوە، ئەو پرسیارانە تا ئێستاش هەر لە ئارادان و بانگمان لێ دەکەن، ئەو پرسیارانەن کە وردە وردە ئێمە کەشفیان دەکەین.

• **دەربارەی کاری سیاسی مرلوپونتی، بەلای تۆوە جیابوونەوەی لەسارتەرو گۆڤاری ((لەتان مدرن)) (سەردەمی نوێ) لە ساڵی 1952 دا وەرچەرخانێك نەبوو لەبیری سیاسی ئەودا؟**

– بێگومان جیابوونەوەکەی وەرچەرخانێك بوو، نازانم جیابوونەوەکە بوە هۆی وەرچەرخانەکە یان وەرچەرخانەکە یەکەمجار رویدا و پاشان جیا بوونەوەکە، هەمیشە ئەم دیاردەیە دووبارە دەبێتەوە. ئەو دۆستی زۆر نزیکی سارتەر بوو. بێگومان جیابوونەوەی ئەو دوانە ئازادی زیاتری دایە مرلوپونتی کە میانەی تایبەتی خۆی لەگەڵ سارتەرا بپارێزێت، بەلام پێش ئەوەی پەیوەندیەکەی لەگەڵسارتەرا تێك بچێت تەواو بیری لە هەڵوێستە فیکریەکانی خۆی کردبوەوە، تێك چوونی ئەو دوانە بە ئاشکرا لە سەر مەسەلە سیاسیەکان بوو.

• **تێزی دوکتۆراکەتان کەلەسەر ماکیاڤیلیە، ئەنجامی دۆستایەتیتانە لەگەڵ بەرهەمی مرلوپونتیا ؟**

– نا، ماکیاڤیلی ئەنجامی دۆستایەتی من نیە لەگەڵ مرلوپونتیا، بەلام ئەو پێشنیازی ئەوەی بۆ کردم کەلە گۆڤاری – سەردەمی نوێ – دا وتارێك سەبارەت بە ماکیا ڤیلی بنووسم، من ئەو کارەم نەکرد، چونکە تازە دەستم دابوە خوێندنەوەی ماکیاڤیلیو زۆریش سەرنجی ڕاکێشا بووم، بەلام هەستم کرد هێشتا زۆر زوە بۆ ئەوەی بتوانم شتێکی لەسەر بنووسم، پاشان چوومە بەرازیل و بەپێی روانینی تایبەتی خۆم کۆرسێکم لەسەر ماکیا ڤیلی کردەوە، لەوساوە پەیوەندیەکی تەواو تایبەتیم لەگەڵ ئەو نووسەرەدا پەیدا کرد، وام هەست دەکرد چەند زیاتر ماکیا ڤیلی بناسم، زیاتر دەسەلاتم بەسەردا پەیدا دەکات.

• **کام لە ڕاکانی ماکیاڤیلی سەرنجی ڕاکێشاویت، بەڕای تۆ چ بەشداریەکی لە بیری سیاسیدا هەیە؟**

– لە بیروڕای ماکیاڤیلیدا هەندێك شت هەن منیان سەرسام کردوە. یەکەمیان ئەوەبوو کە من لە مارکسیزم دوور دەکەوتمەوە و ناچار بووم دەست بۆ سەرچاوەی تر بەرم، ماکیا ڤیلی،

بەجۆرێك، ئەزموونێكی لە سیاسەت و فیكر بۆ من ئاشكرا كرد كە ماركسیزم و بیری ماركس كە بە تەواوی مانا چاكترین لایەنی ئەوەیە كە لەچەمكی پەیوەندیدا واقیعیەت پوخت دەكات- لە چاوی منیان شاردبووەوە. جیاوازی نێوان رژێمە سیاسیەكانیش هەر بە هۆی ئەوەوە بۆ من ئاشكرا بوون، تۆ دەزانیت كە زۆر قسەی بێ مانا بە ماكیاڤیلی دەڵێن : بەڵام لە ڕاستیا ئەو زۆر وردبینانە لەسەر سیستەمی جیاواز (دیكتاتۆریەت) و دەسەڵاتی مەرجدار و كۆماری ڕایدەربڕیوە، هەر ئەو كاتە بایەخی فاكتەری سیاسیشم بۆ دەركەوت، هەڵبەتە زۆر زانیاری لەمانە زیاترم چنگ كەوتن، لام سەیر بوو چۆن نووسەرێك لەو كاتەدا توانیویەتی مێژووی كۆماری ڕۆما، لەسەر بنەمای نووسینی تایبەتی هاوسەردەمەكانی. جارێكی تر پیایاندا بچێتەوە و بیانكاتە ئامرازێك بۆ ڕەخنە گرتن لە ئایدۆلۆژیای سەردەمەكەی، هەموو ئەمانە بە سوود وەرگرتن لەو شێواز و ڕەوشانەی كە بۆ من زۆر سەرنج ڕاكێش بوون و هەوڵمدا تێیان بگەم. تەنانەت ئەگەر ئەسڵەن وشەی ((ئایدۆلۆژی)) لەو سەردەمەدا وجودیشی نەبووبێت، ئەوەی منی ڕاكێشا بیركردنەوە بوو لە سەردەمەكەی، واتا فلورنس، بیركردنەوەیەك كە دەبوو لە مێژوویەكی گەورەدا كە هاوسەردەمەكانی ماكیاڤیلی وێنەیەكی تەواو ئایدۆلۆژیان تیا بەدی هێنا بوو ئەو بازی بە سەرا دان .ئەوان لە ڕۆمادا كە هەڵگری بیری یەك بوون و چاكە خوازی بوون، ئەو هزرەی كە ڕۆمای لە شێوەیەكی نموونەییدا پیشان ئەداو لە ڕاستیشا لە خزمەتی رژێمی ئۆلگارشی[i] فلورەنسەدابوو،لە ڕاستیا ئەم پەیوەندیەی نێوان ئێستاو ڕابوردوە كە شەوقێك بە ئێمە ئەدات بۆ ئەوەی هەمیشە لە تازەوە دەست پێ بكەینەوە، بۆ نموونە باس كردن لە شۆڕشی فەرەنسا و ماركسیزم .

● كەواتە وەك خۆتان لە لێدوانێكدا دەربارەی (پەروەردە و دەسەڵات) كە ساڵی 1979 لە ژنێف سازتان دا، بەڕای هومانیستەكانی[ii] ئیتالیا چون یەكیەك هەیە لە نێوان پاڵەوانەكانی قۆناغی كۆن و ئەو ئەفراندنانەی كە لێرە و لە ئێستادا هەن، بەوتەیەكی دی پێشكەوتنی (توێژینەوە مرۆڤیەكان) لە فلورانسدا لە خزمەتی ڕەوشتی نوێدایە كە چاودێرە بەسەر ژیانی چالاكانەوە بەرانبەر بە ژیانی ڕۆحانی و زاهیدی .

– تەواو، ئەمە ئەو شتەیە كە لە كەسێكی وەك ماكیاڤیلیدا هەبووو ئێمەیان خستۆتە سەر كەڵكەڵەی، لە ڕاستیا تەنیا بیری ژیانی چالاكانە نیە كە لە بیروباوەڕی ماكیاڤیلیدا بایەخی پێدراوە، چونكە هەر ئەو بیرانە لای هومانیزمەكانی فلورانسیش هەبون، بەڵكوو گرنگیەكەی لەبەرئەوەیە كە میتودە تایبەتیەكەی ماكیاڤیلی ڕەخنەیە لە شێوەو وێنەكانی حوكمڕانی ئەو سەردەمە، ئەو شێوەیەی كە ئەمڕۆ بە جۆرێكی نادروست ((بیرە گەورەكانی چەپ و ڕاست)) دەی خوێننەوە، واتا موحافیز كارەكان و لیبرالیزم .

مەبەستمە بڵێم فۆرمەلەی هەڵوێستی سیاسی ماكیاڤیلی وا بەستەیە بە ڕەخنە گرتن لە موحافیز كارەكانی حكوومەتی ئۆلگارش، بۆ من ئەوە سەرنج ڕاكێشە كە هەرگیز ناكرێت بیرە سیاسیەكانی ماكیاڤیلی بەسەر ئەم سەردەمەماندا پراكتیزە بكرێت، چونكە مەودایەكی دیار لە نێوان ئەو دوو دنیایەدا هەیە، بەڵام لەهەمان كاتدا، لەگەڵ ئەو مەودایەشدا، دەتوانین جۆرێك لە هاو ئاهەنگی لە نێوان هەل و مەرجی ئەوو هەل و مەرجی خۆماندا هەست پێ بكەین.

● لە ئێستادا پەیوەندی نێوان فەلسەفە و سیاسەت چۆن دەبینیت؟ بە ڕای ئێوە دەبێت فەلسەفە خۆی لە بەڵای سیاسەت بپارێزێت ؟

– بەڕای من فەلسەفە ناتوانێت خۆی لە داوی سیاسەت ڕزگار كات، سیستەمە مەزنەكانی فەلسەفە هەر لە عەینی حاڵدا بریتی بوون لە

کۆمەڵێك هزر دەربارەی سیاسەت. ئیدی فەلسەفەی ئەفلاتون بێت یان ئەرستۆ سپینوزا بێت یان ماکیاڤیلی، کانت بێت یان هیگڵ، لە نێوان فەیلەسوفاندا وەك هاووڵاتیەك و ئەو کۆمەڵگا سیاسیەی کە فەیلەسوفەکان ڕای خۆیان تیا دەڵێن پەیوەندیەك هەیە ناتوانرێت چاوی لێ بپۆشرێت، ئەمڕۆ زیاد لە هەر سەردەمێکی دی جەخت لەسەر زیندو کردنەوەی فەلسەفەی سیاسی دەکرێت، دەرك و کۆشش بۆ تێگەیشتنی چۆنیەتی ئەو کۆمەڵگا دیموکراتی‌یەی کە خۆمان تیا ئەژین، دەرکیتەم و مژو کەم و کووریەکانی ئەم کۆمەڵگایە و – هەر لەهەمان کاتدا – بەرهەمی سەرەکی دابەش کرانە کۆمەڵایەتیەکان و جیاوازیەك کە لە وێوە سەرچاوە دەگرێت – بایەخی هەیە. بە بڕوای من پێویستە ئەم پرسیارانە روون بکەینەوە، ئەو پرسیارانەی‌کە هەر ئەوەندەی دوا مەرجەعیان نەبێت، ئیتر سەرەکی ترین ئامانج کە داوای یەك بوونە لەگەڵ ویستەکانی خوادا و یانی ئەو فیکرە مەزنەی وەك ((عەقڵ))و ((عەدالەت)) یان تیا نەبێت ئەوە سەرانسەری هەموو کۆمەڵگا دەگرێتەوە. من بڕوام بە شتێکی لەمە زیاتر هەیە، دەبێت فەلسەفە لەمە بگات کەبێ تێپەڕینی بە ئەزمونی دیموکراتیا ئەو وجودی نابێت. ئەم ڕاستیە زۆر نەزانراوە، چونکە ئاشکرایە کە فەیلەسوفەکان زیاتر لە بارەی دیاردەکانی مۆدێرن لێکۆڵینەوە و گفت و گۆ ئەنجام دەدەن. ئەم دیاردانە سەردەمێك بریتی بوون لە سەرمایەداری کە کۆمەڵگای مودێرن خۆی تیا دۆزیوەتەوە، سەر وەختێکیش دەوڵەت و بوروکراسی بوون کە حاکمیەتی مرۆڤیان دەکردو، لە بەرانبەریشدا تاك گەراییەك هەیە کە کۆمەڵگا بەش دەکاتە سەر چەند پارچەیەك – بە وتەیەکی تر، لەلایەکەوە دەوڵەتی دەسەڵات هەیەو، لەلایەکی ترەوە تاکێکی بێ دەسەڵات کە خوازیاری پاراستنی ئەو دەوڵەتەیە. یان ئەوەی کە بابەتی سەرەکی فەلسەفە تەکنەلۆژیا بوە کە حوکمی هەمو شتێکی کردوە تەنانەت خودی‌مرۆڤیش، مرۆڤێك کە فاکتەری تەکنەلۆژی نیە بەڵام کۆیلەیەتی، سەرچاوەی سەرەکی ئەم قسەیەش هایدگەرە، ئەوەی کە سەرمان بە سوور دێنێ ئەوەیە کە دیاردەی دیموکراسی بەم مانایە زۆر کەم دەکەوێتە بەر پرسیارەوە،چونکە دیموکراسی مەنتیقێکی هەیە و لە هەناوی ئەو مەنتیقەدایە کە جۆرێك لە ڕەوشتی ژیانی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت، بەراستیش هەر ئەو ڕەوشتەیە کە ناهێڵێت تەکنیك ئازادانە کار بکات و بەدوا ئامانجەکانی خۆی بگات، هەر وەك بازاڕیش ناتوانێت بە تەنیا ئەکتەری سەر شانۆکە بێت.

هەروەها من لەو بڕوایەدام کە دەوڵەت دەسەڵاتی ڕەهانیە، بەڵگەیەکی سادە بۆ ئەمە هەیە، لە گەلێك زەمینەی جیاوازدا لە کاتی پەلاماری پلە بە پلەی کۆمەڵانی خەڵکا بۆ بەدی هێنانی داواکاریەکانیان، لەگەڵ ئەوەیشدا کە دەسەڵاتی سیاسی لە ڕێی نوێنەرایەتیەوە دروست بووە کەچی یەك ناگرنەوە. من دەڵێم با هەموو شتێك لە دیموکراتیەتا بچووك نەکەینەوە، بەڵام ئەوە دەربخەین ئەگەر دیموکراسی نەبێت چی ڕووئەدات، چی بەسەر تەکنەلۆژیادا دێت، چی بەسەر سەرمایەداریدا دێت. سەبارەت بە سەرمایەداری ئەوەندە بەسە کە لە وڵاتە گەورەکانی ئەمریکای لاتیندا دەی بینین، بۆ نموونە سەرنج بدەنە بەرازیل کە لە زۆر ڕووەوە یەکێکە لە وڵاتە زۆر مودێرنەکان کە تیایدا سەرمایەداریەکی دڕندە فەرمان ڕەوایە، واتا سەر ئەنجام مان گرتن، سەندیکا کرێکاریەکان، سەندیکای جوتیاران نەیان توانی سەقام گیربن، لە ئەنجامدا لەوێ وەك سەگ لەگەڵ خەڵکیدا ڕەفتار دەکرێت، بۆیە بەم مانایە، شتێك نیە پێی بوترێت جەبری‌سەرمایەداری. سەرمایەداری لەو شوێنەدا کە ئازادیەکان بوونەتە لەمپەری سەرکوت کردن و فشاری بێ‌سڵەمینەوە بەردەوام شێوەیەکی تازەی لەخۆگرتوە، چونکە ئازادی و بەرخۆری لەنێو چینەکاندا هەمیشە وا بەستەی

یەکترین، لێرەدا بەرانبەر کۆمەڵێك دیاردە وەستاوین کە بە یەکترەوە ئاڵاون. بەڵام ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ناسینەوەی چوارچێوەی دیموکراتیەتە بەو شێوەیەی کە هەیە .

● لە ڕاستیا پرسیارەکەی من دوو مانای هەبوو، یەکەمیان ئەوقسەیەی هاناڕنتم بیرکەوتەوە کە دەڵێت: ناونیشانێك بەناوی (فەیلەسوفی سیاسی) یەوە نیە، دیارە تۆ بە پێچەوانەی ئەوەوە کار دەکەیت. دوەمیش لەسەر ئەو قسەیەی کەوتت بە بڕوای تۆ بانگەشەی دابڕان لە نێوان بیری سیاسی و نەریتی فیکری ڕۆژاوادا بێ مانایە.

– هەرگیز، من لەگەڵ ئەم بیرەی هانا ئارنتا نیم کە لە بەینی سەردەمی ئێمەو هەموو مێژووی ڕۆژاوادا کەلێنێکی گەورە هەبێت، ئەم قسەیەم پێ قبووڵ نیە، بە بۆچوونی من تەنانەت ئەو کاتەی کتێبەکانی بیرمەندێك دەخوێنینەوە کە لە واقیعدا بیرمەندێکی دێرینەیە، بیرو باوەڕەکانی گەڕانەوەیەکە بۆ ئێستایش.

● کەواتە ڕەخنەی ئێوە لە تیووری دیموکراسی هانا ئارنت لێرەوە سەرچاوە دەگرێت .

– بەڵێ، سەبارەت بە دیموکراسی من لەگەڵ تێگەیشتنەکانی هانا ئارنتا نیم چونکە من وای بیر لێ دەکەمەوە کە ئارنت بێ ئەوەی تێگەیشتنێکی تەواو کاملی لەسەر ئایدیای سەرەکی نوێنەرایەتی هەبێت ئەم مەسەلەیەی خستۆتە ڕوو، ئەو دەسەڵاتی سیاسی و دەوڵەت بەیەك دەزانێت، دیدی ئەو وایە کە دەوڵەت هەموو شتێکی کۆمەڵگای مۆدێرن دەخاتە دەستی خۆیەوە، لەم حاڵەدا کۆمەڵگا دەبێتە دەوڵەتێك کە پێویستی هاووڵاتیان جێبەجێ دەکات. بەڵام ئەوەی لەبیر کردوە کە لەپاڵ ئەو دەوڵەتەدا دەسەڵاتێك هەیە جێگاکەی خاڵیە، لەواقیعیشدا پاشکۆی ڕای گشتیە، نایش توانێت جارێك بۆ هەمیشە ببێتە فەرمانڕەوا، هەر ئەم سیستمەیشە ئەوە دەسەپێنێت کە کۆمەڵگا هەمیشە لەسەروبەندی گەڕاندایە بە دوای ڕەوایەتی و ناڕەوایەتیا، یان هەق و ناهەقا، چونکە ڕەوایەتی ڕەها لەم کۆمەڵگایەدا هەر نیە.

● ئەمە ڕاستە کە هانا ئارنت لەگەڵ بیری دیموکراسیا کە پشت بە نوێنەرایەتی ببەستێت ناجۆرە، بەڵام ئێوەیش لە نووسینەکانتاندا هیچ جۆرە ئاماژەیەك بە دیموکراتیەتی ئەسینا ناکەن.

– لە سیمینارێکدا لە ((قوتابخانەی لێکۆڵینەوەی باڵا)) دا باسێکم لەو بارەیەوە کردوە. بەڵام بەڕاستی وەك دەست نیشان کردن شتێکم لەم بارەیەوە نە نووسیوە.

● کەواتە بەلای ئێوەوە تاقە دیموکراسیەك کە هەبێت ئەو جۆرەیانە کە پشت بە نوێنەرایەتی دەبەستێت.

– بەڵام دیموکراسیەتی یۆنانیش هەرجۆرە دیموکراسیەتێکە، خودی یۆنان لانکەی دیموکراسیە، هیوادارم شتێك لەم بارەیەوە بنووسم، چونکە لە ڕاستیا ئەم دیموکراسیەتە فەیلەسوفە گەورەکانی وەك ئەفلاتۆن و ئەرستۆ زۆریان ڕەخنە لێ گرتووە، بەڵام ئەفلاتۆن، ئەرستۆ، پێش هەموویش سوکرات هەرچەندە ڕەخنە لە مودیلی کۆمەڵگای دیموکراسی دەگرن، بەڵام خۆیان نموونەی بیرکردنەوەیەکن کە بەرهەمی دیموکراسیە .

● ئێوە لە ((جێگای خاڵی دەسەڵات)) دا وەك تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی دیموکراسی مۆدێرن دوان، بەڵام وا نازانیت کە بکرێت لە ((جێگای خاڵی دەسەڵات)) دا قسە لەسەر دیموکراسیەتی ئەسینا بکرێت ؟

– جیاوازیەکە لەوەدایە کە لە دیموکراسیەتی ئەسینادا موڵکداریەتی قەدەغەیە، لای یونانیەکان سەرزەویەکەیان پیرۆزە، لای ئەسینابیەکان بە

تایبــەتی شارنشــینەکان وا بەســتەیی بــە موڵکداریــەتی زەوی، یــان باشــتری بڵێــم بــەو پەیوەندیــەی کــە بەزەویەکــەوە هەیــە بەستراوەتەوە، دەزانیت تەنانەت ئەفسانەیەکی میلیان هەیە گوایا ئەسینایییەکان لە خودی زەوی ڕسکاون، بۆیە دەبینین کاتێك کە بۆ یەکەمجار ئــەم فیکرەیــە دەخرێتــە ڕوو کــە دەســەڵات پــەیوەندی بــە هیــچ کەسێکەوە نیــە، وێنــای کۆمەڵگایەکی ئورگــانێك و پــیرۆزیش دەکرێــت، ئەمەیش بە تــەواوی ئەو پارادۆکسیەیە کە لــە دیموکراسی مۆدێرنا وجودی هەیە، لەوێدا ئیتر کۆمەڵگایەکی گەوهەری نابینرێت.

- بــەڕای ئێــوە ((جێگــای خــاڵی دەســەڵات)) نوختــەی لاوازی دیموکراسیــە یــان نوختــەی هێزیەتی ؟

— هەردووکیان پێکەوە، بەڕای من گەورەترین هێزی دیموکراسی و حەقیقەتیش لەمەدایە، واتا ئەو ئەفسانەیەی کە دەسەڵات دەگرێتە خۆیو پیرۆزی دەکات وجودی نیە، بۆیە مەبەست ئەوەیە کە کۆمەڵگا بۆ پێگەیاندنی خۆی هەمیشە بەرەنگاری لەگەڵ ئەو جیاوازیانەدا بوە کە لە هەناوی خۆیدان، لەودیو کۆمەڵگاوە چەقێکی دەسەڵات نیە کە هەم سەنتەری یەقین و هەم ئەو چەقە یاساییە بێت کە فەرمان دەکات، کەواتە زیاترین هێزو زیاترین بەرهەمی دیموکراسی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، لە ڕاستیا لێرەوەیە کە دیموکراسی هەمیشە خۆی دەخاتە ژێر پرسیارەوە. لاوازی دیموکراسی لەو شوێنەدایە کە دەسەڵاتداران، واتا فەرمانڕەواکانی وڵات بەردەوام پاشکۆی ڕای گشتین، بۆیە هەمیشە بەدوای ئەوەوەن کە بە دەستیان بێنن. کەواتە حیزبەکان کۆمەڵێك ئامێرن بۆ بەدەست هێنانی زۆرترین دەنگ، ئەمەیش بە زەرورەت خەڵەتاندنی ڕەشە خەڵکەکەیە ئەمەیش بە عەوام فریوی دەشکێتەوە.

- **حەز ئەکەم باسێك لە توکڤیل بکەیت. نەك لەبەرئەوەی تۆ خەریکی بەرهەمەکانی ئەویت، بەڵکوو لەبەرئەوەی کە توکڤیل باس لەزیادە ڕۆیی دیموکراسی و ئەو مەترسیانەی هەڕەشەی لێ دەکەن کردووە. ڕاتان دەربارەی لێکۆڵینەوەکانی توکڤیل لەسەر دیموکراسی چیە؟**

— من هەمیشە بە پەرۆشەوە بەرهەمەکانی تۆکڤیل دەخوێنمەوە، توکڤیل تەواو لەوە گەیشتووە کە مەترسی بێ سەرەو بەرەیی ئەوەندە هەڕەشە لە دیموکراسی ناکات، بە پێچەوانەوە ئەوەی هەڕەشەی لێ دەکات گەشەسەندنی ئەو دەسەڵاتە بێناوەیە کە دەتوانێت شێوەی دەوڵەتێك لەخۆی بگرێ و دەست بەسەر هەموو بەشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیا بگرێت. بەڕای من توکڤیل هەستی دەروونی زۆر بە هێز بوە، بەڵام نابێت قسەکانی بشێوێنین، چونکە لە کۆتایی کتێبی دیموکراسی لە ئەمەریکادا و لە یەکێك لە یاداشتەکانی کتێبی ڕژێمی کۆن و شۆڕشدا بڕوای وایە ئەگەر ئەم گۆڕانکاریە بەوە تەواو بێت کە دەسەڵاتەکان ببنە یەك و یەکپارچە، ئەوسا ئازادیە مەدەنیەکان لەنێو دەچن و ئیتر دیموکراسیش وجودی نامێنێت.

- **جەنابی لۆفۆر لە بەشداری کردنت لەم گفت و گۆیەدا سوپاس گوزارم .**

سەرچاوە : نقد عقل مدرن . بەرگی دوەم، دیمانەی رامین جها نبگلو لاپەڕە 122- 145.

---

[i] ئۆلگارش : دەوڵەتێك کە چەند خانەوادەیەك فەرمانڕەوایی بکات.

[ii] هومانیزم : مرۆڤ دۆستی، ئەسڵی ئینسانیەت

# فایلی ژماره

## فیمینیزم

■ فیمینیزم چی‌یه؟

■ ئافره‌ت و په‌ره‌سه‌ندنی سیاسه‌تی جیهان

■ سه‌رمایه‌داری و سه‌ربه‌ستیی ژنان

■ بازرگانی کردن به‌ژنان

■ فێمینیزم و کۆنترۆڵی کۆمه‌لایه‌تی

■ گفتوگۆیه‌ک له‌گه‌ڵ ئه‌نتوانێت فۆک دا

# ئەم فایلە بۆ؟

دەشێ لای هەندێ لەخوێنەران ئەم پرسیارە
وت بێتەوە کە فایلێکی تایبەت لەسەر فێمینیزم
ۆ؟ رەنگە هەر لەنێو ئەم خوێنەرانەشدا هەبێت
ڵێت فێمینیزم بزاڤێك بووە رۆژگارێك باو بووەو
ێستا ئەو گوڕو تینەی نەماوەو سیحری بەتاڵ
ۆتەوە.

لەراستیدا مەسەلەی ئافرەتو مافی ئافرەت
ەر لەبەرەبەیانی مێژووی مرۆڤایەتی‌یەوە یەکێك
ووە لەمەسەلە زیندووەکانی کۆمەڵگاو بەجۆرێك
ەجۆران دەکرێ بوترێ بەشێکی زۆری ئەو
ێژووە مێژوویەك بووە لەسەر چەوساندنەوەو
ەوتکردنی مافی ئافرەتان بیناکراوە، ئەم بارەش
ەروا مایەوە تاوەختێ کۆمەڵگای پیشەسازی
اتە ئاراوەو بەحوکمی دابەشکردنی کار ئەو
یاوازیکردنە لەنێوان ژنو پیاودا زیاتر بەزەقی
خۆی نواند، لەمەشەوە کۆمەڵێك بزاوت بۆ
ەرگریکردن لەئافرەتانو مافی ئافرەتانو

یەکسانییان هاتەگۆڕێ کە دواجارو لەم سەدەیەدا خۆیان لەبزاڤی (فێمینیزیم)دا بینی‌یەوەو دەشبێ بڵێین کە فێمینیزمیش خۆی لەخۆیداو بەحوکمی جیاوازیی فەلسەفەو بۆچوونەکان لەچەندین رێبازی جیادا خۆی خستە ڕوو بۆ نموونە وەك: رادیکاڵ فێمینیزم، لیبراڵ فێمینیزم، سۆسیال فیمینیزم.. هتد. کە هەر رێبازەو لەڕوانگەی فیکریی خۆیەوە کێشەو مەسەلەکانی ئافرەتی دەخستە بەرباسو لێدوان.

لێرەوە دەڵێین کە تائێستاش مەسەلەکانی ئافرەت (بەتایبەتیش لەکۆمەڵگای خۆماندا) لەو مەسەلە گرنگانەن کە پێویستە رۆشنبیریی کوردی ئاوڕیان لێ بداتەوەو هێشتا ئافرەتی کۆمەڵگای ئێمە گیرۆدەی گەلێ کۆتو پێوەندی فیکریی‌و کۆمەڵایەتی‌یەو لەدەرگادانی کێشەو گرفتەکانیان بەنیسبەت ئێمەوە پێداویستی‌یەکی کەلتووری‌و ژیاری‌یە.

ئەمە لەسەرێکەوە، لەسەرێکی ترەوە دەشێ فێمینیزم لەجیهانی خۆرئاوادا زیاتر لەدەهەکانی شەست و حەفتادا لەمەیدانی رۆشنبیریی و کۆمەڵایەتیدا، بزاڤێکی دیارو کاریگەر بووبێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئێستا ئەو بزاڤە درێژەی نەبێت، بگرە ئێستاش فێمینیزم یەکێکە لەو مەسەلە گرنگانەی جێی وتوێژو گفتوگۆی رۆشنبیرین، هەروەکو ئەو بابەتانەی هەڵبژاردووە نیشانی دەدەن، بەتایبەتیش وەچەی دووەمی فێمینیستەکان. هەروەها بەنیسبەت ئێمەشەوە دەتوانین بڵێین کە رۆشنبیریی کوردی تائێستا ئاگاییەکی ئەوتۆی لەسەر ئەم بزاڤە نەبووەو ناکرێ ئەوە بکەین بەبیانوو کە مادامەکی ئەو بزاڤە لەخۆرئاوادا ئەو گڕو تینەی یەك دوو دەهە لەمەوبەری نەماوە، ئیدی ئێمەش دەبێ پشتی تێ بکەین و بێ ئاگایانە بەسەریدا تێپەڕین. خۆ ئەگەر وابێت نەك بەتەنها فێمینیزم، بەڵکو دەیان تەوژم و شەپۆلی فیکریی و فەلسەفیی و ئەدەبیی و هونەری هەن کە ئێستا بوونەتە بەشێکی زیندووی کەلتووری جیهانیی و کەمی خوێندەواری کورد لێی بێ ئاگایە.. ئایا دەکرێ ئێمە هەموو ئەو تەوژم و شەپۆلانە فەرامۆش بکەین و بەو وەهمە خۆمان فریودەین کە بەسەرچوون و کاتی لێدوان لەسەریان نەماوە؟ ئایا تائێستا چەند کتێب و لێکۆڵینەوەو تۆژینەوە بەکوردی لەسەر ئەو تەوژم و رێبازانە نووسراون و بەدیدی هەڵسەنگاندن و رەخنەلێگرتن و سوود لێوەرگرتنەوە گفتوگۆیان لەسەر کراوە؟ ئایا دەکرێ لەکاتێکدا دونیا ئەو هەموو ململانێ فیکریی و مەعریفیانە بەخۆیەوە دەبینێ و پاشانیش تێیاندەپەڕێنێت، ئێمەش لێرەوە پاڵی لێ بدەینەوەو خۆمان بەخۆشبەخت بزانین کە بێ ئاگاین لێیان و لەلەدایکبوونیان و لەگەشەسەندن و کاریگەریی رۆشنبیرانەیان لەسەر کۆمەڵگاکان، بڵێین کۆمەڵگای کوردی بەختەوەرە چونکە ئەو رێبازو تەوژمانە هاتوون و چوون و ئێمەش ئاسوودەو ئارامین، بەوەی لێیان بێ ئاگاین.

ئێمە لەکاتێکدا ئەم لۆجیکە لەبیرکردنەوەدا بەلۆجیکێکی هەڵە دەزانین، هەر لەهەمان کاتدا لەگەڵ ئەوەشدا نین کە رۆشنبیریی کوردی لاساییکەرەوەیەکی کوێری ئەو رێبازو تەوژمە فیکریی و مەعریفیانە بێت، بەڵکو دەبێ خوێندنەوەیەکی وردمان بۆیان هەبێت و بەهەمان شێوە بە رۆحی سەردەم و بەگیانێکی والاو بەدیدێکی رەخنەییانەوە هەڵیانسەنگێنین.

هەر لەم رووەوە (سەردەم) ئەمجارە ئەم فایلەی لەسەر (فێمینیزم) بەپێویست زانیی و، چەند نموونەیەکی جیاوازی ئەو وتارو باسانە لەسەر فێمینیزم دەخاتە بەرچاوی خوێنەرانی و ئومێدەوارە کە توانیبێتی دیمەنێکی روون لەسەر ئەو رێبازە گرنگەی ئەم سەردەمە بخاتە روو.

بەڕێوەبەری نووسین

# فیمینیزم چیه؟

## وەڵامێكی تایبەت

■ دەیڵ سپێندەر

● و: ئاوات ئەحمەد

هەڵبژاردنی فیمینیزم بۆ من شتێكی یاسایی بوو، بڕیارێكی دەستەنقەست بوو بۆ پێشخستنی ژیانی خۆم. من فیمینیزمم وەكو ڕێبازێكی ژین ئیختیار كردووە، وەكو بەهای سیستمێك و مانایەك بۆ لێكدانەوەی جیهان و شوێنی من لەناویدا، لەوكاتەدا كە ڕەنگە خەملاندنی من بۆئەم پرۆسێسە چەند خەسڵەتێكی كەلتوریی هەبێت، گومان دەبەم كە ئەمە شتێكی نائاسایی نەبێت لە جیهانە سپییەكەی خۆراوادا. گەلێك ژنی تریش چیرۆكی لەم بابەتەیان هەیە تابیگێڕنەوە.

من لە ئوستراڵیادا، لە شوێنێكدا جێمابووم كە بۆ نەوەی ئێمە نمونەیی نەبوو، دایك و باوكم خەمیان زۆربوو. ئەوان بە پارەیەكی كەم و خۆشەویستیەكی زۆر بەرامبەری یەكتریی زەماوەندیان كرد. لە هەندێ ڕووەوە هیچ داب و نەریتێك دایكمیان نەتۆقاندبوو: تاڕادەیەك لەبەر تواناو لێهاتووی خۆی هەرگیز هەوڵی نەدابوو مێینەیەكی دەقاودەق بێت، بۆیە شتێك لە بەكۆمەڵایەتی بوون لە گۆڕێ بووكە ئەو خۆی لێ نەبان كردبوو.

سێ ساڵ دوای زەماوەندەكەی ئەوان من هاتمە دونیاوە. دایكم شێوازی خۆی هەبوو لە سك پڕنەبووندا (ئەو داهێنانەی كە لەوماوەیەدا ڕەنگی دابۆوە: ئیسفەنج)؛ دایكم ئەم زانیارییەی لە خەسویەوە پێگەیشتبوو، خەسووی مامان

بوو. دایکم دەیوت کە بەلایەوە گرنگ نەبوو منداڵی یەکەمی کوڕبێت یان کچ، بەڵام کاتێك من لەدایك بووم ئیتر دایکم حەزی لە کچێکی تریش بوو. ئەو خۆی خوشکی نەبوو، هەمیشە هەستی دەکرد ئەوە زیانێکی گەورەیە – بۆیە دەیویست دوو کچی هەبێت تاکو ببن بە خوشك، بۆیە کاتێك لینی خوشکم سێ ساڵ دوای من لەدایك بوو، دایکم شاگەشکە بوو. بۆ منیش و خوشکەکەشم داب و نەریتێکی تۆکمە هەبوو کە هەمیشە داوامان لێدەکرا پێڕەوی بکەین. هەر لە ڕۆژی لەدایك بوونی خوشکەکەمەوە دایکم چۆنیەتی خوشکایەتی ئێمەی دامەزراندو هەمیشە جەختی لێدەکردین کە ئەوە ئیمتیازێکی گەورەیە ئێمە یەکتریمان هەیە، گەورەترین لێپرسراوێتی ئێمە بەرامبەری یەکترییە. نەلینی و نە من بیرمان نایەتەوە لە یەکتری جیابووبین: هەمیشە هەر "ئێمە" هەبوو، یان وەك دایکم دەیگوت "ئەوان".

بێگومان ئێمە وەك منداڵ ناخۆشی هەردەکەوتە نێوانمان (دەیانوت، ئەگەر من ولینی شتێکمان بخواردایە، من بەدەست دەمگرت و ئەویش قەپی لێدەگرت)، بەڵام هەوڵی دایکم ئەوە بوو کە ئێمە باشترین هاوڕێی یەکترین بین. ئەم ئەزموونە زووەی من لەمەڕ خوشکایەتی، دواتر بوو بە ڕێنیشاندەرێکی گرنگم لە پەیوەستبوونمدا بە سیاسەتی خوشکانەی فیمینیزمەوە.

هەرچۆنێك بێت کاتێك بووم بە پازدە ساڵان، هاوسەنگییەکەی زوو مەترسیی تێکەوت، براکەم لەدایك بوو. لەپڕێکا ئاگادارکردنەوەکەی دایکم بۆ جیا نەبوونەوە لە گۆڕێ نەما، ترسی ئەوەمان لێنیشت کە لەگەڵ هاتنی کوڕێکدا هەندێ گۆڕانکاریی بکات. ئەم گۆڕانکارییە حەقیقەتێك بوو کە لە تەمەنی سیازدە ساڵیمەوە لە ململانێیەکدا لەگەڵ باوکمدا دەستم پێکردبوو. باوکم دەستی کرد بە تاقیکردنەوەی دەسەڵاتی خۆی – لەوەبەر شتی وای نەکردبوو– ڕێك لەو کاتەدا کە من دەستم دایە لاسارییەکی منداڵانەو دەمویست وەك نەرزەیەك "adolescent" ڕەفتار بکەم. خۆی و هاوەڵانی ئەرکی پاراستنی پاکیزەیی کچانیان گرتە ئەستۆی خۆیان – سێبەری مەترسییەکیان دەبینی کە لە پشتی هەموو شتێکەوە خۆی شاردبۆوە، هەر لە قەڵەمی لێوەوە تا دەگاتە سوخمەی مەمك "ستیان" کە بەکارهێنانیان نیو خولەکی نەدەبرد. ئەمە ئەوە نەبوو کە ئێوە حەزدەکەن پێی بڵێن سەربەستیی گەورەبوون، یاخود تەنانەت کرێس (فضولي) یش نەبوو.

لە ماوەی نەرزەبوونمدا لەلایەنی سۆزییەوە زۆر نائارام بووم. زۆر قەڵەو بووم، قژم زۆر ڕێك و تەنك بوو، دایك و باوکم دور لە من لە دەرەوەی شار دەژیان بۆئەوەی ژیانێکی کۆمەڵایەتی باشم لەدوای قوتابخانە بۆ دابین بکەن. دوای ئەوەی دەرسم وەرگرت لەوەی کە ناسراوی لەناو خەڵکدا پاداشتێك نییە بۆ ئەو کچانەی لە ماتماتیك و زانستەکاندا سەرکەوتوون، پەیوەندیم کرد بە قوتابخانەیەکی ئامادەیی تێکەڵاوەوە، جگە لە گرفتی قورسایی و قژ و شوێنی نیشتەجێ بوونم، توانای شیکارکردنی هاوکێشەکانی ماتماتیك و زانستەکانم هەبوو، بۆیە لە ساڵی سێیەمیندا لەو قوتابخانە ئامادەییەدا تەواو بێ هیوا بووم و هەوڵمدا بۆ سەرکەوتن لە ژیانی سێکسیدا. تێکۆشام و – جەنگام – بۆ هاوسەنگ کردنەوەی خۆم. زۆر خەریکی قژم بووم و بایەخم پێدا – بە شتن و تەرکردن و ڕێك خستن و لول کردن و چاککردن – ڕۆتینێکی خۆ دەرخەرانەبوو. دەستم کرد بە خۆلاوازکردن لەگەڵ بە خۆداچوونەوەیەکی بەنازانەو حەزێکی زۆریش بۆ خۆراك، دوای نانخواردن خۆمم دەرشاندەوە. ئەمە بۆئەوەی جێگایەك بۆ خۆم بکەمەوە و بە دڵی کوڕان بم.

بۆچی براکەم جیاواز لە من مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا؟ بۆچی دەبێت کچان پاکیزەبن؟ بۆچی هەبوونی ئەزموونی سێکسی لە ڕێگادا بەرەو زەماوەند دزێوەو بەدڕەوشتیە کەچی لە ڕێگای ماڵەوەدا شەرەفمەندو شکۆدارە؟ بۆچی دەبوو باوکم وەکو سەرگەورەی ماڵ دەربکەوێت؟ ئایا کە من بەشێوەیەکی پراکتیکی تەحەدای دەستەڵاتەکەی باوکمم کرد، ئەو هیچی لێکەم بووەوە، بە ڕاشکاویی ئەو بوو کە بوارێکی بۆ تووڕەبوون کردەوە، لەوکاتەدا کە من بەشێوەیەکی فیکریی بەرەو رووی وەستابوومەوە. بۆیە منیش دووبارەم کردەوە. ڕەنگە ئەوە تاقە ئەزموونی فیکریی بووبێت کە من لەوکاتەدا هەمبوبێت.

بە مەزەنەی خۆم، لە تەمەنی پازدە ساڵیدا بڕوانامەکەمم لەدەست داو ئەمەش زۆر بێتاقەتی نەکردم. بەلای خۆمەوە ئەوە باشترین بیانوو بوو بۆئەوەی ببم بە وەستای قژ بڕین - دواجار ئەزموونی زۆرم پەیداکرد. بەڵام دایك و باوکم ناهێڵن بەبێ پسپۆڕییەك قوتابخانە بەجێ بهێڵم. بۆیە کۆچمان کرد بەرەو "سیدنی" و خۆم لە قوتابخانەیەکی کچاندا بینیەوە، ئەگەر بەرواری هەنگاوی دووەمم بەرەو فیمینیزم دیاری بکەم، ئەوا تۆمارکردنمە لە قوتابخانەی باڵای بێرووودی کچان. دوو ساڵ دواتر کە ئەو قوتابخانەیەم بەجێهێشت بۆئەوەی بچم بۆ زانکۆی سیدنی، تێڕوانینێکی زۆر جیاوازترم هەبوو بۆ جیهان. سەرەتا قوتابخانەکە کوڕی تێدا نەبوو، هێمنی ناو پۆل وەکو ئەدەبی زانستیی وەها بوو بەلای منەوە. مامۆستا ژنەکانم خۆشدەویست، چێژم لە دەرسەکان وەردەگرت کە بە ڕاستی خۆش و بەهادار بوون، ڕەخنە ئامێز و پڕ لە تەحەدابوون - هەروەها بە جۆرەها ڕێگا ئەو دەرگایانەیان دەکردەوە کە من هەر بە بوونیانیشم نەدەزانی.

جێگای داخە کە تا ئێستا هەلم بۆ نەڕەخساوە کە بگەڕێمەوە بۆئەوێ و سوپاسی هەندێك لەو ژنە مامۆستایانە بکەم - خاتوو دۆونی، خاتوو بێنسۆن، ریس خانم). ڕاستیەك هەبوو کە من لە دەرەوەی قوتابخانە و بەناو دراوسێ تازەکانمدا هیچ هاوڕێیەکم نەبوو. بۆیە بە روخسەت و لە سایەی مامۆستاکانمدا، زۆربەی ژیانم خزابووە ناو کتێبەوە.

کاتێك لە سەرەتای شازدە ساڵیدا زانکۆم تەواو کرد، دەستم کرد بە وانە وتنەوە لە قوتابخانەیەکی کوڕاندا. حەزم لێی نەبوو، زۆریش تیایا سەرکەوتوو نەبووم گلەییم لە خۆم دەکرد. هەروەها دەستم کرد بە گوێگرتن لەو ئەفسانە سەرنج ڕاکێشەی کە ڕەنگە ژنان بۆ کارکردن دروست نەکرابن. چۆنیەتی پێشکەوتنم لە توێی ژینەوە، هەمووی لە دەرەوەی خۆمەو بەرەنگاربوونەوەیی چەند مانایەکی هەیە.

لە تەمەنی بیست و چوار ساڵیمدا خۆمم بینیەوە نوشوستی هێنانی خۆم لە پەیداکردنی مێردێکدا بۆ ژمارەیەك لە ژنی بە مێردی ناڕەزا لە قسەکانم روون دەکەمەوە، هەستم بە ڕەزامەندی نەکرد لە ڕازیبوونی ئەوان بەوەی موبەقێکی گونجاو ئەوپەڕیەتی، بەڵام نەشمتوانی ئەڵتەرناتیڤی گونجاو پێشکەش بکەم. بەبیانووی ئەوەی کە شتێکی کەمم لەکیس دەچێت بڕیارم دا فرسەتێك ببەخشم بە زەماوەند (marrage).

لەبەرئەوەی جەستەم لەگەڵ بیرمدا نەبوو، شەش مانگی ڕەبەق پێش زەماوەندەکەم نەخۆش کەوتم، بەڵام کە دواتر بۆم دەرکەوت کریستاڵ ئێستمان و چارلۆت پێرکینز جیلمان دوو پاڵەوانەکەی من - لەگەڵ ئۆلیف سچرینەر و گەلێکی تریشدا، هەر هەموویان شەش مانگ پێش زەماوەندەکانیان نەخۆش کەوتوون. کەوتمە ئەوەی مانایەك بۆ ئەم ڕوداوە بدۆزمەوە. هەرچۆنێك بێت زەماوەندەکەی من نەبوو بە

گەشتێکی ستاندەرو بـە کـەناری گەشـەکردنی ژنانەدا بەرەو منداڵ و کاتی کارکردن. دوو فاکتەر هەبوون کە نەیان هێشت لەم فۆرمۆلەیە تێبگەم.

یەکەم کاتێك زەماوەندم کـرد، چەند شارێکم گۆڕی، هەروەها بەهۆی چارەنوسێکی سـەمەرەو هیچەوە من و لینی خوشـکم هـەردوکمان لـە یـەك قوتابخانەدا بووین بە مامۆستای ئینگلیزی.

فاکتەری دووەم زەماوەندەکەم بـوو. هـەرگیز خۆمم بە دروسـتکردنی ماڵەکـەم دڵخۆش نـەکرد، کـاری دەرەوەی مـاڵ داگیری کردبـووم. بـەڵکو بەبێ ئەو فشارە فریودەرە دانوساندنم دەکرد کـە دەیتوانـی چارەیـەکی دەرەکـی بـۆ بدۆزێتـەوە. مێردەکەم چەند سەعاتێکی زیـاتر کـاری دەکرد، بۆیە شتێکی ئاسایی بوو من ئیشی بازاڕ بکەم، وا نەبوو؟ دواجار کاتێك لە قوتابخانە تەواو دەبووم، دوکانەکان هەر کراوە بوون، ئەگەر بچـم بـۆ بـازاڕ دەبێ دوای ئەوە چێشتیش لـێبنێم. هـەرچۆنێك بێت ئەو چێشت لێنانی نـەدەزانی (یاخود قـاپ شـتن و پاککردنـەوە). منیـش نـەمدەزانی ئـەو ئیشانە چۆن دەکرێن، بەڵام پرسیاری نەدەویست کە مـن ئـەو کەسە ئاساییە بـووم کـە توانـای سروشتیی تێدایە بـۆ راپـەڕاندنی ئـەو کارانـەو فێریش دەبم.

یەکێك لـە سـەدمە گـەورەکانی سیستەمەکەم لەگەڵ چێشت لێناندا قـەوما. هـەتاکوو شـوکردنم چێشتم لـێنەنابوو، کاتێك دەیپرسی چیمان هەیە بۆ شێو، بەرووخۆشییەکەوە وەڵامم دەدایەوە کـە سێو، پرتەقاڵ لەگەڵ مۆز یـان پسکیتی قـاوە – هەڵبژاردنێکی سەربەستانە – دیـارە رەفتارەکـەم شـتێکی خـەندە ئـاوەر بـووە. لـە ژیـانی ژن و مێردایـەتیمدا مـانم لـە چێشت لێنـان گـرت – بـا وەڵامـی خۆشمتـان بدەمـێ– بـۆم دەرکـەوت کـە رەفتارەکەم زۆر دوورە لە خەندە و بزە گرتنەوە. مـن هـەر هـەمان کـەس بـووم، بـەڵام کۆدێکـی کۆمەڵایـەتی لـە تـاکێکی یاخیـەوە گۆڕیمـی بـۆ سۆزانییەکی خۆپەرست. ئەمەش، بەبێ سەرسـام بوون وای لێکردم کە گەلێك پرسـیاری (بێدەنـگ) بکەم سەبارەت بە ژنانی وریاو چالاك. بەلاسایی کردنـەوەی ئـەو ئیمتیازانـە ناچار بـووم لەگـەڵ مێردەکـەم بکەومـە نـاو دژایەتیـەکی کـراوەوە. بەشێکی زۆر لـە وزە و توانـام تـەرخان بـوو بـۆ بەرهەمـهێنانی پـیرۆزیی ژن و مێردایـەتی. هـەموو جـارێکیش داکۆکـی کردنەکـەم لـەخۆم سـەری نەدەگرت‌و تووشی ناڕەحەتیی دەکردم. هەوڵم دا کـەلینی لەمەترسییەکانی ژیانی ژن‌و مێردایـەتی وریـا بکەمـەوە – بـەڵام ئـەو گوێـی لـێ نـەگرتم. شـووی کـردو گواسـتیەوە بـۆ خانوویـەك لـە دەوروبـەری سەرسـووچەکە. کەواتەسـاڵانێك بەرلـەوەی زاراوەی هەسـت و سـۆز ببیسـتین، پێکـەوە سـەرنجمان دەگۆڕیـەوە و باشـتریش قسـەمان دەکـرد و جـەختمان لـە واقیعیـەتی یـەکتریی دەکـرد بـەرەو قوتابخانـە و لـە قوتابخانەوە.

چۆن دەتـوانم ئێسـتاکە ئـەو سـاڵانە روون بکەمەوە؟ ئەو ساڵانە چیتر لەگەڵ ئـەو شـتانەدا نایەنـەوە کـە مـن دەیـانزانم، هەست بە بێزاریی دەکـەم لەگـەڵ ئـەو ژنانـەدا کـە بـە نیگـەرانی و پەرۆشـەوە بـەردەوامن لەسـەر ئـەرك و ماندووبوونەکانی خۆیان.

مـن لەلایـەنی ئابووریـیەوە سەربەست بـووم، هـەرکاتێك بمویستایە دەمتوانی بڕۆم. بـەڵام لـە رووی کرداریـیەوە زۆر سانا نـەبوو. سـنورداریی جیهانەکەم بەڕادەیەك بوو کە نەمدەزانی بۆ کـوێ بـڕۆم: نـەمدەتوانی لـەوە تـێ بگـەم کـە ژنێـك دەتوانێت ژیانێك بۆ خۆی دروست بکـات. جیهان سەخت و رێکخراو بوو. گرفتی من لەوەدا بوو کە نەمدەتوانی لەناویدا بسازێم. هەستم دەکرد شتێك لەگەڵ مندا هەڵەیە – بۆیە پەشۆکاو و دەمارگیر و دەروون شێواو بووم – هەست و سۆزی مـن بـەو شرینقانە چاك نەدەبوون بۆ کامەران بوون و ئارام

گرتن، چونکە دوای هەموو شتێك من خۆم لە خۆمدا کچێکی شانسدار بووم.

لە میانەی یەکەم ساڵی شوکردنمدا لە کۆتایی ساڵی 1960 دا، هەوڵەکانم بۆ گۆڕینی ژیانم بەرەو ژیانێکی باشتر، زۆر بە خراپی بە ئاڕاستەیەکی تردا ڕۆیشت، لەسەر بنەمای ئەوەی کە هەڵەکان هەر هەموویان لە منەوەبن. ڕەنگە لە چێشت لێناندا زۆر کارامە نەبووبم، بەڵام خۆ هەفتەی دووجار سەرم لە سالۆن دەدا (لەگەڵ باوەڕێکی جێگیردا کە هەرگیز بە دەستی مرۆڤانەی خۆم کوافێرم نەکردووە)، ڕژێمێکی سەخت، خەریك بوون بە هەموو شتێکەوە هەر لە سەرینەوە تا دەگاتە سێبەری چراکان. ئەم ستراتیژانە هیچ سودێکیان نەبوو: بەپێچەوانەوە، ئازارێکی زۆریان پێ گەیاندم - چونکە وایان دەردەخست کە من هەوڵم دا بەڵام سەرنەکەوتم - ئەو شوێنەی کە تیایا هەستم بە نوشوستی نەدەکرد، بریتی بوو لە شوێنی کارەکەم. بەڵام ئەو خۆشییەی کە لە کارەکەم دەستم دەکەوت دیسان دەروازەیەکی تربوو بۆ ئەرکەکانم، ئەمەش مایەی گاڵتەجاڕیی بوو بۆ تەمەنەکەی من. "ژنە کارگەرەکە" ناتۆرەیەکی سوکی ترە بۆ مرۆڤ و، منیش لەبەردەمی مەترسی ئەوەدا بووم کە ببم بە یەکێك لەو ئافەریدانە. تەنیا بە هۆی منداڵێکەوە دەمتوانی بیسەلمێنم کە لە مەترسیدا نیم. تا ئێستاش دڵنیانیم کە بۆچی دژی ئەو هەوڵە وەستامەوە. زۆر بە ئاسانی دەمتوانی کە بەڵگەنامەکانم بخولقێنم. ڕەنگە هۆی ئەوەبێت کە ئاگاداری ئەو گۆڕانە بووم کە بەسەر ژیانی دایکمدا هات دوای لەدایك بوونی براکەم، چونکە من هەندێ وەهمی ڕۆمانسییانەم لەسەر دایکایەتی هەبوو. ڕەنگە ترسابێتم. ڕەنگە حەزم نەکردبێت کارەکەم بەجێ بهێڵم، چونکە ئەوێ تەنیا پانتاییەك بوو کە تیایا خۆش دەژیام.

هەرگیز بە ڕاشکاویی نەموتووە کە منداڵم نابێت - بۆچی ئەوەندە قسە ڕەق بم؟ بەڵام ئەگەر لە داهاتوویەکدا منداڵیشم ببێت، هەروا هەست بە ساردییەك دەکەم. دەشێ من هەمیشە باوەڕم بە عەقڵی خۆم هەبووبێت.

بۆیە لەجیاتی منداڵ سەرکەوتنم لە کارەکەمدا هەڵبژاردو - بووم بە بەڕێوەبەری بەشی ئینگلیزیی. ئەوە یەکەم جار بوو من لە پایەی لێپرسراوێتیدا بم و ئەم گۆڕانەش شادمانی کردم. لە هەست و نەستی خۆمدا وام دانابوو کە لەگەڵ پیاواندا مشت و مڕ دەکەم و دەریشیان دەکەم، بەڵام کارەکە زۆر جیاواز بوو. لە یادمە جارێکیان یەکێك لە ئەندامە نێرەکانی قوتابخانە بە فوتەیەك ویستی باڵای سەرۆکە ژنەکەیان بپێوێت. پێیان سەیر بوو کە ئەو ژنە ناڕەزایی بەرامبەری ئەو سوعبەتە بچووکە دەربڕی. ئەوە گرەوێکی بچکۆلە بوو، بەڵام ئەوان سووربوون لەسەر ئەنجامدان و بردنەوەی. بەلایانەوە ناخۆش نەبوو کاتێك بە ڕاشکاوی وتم هەرکەسێك دەستی بەر هەر ژنێك بکەوێت دەبێ فوتەکە بە قەدی خۆی بگیرێت و پێوانە بکرێت.

سەبارەت بە خۆم، ئەوکاتە بەبێ بیرکردنەوە دژی پیاوان بووم، دەبێ دان بەو ڕاستییەشدا بنێم کە بەپێی پێوانەکانی ئەوان خۆمم ڕێك دەخست. بە زۆریی درێو دەهاتنە بەرچاوم، خۆیان و گەمە درێوەکانیان، سوعبەتە درێوەکانیان، خووە درێوەکانیان لە خواردنەوەدا، هەستی درێویان بەسەرکەوتوویی بە بیانووی ئەوەی کە "منەکانیان - egos" پێویستی بە دامرکاندنەوەی بەردەوام هەیە. چەند پیاوێکم ناسیوە کە بە هیچ شێوەیەك ڕێزم لێنەگرتوون ئەگەرچی - لە دەرەوەی کار - دەشیا ئازاری زۆرم پێ بگات کە دەمویست مانای پیاوان ڕەت بکەمەوە. جیهانێکی نادادپەروەر بوو.

پـەیوەندی دەكـەن بـە قۆنـاغی دووەمـــەوە – بەتایبەتی ژنی شوكردوو – ئەوە لە قاڵبی ئاسایی خۆی دەچێتە دەرەوە. من و لینی هەردوكمان بە تەواوی سەرمان جەنجاڵ ببوو، ماڵ بـەڕێوەبردن، دەرس وتنەوە، ئامادەكردنی شـانۆ، پـەیداكردنی رۆژنامـە، سـەردانی رێكخراوەكـان.لـەكاتێكدا كەهەنگاوەكانی ژیانمان پڕبوون لە ماندووبوون، هەردووكمان هەستمان دەكرد كە بەتاڵیشن. ژیان سـكە خشـێیەكی بێمانـابوو كـە بـە برگـەی خۆفریودان بەش بەش كرابوو، لەگـەڵ هەستێكی سـەخت بـەوەی كـە بـە دڵنیـایی دەبـێ شـتی زیاتریش هەبێت.

ئێسـتا، شـەرمەزاردەبم كاتـێ بـە ژیـانی رابوردومـدا دەچمـەوە، بە بـەراوردكردن لەگـەڵ زۆرێك لە ژنانی تری ئەم جیهانەدا من ئیمتیازێكی زۆرم هـــەبوو. خودێتـــــی egocentricity و رەگـــەزێتیم enthnocentrism هـــەردوكیان لەقیبوون.

بۆچی من نەسازام، نەمتوانی پەنجەرەیەك بۆ خـۆم بدۆزمـەوە و ژیـــانێكی هێمـــن و مـــاقوڵ بەسەربەرم؟ هـەرگیز نەمپرسیوە ئەمـە چ جـۆرە ژیانێكە، چـی لـێدەزانم و چۆن دەیـزانم؟ ئـەی خزمـەتی چ مەبەستێك دەكات؟ قـەت پرسـیاری ئەوەم بە مێشكدا نەهاتووە كە چۆن ژیانی مـن وەك ژنێكـی ئوسـترالیی سـپی لەگـەڵ ژیـان و شێوازی هی تردا بەراورد بكـەم. تـەنیا پرسـیاری رووكەشیم كردووە دەربارەی بـەهاو ئایدیۆلۆژیـاو گەلـێ شـتی تریش كـە دەوریـان داوم، ئەوانـەش پرسیاری وەهابوون كە زیاتر خەڵكیان دەشـێواند وەك لەوەی دەروازە لە رووی خۆمدا واڵابكەن.

ژنان ئەوەیـە شـكڵێكی وایـان هـەبێت كـە پیـاوان حەزی لـێ بكەن، ئەویش ئەوەیە بچنـە دەرەوەی زانینەوە. لەوكاتەوە بۆم دەركەوتووە كە زیاتر لە رێگایـەك هەیـە بۆئـــەوەی ژنـــان بـــە نـــەزانی بهێڵرێنـەوە. پێویسـت ناكـات ئـارەزووی چوونـە پەیمانگا بكەین بـۆ فـێربوون: دەتوانـین سـاڵ لـە دوای ساڵ (من خـۆم دوازدە سـاڵ قوتـابی زانكـۆ بوم) شـتێكی كـەم یـان هـەر هیـچ شـتێكی وافـێر نـەبین كـە لەگـەڵ ژیانمـاندا بێتـەوە، لەگـــەڵ تێگەیشتنماندا بسـازێت و جـەخت لـە بوونمـان بكـات، وامـان لــێ بكـات پرسـیاری بابـــەتیی سەبارەت بە جیهان بكەین. سـەبارەت بـە خـۆم، ئـەوەی زیـاتر تێگەیشـتووم، گەیشـتوومەتە ئـەو قەناعەتەی كە ئەم دونیایـە زۆر ئـاڵۆزە و قـابیلی تێگەیشتن نیە، هۆی ئەمەش ئەوەیـە مـن توانـای تێگەیشتنم نەبووە (ئـەو سـوربوون و مكومییـەی مـن هـەمبوو شـتێكی كـەم نـەبوو– چونكـە لـە راستیدا دوازدە ساڵ كاتێكی درێژە بـۆ هـەوڵدانی بەردەوام!).

رەنگـە ئـەمـە نزمـترین خـاڵ بێت لـە ژیـانمدا، ئەوكاتەی زۆر نزیك بووم لە دیارنەمانەوە. هەموو شـتێكم تـاقی كـردەوەو سـوودی نـەبوو، هیـچ رێگایـەكم لەبـەردەمدا نـەمابۆوە. ئـەو هەسـتە روونـەم لـــەبیرماوە كـــە ئەگـــەر بۆمـــاوەی چركەیـەكیش بێـت چـۆك دابـدەم، تووشـی هەرەسـهێنانێكی نـیرۆتی دەبم (كـە ئەمـەش پڕاوپڕی ئەوەبوو كە هەندێك كەس چاوەڕێ بوون بەسەرم بێت).

من و خوشكەكەم بێ پسانەوە قسەمان كرد، بـەڵام رێگـای دەربازبوونمـان بـەرچاو نەكـەوت. ناتوانم لەجیاتی لینی قسە بكەم، بەڵام سەبارەت

به خۆم دەڵێم هێزم. لە پارانویەکەمدا بوو. "مەهێڵە ئەو نامەردانە پێت بگەن" ئەمە پەندێك بوو کە لە ژیانی مندا زۆر رەنگی دابۆوە. لەناو زانکۆ و دەرەوەشیدا پیادەم دەکرد. دیسانیش، زانکۆ جێگای دەستەڵاتی پیاو و سیاسەتی ئەوان بوو. من هەردەم وام بیردەکردەوە کە جیهانی ژن لەناو نمرەی بەرزدایە، ئەزموونێکی سەختی بێدار بوونەوەم تووش هات، هەست کردن بە گەمژەیی لە بەرامبەری گەلێك لە قوتابیە زیرەکە کوڕەکاندا. لەوکاتەدا چرپەی "سەربەستی ژنان" نەگەیشتبووە گوێمان، بەڵام ئێمە ئامادەبووین بۆ بیستن. ئێمە وامان لێهات بە راشکاوی رەخنە لە "منی نێرینە" بگرین، تەنانەت یەکەم نامەی ماستەریش کە من پێشکەشم کردو قبوڵ نەکرا بریتی بوو لە رەخنەگرتن لە دەستەڵاتی پیاو لە ڕۆمانی ئوسترالیدا.

لەم خاڵەدا جێرمانین گریر هاتە ناو ژیانمەوە. ئەم ژنە تەندروستیەکی زەینی پێ بەخشیم. سەرەتا، خوێندنەوەی کتێبی خەساندنی مێینە وەکو خوێندنەوەی چیرۆکێکی تۆقێنەر وەهابوو: ئەو هەموو بەڵگانەی کە من پێم نەدەزانین، ئەو هەمووپەیوەندییانەی کە من بەخەونیش نەمبەستبوون، ئەو هەموو روداوانەی کە نەمدەوێرا تاقییان بکەمەوە، هەر هەموویان بەیەکەوە شالاویان بۆ هێنام، ویستم نکوڵیی لە هەندێکیان بکەم، موبالەغەیان تێدابوو بەڵام بەڕاستی روویان دابوو. هەرگیز ناتوانم ئەو کاردانەوەیەم لەبیر بچێتەوە کە بەرامبەری چاپتەری "قێزەون" لام دروست بوو، کە بە رستەی "ژنان شتێکی کەم دەزانن لەوەی تا چ رادەیەك پیاوان رقیان لێیانە" دەست پێدەکات لەگەڵ ئەو رستەیەدا کتێبەکەم ناسی – ئەگەر چی هەندێ بەرەنگاریشم هەر تێدابوو.

ساناترین شێواز بۆ دەرخستنی بایەخدانی من ئەوەیە بڵێم دەستم کرد بە پێکەنین. ئەو پێکەنینە تێکەڵەیەك بوو لە چێژو، ئارامیی و هیستریا و ژان و تورەیی و کرێسی بوو؟ دڵنیام لەوەی لە پرێکدا یەك ساڵی رەبەق گەنج بوومەوە. کە سەیری وێنەی خۆم دەکەم دەزانم کەهەموو جەستەم گۆڕانی بەسەردا هات. بەبێ هیچ هۆیەکی هەستیی، تەندروستیشم باش بوو، چالاکتر بووم – قورساییم دابەزی . دەتوانم زۆر شت بڵێم کە لە جێرمانین گریرەوە فێریان بووم – دەربارەی ستەمکردن لە ژنان (پێشتر هەرگیز ئەو وشەیەم بەکارنەهێنابوو)، دەربارەی ئەوەی کە ئێمە زۆر بە فراوانی وێران کرابووین و بە باش و خراپ بەکارهێنرابووین.

من هەر لە بێشکەوە، راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ فێرکرابووم کە ژن بوونەوەرێکی سەلبییە، پێویستیان بە وەیە بڕواننە پیاوان، بۆیە دەبێ بە ملکەچی و دەستەمۆیی رازیی بن. من باوەڕیشم بەمە کردبوو، سی ساڵی رەبەق خەریکی شاردنەوەی ناتەواوییەکەم بووم، بۆ شاردنەوەی دڵنییای خۆم لەو بەختەی کە زۆربەی ئەو پیاوانەی دەیانناسم رێزم لێ بگرن، شاردنەوەی رازی نەبوونم بەوەی ملکەچ و دەستەمۆ بم، بۆئەوەی کەشف نەبم و وەکو مێیەیەکی سەرنەکەوتوو نیشانە نەکرێم. ئەوەی جێرمانین گریر دەیویست پیشانی منی بدات، ئەوەیە ئەگەر بمەوێت مێیینەیەکی راستەقینە بم، دەبێ مرۆڤێکی تێکشکاوبم. جیهان ئاواهی سەیرمان دەکات! دیسان لەوەش تێگەیشتم کە بەشێکی گەورەی بوونی مرۆڤ، بوونێکی رۆشنبیرییانەیە.

مرۆڤ سیستمێك لە هێماو رەمزی داهێناوە کە مانای جیهان و ژیانی رۆژانەی خۆمانمان بۆ روون دەکاتەوە: ئێمە بەبێ ئەوەی بیری لێبکەینەوە، واقیع دەخولقێنین. هەتاکو ساڵی 1970 من لە جیهانێکدا دەژیام کە باوەڕی بەبێ توانایی ژنان هەبووە. گەلێ جار بیرم لەوە

کردۆتەوە کەرەنگە ژن تەنیا بۆ یەك شت باش بێت: باخەڵی پیاو!، چەندەها جار لەلایەنی پیاوانەوە قسەی لەمجۆرە کراوە. بۆیە ئەو مەبەستە ئایدیۆلۆژییانەی کە بەهۆیانەوە ژنەکان بەکاردەهێنرێت، هەتا ئێستاش هەر برەوی هەیە.

بە واتایەکی تر، هەتاکو سالّی 1970 قەرەبۆی نوشوستییەکەمم بەوەدا بۆوە کە وەکو تاکێکی بەرهەمدار لەم جیهانەدا گوزەران بکەم: دوای سالّی 1970 بۆم دەرکەوت کە وەکوو دەستە جلێکی سەمەرە سەیریان کردووم، تووشی سەدمەیەکی گەورەبووم.

هەندێك جار ئەم حالّەتەم لەگەلّ ئەزموونی ئەنترۆپۆلۆژییەکاندا بەراورد کردووە، ئەوانەی لە کولتورە جیاوازەکانیان کۆلّیوەتەوە، یان لەو کەسانەیان کۆلّیوەتەوە کە سەر بە هیچ کولتورێك نین، هەموو شتێکیان، هەر لە بێزارییەوە تادەگاتە پێکەنین، لە کرۆکەوە تا دەگاتە توێکلّ. لە سیستمی باوەڕی کۆمەلّگادا هەموو شتێك بەکارهاتووە بۆ تەقاندنەوەی کۆدی کەلتور، بۆئەوەی هەر لە سەرەتاوە ئەو مەشقانەی بەژن دەکرێن مانایان هەبێت.

فیمینیستەکانیش وەکو ئەنترۆپۆلۆژیستەکان لە کولتورێکی بیانی دەکۆلّنەوە. دەوری مرۆڤە بێکەلتوورەکان دەبینن و توێژینەوە لە سیستمی رەفتاری کۆمەلّگا دا دەکەن (مەرکەزیەت و سەرداریّتی نێر) کە شتێکی شاراوە نیە. کاتێك فیمینیست بەدەنگی بەرز باسی سێکسیزم SEXISM دەکات، ئەوا ئەو کۆدە دەتەقێنێتەوە کە باس لە بالّا دەستیی نێر دەکات.

بەلّام فیمینیزم تێڕوانینێکی زۆر کراوەیە (Fxlexible) بۆ جیهان. من بە هیچ شێوەیەك نالّێم فیمینیزم راستەو هەموو بۆچوونەکانی تر هەلّەن. ئەگەر فیمینیزم چیتر بەشێوازی پاتریارك دروست نەبێت.. ئەی کەواتە فیمینیزم چیە؟

فیمینیزم تەرزە شی کردنەوەیەکە کە زۆربەی ئەزموونەکانی من و ژیانی من و ژیان و ئەزموونی گەلێك ژنانی دیکەش دەگرێتە خۆی، هەروەها من کە فیمنیزمم هەلّبژاردووە، هۆی دیکەش هەیە. من فیمینیستم چونکە پێم وایە فیمنیزم لەسەر باشترین قەناعەت و تێڕوانین بۆ دونیا بیناکراوە. پێم وایە گونجاوترین رێگایە بۆ تێڕوانین و بەڕێوەبردنی جیهان. بڕوام وایە کە مرۆڤەکان هەموویان یەکسانن، بۆیە دەتوانین فێری ئەوەببین بە هاوسەنگی پێکەوە بژین و، چیتر پێویستیمان بە ژان و موعانات و خوێن رشتن و تۆقاندن وشەڕ و شۆڕ نابێت. ئەم قەناعەتانە فەلسەفەی فیمینزم روون دەکەنەوە: نەمانەوە لە ژێر سێبەری فەلسەفەی باوکایەتیدا.

بناغەی پاتریاریکی بریتیە لە بالّادەست بوون — پیاوان بەسەر ژناندا، رەش بەسەر سپیدا، دەولّەمەند بەسەر هەژاردا، ئەوە بالّا دەستییە کە لەناو کایەکانی تێکۆشان و بالّابووندا دەدرەوشێتەوە (دەشێ پیاوی باشتر بیباتەوە) بەلّام هێشتا هەر بالّادەست بوونە. بالّادەست بوون روویەکی تریشی هەیە، ئەوانەی کە ژێر دەستەلّات خراون. ئەوەی لە چوونە ناو فیمنیزمەوە فێری دەبین ئەوەیە زۆربەی ئەو شتانەی کە ئێمە دەیان زانین لە بەرجەستەکردنی ئەو کەسانەوە هاتووە کە بالّادەستییان پیادە کردووە. ئەوانە لەو شوێنەوە جیهانیان شی کردۆتەوە کە خۆیان لێی راوەستاون و قسە کانیشیان کەلّەکەبوون و بوون بە کەلتووری ئێمە. ئەوانەی کە ژێر دەستە کراون تێڕوانینێکی زۆر جیاوازیان هەیە. بەلّام زۆر بە دەگمەن تێڕوانینی ئەوان گوزارشتی لێکراوە، خۆ ئەگەر گوزارشتیشی لێکرابێت زۆر بە دەگمەن ناسراوەتەوەو داکۆکیی لێکراوە. ئەو کەسەی فەرمان دەدات ئەزمونێکی زۆر جیاوازی هەیە لەوەی کە فەرمانەکان جێبەجێ دەکات،

هەروەها ئەو کەسەی دەست درێژیی دەکات جیاوازە لەوەی دەست درێژیی دەکرێتە سەر، بەڵام هەموو ئەوانەی کە فەرمانیان بەسەردا کراوە و ئەوانەش کە دەست درێژیان کراوتە سەر، ئەوانە بێدەنگترین بەشی کۆمەڵگەکەمانن، بە راشکاویی: ئەگەر دەنگێکیان لێوەبهاتایە ئەوا نەدەبوونە مایەی فەرمان بەسەردا کردن یاخود دەست درێژیی کردنە سەر. بۆیە ئەوەی من وەکو فیمینیستێك کردوومە هەوڵدانێکە بۆ شکاندنی ئەو بێدەنگیە، هەوڵدانێکە بۆ پیشان دانی ئەو رێگایەی لێوەی نارەزایی بەرامبەری ئەو بێدەنگییە دەردەبڕرێت، ئەو رێگایەی کە باڵا دەستی نکولی لێ کردووە.

ئەوەی دەبێت لە هەموو حاڵەتێکدا خۆمی لێ لابدەم بریتیە لە درێژکردنەوەی بونیادی باڵادەستیی: رەنگە بە هەندێ پێوانە من دەرەکی (بێ کەلتور) بم، بەڵام من هێشتا بەرهەمهێنەری کەلتورێکم کە باڵادەستیی تێدا نامێنێت. ئەگەر گۆشەنیگایەکی جیاواز لە خۆمم رەت کردەوە، ئەگەر خۆمم لە ئەزموونێکی دەرەوەی خۆم لادا، ئەوا من لە ستانداردی فیمنیزم لامداوە. تەحەداکەی فیمنیزم لەوەدایە کە هەموو ئەزموونە جیاجیاکانی مرۆڤ لەناو خۆیدا کۆبکاتەوە: ئەگەر فیمنیزم لێکدانەوەیەك رەت بکاتەوە، کە داوای جەخت لێکردن دەکات، ئەوا بێشك خۆشی نوشوستی دەهێنێت. چونکە ئەوە خۆی لەخۆیدا گوزارشت کردنێکی ترە لە باڵادەستی.

من نامەوێت پێشنیاری ئەوە بکەم، کە فیمنیزم هەرئەوەندەیە. نامەوێت نکولیی لە کاریگەریی جیهانی فیزیاویی بکەم، یاخود کەمی بکەمەوە هەروەها هەست بەو ئیمتیازە گەورەیە دەکەم کاتێك بتوانم وەسفی گرنگیی ئاراستە رۆشنبیرییەکان بکەم، دڵخۆش دەبم. کاتێك گەدە بەتاڵ بێت، رۆشنبیری بەرەو خۆراك ئاراستە وەردەگرێت، کاتێك لە ژێر مەترسی ئاگردا بێت، رۆشنبیری رووداوەکاتە پێویستی خۆراگرتن و درێژە پێدان. ژنانێکی زۆر هەیە کە ئەم شتانە پێداویستیە سەرەتایەکانیانە - هیچ بیرکردنەوەیەکی جیاوازیش، نابێت بە خۆراك بۆیان یان تفەنگەکان راناوەستێنێت، بەڵام من بە راستی حەز دەکەم پێشنیاری ئەوە بکەم کە گۆڕانکارییەکی کەم لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا رووبدات - لەوێدا برسێتی و قات و قڕیی و جەنگەکان هەر دەمێنن تائەوکاتەی کە بەشێوەیەکی جیاوازتر بیردەکەینەوە.

کە سەیری دواوە دەکەم، زیادە رۆیی نیە ئەگەر بڵێم دیسان لە ساڵی 1970 دا ژنانم کەشفکرد. من تا ئەوکاتە باوەڕم وابووە کە پەیوەندیی نێوان من و لینی خوشکم پەیوەندییەکی بایۆلۆژیی بووە: پێم وانەبووە کە دەشێ بونیادی پەیوەندیی من لەگەڵ ئەودا بگوێزرێتەوە بۆ ناو پەیوەندیم لەگەل ژنانی تریشدا، کە ئەوانە خوشکی بایۆلۆژی من نەبوون.

بەڵام پەیوەندیکردنم بە فیمنیزمەوە شتێکی زیاتر بوو لەو کەشفکردنەم چونکە من ژنانم خۆشدەویست. هەروەها چۆنیەتی پەیوەندیم بە پیاوانیشەوە هەر لەوێوە بوو. ئەوکاتە هێشتا هەر بە مێرد بووم. شتێکی گران بوو، من گۆڕابووم، بەڵام مێردەکەم نەگۆڕابوو. من زیاتر و زیاتر رەخنەم لەو ئامۆژگارییە ناڕاستانە دەگرت کە چەند ژنێکی کەم هۆش گوێمیان پڕ دەکرد و تادەهات زیاترو زیاتر بێتاقەتیان دەکردم. ئەو رۆژەی کە بە هەمان شێوە لەگەڵ مێردەکەمدا قسەمان لێك گیربوو، ئەو رۆژە، یادی ساڵانەی ژن و مێردایەتیمان بوو: بۆچی من لێپرسراوبم لە شتن و ئوتوکردن و چێشت لێنان و پاکردنەوە؟

گەڕامەوە بۆ سەر نوسینەکەی پات مەیناردی Pat Mainardi "سیاسەتی کاری ناوماڵ" ئەو کۆمەڵگا وای لێکردبوو. هەرگیز من پێویستیم بە

لێکدانەوەی دروشمی "ئەوەی تایبەتیە، ئەوە سیاسییە" نەبووە.

پیاوان! بوونەتە هۆی چەرمەسەریی ژنان — چۆن پەیوەندیی بە پیاوانەوە بگرین — ئەو ڕێو شوێنەی کە بۆم دانراوە، لێرەشدا ناتوانم خۆمی لێ لابدەم. لێرەدا دەچمەوە سەر قسەیەکی پێشووترم و جەختی لێدەکەمەوە، دەبێ هەموو مرۆڤەکان یەکسان بن ئایدیۆلۆژیای فیمنیزمم بۆ ئەوە هەڵنەبژاردووە تاکو بزانین سیستمی باوکایەتی چی بە ئێمە کرد، ئەویش بە پیاوانی بکات. بەڵام دەبێ ئیشارەت بەوە بدەم کە من لەگەڵ پیاوان دا تەنگو چەڵەمەم هەبووە، تەنگوچەڵەمەی هێزی ئەوان کە ئەو هێزە بۆ ئەنجام گەیاندوون. من بۆیەك ساتیش باوەڕم بەوە نیە کە پیاوان لەگەڵ ئەم سیستەمەدا لەدلیك دەبن و دەبێت بە مانیفێستی سەرەکیی ئەوان، بەڵکو بەدەستیان هێناوە، من چەند پیاوێکم دیوە کە لەتوانایاندا هەبووە دەسبەرداری ئەو هێزە بن.

حاڵی حازر لەگەڵ پیاوێکدا دەژیم: لایەنەکەی تری ئەم پەیمانە، براکەم و باوکم تێیدا بەشدارن، دەزانم ئەویش هەر پیاوە، ئەمەش چونکە زۆر کەمن ئەو پیاوانەی لەگەڵیاندا هەست بە ئارامیی دەکەم یاخود، بوارم پێدەدەن لە رووی چەشنەوە پەرە بە ژیانی خۆم بدەم. من لەسەر ئەوەم کە بڵێم: ئێوە، بەڵام پیاوەکەی من فیمینیستێکی جیایە. کاری من و بەشێکی زۆر لە ژیانی کۆمەڵایەتیم و بەشێکی زۆری زەخیرەی رۆشنبیریم هەموویان لە ژنانی هاوڕێمەوە هاتوون، کە دەشڵێن هەر دەبێ وابێت، منیش دەڵێم بۆیە ئەو پیاوانەی من لەگەڵیاندا دەژیم جیاوازن. ئێمە جووتێك نین یەك بیروباوەڕمان هەبێت.

(دیانا لیۆناردی هاوڕێم دوای دە ساڵ چاوی پێی کەوت و وتی ئەم پیاوە جۆرێکە لە ئەفسانە).

ئێمە دوو مرۆڤی ئوسترالین کە هەریەکەمان ژیان و کاری خۆی هەیە (ئەو خەریکی زانکۆیە). ئێمە لە شوێنێکدا پێکەوە دەژین و هاوکاریی تەواوی یەکتریش دەکەین. شتی تایبەتی خۆمانمان هەیە (بۆ نموونە شەرابی سووری ئوستراڵی). هەریەکەمان پشت و پەناو یاریدەدەری ئەوی ترمانە.

زیاتر لە دەساڵە فیمینیزم بۆتە ڕێبازی ژیانم و کارکردنم لەم جیهانەدا، بە ئومێدی ئەوەی رەنگە جیهان ببێتە شوێنێکی باشتر بۆ ژیانی مرۆڤ. فیمینیزم بۆ من بووە بە دەروازەی ژیانێکی گونجاوتر، گەلێ دەرگای هاوکاریی و خۆشیی و جیایی ئاوەڵا کردووە. ئا لەم جیهانەدا من جێگایەك و لێپرسراوێتیەکم هەیە. هیچ شتێك لە فیمینیزم گرنگتر نیە. ژیری و توانای بەرەو رووبوونەوەم پشتی پێ دەبەستن. ژیری و مقاوەمەتی چەشنی مرۆڤ پشت بەو دەبەستێت.

- دەیل سپێندەر:

ژنە لێکۆڵەرەوەو نوسەری ئوسترالیایی، یازدە ساڵ لە لەندەن ژیاوە. کتێبەکانی بریتین لە "پیاو زمانی دروست کرد" ، "ژنانی ئایدیاو پیاوانیش چییان بۆ کردوون"، "دایکانی رۆمان" ، "100 رۆماننوسی ژن لەپێش جین ئۆستن دا".

سەرنوسەری:

Women Studies International) Form) ە .

سەرچاوە:

What is Feminism?
Edited by:
Joliel Mitchell &
An Oakley.
Chapter 12. What is feminsm?
A personal answer. By Dale Spender
PP 208 – 219.

# ئافرەت و پەرەسەندنی سیاسەتی جیهان

■ فرانسیس فۆکۆ یاما

● و: یاسین قادر سعید

### سیاسەتی شەمپانزی

لەناو گەورەترین مۆلگەی سرووشتی پاراستنی شەمپانزیە دیلکراوەکانی جیهاندا، لەباخچەی ئاژەڵانی بێرگەر لەئەرنهایم لەهۆڵندا، خەباتێك کەهەر شایستەی مەیکافیلی‌یە لەدوای سالآنی (1970)وە تاکو ئێستا نمایشێکی بەردەوامە. هەروەك لەوەسفەکەی پرایمەتۆلەجیست (Primatologist)(1) (فرانس دو وال)ەوە دەردەکەوێت شەمپانزی نێرینەی هەرە بەتەمەنی مۆلگەکە کەناوی یەرۆن بوو، وردە وردە لەلایان نێرینەیەکی گەنجترەوە کەناوی لویت بوو لەپێگەی دەستەڵات لابرا، وای پێدەچێت لویت نەیتوانیبێت تەنها لەسەر بنەمای هێزی فیزیکی خۆیەوە ئەمەی ئەنجامدابێت، بەڵکو دەبوایە هاوپەیمانی لەگەڵ نیکی‌دا ببەستایە کەئەمیش نێرینەیەکی لەم گەنجتربوو. هێشتا لویت نەگەیشتبووە لووتکە کاتێك نیکی لێی هەڵگەڕایەوەو، بەمەبەستی قۆستنەوەی دەستەڵات بۆ خۆی رێکەوتنێکی لەگەڵ سەرکردەی ناوبراودا سازدا. بەڵام لویت هەمیشە وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر حوکمەکەی مابووەوە، هەر لەبەرئەوە رۆژێکیان لەلایەن یەرۆن و نیکی‌یەوە کوژراو دیمەنی وونجرکردنی گونی و پەنجەکانی پێی لەسەر زەوی قەفەسەکەیدا دڵی بینەری پێکا دەهێنا.

جەین گودۆڵ بەبۆنەی ئەو توێژینەوەیەی لەسالآنی شەستەکاندا دەربارەی گروپێکی بیست سی شەمپانزی لە(Gombe National Park) لەتەنزانیا ئەنجامی‌دا، ناوبانگی دەرکرد، گودۆڵ ئەو گروپەی بەبێوەی ترینی هەموو گروپەکانی‌تر دانابوو. لەسالآنی (1970)دا، ئەم گروپە هەڵوەشایەوەو جۆرە فۆرمێکی لەدابەش بوون

بەخۆوە بینی کەتەنها ئەتوانرێت ناوی دوو دەستەی کێباری باکورو باشوری لێبنرێت. زانای بایۆ ئەنترۆپۆلۆژی ریچارد رانگهام و دەیل پیتەسن لەکتێبەکەی ساڵی (1996)یاندا (نێرینە ئەهریمەنی‌یەکان) ئەنجامی ئەو رووداوەمان بۆ وەسف دەکەن. چەند دەستەیەکی چوار پێنج شەمپانزی نێرینە لەگروپی باکور چوونەدەرەوە نەك بۆ بەرگری‌کردن لەخۆیان و گروپەکەیان بەڵکو زۆربەی جار سنووری ناوچەی گروپی باشوریان بریوە بەمەبەستی کوشتنی ئەو شەمپانزانەی کەتەرە کەوتبوون یان ئامادەی بەرگری‌کردن لەخۆیان نەبوو. بکوژەکان زۆربەی جار تۆقێنەربوون، وەبەهەڵمەتبەرانی قیژەو وروژاندنی گەرم (تالێهاتوو) دەناسرانەوە. دواجار هەموو نێرینەکان و ژمارەیەك لەمێینەکانی گروپی باشور کوژران، ئەو نێرینانەش کە نەکوژرابوون ناچاربوون بچنە ژێر رکێفی گروپی باکورەوە.

شەمپانزیەکانی (Gombe) ی باکور، لەواقعدا ئەوەیان کردووە، کە رۆم لەساڵی (146) پ.ز بەقرتاجیەی کرد، بەبێ ئاسەوار بوونی کێبارەکەی خۆی کوژاندەوە.

ئەم بەسەرهاتانەی تایبەتن بەهەڵسووکەوتی شەمپانزیەوە چەندین سیمای جێسەرنجیان هەیە: یەکەم، توندوتیژی. لەناو شانشینی ئاژەڵاندا توندوتیژی لەنێویەك جۆر ئاژەڵدا شتێکی دەگمەنە، گەر هەشبێت ئەوا توندوتیژی‌یەکە سنووردارە بەمنداڵ کوژی‌یەوە (Infanticide) ئەمەش کاتێك نێرینەکان دەیانەوێت وەچەی کێبارەکانیان لەناوبەرن و لەگەڵ دایکەکانیاندا جووت ببن. لێرەدا وا دەردەکەوێت تەنها شەمپانزو مرۆڤ مەیلی کوشتنی رۆتینانەی کێبارەکانیان هەبێت. دووهەم، بریتی‌یە لە گرنگی هاوپەیمانی‌یەتی و ئەو سیاسەتەی هاوشان لەگەڵیدا دەڕوات. شەمپانزیەکان وەك مرۆڤ بوونەوێکی یەکجار کۆمەڵایەتین بەجۆرێك پێش لەدایك بوونیان مەحکومن بەهەوڵدان لەپێناو بەدەست هێنان و بەردەوامی پێدانی دەستەڵات لەناو پلەکانی هەرەمی دەستەڵاتدا. هەڕەشەدەکەن، پاساو بۆ راستییەکانیان دەهێننەوە، زمانلووسی دەکەن، بەرتیل دەدەن بە شەمپانزەکانی دەوروبەریان بۆئەوەی لەهاوپەیمانی‌یەکدا لەگەڵیان پێك بگەن و، دەستەڵاتەکەشیان تەنها هێندەی درێژی توانای بەردەوامی پێدانی ئەم پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یانە بەردەوام دەبێت.

دوا خاڵ و گرنگترین خاڵ ئەوەیە، توندوتیژی و هاوپەیمانی‌یەتی بەشێوەیەکی سەرەکی کاری نێرینەکانە. دەشێت شەمپانزە مێینەکانیش هەندێك جار وەك نێرینەکان توندوتیژو درندەبن، مێینەکان لەهەرەمی دەستەڵاتدا بەربەرەکانی یەکتر دەکەن هاوپەیمانیش بۆ ئەو مەبەستە دەبەستن. بەڵام هەرە بکوژترین توندوتیژی دەکەوێتە نێو بازنەی تایبەتمەندی نێرینەوە، هەروەها سروشتی هاوپەیمانی‌یەتی مێینەکان جیاوازە. بەپێی بۆچوونەکانی دو واڵ، شەمپانزە مێینەکان لەگەڵ ئەو هاونەژادانەیاندا پەیمان دەبەستن کەجۆرە پەیوەندی‌یەکی سۆز هەیە لەنێوانیاندا، بەڵام زیاتر وا دێتە بەرچاو کەنێرینەکان لەسەر بنەمای هۆکارە تەواو عەقڵی و واقعی‌یەکان هاوپەیمانی‌یەکانیان ببەستن، بەواتایەکی‌تر، شەمپانزە مێینەکان پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا هەیە، شەمپانزە نێرینەکان سیاسەتی واقعی (Realpolitik)(2) پیادە دەکەن.

شەمپانزەکان نزیکترین خزمی پەرەسەندوی مرۆڤن، هەردووکیان (مرۆڤ و شەمپانز) کەمتر لەپێنج ملیۆن ساڵێك لەمەوبەر لەپشتێکی شەمپانز ئاسای هاوبەشەوە هاتوونەتە خوارەوە. ئەو خزمایەتی‌یە بەهێزە تەنها لەئاستی بۆماوەیدا نی‌یە بەڵکو چەندین لەیەکچوونی هەڵسوکەوتیش

هەیە لەنێوانیاندا. هەروەك رانهامو بیتەسن تێبینی دەکەن لەنێوان (4.000) شیردەرو (10) ملیۆن یان زیاتر جۆر ئاژەڵدا، تەنها شەمپانزو مرۆڤ لەشێوەی رێکەوتنی نێرینەی (-Male bonded)و کۆمەڵگای باوکسالاریدا دەژین کەتیایدا گروپێك لەنێرینەکان بەشێوەیەکی رۆتینی سەرقاڵی توندوتیژی دابارینە سەر هاونەژادەکانی خۆیانن. نزیکەی سی ساڵێك لەمەوبەر زانای مرۆڤناسی لیۆنڵ تایگەر ئاماژەی بۆ ئەوەکرد پیاوان کارامەیی دەروونی تایبەتییان هەیە بۆ رێکەوتن لەگەڵ یەکتریدا، ئەمەش لەپێویستیان بەراوی هەرەوەزدا سەرچاوەی گرتووە، کە باڵا دەستیان لەناو چالاکییە بەپێشە کۆمەڵایەتییەکاندا (Group-Oriented) هەر لەسیاسەتەوە تاوەکو جەنگ روون دەکاتەوە. تایگەر بەتووندی لەلایەن فێمینیستەکانەوە مەحکوم کرا چونکە لەکاتی ئەو ئاماژەیەدا چەندین جیاوازی سایکۆلۆژی بنەما بایۆلۆژی لەنێوان ژنانو پیاواندا هەبوون، بەڵام لێکۆڵینەوەی زانستی نوێتر بەبەڵگەی پرایمەیتۆلۆژییەوە ئەو راستییەی سەلماندووە کە لەڕاستیدا رێکەوتنی نێوان نێرینەکان بۆماوەییەو پێش پەیدابوونی جۆری مرۆڤ هەبووە.

## پیاوان درندەیەکی هێندە بەخشندەنین

شتێکی زۆر ئاسانە بەراوردێکی رووکەشی نێوان هەڵسوکەوتی ئاژەڵو مرۆڤ بکەیت بەمەبەستی سەلماندنی خاڵێکی جەدەلی، هەروەك سۆشیالیستەکان کردیان کاتێك ئاماژەیان بۆ هەنگو مێرووله کرد بۆئەوەی بیسەلمێنن سروشت پشتگیری لەڕاستی کۆلێکتڤیزم(3) (Collectivism) دەکات. گومانخوازەکان(4) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەمرۆڤ زمانو عەقڵو کلتورو ئەو بەها ئەخلاقیانەی هەیە کەبەشێوەیەکی جەوهەری لەنزیکترین خزمی ئاژەڵی جیای دەکاتەوە. لەڕاستیدا، چەندین ساڵە مرۆڤ ناسەکان لەهەوڵی سەلماندنی ئەو راستییەدان کەلەئەنجامدا وەرگێڕانێکی نوێی چیرۆکەکەی رۆسۆیە(5) سەبارەت بەدرندەی بەخشندە: ئەو کەسانەی لەکۆمەڵگا راوچییە بەرووبوم کۆکەرەوەکاندا ژیاون، سروشتێکی ئاشتی خوازانەیان هەبووە. ئەگەر شەمپانزو مرۆڤ مەیلێکی توندوتیژی هاوبەشیان هەبێت ئەوا لەم حاڵەتەدا دەبێت لەناو شارستانیدا نەك سروشتی مرۆڤ بەڵکو بۆ هۆکارەکەی بگەڕێین.

تاکو ئێستا ژمارەیەك لەنووسەران بیرۆکەی درندەی بەخشندەیان چڕکردۆتەوە بۆئەوەی بیسەلمێنن کەتووندوتیژیو باوکسالاری داهێنانێکی پاشینەبوون، یان لەناو نەریتە جولەکەییە مەسیحییەکاندا رەگو ریشەیان داکوتاوە یان لەناو ئەو رژێمی سەرمایەدارییەی کەهەمان نەریتی هێناوەتە بەرهەم. فریدریك ئەنجلس پێش بەرهەمی فێمینیستە پاشینەکان کەوت بەهۆی گریمانەکەیەوە دەربارەی بوونی سیستمی دایك سالاری سەرەتایی کە لەلایەن سیستمی باوك سالاری تووندوتیژو چەوسێنەرەوە تەنها بەگۆڕانی کۆمەڵگا بەرەو کۆمەڵگا کشتووکاڵییەکان جێگەی پێگیرایەوە. کێشەی ئەم تیۆرە، هەروەك لۆرانس کیلی لەکتێبەکەیدا (جەنگ پێش شارستانیەت) ئاماژەی بۆ دەکات لەوەدایە لێکۆڵینەوە هەرە بەرفراوانو نوێکانی تایبەت بەتووندوتیژی لەکۆمەڵگا راوچییە بەروبووم کۆکەرەوەکاندا ئەو راستییە دەخەنەروو کەجەنگ لەلای ئەو کۆمەڵگایانە هەمیشەییتر بووەو رێژەی کوشتن تیایاندا لەکۆمەڵگا هاوچەرخەکان بەرزتربووە.

ئاماری زانیارییە ئیتنۆگرافییەکان ئەوە دەردەخەن تەنها (10٪–13٪) کۆمەڵگا سەرەتاییەکان هەرگیز یان بەدەگمەن چوونەتە

جەنگو پێکادانەوە، ئەوانەی تریان هەمیشە یان بەپشوویەکی کەمتر لەساڵێکەوە سەرقاڵی جەنگ بوون. پشکنینێکی وردتری حاڵەتە دوور لەشەڕەکان ئەوە دەردەخات کە ئەو کەسانە کەسانێکی پەنابەربوون بەهۆی جەنگێکی پێشترەوە دەرپەڕێندراونەتە ناوچە دوورەکانەوە یان ئەو گروپانەبوون لەلایەن کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوتر لەخۆیان پارێزراون. لەلێکۆڵینەوەیەك تایبەت بە پیاوەکانی خێڵی (یانومامۆ) لەلایەن ناپلیۆن شاگنن لە ڤەنزویلا وا دەردەکەوێت (30٪)ی پیاوەکانی خێڵی ناوبراو بەهۆی جەنگو کوشتارەوە لەناوچوون، هەروەها خێڵی کۆنگ سان کەماوەیەك لەمەوبەر بەخێڵێکی (بێوەی) ناودەبران دەبینین ڕێژەی کوشتن تیایدا گەر بەراوورد بکرێت لەنیویۆرکو دیترۆیت (6) ئەوا گەلێك بەرزترە.

بەڵگە ئارکیۆلۆژیە دڵتەزێنەکانی ناوچەکانی وەك (جبل صحابة) لەمیسر، تالهایم لەئەڵمانیا یان رۆ لەفەرنسا وا دەردەخەن کوشتنی سیستماتیکی بەرفراوانی پیاوانو ژنانو منداڵان لەسەدە بەردینە نوێکاندا روویداوە. کوشتنی بەکۆمەڵ لەکەمبۆدیاو بۆسنە تاکو ئێستا وەك رووداوی بێوێنە، هەندێك جاریش وەك کارەساتی تەواو نوێو شێوەیەك لەتۆقاندنو تراجیدیا وەسف کراون، بەڵام دەبێت ئاماژە بۆ ئەو دەستپێشکاریانەش بکەین گەر نەیڵێین سەدان هەزار ساڵ ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ دەیان هەزار ساڵ لەمەوپێش.

شتێکی ئاشکراشە بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەو توندوتیژانە، پیاوان پێی هەستاون. ئەمە لەکاتێکدا کەمایەتییەکی کەمی کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان تاکو ئێستا لەچوارچێوەی سیستمی دایك سالاریدا ماونەتەوەو دۆزینەوەی بەڵگەیەك تایبەت بەبوونی سیستمێکی دایکسالاری سەرەتایی وەها کەتیایدا ئافرەتان سەردەستەی پیاوان بووبن، یان هەتاوەکو بەشێوەیەکی نسبیش بێت هاوتای پیاوان بووبن، بۆتە دۆزینەوەیەکی قورس، قۆناغێك نەبووە لەژیانی مرۆڤایەتیدا بەبێتاوان چووبێتە سەر. ئەم ریزبەندییەی تاوان لەشەمپانزەوە تاکو مرۆڤی هاوچەرخ هەر بەردەوامە.

کەواتە، وا دەردەکەوێت، خەباتی فێمینستەکان ئەوەی بەلاوە گرنگە کە دیاردەکانی وەك دوژمنخوازیو توندوتیژیو، جەنگو کێبەکێی بەهێز لەپێناو گەیشتن بەپلەکانی دەسەڵات لەناو هەرەمی دەسەڵاتدا بەتووندی بەستراونەتەوە بەپیاوانەوە نەك ژنان. تیۆرەکانی پەیوەندییە دەولییەکان بۆ نموونە ریالیزم کە لەو باوەڕەدایە سیاسەتی دەولی خەباتێکی درندانەیە لەپێناو دەسەڵاتدا، لەڕاستیدا لەو پێناسەیە تێناپەڕن کەفێمینستیەکان ناوی روانگەی نەژادییان لێناوە، زیاتر لەو رووەوە وەسفی هەڵسووکەوتی دەوڵەتان دەکەن کەتیایدا پیاوان دەسەڵاتدارن نەك وەسفی خودی ئەو دەوڵەتانە بکەن. جیهانێك گەر ئافرەتان بەڕێوەی ببردایە لەوانەبوو بەپێرەوی یاسایەکی جیاوازی بکردایە. ئەمەش دەشێت بێتەدیو هەر ئێستاش هەموو کۆمەڵگا پیشەسازییە هەراشەکانو رۆژئاواییەکان بەرەو ئاسۆی جیهانێکی لەم چەشنە پێ هەڵدەگرن. گەر ئافرەتان بتوانن لەو وڵاتانەدا دەسەڵات بگرنە دەست، دەشێت پیاوان کەمتر توندوتیژو سەرکێشو دووبەرەکی خوازو تۆقێنەربن.

کەموکوڕی لێکدانەوەی فێمینستی لەوەدایە کەواتێدەگات راوبۆچوونەکانی تایبەت بە توندوتیژی، دەسەڵاتو پلەکانی دەسەڵات سەرتاپا بریتین لەدەرهاویشتەکانی فەرهەنگی سیستمی باوکسالاری، لەکاتێکدا کەلەڕاستیدا ئەو دیاردانە رەگو ریشەیان لەناو بایۆلۆژیادا داکوتاوە. هەر ئەمەش وا لەو بۆچوونانە دەکات

بەئاستەم بتوانن لەسروشتی پیاوان و پاشان کۆمەڵگاکان بەگشتی بگۆڕن. سەرەڕای ئەم بەرهەڵستکارییە فێمینیستییە، هێشتا پیاوان بەردەوام دەبن لەبوونیان وەك فاکتەرێکی گرنگ لەناو دەستەڵاتدا لەوڵاتە پیشەسازییە هەراشەکاندا، گەر نەشڵێین دەستەڵاتدار دەبن، وابزانم پێویستیش بەوە ناکات ئاماژە بۆئەو وڵاتانە بکەین کە کەمتر پێشکەوتوون لەڕووی پیشەسازییەوە.

دنیای جەنگ و سیاسەتی دەوڵی بۆ ماوەیەکی لەوە درێژتر لەژێر دەستەڵاتی پیاواندا دەمێننەوە کەتاکو ئێستا چەندین فێمینیست ئاواتیان پێخواستبێت. لەهەمووش گرنگتر، ئەرکی سەرلەنوێ بەکۆمەڵایەتیکردنی پیاوان بۆئەوەی زیاتر لەئافرەتان بچن – واتە کەمتر توندوتیژبن – بنبەست دەبێت. شتێك تێکەڵ بەخوێن بووبێت ناتوانرێت بەئاسانی لەڕێگەی گۆڕینی فەرهەنگ و ئایدیۆلۆژییەوە بگۆڕدرێت.

## گەڕاندنەوەی بایۆلۆژی

ئێمە بەناو قۆناغێکی شۆڕشگێڕانەی ژیانی زانستدا دەگوزەرێین. بەدەگمەن هەفتەیەك بەسەرماندا تێدەپەڕێت. بەبێ بیستنی هەواڵی دۆزینەوەی جینێك پەیوەست بەنەخۆشییەك، حاڵەتێك یان هەڵسووکەوتێکەوە، هەر لەشێرپەنجەوە بیگرە تا دەگاتە نەخۆشی قەڵەوی و خەمۆکی، سەرەڕای مژدە دڵفرێنەکانی تایبەت بەچارەسەرە جینییەکان (genetic) هەتاوەکو چارەسەرکردنی تەواوەتی زنجیرە کرۆمۆسۆمییەکان (genome) کەهەر ئێستا لەئارادایە. بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەو بایەخە مەزنەی بەپێشکەوتنەکانی بایۆلۆژیای گەردیلەیی دراوە (molecular biology) پێشکەوتنێکی زۆر بەدەست هاتووە لەبواری هەڵسووکەوتدا (behaviour). سەبارەت بەسایکۆلۆژی، نەوەی رابردوو قۆناغی زیندوبوونەوەی داروینیزمی بەخۆوەدی، ئەمە سەرەڕای خۆتێخزانە قوڵەکانی ئەم رێبازە بۆناو پانتاییەکانی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان.

بەشێکی زۆری زانستە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سەردەمە پاڵیان داوەتەوە بەو وتەیەی ئێمیل دۆرکهایمەوە کەپێی وایە راستییە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانرێت تەنها لەڕێگەی راستییە کۆمەڵایەتییە پێشینەکانەوە شیبکرێتەوە نەك لەڕێگەی هۆکارە بایۆلۆژییەکانەوە. شۆڕشەکان و جەنگەکان، گۆڕانکاری ئابووری و نایەکسانی نێوان چینەکانی کۆمەڵ و هاوپەیمانییە ئاڵوگۆڕپێکراوەکان بریتین لەدەرهاویشتەکانی راستییە کۆمەڵایەتییەکان. گەر پشت ببەستین بەکارپێکراوترین نموونەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، دەبێت بڵێین عەقڵی مرۆڤ ناوچەیەکە پێك هاتووە لەبیرۆکەکان و عورفە کۆمەڵایەتییەکان و ئەو هەڵسووکەوتە کۆمەڵایەتیانەی کەبەدەرهاویشتە کلتوورییە دەستکردەکانی مرۆڤ خۆی دەدرێنە قەڵەم.

بەواتایەکی تر، واقعی کۆمەڵایەتی بریتییە لەڕاستییەك بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی بونیادنراوە:

گەر وابێتە بەرچاو منداڵە کوڕەکان زیاتر لەمنداڵە کچەکان حەز بەیەکتر کوژی بکەن، ئەمە تەنها لەبەرئەوەیە ئەو کوڕانە ئەوەتەی هەن بەم شێوەیە بەکۆمەڵایەتی کراون.

بۆچوونی بونیادی کۆمەڵایەتی و ئەو سەروەرییەی بەخۆوەی دیوە لەناو زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ کاردانەوەیەك بەرامبەر بەهەڵە بەکاربردنی پێشینەی داروینیزم (Darwinism). داروینیستە کۆمەڵایەتییەکانی نموونەی هیربرت سپێنسەر یان داروینیستێکی تەواو رەگەزپەرستی وەك مادسن گرانت، لەدواینەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی

سـەدەی بیسـتەم، بەشـێوەیەکی تایبـەتی، بایلۆژیایان بـەکارهێنا بەمەبەسـتی سـەلماندنی پێوانـەی لێکچونـی هـەڵبژاردنی سروشـتی (Analogy of natural selection لـەپێناو روونکردنەوەو پاساودانەوەی هەموو شـتێك، هـەر لەدابەشـبوونی چینایـەتی کۆمەڵـەوە تـاوەکو دەسـتەڵاتدارێتی ئۆروپیـیـە سـپی پێیسـتەکان بەسـەر زۆربـەی زۆرینـەی جیـهاندا. پاشـان فرانزبـۆز، کەمرۆڤناسـێکی کۆلۆمبیـیـە، پـەردەی لەسەر لایەنە داتاشراوەکانی زۆربـەی تیۆرەکـانی پاڵپشـتی سـەروەری رەگـەزی ئۆروپـی لابـرد، ئەمەش بەچەند رێگایەك، یەکێك لەوانە بریتیبـوو لەپێوانەکردنی‌و وریایانەی قەوارەی سەری منداڵە کۆچکردووەکان‌و تێبینی‌کردنی ئـەوەی گـەر ئـەو منداڵانە دایتی (Dite) (7) ئەمەریکی‌یان درابێتێ ئـەوا قـەوارەی سـەریان تـەواو نزیکـە لەقـەوارەی سـەری منداڵە ئەمەریکی‌یـەکان. بـۆزو هـەردوو قوتابی‌یـە بەناوبانگەکـەی مـارگرێت میـدو روس بێندیکت پشـتگیریان لـەو بۆچوونـە دەکـرد کـە پـێ‌ی وایـە جیاوازی‌یـەکانی نێـوان گروپـە مرۆی‌یـەکان دەشـێت زیـاتر کەوتبێتـە پێپلیکانەکانی فەرهەنگەوە نەك سروشت. لەمەش زیـاتر، هیـچ بۆنەیـەکی چەسپاوی وەهـا لـەئارادا نی‌یـە تـاوەکو ئۆروپایی‌یەکان‌و ئەمەریکی‌یـەکان بیکەنە بیانویەك بۆئەوەی حوکمی فەرهەنگەکانی تـری پێبکـەن. ئەوانـەش کەبەمرۆڤـە سـەرەتایی‌یەکان ناودەبرێن کەسـانێکی لەئێمـە کەمتر نەبوون، تەنها لەئێمە جیاوازبوون. لێرەوە هـەردوو بونیـادخوازی کۆمەڵایـەتی‌و نسـبیەتی کلتوری لەدایك بوون‌و هەر لەوکاتەشـەوە زانستە کۆمەڵایەتی‌یەکان خۆیانی پێ‌دەڕەنگێنن.

بـەڵام وا ماوەیەکـە شۆڕشـێك لـەناو پانتایی‌یـەکانی بیری نش‌ونماخوازی هاوچـەرخدا سـەری هـەڵداوە، کـەرەگـو ریشـەیەکی ئـاڵۆزو لێکدراوی هـەیە، یـەکێك لـەو ریشـانە بریتـی‌یـە لـەئیتۆلۆجی (ETHOLOGY) کەبریتی‌یـە لەزانستی پیادەکردنی تۆیژینـەوەی بـەراوردکاری هەڵسوکەوتی نێـوان ئـاژەڵان. ئیتۆلۆجیسـتەکان لەنموونـەی کۆنرادلۆرنـس سـەرنجی ئـەو لێکچوونانـەی نێـوان هەڵسووکەوتە جۆراوجـۆرە بەرفراوانـەکانی نـاو ئـەو جـۆرە ئاژەڵانـەیان داوە کەڕەچەڵەکێکی نش نماخوازی هاوبەشیان هەیـە، ئەمانە نـەك تەنـها بۆیـان دەرکـەوت کـە دەشێت بۆچوونـە گشـتگیری‌یە (Generalized) گرنگەکان بەشێوەیەکی پراکتیکی بەسـەر هـەموو کلتـورە مرۆی‌یـەکاندا بسـەپێنن (بـۆ نموونـە مێ‌ینەکان، زیاتر لەنێرینەکان توانای هـەڵبژاردنی هاوبەشـە سێکسـی‌یەکانیان "Sexual Partner" هەیـە) بـەڵکو بەسـەر زنجیرەیـەکی بـەرفراوانی جۆرەکـانی ئاژەڵیشـدا. لەسـاڵانی شەست‌و حەفتاکاندا چەندین پێشکەوتنی کتوپڕو گرنگ لەلایەن ویلیەم هاملتن‌و رۆبرت تلایڤیرسەوە بەدەسـتهێنرا لـەبواری لێکدانـەوەی چـەمکی بێگانەپەرستی‌دا (ALTRUISM) لەناو جیـهانی ئـاژەڵدا، لێکدانەوەیـەك کەبنەماکـەی جـۆرە غەریزەیـەك نی‌یـە کەهەمیشـە بەئاڕاسـتەی پاراسـتنی مانـەوەی جۆرەکـاندا بـڕوات بـەڵکو غەریزەیەکـە بەئاڕاسـتەی ویسـتی "جینـە خۆپەرستەکان"دا (هـەروەك ریتچاردداوکین ناوی لـێ‌ناوە) دەڕوات، ئەمـەش بۆتـە هـۆی ئـەوەی هەڵسـووکەوتی کۆمەڵایـەتی فـەردێکی ئـاژەڵ سەمەرەبێت. دواجار پێشکەوتنەکانی دەروونناسی مێشـك (neurpsychology) ئـەوەیان سەلماندووە کەمێشکی مرۆڤ قوڵینەیەکی بەتاڵ نی‌یـە چـاوەڕوانی ئـەوە بێـت بـەناوەڕۆکی فەرهەنگی پڕبکرێتـەوە، بـەڵکو زیاتر ئۆرگانێکی هێندە ئاڵۆزە بەشە سەرەکی‌یە گرنگەکانی پێشتر گونجێـنراوە بـۆ مەبەسـتی بەرهەمـهێنان‌و گونجـاندنی لەمـەڕ پێویسـتی‌یە بەرپیشـە کۆمەڵایەتی‌یەکانی ئاژەڵـە سەرۆکەکان (مـرۆڤ،

شەمپانز)(8). مرۆڤ بەشێوەیەكی بەهێز پەیوەستكراوە بەچەندین شێوازی لەهەڵسووكەوتی دیاریكراو.

ئەو سۆسیۆلۆژیایەی لەو سەرچاوە تیۆرییانەوە قەڵەمبازی داوە بۆ سەر زەمینەی واقع، هەوڵی داوە دەستەبەری شیكردنەوەیەكی داروینیانەی توندوتۆڵ ئەنجام بدات سەبارەت بەهەموو شتێك، لەوانەیە شتێكی حەتمیش بووبێت كەبەهەمان شێوە دژكاردانەوەیەكیشی بەرامبەر بەخۆی دانابێت.

بەڵام لەكاتێكدا كەخۆری سەردەمی سۆسیۆلۆژیا بەرەو ئاوابوون رۆیشتوە، دەبینین ئەو تۆوەی بیری داروینیزمی نوێ لەجەستەی سۆسیۆلۆژیادا چاندبووی ئێستا لەژێر ناوی سایكۆلۆژیای پەرسەندن یان مرۆڤناسی پەرەسەندن چەكەرە دەكاتو ئەمڕۆ بۆتە گۆڕەپانێكی ململانێی گەورەی داهێنانو توێژینەوەی نوێ.

بەپێچەوانەی هەڵوێستی داروینیستە بێبنەماكان لەئاستی ساتەكانی كودەتا زانستییەكاندا، زۆربەی هەرە زۆری بایۆلۆجیستە هاوچەرخەكان تیرەو رەگەز دانانێن بەپلەو پایەیەكی بایۆلۆژی گرنگ. ئەمەش لەپێناو ئەو ئەنجامگیرییەدایە كە لەو باوەڕەدایە رەگەزە مرۆییە جیاجیاكان تەنها سەد هەزار ساڵێك دەبێت پەیدابوونو سیمای جیاجیای تایبەت بەخۆیان هەڵگرتووە كە ئەم ماوەیەش لەقۆناغی گەشەكردندا بەساتی چاوتروكاندنێك دەدرێتە قەڵەم.

هەروەك ژمارەیەكی زۆر لەنووسەران ئاماژەیان بۆكردووە، رەگەز نموونەیەكی بونیادی كۆمەڵایەتییە: لەبەرئەوەی هەموو رەگەزەكان دەتوانن (و دەیكەن) لەگەڵ یەكتردا جووت ببن (interbreed)، زۆربەی جاریش هێڵی سنوورە جیاكەرەوەكانی نێوانیان تەڵخو شێواوە.

هەرچۆنێك بێت، ناتوانین بڵێین هەمان شت سەبارەت بەسێكس راستە. لەكاتێكدا هەندێ رۆڵی سێكسی، لەڕاستیدا، بونیادێكی كۆمەڵایەتییان هەیە، دەبینین بەپراكتیك هەموو لایەنگرانی بایۆلۆژیای پەرەسەندن لەو باوەڕەدان كەچەندین جیاوازی قوڵ هەیە لەنێوان ئەو جۆرە سێكسانەی كەزیاتر رەگو ریشەیەكی جینیان هەیەو ئەوجۆرانەش كەڕەگو ریشەیەكی فەرهەنگی یان هەیەو ئەو جیاوازییانەش لەدەرەوەی جەستە بۆ ناو جیهانی عەقڵ دادەكشێن. دووبارە ئەمەش بۆ بەڕاستی گەیاندنی روانگەی داروینییەكانە: گوایە تەمەنی بەرهەم هێنانەوەی سێكسی سەدان ملیۆن ساڵە بەردەوامە نەك هەزاران ساڵ. نێرو مێ تەنها دژایەتی ژینگە ناكەن بەڵكو لەو پرۆسەیەدا كەداروین ناوی (هەڵبژاردنی سێكسی) لێناوە دژایەتی یەكتریش دەكەن، بەپێی ئەم هەڵبژاردنە هەر سێكسێك هەوڵی بەرزكردنەوەی ئاستی تەواوسازی خۆی دەدات لەڕێگەی هەڵبژاردنی چەندین جۆر لەهاوڕێو هاوسەر. ئەو ستراتیجییە سایكۆلۆژییانەی كە لەم لەشكركێشییە رەگەزییە بێكۆتاییەی نێوان ژنو پیاوەوە سەرهەڵدەدات لەلای هەر یەكێك لەو سێكسانە جیاوازە.

لەهیچ بوارێكدا جیاوازی سێكسی هێندەی ئەو بوارە ئاشكرا نییە كە پەیوەستە بەتووندوتیژیو دوژمنكارییەوە. نەوەیەك لەمەوپێش دوو سایكۆلۆژیست ئێلینەر ماكۆبیو كارل جاكلین كتێبێكی بەهێزیان دەركرد تایبەت بەمەسەلەیەك كە ئەوكاتە بەشێوەیەكی ئەزموونگەری باسی لەجیاوازی نێوان سێكسەكان دەكرد. لەو نووسراوەدا ئەوەیان دەرخست كەچەندین ووتەی سواو دەربارەی نەژاد لەنموونەی ئەو سووربوونەی كەگوایە ئافرەتان خاوەنی ئیرادەیەكی لاوازو خودڕێزییەكی كەمترن لەچاو پیاواندا یان گیانی بەڕەنگاربوونەوەو كێبەریان

کەمترە، بەهیچ شێوەیەك شایانی سەلماندن نین. لەیەکێك لەمێزگردەکانیشدا، هەرچۆنێك بێت هیچ ڕێنەکەوتنێك نەبوو لەسەر ئەو ڕاستییەی کە گوایە کوڕان دوژمنخوازترن لەکچان، چ بە زار چ بە کردار، لەخەونەکانیاندا، لەوشەکانیاندا، لەکردەوەکانیاندا. کەسێکیش تەنها سەیری ئامارەکانی تاوان بکات دەگاتە هەمان ئەنجام، هەموو دەزانین هەموو ئەو فەرهەنگە ناسراوانەی کە ئێمە بەقۆناغی سەردەمە مێژووییەکان ناویان دەبەین، بەدەستی تاوانی بەرفراوانی پیاوان سووربوون، بەتایبەتی تاوانەکانی توندوتیژی. شایانی باسە دەتوانین بەڕووکەش تەمەنێکی جینی دیاریکراوی تایبەت بەتوندوتیژیو دوژمنکاری دیاریبکەین: تاوانەکان بەشێوەیەکی یەکجار زۆر لەلایەن ئەو کوڕە گەنجانەوە ئەنجامدراون کەتەمەنیان دەکەوێتە نێوان (15-30) ساڵ. لەوانەیە کوڕە گەنجەکان لەهەموو شوێنێکی ئەم دنیایەدا بەهەڵسووکەوتی توندوتیژی ڕاهاتبن بەڵام ئەم بەڵگەیە، لەکاتو کلتووری جیاجیادا، ئاماژە بۆ هەندێ ئاستی قوڵتری (سببية) لەکاردا دەکات. ئا لەم خاڵەی دەمە تەقێکەدا، زۆربەی خەڵکی سەغڵەت دەبنو سەرئەنجام بەرپرسیارییەکانی حەتمییەتی بایۆلۆژی (biological determinism) سەرهەڵدەدات. ئایا ئێمە ژمارەیەکی زۆر لەو ئافرەتانە نازانین کەبەهێزترو خاوەن بڕیارترو توندوتیژتر یاخود کێبارترن لەنێرینەکانی بەرامبەریان؟ ئایا ڕێژەی مێینە تاوانبارەکان لەچاو نێرینە تاوانبارەکاندا لەزیادبووندا نییە؟ ئایا ئاستی فیزیکی کار لەدابەزیندا نیە؟ دروست کردنی جیاوازی سێکسی بێ بایەخ نەبووە؟ وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە بریتییە لەبەڵێ: دووبارە هیچ بایۆلۆژیستێکی نشونماخوازی بەناوبانگ ئینکاری ئەوە ناکات کەفەرهەنگیش بەش بەحاڵی خۆی شێوازی هەڵسووکەوتی مرۆڤەکان بەچەندین ڕێگای تەنگ پێهەڵچنراوی بێشومار دیاریدەکات، بەجۆرێك زۆربەی کات لەتوانادایە مەیلە جینییەکان تێك بشکێنێت لەئاست پێویستی گونجاندنو مانەوەی کۆمەڵایەتیدا.

گەر بڵێین جیاوازی سێکسی بنەمایەکی جینیی هەیە ئەوا بەشێوەیەکی سادە سووربوونێکی ئامار ئاسا پێك دەهێنێت بەو پێیەی کە ئەو هێڵە چەماوە ترسناکەی وەسفی دابەش کردنی چەندین سیفەت دەکات لەسەر بنەمای سێکس تارادەیەك جێلەق دەبێت سەبارەت بەپیاوان کاتێك بەراورد دەکرێت لەگەڵ ئافرەتاندا ئەو دوو هێڵە چەماوەیە لەزۆربەی بەشەکانیدا بەناو یەکتردا دەچن، وە کەسانێکی زۆر لەناو هەریەکێك لەو خەڵکانەدا پەیدادەبن کەلەسێکسەکەی بەرامبەری زیاتر سیفاتێك لەو سیفاتانەی تیادا بێت.

بایۆلۆژی ئەو قەزاو قەدەرە نییە کەسەرکردە مێینە مەزاج واقعیەکانی نموونەی مارگرێت تاتشەرو ئیندیراگاندیو گۆڵدامایر سەلماندویانە.

شایانی باسە لەو وڵاتانەدا کەتیایدا ئافرەتان سەرکردەو خاوەن دەسەڵاتن تەنها ئافرەتە نائاساییەکان بەو پلەیو پایەیە دەگەن. بەڵام سووربوونە ئامارییەکەی سەرەوە بەهەمان شێوە ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات، خەڵکانی ئاسایی بێجگە لەو کەسە شازانە تەنها بەوشێوەیە دەجوڵێنەوە کەلەلای هەموان ئاشکرایە ئەمە لەلایەکو لەلایەکی تریشەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کەمرۆڤەکان بەو ڕادەیە نەرم نین کۆمەڵگا بتوانێت لەڕێگەی فەرهەنگەکەیەوە لەقاڵبیان بدات.

### فێمینیستەکانو سیاسەتی هێز

لەم ماوەیەدا ئەدەبیاتێکی بەهێز بەدی دەکەین دەربارەی نەژادو سیاسەتی دەوڵی هەروەها لقە زانستێکی بەهێز لەناو جەستەی تیۆری پەیوەندییە دەوڵییەکان لەسەر بنەمای

بەرهەمەکانی زانایانی وەك ئان تیکنەر، سارا دۆدیك، جین بیسك ئێلشتەین، جودیس شاپیرۆ و ئەوانیتر سەری هەڵداوە. گەر بەکورتی وەسفی ئەم ئەدەبیاتە بکەین دەڵێین ئەدەبیاتێکی زۆر جۆراوجۆرەو راستیشە گەر بڵێین ئەم ئەدەبیاتە بەپلەی یەکەم بایەخی داوە بەچۆنیەتی بەنەژادکردنی سیاسەتی دەوڵی، واتە چۆن ئەم بوارە بەئاراستەی خزمەتکردنی بەرژەوەندیە نێرینەیەکان لەلایەن پیاوانەوە بەڕێوەدەبرێت، جا بەشێوەیەکی هەستی بێت یان نەستی بەپێی روانگەی نێرینەکان شیدەکرێتەوە. بەم شێوەیە کاتێك تیۆریستێکی ریالیستی وەك هانزمۆرگانتۆ یان کینس والز دەڵێن: دەوڵەتەکان خولیای بەرزکردنەوەی ئاستەکانی دەستەڵاتەکانیان، لەو باوەڕەدان کە بەم وتەیەیان وەسفی سیفەتێکی کەونی مرۆڤ دەکەن. ئەمەش هەروەك تیکنەر ئاماژەی بۆ دەکات وەسفێکە تەنها لەو گۆشەیەوە دەڕوانێتە دەوڵەتان کەبونیادێکەو پیاوان بەڕێوەی دەبەن.

بەراستی هەموو ئەو فێمینیستانەی کە لەسیاسەتی دەوڵی دەکۆڵنەوە پەرۆشی بەدیهێنانی ئامانجێکی دڵخۆشکەرانەی بەشداریکردنی بەرفراوانی ئافرەتانن لەهەموو بوارەکانی پەیوەندیە دەوڵیەکاندا هەر لەخانەکانی جێبەجێکردن و وەزارەتەکانی دەرەوە تاوەکو سوپاکان و زانکۆکان.

ئەو فێمینیستانە لەگەڵ ئێمەدا کۆك نین دەربارەی ئەوەی ئاخۆ پێویست بکات ئافرەتان لەبواری سیاسەتدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن یان نا، لەو گۆشەیەوە کەرۆشنایی دەخاتە سەر لایەنە باشە تەقلیدیەکانی توندوتیژی نێرینە، دوژمنخوازی و دووبەرەکی و ئارەزووی بەکارهێنانی هێز لەشوێنی پێویستدا، یان ئاخۆ پێویست بکات کتومت پشت بەکارنامەی سیاسی پێشینەی نێرینەکان ببەستن لەهەرەمی دەستەڵات و سەروەریدا. ئەم هاوشانیەی نێوان ئەم دوو دژە لەناو کاردانەوەی فیمینیستەکاندا کرایە نموونەو بەرامبەر مارگرێت تاتشەر دانرا، ئەو کەسایەتیەی کەبەهەر پێوانەیەك بیپێویت زۆر توندوتیژترو کەللەرەقتربوو لەهەموو ئەو سیاسیانەی رووبەڕووی بوونەتەوە. پێویست بەئاماژەکردن ناکات بڵێین ئەو سیاسەتە کەنارگیرییەی تاتشەر پیادەی دەکرد نەبووە مایەی بەهێزکردنی پێگەی سیاسی خۆی لەلای زۆرینەی فێمینیستەکان، ئەوانەی کەزیاتر ماری رۆبنسن یان گرۆهارلم برەندتلاند بەسەرکردەیەکی مێینەی باشتر دادەنێن، سەرەڕای یاخود بەهۆی ئەو راستیەوە کەتاتشەر پیاوانی لەیاریەکەی خۆیاندا بەزاندووە.

## ئاشتی دیموکراتی و مێینە

گەر کەسێك بەگەردبینی سێکس و بایۆلۆژی لەپەیوەندیە دەوڵیەکان وردبێتەوە هەرگیز جارێکیتر بەهەمان شێوەی جاران نایبینێتەوە. بەراستی شتێکی گرانە بڕوانینە موسوڵمان و سەربیەکانی بۆسنە، هوتو و توتسیەکانی رواندا، یان میلیشیایەکانی لیبریاو سیرالیۆن و جۆرجیاو ئەفغانستان خۆیان خزانبێتە ناو حاڵەتێکەوە کە لەگروپەکانی رێکەوتنە نێرینەیەکان دەچێت بۆئەوەی بەشێوەیەکی سیستماتیکی قڕ بخەنە یەکتری و، بیر لەشەمپانزەکان (GOMBE) نەکەینەوە.

ئەو کێشە کۆمەڵایەتیە سەرەکیەی کەتووشی هەموو کۆمەڵگایەك دەبێت بریتیە لەکۆنترۆڵ کردنی مەیلە شەڕانیەکانی کوڕە گەنجەکانی ئەو کۆمەڵگایە. لەناو کۆمەڵگا راوچیە بەروبومە کۆکەرەوەکاندا، جۆری گرنگ و بەرفراوانی توندوتیژی بەهۆی سێکسەوەیە، ئەمەش ئەو دۆخەیە کەبەردەوام دەبێت لەبەرهەم هێنانی تاوانی توندوتیژی ناوخۆ لەناو کۆمەڵگا پیشەسازیە هەراشە هاوچەرخەکاندا. پیاوە

بەساڵاچووەکانی تری کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشتی بەرپرسیارن بەرامبەر ئەرکی بەکۆمەڵایەتیکردنی کوڕە گەنجەکان لەڕێگەی بەسرووت کردنی مەیلە شەڕخوازیەکانیان، یاخود زۆربەی جار لەڕێگەی ئاڕاستەکردنی ئەو مەیلە شەڕخوازییانە بەرەو رووی دوژمنە دەرەکییەکانی کۆمەڵ. ئەشێت هۆکاری زۆربەی زۆری و ئەو توندوتیژییە دەرەکییەش ئافرەت بێت. مێژوو نووسە هاوچەرخەکان باوەڕیان وایە گریکەکان و تروادەکان (9) شەڕێکی دە ساڵەیان لەسەر هێلین (HELEN) (10) نەکردبێت. بەڵام زۆربەی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان کتومت وایان کردوە بۆ نمونە یانۆمامیۆکان. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کشتوکاڵدا، دە هەزار ساڵێك لەمەوبەر، و کەڵەکەبوونی سامان و زەوی، جەنگەکان رووی خۆیان بەرەو بەدەستهێنانی کاڵا ماددییەکان وەرگێڕا. دەشێت گۆڕینی ئاڕاستەی دوژمنکاری بەرەو دەرەوەی کۆمەڵگا رێژەی گشتی توندوتیژی کۆمەڵگاکان نزم نەکاتەوە، بەڵام بەلایانی کەمەوە ئیمکانیەتی دابین کردنی ئاشتی ناوخۆیی نێوان جەنگەکانیان بۆدەخاتەروو.

بەشێوەیەکی بنەڕەتی، کرۆکی کارنامەی فێمینیستی سەبارەت بەسیاسەتی دەولی راست دێتەبەرچاو: پێویستە مەیلە توندو تیژو دوژمنخوازەکانی پیاوان کۆنترۆڵ بکرێن، ئەمەش بەشێوەیەکی سادە لەڕێگەی ئاڕاستە گۆڕینی ئەو مەیلانە بەرەو دوژمنێکی دەرەکی نایەتە دی بەڵکو لەڕێگەی بەتووندی بەستنەوەی ئەو غەریزە شەڕخوازە بەهێزانە لەناو تۆڕێك لەمۆدێلە کۆمەڵایەتییەکان و یاساکان و رێکەوتننەکان و کۆنتراکتەکان و.. هتد.. دێتەدی. لەمەش زیاتر، ئەمڕۆ ژنان لەهەموو کات زیاتر پێویستییان بەوە هەیە وەك سەرکردەو کارمەندو دەنگدەر بێنە ناو بوارەکانی سیاسەتی دەولیەوە. تەنها لەڕێگەی بەشداریکردنی تەواوەتی لەسیاسەتی جیهاندا ئافرەتان دەتوانن لەلایەکەوە بەرگری لەبەرژەوەندییەکانیان بکەن لەلایەکی تریشەوە ئەو کارنامە نێرینەییە بگۆڕن کە لەمەوپێش باسمان کرد.

بێگومان بەمێینەکردنی سیاسەتی جیهانی بەدرێژای سەدساڵی رابردوو بەچەندین کاریگەری پۆزەتیڤەوە هەنگاو هاتۆتە پێشەوە. لەهەموو وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان و زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەمیش ئافرەتان مافی دەنگدان و بەشداریکردنی بواری سیاسەتیان بەدەستهێناوە لەهەمان کاتدا توانیویانە بەهێزو توانایەکی بەرفراوانەوە ئەو مافانەیان پیادەبکەن. لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو وڵاتە دەوڵەمەندەکانی تری وەك ئەو بۆشاییەکی نەژاد ئاسای ئاشکرا لەبواری سیاسەتەکانی دەرەوەو ئاسایشی نەتەوەی دێتە بەرچاو. هەمیشە ئافرەتە ئەمریکییەکان لەپیاوە ئەمریکییەکان کەمتر پشتگیری خۆتێگلانی ئەمەریکا بوون لەجەنگەکاندا، لەنێوانیاندا جەنگی جیهانی دوهەم، کۆریا، ڤێتنام، و جەنگی کەنداوی فارسی ئەمەش بەرێژەی (7٪-10٪). ئەوان بەشێوەیەکی چەسپاو کەمتر لایەنگری خەرجییەکانی بواری بەرگریکردن و بەکارهێنانی هێزی سەربازی ئەمەریکین لەدەرەوەی وڵات. لەراپرسیێکی ساڵی (1995)ی رۆپەردا کەلەبەرژەوەندی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی شیکاگۆ ئەنجامدرا، پیاوان بەرێژەی نێوان (40٪-49٪) لەرووداوێك دا کەئەمەریکا هێرشی بردەسەر کۆریای باکور، دەستێوەردانی ئەو وڵاتەیان پەسەندکرد، ئەمە لەکاتێکدا کەئافرەتان بەرێژەی نێوان (30٪-54٪) دژی ئەو دەستێوەردانەی ئەمریکا وەستانەوە. بەهەمان شێوە، لەرووداوی هەوڵدانی عێراق بۆ داگیرکردنی سعودیە، کردەوە سەربازییەکانی ئەمریکا لەدژی عێراق، لەلایان پیاوانەوە بەرێژەی نێوان (31٪-62٪) پەسەندکراو لەلایەن

ئافرەتانیشەوە بەڕێژەی نێوان (43٪-45٪) بەرپەرچ درایەوە. لەکاتێکدا (54٪)ی پیاوان بەلایانەوە گرنگ بوو ئەمەریکا درێژە بدات بەسەروەرییەکانی هێزی سەربازی خۆی لەجیهاندا، تەنها (45٪)ی ئافرەتانی ئەمەریکا ئەو مەسەلەیەیان بەلاوە گرنگ بوو. لەمەش زیاتر راوبۆچوونی ئافرەتان سەبارەت بەپەنابردنە بەر هێز وەك ئامرازێكی شەرعی بۆ چارەسەركردنی كێشەكان لەبۆچونی پیاوان جیاوازە.

تێگەیشتنی ئەم بۆشاییە نەژادییەی نێوان ژنان و پیاوان لەبواری سیاسیدا شتێكی ئاسان نییە، بێگومان كەسیش ناتوانێت بەهەنگاوێك لەبایۆلۆژیاوە قەڵەمباز بدات بۆ هەڵسوكەوتەكانی پرۆسەی دەنگدان (Voting). تاكو ئێستا چاودێرەكان ئاماژەیان بۆ چەندین هۆكاری جۆراوجۆری كردووە دەربارەی ئەوەی بۆچی ئافرەتان كەمتر لەپیاوان خوازیاری بەكارهێنانی هێزی سەربازین، یەكێك لەو هۆكارانەش رۆڵی دایكایەتی ژنانە، ئەمەش ئەو راستییەیە كەزۆربەی ئافرەتان دەكاتە فێمینیست (واتە، پەیوەستە بەو كارنامە لاوەكییەی بەشێوەیەكی گشتی دژی دەستێوەردانەكانی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە لەوولاتانی تردا)، پاشان لایەنگیری پارتیزانی(11) (Affliation) (زۆربەی زۆری ئافرەتان بەشێوەیەكی دیموكراتیتر لەپیاوان لە هەڵبژاردنەكاندا دەنگ دەدەن). لێرەشدا پێویست بەزانینی هۆی پەیوەندی راستەوانەی (12) (Corrlation) نێوان نەژادو ئەنتی میلیتاریزم (13) (Antimilitarism) ناكات بۆئەوەی بڵێین ئەشێت بەشداریكردنی بەرفراوانی مێینە وا لەولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكاو ولاتە دیموكراتییەكانیتر بكات هێندە بەدەستكراوەی جارانیان ئارەزووی بەكارهێنانی هێز نەكەن لەجیهاندا.

ئایا ئەم گواستنەوەیە بەرەو جیهانێك بەرەچەڵەك كەمتر ئارەزووی بەكارهێنانی دەستەلاتو هێزی سەربازی هەبێت شتێكی باش دەبێت؟ سەبارەت بەو دەوڵەتانەی پێیان دەوترێت ناوچەی دیموكراتی ئاشتی، وەلامەكە بریتییە لەبەڵێ. رەچاوكردنی نەژاد شتێكی زۆر دەخاتە سەر ئەو وتو وێژ بەهێزو سەمەرەیەی كە لە دەساڵی رابردووەوە تاكو ئێستا لەسەر پەیوەندی راستەوانەی نێوان دیموكراسیو ئاشتی دەدوێت. جەدەلی (ئاشتی دیموكراتی)، كە رووخساری سیاسی سیاسەتی دەرەوەی حكومەتەكەی كلێنتنو ئەوانەی پێش ئەویش دیاری دەكات، بریتییە لەوەی ئەم ولاتە دیموكراتیانە نایانەوێت شەڕ لەگەڵ یەكتردا بكەن.

لەكاتێكدا ئەم بانگەشە ئەزمونگەرییە كەوتۆتە ناو كێشمەكێشەوە، دەشێت لەلای كەسێكی شارەزا بەسیاسەتی جیهانی، پەیوەندی راستەوانەی نێوان پلەكانی یەك بوونەوەی دەزگا لیبراڵە دیموكراتییەكانو ئاشتی ئینتەر دیموكراتیك (Interdemocratic) بەحاڵەتێكی گشتگیری ناسادەو دەگمەن دێتە بەرچاو. ئەمڕۆ تیۆرستەكانی ئاشتی دیموكراتی كاتێك دەربارەی ئەو هۆیانە دەدوێن كەرێگرە لەبەردەم پێكدادانی نێوان ولاتە دیموكراتییەكان كەمتر لەجاران متمانەیان پێدەكرێت، ئەوان زۆربەی كات ئاماژە بۆ حوكمی یاساو، رێزلێنانی ئازادییە كەسییەكانو سروشتی بازرگانی زۆربەی ئەو ولاتە دیموكراتییانە دەكەن. بێگومان ئەمانە راستن بەلام فاكتەرێكی تر هەیە كەبەشێوەیەكی گشتی تاكو ئێستا حسابی بۆنەكراوە: دیموكراتییە پێشكەوتووەكان هەوڵی ئەوەش دەدەن زیاتر لەدەوڵەتە ئەتۆرۆتارییەكان دەستەلاتەكانیان مێینەبكەن بەتایبەتی لەبوارەكانی فراوانكردنی مافەكانی مێینەو بەشداری پێكردنیان لەدارشتنی بریاری

سیاسیدا. هەر لەبەرئەمە پێویستە کەس سەری لەوە نەسووڕمێت ئەو گۆڕانکاری‌یە مێژووی‌یە بێ‌وێنەیە لەبنەما سێکسی‌یەکانی سیاسەتدا ببێتە هۆی گۆڕانکاری‌یەك لەناو پەیوەندی‌یە دەولی‌یەکاندا.

## واقعی فانتەزی‌یەکانی دوژمنکاری

لەلایەکی ترەوە، ئەگەر رۆڵە نەژادی‌یەکان بەئاسانی بەشێوەیەکی کۆمەلایەتی بونیاد نەنرابن‌و رەگو ریشەیان لەناو بۆماوەیدا داکوتابێت، ئەوا رادەی توانای گۆڕینی سیاسەتی دەولی سنووردار دەبێت. ئەمەش لەهەموو شتێکدا سنووردار دەبێت تەنها لەجیهانێکدا نەبێت کە گشت مێینەو، سیاسەتە مێینەکان تیادا دەشێت ببنە ئیلتیزام.

هەندێك لەفێمینیسەکان وا دەدوێن هەروەکو بلێی پێناسە نەژادی‌یەکان بلوزێکی کۆن‌و بەئارەزووی خۆت دەتوانیت دایکەنیت‌و دانەیەکی نوێ لەجێی لەبەربکەیت، لەوانەیە ئەم جۆرە تێگەیشتنانە بەهۆی ئەو کۆرسە توێژینەوە زۆرە ملی‌یانەوە دروست ببێت کەگەنجەکان لەقۆناغی یەکەمی زانکۆکانیاندا دەیخوێنن. راوبۆچوونە نێرینەیی‌یەکان دەربارەی ژمارەیەکی زۆر لەمەسەلەکان، هەر لەمندالْ پەروەردەکردن‌و کاری ناو مالەوە هەتاوەکو هەست کردن بەدنیای ئەوی‌تر (getting in touth with your feelings)، لەلای دوو نەوەی رابردوو، بەشێوەیەکی دراماتیکی بەهۆی پەستانە کۆمەلایەتی‌یەکانەوە گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە. بەلام بەکۆمەلایەتی‌کردن (socialization) لەوپەڕی تەواوسازی خۆیدا لەوانە تێناپەڕێت‌و، ئەشێت ئەو هەولانەش کەلەپێناو بونیادنانی کوڕە گەنجە تەواو بەمێینەکراوەکاندا دەدرێت زۆر لەهەولەکانی یەکێتی سۆڤیەت باشتر نەبێت رازی‌کردنی گەلی سۆڤیەتی کەرۆژانی شەممان لەبەرخاتری گەلە قارەمانەکانی کوباو ڤێتنام کاربکەن دەتوانرێت ئاراستەی ئەو میلە نێرینانەی کەدەیانەوێت یەکبگرن لەپێناو ئامانجە کێباری‌یەکان، پەرۆشی رکێف کردنی پلەکانی دەستەلات لەناو هەرەمی دەستەلاتداو، پیادەکردنی فانتەزی‌یەکانی شەڕخوازی بەرامبەر بەیەکتر، بگۆڕدرێت بەلام هەرگیز لەتوانادا نیە بۆ هەتا هەتای لەکۆل بکرێنەوە.

گەر بشتوانین دنیایەکی پڕ لەپەیوەندی‌یە ئاشتی خوازەکانی نێوان وولاتە دیموکراتی‌یەکان بخەینە پێش چاومان، ئەوا هێشتا دنیایەکەی لەوە فراوانتر هەیە رێکەوت زادەکانی وەك مۆبۆتۆو میلۆسێڤیچ یان (صدام) تێدا زەق دەبنەوە. رەخنەکانی ماکیەڤیلی ئەریستۆتلْ (aristotle) (14) ئەوەبوو کەدووهەمیان لەنموونەی شاردە دادپەروەرەکەیدا رەچاوی سیاسەتی دەرەوەی نەکردووە: لەناو سیستمی دەولەتە کێبارەکاندا، رژێمە هەرە باشەکان پیادەی خراپترین جۆری دەستەلات دەکەن لەپێناو پارێزگاری کردن لەمانەوەی خۆیان ئەم راستی‌یە هاوکات دەبێت لەگەلْ بوونی جیهانێکی دیموکراسی، مێینەکراو کەبۆتە ناوچەیەکی ئاشتی‌و لەلایەن پیاوانێکی لاو و پڕ هیواو سەربەستەوە بەڕێوەدەبرێن.

ئەگەر صدام حسێنی پاشەڕۆژ کەسێك دەرنەچێت لەسەر یەکێك لەولاتە نەوتی‌یە جیهانی‌یەکان دانیشتبێت بەلکو تەواو خۆی بەچەکی کیمیاوی‌و بایۆلۆژی‌و ئەتۆمی پڕچەك کردبێت، لەوانەیە وا بۆ ئێمە باشتر بێت کەسێکی وەك مارگرێت تاتشەر بەرەنگاری ببێتەوە نەك گرۆهارلم برەندتلاند. سیاسەتی نێرینە هەر بەپێویست دەمێنێتەوە ئەگەرچی پێویست بەپێشەوای نێرینەش نەکات.

جێ‌بەجێ‌کردنەکانی بایۆلۆژیای نش‌ونماخواز بەسەر مەسەلە حەساسەکانی ئافرەتدا لەبواری سەربازیدا لەوانەیە ئاراستەیەکی هێندەرێکی نەبێت وەك هەندێك کەس بیری لێ‌دەکاتەوە.

کاره گرنگە بەرفراوانەکانی ڕێکخراوێکی سەربازی هاوچەرخ ئەو پشتگیریە زۆرەی لەپشتەوەیە کەلەپشت یەکە جەنگاوەریەیە راستەقینەکاندا خۆی حەشارداوەو هیچ ڕێگرێکیش لەبەردەم ژناندا نییە گەر نەشڵێین لەپیاوان باشتر ئەوا وەك پیاوان پیادەیان بکەن. لەکاتێکدا کەپیاوان وەك راوچیو بەروبووم کۆکەرەوەو جەنگاوەر کاریان کردووە، شتێکی ئاشکرا نیە بۆچی گروپێکی فەردی ئافرەتان هێندەی گروپێکی فەردی پیاوان ئەو کارانە بەباشی ئەنجام نادەن لەجەنگدا. ئەوەی لەم بەراوردە ئاڵۆزترە بریتییە لەکۆبوونەوەی ئەم دوو سێکسە لەژێر سایەی هەمان یەکەی سەربازیدا، کەتیایدا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەپەیوەندییەکی فیزیکی توندوتۆڵدا دەبن. یەکخستنی یەکەکان کەبریتییە لەو بنەمایەی جێبەجێکردنی ئامانجە سەربازییەکان بەشێوەیەکی تقلیدی لەدەوری ڕێکەوتنی نێوان نێرینەکان کۆبۆتەوە کەتەنها لەوکاتەدا بۆی هەیە زیان بەخش بێت پیاوان بەمەبەستی راکێشانی سەرنجی ئافرەتان بۆخۆیان لەناو خۆیاندا بەربەرەکانی بکەن. ئەو فەرماندەرانەی پشتگیری لەڕێکەوتنی نێوان نێرینەکان دەکەن لەسەر بنەمای غەریزەیەکی سروشتی بونیاد بەهێز، ئەوانەی هەوڵدەدەن چاکی سێکسی لەنێوان پیاوانی لەش ساغی تەمەن بیست ساڵانو ئافرەتاندا لەژێر چاودێری بەردەوامو لەڕێگەی "سفری لێبوردن"دا بهێڵنەوەو سزای توندوتیژی بەرامبەر دابنێن، بەپێچەوانەوە لەهەمان کاتدا پەرۆشی کردنی شتێکی زۆر ناسروشتین. جیاکردنەوە لەسەر ئاستی رەگەز وەك جیاکردنەوە لەسەر ئاستی سێکس نییە، لەچەندین بەشی سوپادا نەك تەنها بەشتێکی گونجاو دێتەبەرچاو بەڵکو بەپێویستیش دادەنرێت.

## مارگرێت تاتشەرەکانی پاشەڕۆژ

لەپەنجا ساڵی داهاتوودا، بەمێینەکردنی سیاسەتی دیموکراتی سەرئەنجام لەگەڵ مەیلە دیمۆگرافییەکاندا کارلێك دەکات بۆئەوەی گۆڕانکارییە گرنگەکان بەرهەم بهێنێت. بەهۆی ئەو دابەزینە بەرفراوانەی بەپیتی لە جیهانی سێهەمدا لەساڵەکانی (1960)وە سەری هەڵداوە، دابەش بوونی تەمەن لەلای ئەو وولاتانەی ئەندامن لەڕێکخراوی هاریکاری ئابووریو پەرەسەندن دا، بەشێوەیەکی دراماتیکی بەسەردا دێت.

لەکاتێکدا لەسەرەتای بیستەکاندا ناوەندی تەمەن لەئەمریکا لەناوەندی بیستەکاندا بوو لەدەوروبەری ساڵانی (2050)دا بەرەو (40) قەڵەمباز دەدات، ئەم گۆڕانکارییە لەئۆروپاو یاباندا زیاتر دراماتیکی دەبێت کەتیایدا ڕێژەکانی بەپیتیو کۆچکردن نزمترن. لەسایەی پێشبینیکردنی دابەش کردنی ئاست نزمی دانیشتوان، ناوەندی تەمەن لەئەڵمانیادا دەبێتە (55)و لەیاباندا دەبێتە (53)و لەئیتالیادا دەبێتە (58).

ئەم گۆڕانکارییە مژدەیەکی ناخۆشی ئاکام کۆمەڵایەتی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، ئەویش سەرهەڵدانی ئافرەتە پیرەکانە وەك بلۆکێکی دەنگدانی هەرە گرنگ بەوشێوەیەی کە سیاسییەکانی ناوەندی سەدەی بیستویەك بەشانو بازویاندا هەڵیانداوە! بۆ نموونە لەدەوروبەری ساڵانی (2050)دا، لەئیتالیاو ئەڵمانیادا، ئافرەتانی سەرو پەنجا ساڵ، کەهەر ئێستا (20٪)ی دانیشتوانی ئەو دوو وڵاتە پێك دەهێنن ژمارەیان دەگاتە (31٪)ی کۆی دانیشتوان. بێگومان ناکرێت پێشبینی چۆنییەتی دەنگدانی ئەم ئافرەتانە بکەین، بەڵام وابێ دەچێت بتوانن زیاتر پێشەوا ئافرەتەکان هەڵبژێرنو بەبەراورد لەگەڵ پیاوە تەمەن مام

ناوەندیــە تەقلیدیـیـەکان کــەمتر خوازیـــاری دەستێوەردانی ســەربازی بــن. ئێدوارد لــەتۆك لەمەڵبەندی لێکۆڵینــەوە ستراتیژیو دەوڵیـیەکان (csis) تێبینی ئەوەی کــردووە بچوك بوونــەوەی قـــەوارەی خـــێزان وا لەدانیشـــتوانی وڵاتـــە پێشـــکەوتووەکان دەکـــات بەبــەراورد لەگـــەڵ کۆمــەڵگا کشـتوکاڵیەکان زیـاتر، لەکارەسـاتە ســەربازیەکان بترســن بەوپێیــەی کەوڵاتــە کشتوکاڵیەکان گــەنجانێکی زیاد لەپێوویستو شەپۆکاویان هەیــە. بــەپێی بۆچوونــەکانی زانــای دیمۆگرافـی نیکۆلاس ئێبەرشتات، لەدەوروبــەری سالانی (2050)دا، سێ لەسەر پێنجی وەچەکانی ئیتالیا تەنها لــەو منداڵانــە پێك دێت کەخوشكو براو خاڵو خاڵۆزاو مامو ئامۆزاو پوریان نـابێت. خستنە پێش چاوی جیــهانێکی بــەم شــێوەیە هێنــدە ناعەقلانیــە هـــەتاوەکو کارەســـاتە سەربازیەکانیش لەئاستیدا دڵ نەرم دەبێت!

وای پێدەچێت لەدەوروبەری ناوەندی سەدەی داهاتوودا ئۆروپا لەو نەتەوە دەوڵەمــەندو بــەهێزو دیموکراتیـیانــە پێـك بێـت کــە دانیشـــتوانێکی خێراپووکـــاوەی وەهـــای تێـــدا بـــژی زۆربـــەیان خــەڵکانی پــیربن‌و تیـــایدا ئافرەتـــان ڕۆڵێکـــی ســەرەکی گرنگ ببینن.

هــەروەها وڵاتــە یــەکگرتووەکانی ئەمــەریکاش کەڕێژەیەکی بەرزی لەکۆچ کردن‌و بــەپیتی هەیــە، پێشــەوای ئـافرەتی زیــاتر تیــادا دەبێــت بــەڵام بەشێوەیەکی جەوهەری دانیشـتوانێکی گــەنجتری دەبێـت.. بەشـێکی گــەورەترو هــەژارتری جیــهان کەپێك هــاتووە لەوڵاتــەکانی ئــەفریقا، ڕۆژهــەڵاتی ناوەڕاستو ئاسـیای باشـوور کەدانیشـتوانێکی گەنجو پەرەسەندوی تیادایە، تاڕادەیــەك لەلایــەن پیــاوانی گــەنجترەوە بــەڕێوەدەبرێن. هــەروەك ئێبەرشـتات ئامـاژەی بۆ دەکـات، ئاسیا بێجگــە لــەیابان روو لــە ئاڕاســتەی بەمێینــەکردن (feminization) وەردەگێرێت بەهۆی ئەو ڕێژە بــەرزەی منــداڵ لــەباربردنی کۆرپەلــە مێینــەکان کــەڕێژەی رەگەزەکــەیانی لــەچاو پیـــاواندا دابــەزاندووە. (15) بــەلایانی کەمــەوە ئــەتوانین بڵێین ئەو جیهانە دەبێتە جیهانێکی نامۆ.

## وەك ئاژەڵ بژین؟

لــە(نێرینــە ئەهریمەنیـیــەکان)ی ڕینـــهامو پیتەســـن دا (وەك دەڵێــن یەکێکــە لــەو کتێبــە پەسەندانەی هیلاری ڕۆهام کلینتن، کەلەبەرچەند هۆیــەکی تایبــەتی خــۆی بەربــەرەکانی لەگـــەڵدا دەکـات)، نووســەران گەیشـتوونەتە ئــەو ئاکامــە ڕەش بینــە کـــە لـــەڕۆژی جیابوونـــەوەی زووی هۆمـــــەنیدەوە (16) (hominids) لەپشـــــتی شەمپانزی بالاوە پێنــج ملیـۆن سـالێك لەمەوبــەر، تـاکو ئــەمڕۆ هیـــچ شـتێکی وەهـــا نــەگۆڕدراوە. هاوپشـتی کۆمــەڵ تـاکو ئێستا لەســـەر بنــەمای پیـادەکردنی توندوتیـژی دژی کۆمەڵــەکانی تـــر وەستاوە، هاریکاری کۆمەلایەتی تاکو ئێستا هــەر بەو مەبەستە لە ئەستۆ دەگیرێت کە بگاتە ئاستە هـــەرە بـــەرزەکانی توندوتیـــژی ڕێکخـــراو (organized violence). ڕۆبن فۆکس ئامـاژەی بۆئەوەکردووە کە تەکنەلۆژیا ســەربازیەکان زۆر زیاتر پێش توا مرۆمیـیەکان کەوتوون بەمەبەستی بەسـرووت کردنـی توندوتیــژیو ئاڕاسـتەکردنی بــەرەو کەناڵــە بێوەیترەکــان لــەلای مـــرۆڤ. شـــەمپانزەکان (GOMBE) دەیـــانتوانی تەنـــها چەنددانەیەك لەوانەی تر بکوژن، مرۆڤی هاوچەرخ لەتوانایدایە دەیان ملیۆن مرۆڤ بکاتە هەڵم.

ســەرەڕای ئــەوەی مێـژووی یەکــەمین نیــوەی سەدەی بیستــەم زەمینــە مەزنــەکانی باوەڕهێنـان بەئەگەری گەشــەکردنی مرۆڤمان پێنابەخشێت، هێشتا دۆخەکە هێندە تاریك نیـیە بەو شـێوەیەی ئەو دوو نووسەرە گەرەکیانــە بڕوایان پێبکــەین. ســـەرلەنوێ دەیلێنــــەوە، بـــایۆلۆژی قـــەدەر نیـیـــە.ڕێژەکـــانی یەکترکوشـــتن بـــەهۆی توندوتیژیـیەوە لەچاو ســەدە دوورو درێژەکانی قۆنـــاغی ڕاوچـــی – کۆکـــەرەوە (-Hunter

Gatheren)دا کــەمتر دێنــە بــەرچاو ئەمــە ســەرەڕای بوونــی فرنــە گازەکــانو چەکــە ئەتۆمی‌یەکانی مرۆڤــی هاوچــەرخ. ئەمــەش تــەواو پێچەوانەی بۆچوونەکانی باڵە بەهێزەکانی پۆست مۆدێرنیزمە (Postmodernism) کەپێ ی وایــە خــەڵکی نــاتوانن بەتــەواوەتی خۆیــان لەسروشــتە بایۆلۆژی‌یەکەیان دەربازبکەن.

بەڵام لەڕێگەی پەسەندکردنی ئــەو ڕاستــی‌یەی کەخەڵکی ئەو سروشتانەیان تیادا هەیە کەزۆربەی جــار خــراپو تێکــدەرن، سیســتمە سیاســیو ئــــابووریو کۆمەڵایەتی‌یــــەکان دەتوانرێــــت بەشێوەیەك دابڕێژرێن کاریگەری‌یە خراپــەکانی ئەو غەریزە تێکدەرانەی مرۆڤی چوار دەور بداتو نەرمیان بکاتەوە.

بــۆ نموونــە ئــارەزووی مــرۆڤ بەگشــتی‌و نێرینەکان بەتایبەتی بۆ بەدەست هێنانی پلەکانی هـــەرەمی دەســـــتەڵات، کـــــەمرۆڤ لەگـــەڵ شەمپانزەکانی تردا بەشی دەکات خــۆی لــەخۆیدا یەکێکە لــەو غــەریزە توندوتیژانــە. ســەرهەڵدانی لیــبراڵ دیموکـراسو مۆدێــرن کاپیتــالیزم ئــەو ئــارەزووە لــەناو نابات، بــەڵام چــەندین کــەناڵی ئاشــتی خوازانــەی‌تر لەبــەردەمیدا واڵا دەکــات بەمەبەســتی تــێرکردنی. لــەنێو هینــدە گردنشینەکانی ئــەمریکا یــان یــانۆ مامۆکــاندا، لەڕاستیدا، تاقە ڕێگەیــەك لەبــەردەمی فــەردێك دا هــەبێت بۆ ســەلماندنو دەرکــەوتنی خــۆی لــەناو کۆمەڵگادا ئەوەیە ببێتە جەنگاوەر، بێ‌گومان بەو واتایــەی لەجــەنگاوەرەکانی‌تر توندوتیژتــر بێــت لەجــەنگدا. کۆمــەڵگا تەقلیدی‌یەکانی‌تر لەوانەیــە پیشەیەکی کەمتریان هەبێت بۆ فەردەکانیان وەك کاری ناو کەنیسە یان کارە بیورۆکراسی‌یەکان تا کەسێك بتوانێت جێ‌پێ ی کۆمەڵایــەتی خــۆی پــێ بکاتەوە. بەپێچەوانەوە، کۆمەڵگایەکی هاوچەرخو تەکنەلۆژی، هەزاران گۆڕەپانی مل ملانێ بۆ تاکە کەس دەخاتەڕوو، تیایدا مرۆڤ دەتوانێت بگاتــە پلەکانی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی‌و، لەزۆربــەی ئــەو کۆمەڵگایانــەدا، گــەڕان بــەدوای پلــەو پایــەدا لــەجیاتی ئــەوەی توندوتیــژی بەرهــەم بــهێنێت، چالاکی‌یە بەرهــەمدارە کۆمەڵایەتی‌یــەکان بەرهــەم دەهێنێت.

پرۆفیسۆرێك مافی موڵکایەتی زەینی لەیەکێك لــەزانکۆ پێشــەواکاندا وەردەگرێــت، سیاســەت مــەدارێك لەهــەڵبژاردنێکدا ســەرکەوتن بەدەســت دێنێت.. هتد. بەڵام لەم پرۆسەیەدا ئــەم فەردانــە کتێبیان نووسیوە، ئــەو تەکنــەلۆژیا نوێیانــەیان خســتۆتە بــازاڕەوە کەئاســتی خۆشــگوزەرانی خەڵکی پێش خستووە.

بێ‌گومــان بەدەســـتهێنانی پلــەو پایــەو دەســتەڵات شــتێك نی‌یــە بەشــێوەیەکی ڕەهــا لــەتوانای هــەموو فــەردێکدا بێــت، چونکــە ئــەو پرۆســانە بەپێناســەکردن پێیــان دەوترێــت یاری‌یەکانی بڕی سفر (ZERO-SUM) کەتیایدا هەر سەرکەوتوویەك دۆڕاوێك بەرهەم دێنێت.

بــەڵام لایەنــە پۆزەتیڤــەکانی کۆمــەڵگا نەرمــە ئــاڵۆزە هاوچەرخــەکان لەوەدایــە، – هــەروەك ئابووری ناس ڕۆبیرت فرانك ئاماژەی بۆکردووە – بۆقــە بچوکــەکان دەتوانــن چەمــە گــەورەکان بەجێ‌بهێڵنو بچنــە نــاو ئــەو چەمــە بچوکانــەی کــەتیایدا گــەورەتر دەنوێنن. بەپەرۆشبوون بــۆ دەســـتەڵات لەڕێگــەی هـــەڵبژاردنی چــەمی گونجاوەوە فەردە پڕ هیــواو هــەرە مــەزنو هــەرە بەخشندەکان تــێر ناکات، بــەڵام لەهــەمان کاتدا ڕێگــە لەبــەردەم هەناســەدانی ئــەو ووزە پــڕ کێبەری‌یەدا خۆش دەکات کە زۆربــەی جار لــەناو کۆمەڵگا کشتووکاڵی‌یە ڕاوچــی – کۆکــەرەوەکاندا جەنگێکی ترسناکی بەرهەم هێناوە.

دیموکراســی لیــبراڵو ئــابووری بــازاڕ زۆر بەسەرکەوتوویی ئامانجــەکانیان دەپێکن چونکە ئــەمان وەك سۆشیالیزمو فێمینــیزمی ڕادیکــاڵو سیســتمە یۆتۆپیایی‌یــەکان نــین، هــەوڵ نــادەن سروشتی مرۆڤ بگــۆڕن. زیاتر، سروشتی بنــەما بایۆلۆژی مرۆڤ وەك ڕاستی‌یەك پەسەند دەکەنو

بەجدی هەوڵ دەدەن لەرێگەی دەزگاکان، یاساکان و مۆدێلە کۆمەڵایەتی‌یەکانەوە دەستی بەسەردا بگرن. ناشڵێین هەمیشە سەرکەوتوو دەبێت، بەڵام لەوە باشترە وەك ئاژەڵ بژین.

سەرچاوە

Foreign Affairs – september – 1998
Women and Evolution
of world Politics
Francis Fukuyama
page 24-40

پەراوێز:

– تایبەتمەند لەبواری توێژینەوەی ئاژەڵە سەرۆکەکاندا کەبریتین لەئاژەڵە شیر دەرەکانی وەك مرۆڤو مەیمون. (و.ك)

– سیاسەتی واقعی (realpolitik) بریتی‌یە لەو سیاسەتەی لەسەر بنەما مادی‌و واقعی‌یەکان دادەمەزرێت نەك لەسەر بنەمای فاکترە تیۆری‌و ئەخلاقی‌یەکان. (و.ك)

– بریتی‌یە لەو سەرەتا سۆشیالیستی‌یەی بانگەشەی دەستەڵاتداریتی دەوڵەت یان هەموو گەل دەکات بەسەر هۆکانی بەرهەم هێنان‌و چالاکی‌یە ئابووری‌یەکاندا. (و.ك)

– ئەو کەسانەن بانگەشەی گومان کردن دەکەن بەرامبەر بەبوون‌و دیارە باوەڕ پێکراوەکان، بەتایبەتی سەبارەت بەسەرەتا ئاینی‌یەکان.

– مەبەست لە (ژان ژاك رۆسۆ)یە.

– شاری دیترۆیت مەڵبەندی پیشەسازی ئۆتۆمبێلە دەکەوێتە باکوری میشگنەوە لەسەر رووباری دیترۆیت بەرامبەر بەوێندسەر لەئۆتاریۆ لەکەنەدا، ژمارەی دانیشتوانی (1.511.000) کەسە.

– diet لەوشەی گریکی (diaita) وە وەرگیراوەو هاتۆتە زمانی ئینگلیزی‌یەوە ئەم ووشەیە لەزمانی گریکیدا بەواتای شێوازی ژیان بەکاردێت، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەزمانی ئینگلیزی نوێدا بەواتای رێکخستنی زانستیانەی خواردن‌و خواردنەوە بەمەبەستی زیادکردن یان کەم کردنی کێش. ئەم رێجیمە لەئەمەریکا بایەخێکی تایبەتی پێدراوە بەجۆرێك سەربەخۆی وەرگرتووە بەدایتی ئەمەریکی ناوی دەرکردووە. (و.ك)

– ئەم زاراوەیە تەنها مرۆڤو شەمپانز دەگرێتەوە کەخزمایەتی‌یەکی بایۆلۆژی‌و سایکلۆژی نزیکیان لەنێواندایە ... رەرای ئەوەی لەرووی پلەکانی عەقڵدا بەسەرۆکی ئاژەڵەکانی تر دادەنرێن یاخود بە(alpha) ئاماژەیان بۆ دەکرێت واتە یەکەم یان پلەیەك یان سەرۆك. (و.ك)

– دانیشتوانی شاری دیرینی (Troy). (و.ك)

– Helen نازناوێکی مێینەیە لەووشەی (helené)ی فەرەنسی کۆنەوە ئەویش لەووشەی (helena)ی لاتینی‌و ئەویش لەووشەی (helene)ی گریگی‌یەوە وەریگرتووە. واتای (کەسێکی رۆشن) لەرەچەڵەکدا نازناوی خواوەندی رووناکی یۆنانی‌یەکان بووە. (و.ك)

– هەموو ئەو بزووتنەوانە دەگرێتەوە لەپێناو گەیشتن بەئامانجە سیاسی‌یەکانیان، پەنا دەبەنە بەر خەباتی چەکدارانە لەجیاتی شێوازە پەرلەمانی‌یە ئاشتی خوازە دیموکراتی‌یەکان. لەراستیدا بەدرێژایی مێژوو خەباتی پارتی زانەکان ناچاری بووەو رەنگدانەوەیەکو کاردانەوەیەکی سروشتی ئەو سیاسەتی توندوتیژی‌یە بووە کەرژێمە نادیموکراتی‌یەکان پیادەیان کردووە. (و.ك)

– پەیوەندی راستەوانە (correlation) ئەو پەیوەندی‌یەیە کە لەنێوان دوو دیاردەدایە، بەزیادبوون‌و کەم بوونی یەکێکیان ئەوەی تریشیان وەك ئەو زیادو کەم دەکات، واتە هەمیشە ئاراستەی جوڵەیان یەکسانە. (و.ك)

– ئەو مەیلە سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌یەیە کەهەمیشە دژ بەشێوازی سەربازیانە دەوەستێتەوە لەساتەکانی بەرێوەبردنی کێشە جیاجیاکاندا. ئەشێت بڵێین ئەم زاراوەیە مەڵبەندی ئایدیای فێمینیستە نوێکانە. (و.ك)

– ئەریستۆتل (384–322پ ز) فەیلەسوفێکی گریکی‌و قوتابی‌یەکی ئەفلاتون بووە، مامۆستای ئەلێکسەندەری گەورەو نووسەری چەندین بەرهەم بووە لەبوارەکانی لۆژیك، فەلسەفە، زانستە سروشتی‌یەکان، رەوشت، سیاسەت‌و شیعر. (و.ك)

– پێش هاتنی ئیسلام، لەقۆناغی (جاهلية)دا، ئافرەت زیندەبەچاڵ دەکرا، لەدوای هاتنی ئیسلام و پێشکەوتنی مەدەنیەت ئەم دیاردەیە زیندەبەچاڵ کرا. ئێستا مرۆڤایەتی خۆی ئامادە دەکات بچێتە ناو ساڵی (2000)وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دیاردەیە نەك هەر زیندوکراوەتەوە بەڵکو تەندروستی‌یەکی باشیشی هەیە زۆر بەتایبەتی لەکیشۆری ئاسیادا کەفاکتەری ئابووری رۆڵی هەرەسەرەکی تیایدا دەبینێت. وابزانم ئێستا گونجاوترین کاتە بپرسین:

(واذا المؤودة سؤلت بأي ذنب قتلت). (و.ك)

16– hominid هۆمەیند یاخود مەیمونی باڵا: ئەوجۆرە مەیمونە بوو کەزانایان دایانناوە بەباوباپیری مرۆڤو مرۆڤی ئێستای لێ‌پەیدابووە. لەسەدەی پێکهاتنی بایۆلۆژی سێ‌هەمدا ژیاوە. (و.ك)

# سەرمایەداریی و سەربەستی ژنان

■ میشێل بارێت

● و: ئاوات ئەحمەد

... لە ئەنجامدا، دەمەوێت بە خێرایی بگەڕێمەوە بۆ سەر ئەو گرفتە چەمکییەی کە لە برگەی یەکەمدا دروست بوو، لەگەڵ ئەو مەسەلە سیاسیانەدا کە لە سەرەتادا ئاماژەیان بۆکرا. گفتوگۆکە چ ڕۆشناییەکی خستە سەر سودی چەمکی باوکسالاریی، یاخود هەوڵدانی شیکردنەوەی ستەمی ژنان لە ناو زاراوەی بەرهەمهێنانەوەی سەرمایەدارییدا reproduction of capitalism؟. ئێمە تا چ مەودایەك پاساوی ستەمی ژنانمان وەك پرۆسێسێکی ئایدیۆلۆژیی داوەتەوە؟ شێمانەکانی بەدیهێنانی سەربەستیی ژنان لە سیستمی سەرمایەداریی چین و، بەگەڕخستنی سیاسیانەی ژنان چ پەیوەندییەکی هەیە، یان پێویستە هەبێت بە جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی سوسیالیزمەوە؟ من ئاماژەم بۆ ئەوە کرد کە هێندە بەس نیە هەوڵ بدەین خەسڵەتی ستەمی ژنان لەم سەرمایەدارییەی ئێستادا ببەینەوە بۆسەر پێداویستیی گریمانە کراوی خودی سەرمایەداریی بۆ ئەو ستەمە. پاساوی ئەمەش بەوە دراوەتەوە کە گوایە سەرمایەداریی لە توێ کاری ناوماڵەوە سیستمی بەرهەمهێنانەوەی هێزی کار دەپارێزێت، ئەمەش لە نزمترین تێچوونی شیاودا دەکەوێتە گەڕو سوپایەکی قۆرخ کراو و گونجاو لە ژنانی بەمێرد پێشکەشی کرێی نزم دەکات. هەرچەندە ئەم خاڵانە گرنگ و حاشا هەڵنەگرن لە هەر لێکدانەوەیەکدا لەمەڕ داکۆکیکردنی سەرمایەداریی لە کاری ناوماڵ، کە لەوێدا ژن و منداڵەکان لەژێر سایەی نێرێکی نانپەیداکەردا دەبن، بەڵام مشت و مڕەکە گەلێ سیمای ستەمی ژنانی بەشینەکراوەیی بەجێهێشت. لە تێڕوانینی مندا تۆمەتی ئەوەی کە

ئەو مشت ومڕە وەزیفەییە، زۆر گرنگ نیە بەقەدەر ئەو راستیەی کە رووی لە کەمکردنەوەی ستەمی ژنانە و نکولیی دەکات لەلایەنێکی تایبەتی پاشکۆیەتی ژنان بۆ پیاوان لەسەردەمی پێش سەرمایەدارییدا، لە کۆمەڵگا سوسیالیستەکاندا، لەتەك چینە جیاجیاکانی سەرمایەداریی ئێستادا.

من ئیشارەتم بۆ ئەم فۆرمە تایبەتەیماڵداریی و ئەو ئایدیۆلۆژیایەش کردووە کە لە گەڵیدایە، لەمەڕ سەربەخۆیی ژنان، وتومە ئەمە تاقە فۆرمی بەرهەمهێنانەوەی reproduction هێزی کار نیە لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییدا.

ئەوە بەرهەمی ململانێ مێژووییەکەی نێوان ژنان و پیاوانە، هەردوولا لە چینی کرێکارانیش و بۆرژواشدا. لەوەش زیاتر، تێزی بەرهەمهێنانەوە دەتوانێت بە رێگایەکی زۆر میکانیکییانە بایەخ بدات بە ئاڵۆسکاویی ئایدیۆلۆژیای بونیاتنانی رەگەز gender، بەو شێوەیەی کە لە سەرمایەدارییدا گەشەی کردووە. بایەخدان بە پانتاییەکانی سێکس و نوێنەرایەتیکردنێکی کەلتورییانەی رەگەز پێویستی بە تێگەیشتنی توانای ئایدیۆلۆژیا هەیە لەبەر هەمهێنان و بەرهەمهێنانەوەی چەشنەکانی نێرایەتی و مێیایەتی، کە شیکردنەوەکە پشتی پێ دەبەستێت، بەڵام بەبێ ئەوەی کەشفی بکات.

پێویست ناکات هەموو ئەم مشت و مڕانە بەیەکەوە بخرێنەگەڕ، بەڵام پێویستە بەپێی مێژوو ریزبەندبکرێن. لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییدا یەك دانە مۆدێل بۆ سەربەخۆیی ژنان کراوە بە سەنگەر لە رووی دابەشکردنی کارەوە بەپێی کرێ، هەروەها لەنێوانی کاری کرێگرتەو کاری ناوماڵیشدا. بەمجۆرە ستەمێکی وەها لە ژنان کراوە کە لە لۆژیکی گەشەکردنی سەرمایەدارییدا، لە هیچ حاڵەتێکی جەوهەرییدا باسی لێوەنەکراوە. کە بووە بە شتێکی پێویست بۆ بەردەوامییدان بە بەرهەمهێنانەوەی شێوازی بەرهەمهێنان لەم فۆرمەی ئێستایدا. لێرەوە ستەمی ژنان لەگەڵ ئەوەدا کە داواکارییەکی وەزیفییانەی سەرمایەداریی نیە، چەند بنەمایەکی مادیی پەیداکردووە لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و بەرهەمهێنانەوەی ئەمڕۆی سەرمایەدارییدا.

دوای ئەمەش، هەرچەندە کە رەهەندە گرنگەکانی ستەمی ژنان بەپێی سەرچاوەکانی شێوازەکانی مارکسیزم پێوانە ناکرێت، هەر بەهەمان شێوەش مەحاڵە سەربەخۆییەکی شیکارییانە بۆ سستمێکی ستەملێکردن لە وێنەی ئەوەی کە باوکسالاریی پێشنیاریی دەکات، دابمەزرێنرێت. سەدای ئەم چەمکە لە ناسینەوەی کاراکتەرە پاش - مێژووییەکانی ستەمی ژناندایە، بەڵام ئەم هانا درێژخایەنە بێبەشمان دەکات لەوەی تێگەیشتنێکی چاکمان هەبێت بەرامبەر گۆڕانە مێژووییەکەی.

چەند بەسوود دەبێت گەر سوتاندنی بێوەژن لە هیندستان و گۆشەگیریی زۆرەملێی ئەوروپای خۆرئاوا هەردوکیان پێکەوە لەناو بچن. ئەوەی پێویستە شیکاری بکەین ئەوەیە بە وردی ئەو میکانیزمانە شی بکەینەوە کە بەهۆیانەوە ستەمی ژنان لەچەندەها هەلۆیستی جیاجیادا زامن کراوە، چونکە تەنها لەوێوە دەتوانین رووبەرووی گۆڕینی ببینەوە.

هەندێك لەو فیمینستانەی کە چەمکی باوکسالاریی تەوزیف دەکەن، چەمکەکە دەبەنەوە بۆ سەر جیاوازییە بایۆلۆژییەکانی نێوان هەردوو رەگەز و، هەندێکی تریشیان فرێی دەدەنە ناو ئەو بونیادە بەهێزو حاشاهەڵنەگرانەوە کە لێوەی دەکەونەوە، هەندێك نوسەر لەبارەی چاوگی مێژوویی باوکسالاریی پرسیاریان کردووە، هەر لەم

بارەیەشەوە پرسیارێك دێتە گۆڕێ كە ئایا ئەو چاوگانە بایۆلۆژیین یان نا. هیچ كەسێك نكولیی لەوە ناكات كە جیاوازیی فسیولۆژیی لەنێوانی نێرو مێدا هەیە، بەڵام ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە چۆن ئەم جیاوازییە سروشتیانە وەك دابەشكردنێك لە كۆمەڵگای مرۆییدا بەكارهێنراون.

ئەو رەچەڵەك پەرستانەی هەوڵیان داوە بیانووی زانستیی بدۆزنەوە بۆ ستەمی رەشپێستەكان، توشی ئەو بێزراندنە بوون كە شایستەی بوون، هەروەها پێویستە بە هەمان رادەش ترسمان هەبێت لە بەهانەی جیاوازیی رەگەزیی، بە وانەشەوە كە هەندێك لە فیمنیستەكان هەوڵی بوژاندنەوەی دەدەن. نرخاندنی ئەو پرنسیپە مێیانەیە لەوەدایە كە دەڵێت پێویستە بەكارهێنانی بایۆلۆژییانەی باوكسالاریی لە هەموو ئاستێكدا رەت بكرێتەوە.

هەرچۆنێك بێت من نامەوێت دانوساندن لەسەرئەوە بكەم كە دەبێت چەمكی باوكسالاری وەلابنرێت، حەزدەكەم بهێڵرێتەوە و بەكاربهێنرێت لەو شوێنەدا كە باڵا دەستی نێرینە لە توێی دەستەڵاتی باوكەوە بەسەر ژنان و لاواندا پیادە دەكرێت.

هەندێك لە كۆمەڵگاكان بە راشكاوی لە دەوروبەری ئەم چەمكە بەرێوەدەچن، ئەگەرچی كۆمەڵگای سەرمایەداریش نین. لەوەش دوورتر بەپێی ئەوەی فیمنیزم لەگەڵ شیكردنەوەی دەروندا سازابێت، هەوڵی داوە ئەم پرنسیپە وەك بونیادێكی سایكۆ – دینامیكی لە قالب بدات لەناو بینای ئێستای رەگەزدا، من لەو ئەنجامانەی ئەوان جودا بوومەتەوە. سەرباری هەمووشتێك هێشتا توخمی وەها لە گۆڕێ ماوە كە دەشێت پێیان بگوترێت دەستەڵاتی باوكسالاری و بە سانایش دەستنیشان دەكرێن، بۆ نموونە هەندێ سیمای ئایدیۆلۆژیای فاشیزم لەگەڵ پەیوەندییەكانی خێزانی بۆرژوازیی سەدەی نۆزدەدا. لێرەوە من داوادەكەم چەمكی باوكسالاریی نرخی خۆی بدرێتێ زیاد لەوەی فراوان بكرێتەوە تاكو هەموو ئەو باڵادەستیانەی نێر بگرێتەوە و لەوەشەوە بگەرێت بۆ لێكدانەوەیەكی وردی زاراوەكە وەك میتۆدێكی سیستماتیكی راڤەكراو.

گفتوگۆی ناو ئەم كتێبە جەختی لەسەر گرنگیی ئایدیۆلۆژیا كردووە لە بیناكردن و بەرهەمهێنانەوەی ستەمی ژناندا. رێكخراوێكی تایبەت بەماڵداریی و ئایدیۆلۆژیای خێزانیی بریتین لە رەهەندە مەركەزییەكانی ستەمی ژنان لە سەرمایەدارییدا، هەروەها بە تەنیا لە توێی شیكرنەوەی ئایدیۆلۆژیاوە دەتوانین ئەفسانەی چەوسێنەر لە سروشتە ئیدیاڵەكەیدا بدۆزینەوە "واتە خێزان، كە دەبێ هەموو ژنان خۆیان لە ناویدا وێنا بكەن. تەنیا لە رێی شیكردنەوەی ئایدیۆلۆژیاو دەوری ئەو لە بیناكردنی خودییەتی رەگەزدا، دەتوانین ئارەزووی ژنان هەروەكو پیاوان پێوانە بكەین بۆ بەرهەمهێنانەوەی بونیادە زۆر خێزانییەكان، كە ئێمە بەهۆی ئەوەوە ستەممان لێكراوە. دانوساندن كردن لەسەر ئەمە بۆ ئەوەنیە پێشنیاری پێویستی هۆگریی و پەیوەندیی سێكسی و لەباری هەست و سۆز هەروەها ئارەزووی دایك و باوكایەتی و شتی تریش خۆیان لە خۆیاندا ستەمكارین.

ستەمكاریی ئەوەیە بڵێین كە ئەم قاڵبەی ئێستای پێویستیەكان تاقە قاڵبێكی شیاوە، یان شێوازی بەیەك گەیشتن هەر لە توێی خێزانەوەیە، وەكو چۆن ئێستا وایە. دەتوانین شتێك بزانین دەربارەی فۆرمی پێداویستیە تایبەتیەكانی رابوردوو، لەوەش كەمتر دەربارەی ئەوەی دەبێ ئەو فۆرمە لە ئایندەدا چۆن دەبێت. ئەوەی فیمنیزم پێویستی پێیەتی بۆئەوەی بگات بە ژمارەیەكی زیاتری گرۆی ژنان، ئەوەیە خێرا بكات و سۆزی زیاتر بێت، نەك تەنیا ئەوەندەی

بالادەست بوون لەلای ئەوان چ مانایەکی بۆ دارێژراوە، بەڵکو چۆن یا بۆچی ژنان بە هۆشیارییەو یان ناهوشیارییەوە باوەشیان پێداکردووەو ئارەزوویان کردووە. ئەم پێداویستیە بریتی نیە لە ئەنجامی پیلانێك یان فریودانێك، بەڵکو شیکردنەوەیەکی قووڵتری خودێتی و ناسنامەیە، کە دەمانخاتە بەردەمی ئەرکی لە ئەستۆگرتنی لەو شوێنەوە کە فیمنیستە دێرینەکانی لەوێنەی سیمۆن دی بۆڤوار لێوەی دەستیان پێ کردووە.

ئەگەر گرنگێتی ئایدیۆلۆژیامان قبووڵ کرد لە ستەمی ژناندا، ئەوا پرسیارێك سەرهەڵدەدات: ئایا ئەو ستەمە تەنیا لەسەر ئاستێکی ئایدیۆلۆژیی جێگادەکرێت؟ هەندێك لە فیمنیستەکان و زۆربەی سوسیالیستەکان گەیشتوونەتە ئەم ئەنجامەو من هەوڵم داوە لەوان جیاوازبم. دانوساندن لەسەرئەوەی ستەمی ژنان تەنیا لەناو پرۆسێسی ئایدیۆلۆژیدا گیر دەبێت، بەرەو یەك یان دوو ئەڵتەرناتیڤی گریمانە کراومان دەبات. چ ئەگەر پێویست بکات بڵێی ئایدیۆلۆژیا بە تەواویی سەربەخۆیە لە پەیوەندییە ئابوورییەکانی سەرمایەداریی، لە مەیاندا بیانووەکە رەونەقی هەیە بەڵام دروست نیە کە ئایدیۆلۆژیای لەبەریەك هەڵوەشاوی سێکس بتوانێت سەربەخۆ لەو پەیوەندیانە بەرەنگاری بکات. یاخود بڵێین کە ئایدیۆلۆژیا هەمیشە لەناوپەیوەندییە ماتریاڵییەکاندا رەگی داکوتاوە، بەڵام ئایدیۆلۆژیای سێکسی لەناو پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان ژنان و پیاواندا رەگی داکوتاوە و سەربەخۆ لە سەرمایەداریی بوونیهەیە. تێڕوانینی یەکەمیان ئایدیالیستانەیەو بەتەواویی ئایدیۆلۆژیا لە مەرجە ماتریاڵییەکان تەلاق دەدات، دووەمیان ماتریالیستانەیە، بەڵام چەندەها شێوازی جیاجیای ماتریالیزم دەگرێتەوە لەوانەی مارکسیزم دیاریی کردوون.


سیمۆن دی بۆڤوار

(شێمانەیەکی سێهەمیش هەیە سەبارەت بەوەی ئایدیۆلۆژیای سێکس بە زەرورەت لەلایەنی پەیوەندییە ماتریاڵییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییەوە دیاریکراوە، کە من پێم وایە ئەمە بۆچوونێکە ناتوانرێت داکۆکیی لێبکرێت و، لە چەند هەڵوەستەیەکدا قسەم لەسەری کردووە).

رەنگە بشێت بەبێ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ شیکارە شکستەکانی "ئەناتۆمیای پەتی" یاخود بۆ فۆرمێکی ماتریالیزم کە ناکۆکیی نێوان کارو سەرمایە لە سەنتەری شیکارکردنی کۆمەڵگای سەرمایەداریی دووردەخاتەوە، بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو دوانە چارەسەریگرفتە کە بکەین. سەرەتا دەتوانین سەرنج بدەین کە ئایدیۆلۆژیای رەگەز - بە مانای نێرایەتی و مێیایەتی - لە رووی مێژووییەوە زۆر گۆڕاوەو نابێ بەشێوەیەکی سەقامگیر یان وەك یەکەیەك مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، بەڵکو پێویستە لە چەندان جیاوازیی مێژوویی و هەڵوێستی چینەکان لە بارەیەوە، تاقی بکەینەوە، پاشان دەتوانین

سەرنج بدەین کە لە سەرمایەداریی ئەمڕۆدا مانای ڕەگەز بەستراوەتەوە بە بونیادی ماڵداریی و دابەشکردنی کارەوە کە جێگایەکی تایبەت دەگرێت لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا، لەبەرئەمەشە کە ئەم ئایدیۆلۆژیایە هەندێ بناغەی ماتریاڵیی مێژوویی و پتەوی هەیە.

سێیەم دەتوانین نارەحەتی باری مۆدێلە ئابوریی و ئایدیۆلۆژییەکان بناسینەوە کە چەند گەمارۆ دراوو ئاشکرایە. پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوە لەمڕۆی سەرمایەدارییدا بە گشتی بەپێی پرۆسێسێکی کەڵەکە بوونی سەرمایە بەڕێوە دەچێت، کە بەشێوەیەکی تەکنیکی بریتیە لە "ساردیی سێکسی sex blind" ، بەڵام فۆرمی دابەشکرنی کار لەوێوە وەردەگرێت کە ئایدیۆلۆژیا بە قووڵی ڕەگی داکوتاوە.

بۆیە دەمەوێ بڵێم، ئایدیۆلۆژیا کایەیەکی زۆر گرنگە بۆ بیناکردن و بەرهەمهێنانەوەی ستەمی ژنان، بەڵام دژی ئەو پێشنیارە دەوەستمەوە کە دەڵێت ئەم ئاستەی ئایدیۆلۆژیا بۆی هەیە لە پەیوەندییە ئابوورییەکان داببڕدرێت. حەزدەکەم لێرەدا کەمێك دوور بکەومەوە لە هەڵوێستی فیمینستەکان لەمەڕ میتۆدە پاش - ئالتۆسێرییەکان، کە دەیانەوێت هەموو سیماکانی ستەمی ژنان لەناو زاراوەکانی یەك تاقە بیردۆزەی گوتارەکەدا کۆبکەنەوە. ئەگەرچی من وێنەیەکی مشت و ماڵ کراوی هەندێك لەو ئایدیایانەم کێشاوە بۆ شیکردنەوەی پێناسەی گۆڕاوی "خێزان"، بەڵام ئامادەنیم بۆ دانوساندن کردن لەسەر ئەوەی پیاوان و ژنان خۆیان نوێنەری نموونەی لێك هەڵوەشاوی وەهابن کە تیایاندا جیاوازییەکان بەرهەم بێت. نێرایەتی و مێیایەتی بەبێ شك دوو مانای یەك هۆشن، بەڵام لە دابەشکردنی کارو بونیادی چینایەتیدا جێگای خۆیان دەگرن، کەهەرچەندە پێش - دراوین بەڵام لە ڕووی مێژووییەوە تۆکمەو ناسراون. ئەو بانگەشە گشتییەی کە دەڵێت دەبێ تەنیا لەسەر ئاستی بەرهەمهێنانی ئایدیۆلۆژیی بۆ ستەمی ژنان بگەڕێین، شتێکە بە ناهەق شیکردنەوەکانمان کۆت دەکات، یاخود لە سەر فراوانبوونەوەیەکی چاوەڕوان نەکراوی پێناسەی بواری ئایدیۆلۆژیا رادەوەستێت.

ئەم دانوساندنانە هەموویان لە دەوری پرسیاری شیکردنەوەی مێژوویی دەخولێنەوە. گرفتێکی سەرەکیی لە پێشکەوتنی کاری فیمینیستە مارکسییەکاندا، بە ئاڕاستەی هەوڵدان بۆ وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێك ڕۆیشتووە، لە نموونەی سەربەخۆیی ستەمی ژنان لە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییدا، یاخود پلەی چەوساندنەوەی ژنان تاکو وەك ستەمی ئایدیۆلۆژیی بۆی بڕوانرێت، ئەمەش بەوەی بخرێتە ناو بۆچوونی تیۆریی وەهاوە کە فۆرمەلەیەکی دروستی وەها پێك بهێنێت کە بتوانێت وەڵامێك بداتەوە. هەرچۆنێك بێت، پێناچێت کە فۆرمەلەیەکی لەو چەشنە ماتریاڵیی بێت، چونکە پرسیارەکان خۆیان زیاتر مێژوویین وەك ئەوەی بەتەواویی تیۆریی بن.

یەکێك لە ڕێگاکانی نیگارکردنی ئەم خاڵە بریتیە لە خستنە رووی ئەم پرسیارە: ئایا سەرمایەداریی پێشخەری ژنان بووە یان نا؟ فیمینستەکان و مارکسیستەکان هەوڵیان داوە لەڕێی پرۆسەی دەرەنجامکردنی تیۆرییەوە وەلامی ئەم پرسیارە بدەنەوە، هەردوولاشیان لێك نزیك بوونەتەوە بەلام وەلامەکان زۆر جیاوازن. ئەگەر پرسیارەکە لە رووی مێژووییەوە بەرزبکەینەوە، مەسەلەکە روونتر دەبێتەوە. لەسەردەمی فیودالدا ماڵداریی لەنێوان ژن و پیاودا بە هیچ جۆرێك یەکسان نەبووە. بەلام پەرەسەندنی سەرمایەداریی ئەم دابەشکردنەی لەرزاند، لە مەسەلەی ماڵدارییدا سەربەخۆییەکی


مارکس

زیاتری بۆ ژنان بەدیهێنا، هەروەهاش سیستمی کاریی کرێگرتەی داهێناو لەوێدا پەیوەندیی ژنان بە بونیادی چینەوە تارادەیەک باشتر بوو، سەربەخۆییەکی لاوەکی یان راستەقینەیان بەدەست هێنا لەچاو کاری نێرینەکاندا. هەرچۆنێک بێت ئەم پێشکەوتنانە بەشێوەیەکی پەرتیی Partly دەدرێنە پاڵ هێزەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی و هەرواش خەباتی چینی کرێکارانیش پەرچ دەکاتەوە.

جارێکیان گرفتەکە ئاوا خرایە روو، روون بۆتەوە کە وەڵامێکی بەرنامەرێژکراو بۆ ئەم پرسیارە لە گۆڕێ نیە: ئایا سەربەستی ژنان لە سەرمایەدارییدا ئەنجام دراوە؟ هەرچۆنێک بێت دەتوانین بگەینە چەند ئەنجامێک، سەرەتا سەربەستی ژنان داوای سەرلەنوێ دابەشکرنەوەی کارو لێپرسراوێتی بەخێوکردن دەکات، چ هەرەوەزیی بێت یاخود تایبەت، هەروەها بە تەوزیمیش لەنێوانی پیاوان و ژناندا دەبێت. پاشان سەربەستی راستەقینە یان گریمانەکراوی ژنان بەپێی کرێی نێر (یاخود سەرمایە) دەبێ بەبێ ئەو ئەنجام بدرێت. سێیەم پێویست دەکات ئایدیۆلۆژیای سێکسی بگۆڕدرێت. پێم وایە هیچ یەکێك لەمانە بۆ سەرمایەداریی گونجاو نیە، نە لە بەریتانیا و نە لە هیچ کۆمەڵگایەکی بەراوردکاری دیکەی حاڵی حازردا. ئەم جیاوازییە قووڵ و بەرفراوانەی لە کاردا هەیە، دابەش کردنی کۆمەڵایەتیانەی کار دیاریی دەکات. بە کارخستنی پیاوان لە سایەی ئەو گریمانەیەداچەسپاوە کە کاری ناوماڵ و منداڵ بەخێوکردن بەلایانەوە گرنگ نیە، ئەمەش لە هەموو چینەکاندا دروستە. تەدارەکی دەوڵەت ئەگەرچی زۆر تۆکمەش بێت، حاڵی حازر بە قورسی خەریکی پاراستنی پیاوانی نانپەیداکەرو مانەوەی کاری ناوماڵە وەکو خۆی. ئایدیۆلۆژیای رەگەز و سێکسایەتی زۆر بە قووڵیی لە هۆشماندا چەسپیوە.

ئەم دابەشکردنە زۆر بەرنامەرێژانە لە بونیادی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی سەرمایەداریی بەریتانیادا رەگی داکوتاوە، هەروەها دەورێکی گرنگیشیان هەیە لە سەقامگیریی سیاسی و ئایدیۆلۆژیی ئەو وڵاتەدا. ئەوانە لەپاڵ هەژمونی سیاسی و کەلتوریی سەرمایەدارییدا پێکهێنەرە بابەتیەکانی ئێمەن. ئاوێتەی پەیوەندییە بنەڕەتیەکانی سیستمی کاری کرێگرتەو دامەزراوی ماڵداریی دەبن و مەحاڵە ئەندێشەی ئەوە بکەین کە رەنگە لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی سەرمایەداریی دابڕدرێن بەبێ ئەوەی وەرچەرخانێکی گەورەیان تێدا رووبدات. لێرەدا دروشمی بەبێ سوسیالیزم ئافرەتان سەربەست نابن، بەبێ سەربەستی ژنان، سوسیالیزم نایەتە گۆڕێ، لەوە زیاتر هەڵدەگرێت کە تەنیا هیوایەکی خۆش بێت. ئەگەرچی هەردوو بەشەکەی ئەم دروشمە بە وردی داوای پێوەست بوون دەکەن بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەسەلانە هەردووکیشیان ئاماژە دەکەن بۆ واقعیەتی بارودۆخی خەباتی ئێستامان.

لە هەمان کاتیشدا پێویستە جەخت لەوە بکرێت کە مەرجی کاریگەریی پێشخستنی پایەی ژنان لەپاڵ گۆڕانکارییەکانی سەرمایەدارێتیدا، ئەگەر ئەرکی سەر ئەستۆی ژنان لەمەڕ کاری ناوماڵ سوك بکرێت لەوکاتەدا کە وەزیفەی ژنان لە پەرەسەندنی سەرمایەدارێتیدا زیاد دەکات. شتێکی مەحاڵ نیە کە سەرمایە وریابێتەوە بەرامبەری ئەو "بەفیڕۆدانی بەهرە" یەی کە لە سیستمی رۆشنبیریی ئەمڕۆدا هەیەو، هەوڵ بدات رەوتی کچان راست بکاتەوە لەناو بابەتە سودمەندەکانی تەکنەلۆژیادا. رەنگە لە تەکنەلۆژیای نوێدا بارێکی وەها بخولقێت کە کاری ناوماڵ و کاری گرێگرتە لەناو بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا کەمتر بەریەك بکەون، بارێکی وەها بخولقێت کە منداڵ بەخێوکردن بەشێوەیەکی یەکسانتر دابەشبکرێت. پێشکەوتنی وەها شتێکی شیاوە، ئەگەرچی بەنابەدڵیش بۆی بڕوانین، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا بارەکە هاوشێوەی کۆمەڵگا سوسیالیستیەکان دەبێت، کە لەوێدا بۆ نموونە، سیاسەتی لەباربردن و سك پڕنەبوون بەپێی پێداویستی کار رێکخراوە.

نکولیی کردن لە بەرەوپێش چوون و ریفۆرم لە سایەی سەرمایەدارێتیدا، هەڵوێستێکی گەمژانەو مەزهەب گیرە. ژنانی بۆرژواش تووشی گۆڕانکارییەکی دراماتیکی بوون لەمەڕ مافە مەدەنیەکانیان - بۆ موڵکایەتی تایبەت، بۆ دەنگدان گەیشتن بە ئۆفیسی کار و پسپۆڕیی. ئەم گۆڕانکارییە ریشەییانە، سەرلەنوێ ئەو ئایدیۆلۆژیاو سیاسەتەیان بیناکردەوە کە پێشتر حاڵەتی ناسازیان بۆ ژنان دروست کردبوو. لەوانەیە زۆر روون و ئاشکرا نەبێت کە بزانین چ گۆڕانکارییەکی بەسەر ژیانی چینی کرێکاردا هێناوە. کاری دوو شەفتیی ناوماڵ و کرێی نزمی دەرەوەش بەرێژەی جیاجیا بوونەتە هۆی کەڵەکەبوونی ئابوریی سەرمایەداریی، پێدەچێت ئەم داتەپینی ئابوورییەی ئێستاش ببێتە هۆی نزمتر کردنەوەی ئاستی گشتیی ژیانی ئافرەتان و پاڵ بە ژمارەیەکی زۆری ژنانەوە بنێت کە لە پێناوی بەرزکردنەوەی مەسرەفی ماڵدا هەندێك کاری پڕ لە رەتاندن بکەن. ئەمانە لەناخەوە پرۆژە سیاسییەکەی فیمینیزمی سوسیالیستیان لەرزاند. ئێمەی سوسیالیست، نەوە دوای نەوە دژی بۆرژواو ریفۆرمەکانی وەستاینەوە. خوشکەکانمان تاوانباریان کردین بە خیانەتکردن لە فیمینیزم، لەبەر قایلبوونمان بە خەباتی سێکسییانەی چینی نێران. رەنگە هەردوولا زمان پاراو و رەوانبێژ بووبین، بەڵام هێشتا پرسیارەکان بریتین لە: ئایا بزوتنەوەی سەربەستیی ژنان بنەماکانی چینی ناوەڕاستی هەیە؟ ئایا فۆرمەکانی خەباتی چینایەتی نوێنەرایەتی ئامانجەکانی فیمنیزم دەکەن؟ ئەوانەی دەڵێن بزوتنەوەی ژنان بزوتنەوەی چینی ناوەندە، بزوتنەوەکە بێبەش دەکات لە دانپیانانێکی دادپەروەرانە لەمەڕ ئەو دەسکەوتە دەگمەنانەی کەلە بابەتە میللییەکاندا بەدەستی هێناوەو سنوری چینەکانیشی بەزاندووە. ئەم بزوتنەوەیە بە هیچ جۆرێك نابەسترێتەوە بە ژنانی یەك چینەوە. رەنگە دابەشبوونی چینایەتی گرفتی وای لێ بکەوێتەوە کە پێویست بکات لە ناوەوە ئیشیان تێدا بکرێت، چەمکی خوشکایەتیی واقعییەتێکی سیاسییانەی هەیە لەناو بزوتنەوەکەدا. بەشێوەیەکی دروستر، گومانی تێدانیە - بەتایبەتی لە ساڵانی سەرەتای بزوتنەوەکەدا. کە خەباتی سیاسییانەی فیمینیزم بەشێوەیەکی زۆر نەگونجاو بەسترابوو بە کۆمەڵێك ژنی رۆشنبیرەوە، زۆربەیان خاوەنی بڕوانامەی زانکۆ بوون.

ئەگەرچی رۆشنبیریی لەنێوانی چینەکاندا دابەشکراوە، بەڵام بەتەواویی بۆئەو نەدەگونجا.

لەناو جوولانەوەکەدا ئەم گرفتە بەبێ تێبینی کردن نەمایەوە، بەتایبەتی لە بەریتانیادا. ئەمە پرسیارەکەی خستۆتە ئەم حاڵەتەوە: چۆن وا لە فیمینیزم بکەین کە پەیوەندییەکی تۆکمەی هەبێت بە هەموو ژنانەوە، بە جیاوازیی ئاست و ئەزموونیانەوە. مانای ئەمەش ئەوەیە کە بەبێ لەدەست دانی توانای ئۆرگانیمان لەمەڕ سیاسەتی سێکس، پێویستە هەرچەندێك بتوانین لە مەسەلەکانی بارو سەعاتی کارو کرێ و ئاسایشی ژناندا خەبات بکەین.

ئەمانە ئەو ناوچانەن کە بزوتنەوەی کاریگەریی لە رابوردودا پشت گوێی خستبوون، دەبێ لەوە دڵنیا ببین کە ژنان خەباتیان کردووە بۆ هێنانەدیی مەبەستەکانی فیمینیزم.

کەواتە پێویستە لە پەیوەندیی نێوان سەربەستی ژنان و چەپ چی هەڵ بهێنجین؟ بزوتنەوەیەکی سیاسی ئۆتۆنۆم لەمەڕ سەربەستی ژنان داوای پاساودانێکی ئامادەکراو ناکات، هەربۆیە بەڕاستی گریمانەی ئەوەمان کردووە کە ژنان بە سەربەخۆیی لە پیاوان بەڕێوەبچن، ئەگەرچی نێرە لە خۆبووردووەکان داکۆکیشمان لێبکەن.

ئەو پرۆسیسە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەی کە بەشدارە لە ستەمی ژناندا، دەبێ خۆیان دژی بجەنگن، هەروەها پاساوێکیش هەیە بۆ ئەو تێڕوانینەی کە دەڵێت سوسیالیزم بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی سەربەستی ژنانیش لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. سەرەڕای ئەوەش، جەنگی نێوان بزوتنەوەی بازرگانیی – بۆ نمونە، لەمەڕ کرێی یەکسان و رۆژی کاری کورت تر، لە دژی داوای پیاوان بۆ کرێی خێزان و هەفتەی کاری کورت تر – دەبێ فیمنیستە بەهێزەکان بۆی بجەنگن و ئامادەییان هەبێت لە جولانەوەی ئۆتۆنۆم بوونی ژناندا.

هەرچۆنێك بێت، چەند مەسەلەیەکی سیاسی بنچینەیی هەن، کە نەك تەنیا بەرەو هەبوونی فیمینزمێکی چەپی پتەو ئاڕاستەمان دەکەن، بەڵکو بەرەو هاوپەیمانیەکیشمان دەبەن لەنێوانی ژنان و چەپڕەوەکاندا. بێشك ئەمە مانای ئەوە نیە کە بزوتنەوەی ژنان ئاوێتەی چەپ ببێت، یاخود ئەرکی سەرشانی بریتی بێت لە رادیکاڵ کردنەوەو تازەکردنەوەی بونیادێك کە هەرەسی هێناوە.

لێرەدا رێ بەخۆم دەدەم رەخنە بگرم لە تێڕوانینی نوسەرانی "لە پشتی وێرانەکانەوە"، چونکە پێدەچێت رەگ و ریشەی سەربەستیی لە بزوتنەوەی ژناندا، وەکو مۆدیلێك بۆ دام و دەزگای سوسیالیزمی نوێ رەچاو بکرێت. پرسیارە گرنگەکانی لەمەڕ رێکخراو ئەمانەن: من قازانجێك لەو هاوپەیمانیانەدا نابینم کە هەرلایەکیان لەویترەوە وەفێر ببێت. پرسیاری زۆر زەرور لێرەدا ئەوەیە کامانەن ئەو بابەتە سیاسیانەی کە دەشێ بنەمای ئەو پەیوەندییانە پێك بهێنن!.

بە بڕوای من حاڵی حازر چەند پانتاییەکی سەرەکیی هەیە بۆ جەخت کردن لە جیاوازییە سیاسییەکان و ململانێ سەختەکانیان. نمونەیەکی دڕکاوی و حاشاهەڵنەگریش بۆئەمە بریتیە لە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی بایۆلۆژییانە. وەکو سوهێمیلوێت Soe Hemmelweit ئاماژەی بۆ کردووە. بە دڵنیایی هەندێ کێشە هەیە لەنێوانی فیمینیزم و سوسیالیزمدا، فیمینیزم سوورە لەسەرئەوەی هەموو ژنێك مافی ئەوەی هەبێت کەی و چۆن منداڵی ببێت، سوسیالیزمیش باس لەوە دەکات دەوڵەت منداڵان بەخێو بکات. ناتوانین خۆمان لەم چەشنە گرفتانە لابدەین. گەلێ چارەسەر هەیە کە دەشێ بنەمای یەکێتیەکی زیاتر

پێشکەش بکەن، یەکێك لەوانە بۆ نموونە پرسیاری کرێی ژنان و حاڵەتی کارکردنی ژنانە.

وەکو لە برگەی پێنجەمدا پێشنیارم کرد، جاران بزوتنەوەی کارگەریی نکولیی لەوە دەکرد کە ژنانی کارگەر وەك پیاوانی ناکارامە بناسرێن، بۆیە کرێی نزمی ژنان و کاری ناسەقامگیری ئەوان لەسەرمایەدارییدا بەکاردەهات بۆ دابین کردنی کاری هەرزان و هێشتنەوەی کرێ لە ئاستێکی نزمدا. ئەمەش ماوەی نێوان ژنان و پیاوانی بەرینتر دەکردەوە لەناو چینی کارگەراندا. ئەرکی سەرشانی فیمینزم و چەپەکانە دژی ئەم گریمانانە بوەستنەوەو ستراتیژێکی دیکە بخەنە روو. ستراتیژێك کە لەسەر بنەماکانی فیمنیزم و سوسیالیزم بیناکرابێت.

گەلێ هۆکاری تریش هەن کە بەرەو هاوپەیمانێتیمان دەبەن. فیمینیزم بە سادەیی داوای گۆڕانی ژنان یان پیاوان یان هەردوکیان ناکات، وەك لەوەی کە ئێستا بوونیان هەیە، بەڵکو داوای گۆڕانی پەیوەندییەکانی نێوانیان دەکات. دیارە بنەماکانی ئەمە لەلایەنی جوڵانەوەیەکی ئۆتۆنۆمی لەمەڕ سەربەستی ژنانەوە پێشکەش دەکرێت، پێویستە ستراتیژەکەی زیاتر لەتەك هاوکاریی پیاواندا بێت لەوەی سیاسەتێك بێت بۆ جوداکردنەوەیەکی پەتی. پیاوانی سوسیالیستیش وەك پیاوانی دیکە، بەهۆی سەربەستیی ژنانەوە هەندێ توانای سیاسیی و ئیمتیازی کۆمەڵایەتی لەدەست دەدەن، بەڵام ئەوان زیاد لە پیاوانی تر سەرنجی سیاسییان پێشکەش کردووە بۆ پاراستنی خەباتی فیمنیزم. ئەمە پرسیاری لوتف و چاکەکاریی نیە. بەوەی کە ستەمی ژنان لە بونیادی سەرمایەدارییدا سەنگەرێکە، بۆیە خەبات بۆ سەربەستی ژنان و خەباتی سوسیالیزم و بەتەواوی لێك دانابڕێن. چۆن ناتوانین تەسەوری سەربەستی ژنان بکەین لەژێر سایەی ستەمی سەرمایەدارییدا، هەرواش ناتوانین تەسەوری سوسیالیزم بکەین کە پرنسیپەکانی ئەو بریتین لە یەکسانی، سەربەستی و شکۆداریی، ئەگەر جەورو ستەمی سێکسی پوچەڵیان بکاتەوە.

NOTES

1. Sheila Rowbotham, Lynne Segal and Hilary Wainwright, Beyond the rugauents Feminism and the Making of Socialism, Landan 1980.
2. Sue Himmelwett, “Abortion: Individul Choice and Social Control, Feminist” Review, no.5, 1980.

# بازرگانی کردن بە ژنان

## چەند تێبینییەك دەربارەی ئابووریی رامیاریی زایەند (SEX)

■ گەیل رۆبن

● و: فوئاد تاهیر سادق

نووسین دەربارەی ژنـان – لەلایـەن یەکسانی خوازانـی نـێرو مـێ و دژانـی ئـەو یەکسانییە – رامـانێکی درێـژو قووڵـە لـە کێشـەی سروشـت و دروست بوونی چەوسـاندنەوە و مـل کـەچ کردنـی ژن. کێشـەکە تـرۆ و بێکـەڵك نیـیـە، چونکـە وەڵامـی پرسـیارەکانی بینایـیمـان دەربـارەی ئـایندە دیـاری دەکـات.. هـەروەها ئایـا هەڵسەنگاندنمان داکەوتی REALISTIC دەبێت و هیوای "کۆمەڵێکی زایەند – یەکسان" دەکـەین یـان نـا. لـە ئـەوەش گرنگـتر، شـیکاری کردنـی هۆیـەکانی چەوسـاندنەوەی ژنـان سـەرەتای هـەر خەملاندنێکـە دەربـارەی چـی بگۆڕدرێـت بـۆ گەیشتنە کۆمەڵێکی بێ دەسەلات و زاڵیـی زایـەند (نێر بێت یان مێ).

کەواتە، ئەگەر زاڵی و ستەمی نێر بنچینـەی چەوسـاندنەوەی مـێ بێـت، بەرنامـەی یەکسـانی خوازیی نێر و مێ نەهێشـتنی ستەمکاریی زایـەند یـان هیـچ نـەبێت چاککردنی رەفتـاری دەوێـت. ئەگەر زایەندێتی SEXISM لابەرهەمێکی (by-product) چڵێسی و بـێ بـەزەیی سـەرمایەداری بێت بۆ قازانج، سەرکەوتنی شۆڕشی هاوبەشێتی نایهێڵێت. ئەگەر بەزینی ژن لە مێژوودا بەدەستی هەڵمەتی چەکدارانـەی پیـاوەوە بووبێـت، کەواتـە کاتی ئەوە هاتووە کە (گەریللایانی ئەمـەزۆن) لـە (ئادیرۆنداکس) دەست بە مەشق بکەن.

دەکەوێتە دەری بواری ئەم وتـارە پشـتیوانی هـەندێ لێکدانـەوەی بـاو دەربـارەی پێکـهاتنی نایەکسـانی زایـەندی بنووسـرێت –بـیردۆزی وەك پێگەیشتنی ساکار بە نموونەهێنانەوە بە "ئاژەڵی

زۆردار" (The Impeaial Animal)، لابردنی پێش مێژووی دایك سالاری، یان هەوڵی وەرگرتنی دیاردەکانی مل کەچ کردنی کۆمەڵایەتی باسکراو لە یەکەم بەرگی "سەرمایە" دا. لەجیاتی یان، دەمەوێت نەخشەی هەندێ توخمی لێکدانەوەیەکی جێگرەوەی (alternate) گیرو گرفتەکە دابنێم.

مارکس جارێکیان پرسی: "زنجی کۆیلە چییە؟".. پیاوێکی رەگەز رەش.. لێکدانەوەیەکە وەك لێکدانەوەی تر چاکە.. زنجی زنجییە.. بە چەند پێوەندییەك دەبێتە کۆیلە. دەسکەلایەکی رستنی لۆکە ئامێرێکی رستنە، بەپێی چەند پێوەندییەکەوە دەبێتە سەرمایە.. لەو پێوەندییانەوە دابڕێت بە سەرمایە دانانرێت هەروەك زێڕ بەدابڕاوی بەخۆی پارە نییە یان شەکر بێ پێوەندی پێویست نرخی نییە (مارکس، 1971، بی:28). کەسێك وەدەبێت دەپرسێت: ژنی ماڵ چییە؟ مرۆڤێکی مێیە.. ژن ژنە، بە هەندێ پێوەندیدەبێتە ژنی ماڵ، کۆیلە، ئامرازی رابواردن، یان قەوان. دابڕاو لە ئەو پێوەندییانە ئەو ستایشانەی نامێنێت. کەواتە ئەو پێوەندییانە چین مێیەك بکاتە ژنێکی چەوساوە؟ شوێنی دەست پێکردن بۆ هەڵوەشاندنی پێڕۆی ئەو پێوەندییانەی کە بەهۆیانەوە ژن دەبێتە نێچیری پیاو لە کارە بەیەکداچووەکانی "کلۆدلێڤی- شتراوس" و " سیگموند فرۆید" ە. ژن بکرێتە ژنی ماڵ، لەژێر ناویتر، لەنووسینەکانی هەردووکیان قسەی لێکراوە.. بە خوێندنەوەیان هەست دەکرێت کە کۆمەڵ مێی بە کەرەستەی خاو و شێوە بەرهەمێکی ماڵیکراو داناوە.. بەڵام نە (فرۆید) و نە (لێڤی - شتراوس) نووسینەکانی خۆیان بە ئەم شێوە نابینن.. هیچ کامیان رەخنەگرانە تەماشای ستایشەکانی خۆیان ناکەن. کەواتە شیکارییەکانیان دەبێت بە ئەو شێوەیە بخوێنرێنەوە وەك مارکس کە کردوویەتی دەربارەی نووسینەکانی ئابووری زانە رامیارییە کۆنەکانی پێش خۆی (دەربارەی ئەمە تەماشای "ئەلپۆسەر و بالیبار" ، 1970: 11-69 بکە).

"فرۆید" و "لێڤی شتراوس" لە هەندێ رووەوە هاوپێچووی "ریکاردۆ" و "سمیپ" ن.. ناوەرۆکی نووسینەکانیان و ئەو رەخنانەی کە دروستی دەکەن نایان بینن، هەرچۆنێك بێت ئامرازی چەمکەکی CONCEPTUAL پێك دێنن کە بەهۆیەوە کەسێك دەتوانێت ستایشی چەوساندنەوەی ژن بکات کە بەشێکی ژیانی کۆمەڵایەتی یە. من ئەو بەشەی ژیانی کۆمەڵایەتییە، لەبەر نەبوونی ناونانێکی چاکتر، بە "پێڕۆی زایەندی نێر و مێ" ناو دەبەم. بۆ ناساندنی "پێڕۆی زایەندی نێر و مێ" دەستەیەك پێکهێنراوە کە بەهۆیەوە کۆمەڵ "زایەندێتی ژیواری" دەکاتە بەرهەمی چالاکی مرۆڤایەتی بۆ دابین کردنی پێویستییە زایەندییەکان.

مەبەستی ئەم وتارە گەیشتنە ناساندنێکی باشتری "پێڕۆی زایەندی نێر و مێ" یە، لەرێی تا رادەیەك خوێندنەوەیەکی لێکدانەوانە و هەوەسانەی "لێڤی شتراوس" و "فرۆید". من لێرەدا وشەی "لێکدانەوانە" بە مەبەست بەکاردەهێنم.. فەرهەنگ "لێکدانەوە" بە شیکاری یان راڤەکردنی رەخنەگرانە، بەتایبەتی وەرگێڕانی نووسراوەی پیرۆز دەناسێنێت.

خوێندنەوەی من دەربارەی "لێڤی شتراوس" و "فرۆید" وەرگێڕانێکی ئازادانەیە، دەست پێکردنە لە دەقێکی رووتەوە بۆ پێش گرێیەکانی و ناوەرۆکی.. خوێندنەوەی هەندێ دەقی شیکاری دەروونییە کە پاڵێوراوە بە چاوی سازدراو لەلایەن "جاکس لاکان" ەوە هەروەك چۆن کە راڤەکانی نووسینەکانی فرۆید زۆر کارتێکراوی "لێڤی - شتراوس" ە.

دەگەڕێمەوە بۆ چاك كردنی ناساندنی "پێڕۆی زایەندی نێر و مێ".. یەكەم، هەرچۆنێك بێت، هەوڵ دەدەم پێویستی ئەو جۆرە چەمكە بخەمە روو بە لێدوان لە كەوتنی ماركسێتی كۆن دەربارەی ناساندنی یان چەمك كردنی چەوساندنەوەی زایەندی. ئەو كەوتنە لەو راستییەوە هاتووە كە ماركسێتی، وەك بیردۆزی ژیانی كۆمەلایەتی، رێژەیی بایەخی بە كێشەی زایەند نەداوە. لە نەخشەی "ماركس" دا سەبارەت بە جیهانی كۆمەلایەتی، مرۆڤ: كرێكارو جوتیار و سەرمایەدارن.. هەروەها كە پیاو و ژنن زۆر گرنگ نەبینراون. پێچەوانەی ئەمە لە نەخشەكانی باری كۆمەلایەتی دیاریكراو لەلایەن "فرۆید" و "لێڤی - شتراوس" ەوە، دان نانێكی قووڵ هەیە لەمەڕ جێی زایەندێتی SEXUALITY لە كۆمەڵدا.. هەروەها دەربارەی جیاوازییە قووڵەكانی نێوان باری كۆمەلایەتی پیاو و ژندا.

- **ماركس**

بیردۆزییەك نییە ژمێرە بۆ چەوساندنەوەی ژن بكات - لە هەمەجۆری كۆتایی نەهاتووی لەیەكچوون و نەریت گۆڕینەوە بە درێژایی مێژوو- وەك ئەو هێزە لێكدانەوەییەی كە بیردۆزیی ماركسی دەربارەی چەوساندنەوەی چینایەتی دەیكات. كەواتە سەیر نییە كە زۆر هەوڵ درابێت بۆ پەیڕەوكردنی شیكاری ماركسی لەسەر كێشەی ژنان.. زۆر رێباز دەربارەی ئەمە هەن.. قسە لەسەر ئەوە كراوە كە ژنان هێزی كاری لەدەستن بۆ سەرمایەداری، لەكاتێكدا كە كرێی نزمی ژنان بە گشتی، پاشەكەوتی پتر بۆ سەرمایەدار پێك دەهێنێت.. ژنان راژەی مەرامەكانی لەكارهێنێتی CONSUMERISM سەرمایەدار دەكەن.. وەك بەڕێوەبەرانی لەكارهێنانە خێزانییەكان ... و بە ئەم شێوانە.

هەرچۆنێك بێت، چەندین بابەتی نووسین هەوڵیان داوە شتێكی زۆر ئاواتانەتر دەربارەی چەوساندنەوەی ژنان بخەنە دڵی "سەرمایەدار" ی كاراو گۆڕاو بە ئاماژەكردن بۆ پێوەندی نێوان كاری ماڵ و بەرهەم هێنانەوەی REPRODUCTION كار (تەماشای بێنستن 1969، دالا كوستا 1972، لارگۆ و دۆمۆلین 1972، گیرستین 1973، ڤۆگل 1973، سیكۆمب 1974، گاردینەر 1974، راونتری، ئێم و جەی 1970 بكە). بۆئەوەی ئەمە بكەیت بۆ دانانی ژنان لە ناساندنی سەرمایەداریدا، كە تێیدا سەرمایە بە دەرهێنانی زێدەبایی SURPLUS VALUE لەكاردا بەسەرمایە پێك دەهێنرێت.

بەكورتی ماركس قسەی لەوە كردووە كە سەرمایەداری بە مەرامە تاكەكەیەوە لە هەموو شێوەكانی تری بەرهەم هێنان جیاوازە كە ئەویش پێكهێنان و زۆركردنی سەرمایەیە. كەچی شێوەكانی تری بەرهەم هێنان وەدەبێت خۆیان لە دروستكردنی شتی بە كەڵك بۆ دابین كردنی پێویستییەكانی مرۆڤ، یان لە بەرهەم هێنانی زۆرتر بۆ زاڵیی بنەماڵێتی، یاخود لە بەرهەم هێنانی قوربانی پێویست بۆ خواكان دەبینن.. سەرمایەدارێتی سەرمایە دروست دەكات. سەرمایەدارێتی دەستەیەك پێوەندیی كۆمەلایەتین - شێوەكانی خاوەنێتی و هی تر - كە تیایاندا بەرهەم هێنان شێوەی گۆڕینی پارە و شمەك و كەسان بۆ سەرمایە وەردەگرێت. سەرمایە بڕی شمەك یان پارەیە كە كەی بۆ كار گۆڕدراوە، خۆی بە دەستكەوتنی كاری پارە پێنەدراو، یان زێدەبایی، لە كارو خۆیدا بەرهەم هێنانەوەی خۆی دەكات.

ئەنجامی كردەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری نە بەرهەمێكی رووتە (بەهای بەكارهێنان) و نە شمەكە.. واتا بەهایەكی بەكارهێنانە كە بەهای گۆڕینەوەی ببێت.

ئەنجامەکەی، بەرهەمەکەی، دروست بوونی زێدەبایییە بۆ سەرمایە. لەئەنجامیدا گۆڕینی راستەقینەی پارەیە یان شمەکە بۆ سەرمایە... (مارکس 1969: 399 نووسینەکانی بە پیتی لار لە بنەچەیەکدا).

گۆڕینەوەی نێوان سەرمایەو کار کە زێدەبایی دروست دەکات، کەواتە سەرمایە زۆر جیاو تایبەتە. کرێکار کرێ وەردەگرێت، سەرمایەدار ئەو شتانەی دەست دەکەوێت کە کرێکار دروستی کردوون لە ماوەی کارکرنیدا. ئەگەر هات و سەرجەمی بەهای ئەو شتانەی کە کرێکارەکە دروستی کردوون لە بەهای کرێیەکەی زۆرتر بێت، مەرامی سەرمایەداریتی دێتەدی.. سەرمایەدار تێچوونی کرێیەکەی دەکەوێتە دەست لەگەڵ سەربارێك – زێدەبایی.. ئەمە روو دەدات، چونکە کرێیەکە بە بەهای شتی دروستکراو دیاری ناکرێت، بەڵکو بە بەهای ئەوەی دەیهێڵێتەوە بۆ بەرهەم هێنانەوەی کرێکارەکە رۆژ بە رۆژ، هەروەها بۆ بەرهەم هێنانەوەی تێکڕای هێزی کار لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی تر. بەم شێوەیە زێدەبایی جیاوازی نێوان ئەوەی چینی کرێکار دروستی دەکات و بڕی ئەو سەرجەمەیە کە دەخولێندرێتەوە بۆ دەستەبەرکردنی چینی کرێکار.

ئەو سەرمایەی کە بۆ هێزی کار دراوە، کراوە بە پێویستی یەکانی ژیان .. ئەمەش بە بەکارهێنانی ماسوولکەو دەمار و ئێسك و مێشکی کرێکاران دەکرێن و بەرهەم دەهێنرێنەوەو کرێکاری نوێ دەست دەکەون... لە کارهێنانی کرێکاران، چ لە سازنگەو کارگە یان لە دەرەوەیان، بەشێکی کردەی بەرهەم هێنان بن یان نا، هۆکاری بەرهەم هێنان و بەرهەم هێنانەوەی سەرمایەن، هەروەك کە بگێڕێکی خاوێن کردنەوە دەیکات.. (مارکس، 1972: 572).

بۆ کەسێك، بەرهەم هێنانی کار لە بەرهەم هێنانەوەی REPRODUCTION خۆی یان چاك راگرتنی پێك دێت.. بۆ چاك راگرتنەکەی، بڕێکی پێدراوی هۆیەکانی مانی (ژیانی) دەوێت... هێزی کار تەنیا بە کارکردن خۆی دەخاتە کار.. بەڵام بەوە بڕێکی دیاریکراوی ماسوولکەو مێشك و دەمار و شتی تری مرۆڤی کارمەند لەناودەچێت کە دەبێت پەیدابکرێنەوە... (هەمان سەرچاوە: 171).

بڕی جیاوازی نێوان بەرهەم هێنانەوەی هێزی کار و بەرهەمەکانی، کەواتە پشت بە دیاریکردنی ئەوەی دەبیات بۆ بەرهەم هێنانەوەی ئەو هێزەی کار دەبەستێت. مارکس لایەنی ئەوەیە کە ئەو دیاریکردنە بەپێی ئەو شمەکانە (خۆراك، بەرگ، خانوو، سووتەمەنی.. هتد.) بێت کە پێویستن بۆ پاراستنی تەندروستی و ژیان و هێزی کرێکار. بەڵام ئەم شتانە دەبێت بەکاربهێنرێن پێش ئەوەی ببنە بژێو.. یەکسەر لە شێوەی لەکارهێنان نین کە بەکرێ دەکرێن. بێجگە لە ئەو شتانە کاری تر دەبێت بکرێت پێش ئەوەی بەرەو رووی کەسان بکرێن.. دەبێت خۆراك لێنرێت، بەرگ بشۆرێت، نوێن دروست بکرێت، دار بشکێنرێت و هتد. کەواتە کاری ماڵ کلیلە توخمە لە کردەی بەرهەم هێنانەوەی کار کە لەوەوە زێدەبایی وەردەگیرێت. هەروەك ئاسایییە ژن کاری ماڵ دەکات، بینراوە کە لەڕێی بەرهەم هێنانەوەی هێزی کار ژنان هاوبەندی زێدەبایی کراون کە زێدەبایی مەرجێکی پێویستی سەرمایەدارییە. لە ئەمەش زیاتر لەبەرئەوەی کرێ بەکاری ماڵ نادرێت، کاری ژنان لە ماڵدا بەشداری بڕی ئەو زێدەبایییە دەکات کە سەرمایەدار وەدەستی دەهێنێت. بەڵام لێکدانەوەی سوودی ژنان بۆ سەرمایەداری شتێکە و قسە لە ئەوە بکرێت کە ئەو سوودە بنەچەی چەوساندنەوەی ژنانە بە تەواوی شتێکی

تره. تەواو لەم خاڵەدا شیکاری سەرمایەداری بۆ لێکدانەوەی ژنان و چەوساندنەوەیان دەوەستێت.

ژنان لەو کۆمەڵانە دەچەوسێنرێنەوە کە بێ ئەندێشەکردن بە کۆمەڵی سەرمایەدار ستایش دەکرێن. لە دۆڵی "ئەمەزۆن" و بەرزاییەکانی "گینیای نوێ"دا، ژنان بەشی زۆری لەلایەن چەتە ئەتککەرەکانی ئافرەت لە شوێنی خۆیان دەهێڵرێنەوە کەی ترسی نێرینە دەری بخات کە کەمە و کاری تەواوی خۆی ناکات.

"ئێمە ژنانمان بە مۆزەکە ماڵی دەکەین"، یەك لە پیاوانی "مۆندۆرۆکۆ" وتی: (مۆرفی، 1959: 195). "تۆمارەی مرۆڤزانی ستایشەکی" ETHNOGRAPHIC RECORD بە پەیڕەوکردنی ئەوها شێواندراوە کە ئەنجامەکەی هێشتنەوەی ژنانە لە "شوێنی خۆیاندا": تیری پیاوان، پێوتنە نهێنییەکان، زانینە مەتەڵییەکانی پیاو هتد. پێش سەرمایەداری ئەورووپای دەرەبەگی بە توندی زایەندێتی SEXISM تێدا نەبوو. سەرمایەداری زاڵ بوو، چەمکی نێرو مێ کە بە چەندین سەدە پێش خۆی بووە دامەزرێنرایەوە. هیچ شیکارییەکی بەرهەم هێنانەوەی هێزی کار لە سایەی سەرمایەداریدا ناتوانێت پشتینەکانی پاکیزەیێتی CHASTITY BELTS و بەستنەوەی قاچ یان هەر رێکخستنێکی دەری باوەڕی "بیزەنتینی" BYZANTINE، ریسواییکردنی پەرستراوەکان کە تووشی ژنان دێن لە شوێن و سەردەمی جیاوازدا لێکیان بداتەوە.. شیکاری بەرهەم هێنانەوەی هێزی کار ئەوەش لێك ناداتەوە کە بۆ ئاسایی ژن نەك پیاو کاری ناوماڵ دەکات. بەپێی ئەم رۆشنایە خۆشە بگەڕێنەوە سەر دەمەتەقێیەکانی مارکس دەربارەی بەرهەم هێنانەوەی کار. ئەوەی پێویست بێت بۆ بەرهەم هێنانەوەی کرێکار لە بەشێکیدا بەپێویستییە ژێوارییەکانی BIOLOGICAL NEEDS لەشی مرۆڤەوە دیاری دەکرێت.. لە بەشێکی تریدا بە باری سروشتی ئەو شوێنەی لێیەتی و بەشێکی تریشی بەداب و نەریتی رۆشنبیرییەکەیەوە بەندە. مارکس بینی کە بیرە بۆ بەرهەم هێنانەوەی چینی کرێکاری ئینگلیز پێویستە، مەی بۆ کرێکاری فەرەنسی (وەك نموونە).

... ژمارە و کشانی پێویستییەکانی کرێکارێك، هەروەها شێوەکانی دابین کردنیان، بەخۆیان بەرهەمی پەرەسەندنی مێژوویین، کەواتە تارادەیەکی زۆر پشت بە ئاستی شارستانێتی وڵاتێك دەبەستێت.. بەتایبەتی تر پشت بە رەوش و نەریت و رادەی حەسانەوەی کە لە سایەیاندا چینی کرێکارانی ئازاد پێکهێنراوە دەبەستێت. کەواتە بە "دژی جیاوازی کردن" CONTRADISTINCTION بۆ کێشەی شمەکی تر، توخمی مێژوویی و رەوشتی دێنە ناو دیاریکردنی هێزی کار... (مارکس 1972: 171 پیتە لارەکانم).

ئەمە بە روونی دەری دەخات کە ئەم "توخمە مێژووییە رەوشتی" یە دیاری دەکات کە ژن لە پێویستییەکانی کرێکارە.. کە ژن نەك پیاو کاری ناوماڵ دەکات... کە سەرمایەداری ماوەتگرە HEIR بۆ دابێکی درێژخایەن کە تیایدا ژن ماوەتگر نابێت، کە تیایدا ژن سەرکردایەتی ناکات. ئەم توخمە "مێژووییە رەوشتییە" یە کە سەرمایەداری بە ماوەتی HERITAGE رۆشنبیریی شێوەکانی نێرێتی و مێیێتی هێناوەتە پێش. لەنێو ئەم "توخمە مێژووییە رەوشتییە" ئەوەیە کە تێکڕای خاوەنێتی زایەند، زایەندێتی و چەوساندنەوەی زایەند پۆلێن کراون.

کورتەی لێدوانی مارکس تەنیا رازەی جەخت کردنی رووبەرێکی فراوانی ژیانی کۆمەڵایەتی

دەکات کە دەیگرێتەوە و بێ تاقیکردنەوەش دەیهێڵێتەوە. تەنیا بە بەکارهێنانی ئەم "توخمی مێژوویی و رەوشتی‌یە" لە شیکاریدا دەتوانرێت چەوساندنەوەی زایەند وێنەی بکێشرێت.

- ئەنگلز

لە "بنەچەی خێزان و خاوەنێتی تایبەت و دەوڵەت" دا ئەنگلز چەوساندنەوەی زایەند وەك بەشێکی ماوەتگریی سەرمایەداری لە شێوە کۆمەڵایەتی‌یە پێشووەکانی دەبینێت. لە ئەمەش زیاتر ئەنگلز زایەند و زایەندێتی لەگەڵ بیردۆزی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکەی تێك هەڵکێش دەکات. "بنەچە" ORIGIN نووسراوەیەکی نائومێدکەرە.. وەك بەرگەکانی سەدەی نۆزدەم دەربارەی مێژووی هاوسەری و MARRIAGE خێزان کە چاولێکەرانە نووسراونەتەوە، چۆنێتی بەڵگە لە "بنەچە..." دا ئەوها لە خوێنەرێکی ئاشنا لەگەڵ دوا پەرەسەندنەکانی مرۆڤزانی دەکات لای سەیر بێت.. سەرەڕای ئەوەش نووسراوەیەکە بینینە گرنگەکانی نابێت بە کەم و کورتی‌یەکانی تاریك بکرێن. بیرکەی "پێوەندی‌یەکانی زایەندێتی" کە دەکرێت و دەبێت لە "پێوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنان" جیا بکرێتەوە کەمترین هەڵهێنانەکانی INTUITIONS ئەنگلز نی‌یە:

بەپێی چەمکی کەرەستەیی، هۆکاری دیاریکەر لە مێژوودا، لە دوا نموونەدا، بەرهەم هێنان و بەرهەم هێنانەوەی ژیانی دەستبەجێیە. ئەمەش هەروەتر دوو خوویی‌یە two&old character: لەلایەکەوە بەرهەم هێنانی هۆیەکانی بوونە، لە خۆراك و بەرگ و خانوو و ئامرازەکانی پێویست بۆ ئەو بەرهەم هێنانە.. لەلایەکی ترەوە بەرهەم هێنانی مرۆڤە بەخۆی، لەڕێی زاوزێوە. ئەو رێکخستنە کۆمەڵایەتی‌یەی کە لە سایەیدا مرۆڤی سەردەم و وڵاتێك دەژی بە هەردوو جۆری بەرهەم هێنان دیاری دەکرێت: بە کاروانگەی پەرەسەندنی کار لە لایەکەوە، خێزانیش لەلایەکی ترەوە... (ئەنگلز، 1972: 71-72 نووسینە لارەکانم).

ئەم پارچەیە دان نانێکی گرنگ دەردەبرێت - کە دەستەیەك مرۆڤ دەبێت زیاتر لە تەرخان کردنی چالاکی خۆی بۆ دروستکردنەوەی جیهانی سروشتی لەپێناو بەرگ و خۆراك و خۆگەرم کردن کار بکات. ئەو پێرۆیەی کە بەهۆیەوە توخمەکانی سروشت دەکرێتە شمەك بۆ لەکارهێنانی مرۆڤ بە ئابووری ناوی دەبەین.. بەڵام ئەو پێویستی‌یانەی بە چالاکی‌یە ئابووری‌یەکان دابین دەکرێن، بگرە لە قووڵترین واتای مارکسی، هەموو پێویستی‌یەکانی مرۆڤ تەواو ناکەن. هەروەها هۆبەیەك مرۆڤ دەبێت خۆی لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی تر دروست بکاتەوە. پێویستی‌یەکانی زایەندێتی و زاوزێ دەبێت بکرێن هەروەك پێویستی بۆ خۆراك. یەك لە هەرە دەرئەنجامەکانی روون کە بتوانرێت بکرێت لە زانینەکانی مرۆڤزانی‌یەوە ئەوەیە کە ئەو پێویستی‌یانە بە زەحمەت لە هەر شێوەیەکی سروشتی لە دەمێکدا دابین کرابن... هەروەك پێویستی‌یەکان بۆ خۆراك کە لەهیچ کاتێکدا بەتەواوی دابین نەکراون. برسێتی برسێتی‌یە.. بەڵام ئەوەی بەخۆراك دانرابێت بەپێی نەریت دیاریکراوە و وەدەست هێنراوە.. هەر کۆمەڵە شێوەی چالاکی‌یە ئابووری‌یەکانی تایبەت بەخۆی هەیە. زایەند SEX زایەندە، بەڵام ئەوەی بەزایەند دادەنرێت بەپێی رۆشنبیری کۆمەڵەکەی دیاریکراوەو وەدەست هێنراوە.. هەروەها هەموو کۆمەڵێك پێڕۆی زایەندی نێرو مێی هەیە- چەند پێکهێنانێکە کە بەهۆیانەوە کەرەستەی خاوی زایەندی مرۆڤ و زاوزێ لەلایەن مرۆڤەوە رێك دەخرێن.. دەست تێخستنی کۆمەڵایەتی‌و دابین کردن بەشێوەیەکی

چاولێکەرانە هەرچەند ئەو نەریتە سەیرو نەوازە بێت.

جیهانی زایەندیی مرۆڤ، نێرو مێ، زاوزێ بەندە بە، دەگۆڕێت بە چالاکی کۆمەڵایەتی توندوتیژی هەزار ساڵێك.. زایەند هەروەك دەیزانین، جووت بوونی نێرو مێیە.. ئارەزوو و حەزی زایەندی، چەمکی منداڵی CHILDHOOD بەرهەمی کۆمەڵایەتین..

پێویستمان بە تێگەیشتنی بەرهەم هێنانیانە، بۆ ماوەیەك با خۆراك و بەرگ و گەڕێن و رادیۆ لەبیر خۆمان ببەینەوە. لەنووسینە مارکسییەکان و نووسراوەی ئەنگلزیش، چەمکی "دووەم رووالەتی ژیانی کەرەستەیی" لەناو زەمینەکە رووی لە نەمانە، یان بەرەو چوونە ناو بیرکە ئاساییەکانی "ژیانی کەرەستەیی" یە. پێشنیازی ئەنگلز بەدوای نەچوون و پوخت کردنی دەوێت.. بەڵام ئەنگلز بوون و گرنگی خاوەنێتی ژیانی کۆمەڵایەتی دەردەخات کە دەمەوێت بە "پێڕۆی زایەندی نێر و مێ" ناوی ببەم.

ناوی تر بۆ پێڕۆی "زایەندی نێر و مێ" پێشنیازکراون.. هەرە جێگرەوە باوەکان ئەمانەن: "شێوەی بەرهەم هێنانەوە" و "کۆمەڵی باوك سالاری" ن. دەبێتە گەوجی یاری بە زاراوە بکرێت، بەڵام هەردووك لەوانە دەکرێت شێوان دروست بکەن. هەموو ئەو سێ پێشنیازانەی کە کراون بۆ خستنە رووی جیاوازی نێوان پێڕۆیە ئابووریەکان و پێڕۆیە زایەندییەکانە.. هەروەها بۆ دەرخستنی ئەوەی کە پێڕۆیە زایەندییەکان جۆرە خۆڕێبەریەکیان هەیەو ناتوانرێت هەردەم لە شێوەی هێزە ئابووریەکان لێك بدرێنەوە.

"شێوەی بەرهەم هێنانەوە"، بۆ نموونە پێچەوانەی "شێوەی بەرهەم هێنان" پێشنیاز کراوە. بەڵام ئەم زاراوەسازییە ئابووری بە بەرهەم هێنان و پێڕۆی زایەندی بە بەرهەم هێنانەوە دەبەستێتەوە.. لە دەوڵەمەندی هەردوو پێڕۆیەکە کەم دەکاتەوە چونکە "بەرهەم هێنان" و "بەرهەم هێنانەوە" لە هەردووکیاندا هەن. هەموو شێوەیەکی بەرهەم هێنان بەرهەم هێنانەوەی تێدایە – هی ئامراز و کارو پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. ئێمە ناتوانین هەموو هەمەلایەنەکانی رووالەتەکانی بەرهەم هێنانەوە بۆ پێڕۆی زایەند بگێڕینەوە. جێگرتنەوەی ئامێر لەجێی ئامرازی ساکار نموونەی بەرهەم هێنانەوەیە لە ئابووریدا.. لەلایەکی ترەوە ناتوانین پێڕۆی زایەند بە "بەرهەم هێنانەوە" وەك زاراوەیەکی کۆمەڵایەتی یان ژیواری ببەستینەوە.

پێڕۆی زایەندی نێرو مێ بە ئاسانی تروکەیەکی بەرهەم هێنانەوەکی reproductive moment "شێوەی بەرهەم هێنان" نییە. پێکهاتنی پێناسی زایەند نموونەیەکی بەرهەم هێنانە لەجیهانی پێڕۆی زایەندا. پێڕۆی زایەندی نێرو مێ لە پێوەندییەکانی زاوزێ (بەرهەم هێنانەوە بە واتەی ژیواری) زیاترە.

زاراوەی دەستەواژەی باوك سالاری هێنرایە پێش بۆ جیاکردنەوەی ئەو هێزانەی کە زایەندێتی لە هێزە کۆمەڵایەتییەکانی تری وەك سەرمایەداری دەپارێزن بەڵام بەکارهێنانی زاراوەی "باوك سالاری"، جیاکردنەکانی تر دەشێوێنێت.. بەکارهێنانەکەی بە بەکارهێنانی سەرمایەداری دەچێت بۆ ئاماژەکردن بۆ هەموو شێوەکانی بەرهەم هێنان... سوودی بەکارهێنانی زاراوەی "سەرمایەداری" بە وردی لەوەدایە کە دوو پێڕۆی جیاواز کە کۆمەڵانی مرۆڤایەتی رێك دەخەن و شمەك و پێویستییەکانی ژیان ساز دەدەن جیایان دەکاتەوە. هەر کۆمەڵێك پێڕۆیەکی "ئابووری رامیاری" هەیە.. ئەو شێوە

پێڕۆیە یان یەکسانییەکی "هاوبەشی" دەبێت یان چەندچینی "سەرمایەداری" دەبێت.. لەم بارەدا چینی چەوساوە لە کۆیلە یان وەرزێر یاخود کرێکار پێك دێت. کاریگەری زاراوەکە کەوتۆتە سەر بەجێگەیاندنەکەی کە لە راستیدا سەرمایەداری جێگرەوەی هەیە..

هەروەتر هەر کۆمەڵە هەندێ رێبازی رێکی خۆی هەیە بۆ سەوداکردن لەگەڵ زایەند و نێر و مێ و منداڵ. ئەو جۆرە پێڕۆیە لەوانەیە لە رووی زایەندەوە یەکسانی بێت، هیچ نەبێت لە رووی بیردۆزییەوە.. یان وەدەبێت "نێر و مێی چەند چینە"، لەوە دەچێت زۆربەی یان هەموو نموونە زانراوەکان ئەوها بن. بەڵام گرنگە - بگرە دەربارەی مێژوویەکی شکست - جیاوازی نێوان توانای مرۆڤ و پێویستی دامەزراندنی جیهانێکی زایەندی لەگەڵ رێبازە ستەمکارە پەیرەوکراوەکان لە جیهانی زایەندی رێکخراودا بمێنێت. باوك سالاری هەردوو واتا لە هەمان زاراوەدا کۆدەکاتەوە. پێڕۆی زایەندی نێر و مێ، لەلایەکی ترەوە زاراوەیەکی بێلایەنەو ئاماژە بۆ دەسەڵات دەکات و دەری دەخات کە ستەمکاری لەو دەسەڵاتەدا هەردەبێت.. ستەمکاری بەری ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییە تایبەتانەیە کە رێکی دەخەن.

لە پاشدا نا، پێڕۆی نێرو مێی چەندچین کە باوك سالاری بێت بە وردی ستایش نەکراوە.. زۆر لە کۆمەڵانی "نیوگینیا" (ئەنگا، ماردینگ، بینابینا، هولی، میلپا، کۆما، گاهوکو، گاما، فور، مارین ئانیم) تاڕادەی قێز لێبوونەوە دڕندانە ستەمکاری لەگەڵ ژنان دەکەن (تەماشای بیرندت 1962، لانگنیس 1967، راپاپۆرت 1975، رێد 1952، مەگیت 1970، گلاسە 1971، ستراثرن 1972، رەی 1959، ڤان باڵ 1966، لیندنباوم 1973 بکە).

هێزی پیاوان بەپێی ئەوە دانەمەزراوە کە باوکن یان باوك سالارن، بەڵکو لەسەر دەستەی نێرینەی هەرزەکار کە شێوەی نهێنی وەرگرتووە، گوزەری پیاوان، شەڕ، گۆڕینەوەی تۆڕی کار، زانینە شێوەکارییە ئاینییەکان، کاری دەسپێکی هەمەجۆر دامەزراوە - کۆمەڵی "باوك سالاری" شێوەیەکی زاڵی پیاوە.. بەکارهێنانی زارەوەکە دەبێت بەستراوەی سپاردە کۆنەکەی شوانکارە کۆچەرەکان یان هۆبەکانی وەك ئەوان بووبێت کە لەوانەوە زاراوەکە داهاتووە. ئیبراهیم باوك سالار بوو - پیاوێکی پیر بووە دەسەڵاتی تەواوی بەسەر ژن و منداڵ و ئاژەڵ و راگیراوان رووالەتێکی دامەزرەی باوکایەتی بووە، هەروەك لەلایەن دەستەی کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی ناساندراوە.

هەر زاراوەیەك بەکاربهێنین، ئەوەی گرنگ بێت پەرەپێدانی چەمکەکانێتی بۆئەوەی بە تەواوی ستایشی رێکخستنی کۆمەڵایەتی زایەندێتی و بەرهەم هێنانەوەی داب و نەریتەکانی زایەند و نێر و مێ بکات. پێویستیمان بە پەیرەوکردنی ئەو پرۆژەیە هەیە کە ئەنگلز دەستی لێ هەڵگرتبوو و مل کەچی ژنانی بۆ پەرەسەندنی شێوەی بەرهەم هێنان دانابوو.. بۆ ئەم مەبەستە دەتوانین چاو لە رێبازەکەی ئەنگلز بکەین نەك لە ئەنجامەکانی. ئەنگلز لە کاری شیکردنەوەی دووەم رووالەتی ژیانی کەرەستەیی لەرێی تاقیکردنەوەی بیردۆزی پێڕۆیەکانی خزمایەتی Kinship نزیك بووە.. پێڕۆیەکانی خزمایەتی زۆر شتەو و زۆر شت دەکات..

لەو بەرهەم هێنانەوەی زایەندێتی پتەو و رێکخراو لە رووی کۆمەڵایەتییەوە پێکهاتووە. پێڕۆیەکانی خزمایەتی بەرچاون و شێوە پەیرەوکراوەکانی پێڕۆیەکانی زایەندیی نێرو مێن.

**خزمایەتی**

(دەربارەی ئەو بەشەی کە زایەندێتی کردوویەتی لە گواستنەوە لە پێچووی مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ) بۆ مرۆڤزانێك پێڕۆی خزمایەتی رستێك لە خزمانی ژێواری نییە.. بەڵکو پێڕۆی توێژان و پایەیانە کە زۆرجار پێچەوانەی پێوەندییەکانی بنەچەیی GENETIC راستەقینەیە.. دەیان نموونە هەن کە پایەکانی خزمایەتی لە رووی کۆمەڵایەتییەوە پێشینێتی PRECEDENCE بەسەر لایەنی ژێواری وەردەگرن.

نەریتی "نوەر" NUER دەربارەی شووکردنی ژنان کێشەیەکە ناخی بابەتەکەیە.. "نوەر" پایەی باوکایەتی بە هی کەسێك دەناسێنێت کە بەناوی ئەوەوە زاوایانە (لە شێوەی مەڕو بزن و مانگا) دەدرێت بۆ دایکەکە (ژنەکە). بەم شێوەیە دەکرێت ژنێك شوو بە ژنێکی تر بکات و ببێتە مێردی و باوکی منداڵەکانی، سەرەڕایی ئەوەی کە ئەو پیتکەری نەبووە (منالەکانی لە ئەوەوە نین) (ئیڤانس پریتشارد (1951 :107-9).

لە پێش - باری کۆمەڵان، خزمایەتی زاراوەی ئاوێتەبوونی کۆمەڵایەتییە.. رێکخستنی چالاکی ئابووری و رامیاری و ئاهەنگی و زایەندی بووە.. ئەرك و کاری کەسێك، بەرپرسیارییەکانی، مافەکانی بەرامبەر کەسانی تر بە زمانی خزمایەتی هاوبەش یان نەبوونی ناساندراوە. گۆڕینەوەی شمەك و راژە، بەرهەم هێنان و بڵاوکردنەوەی، دوژمنایەتی و هاوکاری، شێوەکارییە ئایینییەکان و ئاهەنگەکان، هەموویان جێی خۆیان لەناو دامەزرەی خزمایەتی دەگرن. بوون و کاریگەریی گونجاوی خزمایەتی ئەوهای لە مرۆڤزانایان کردووە کە بیر لە داهێنانەکەی بکەنەوە لەگەڵ داهێنانی زمانیش.. ئەو پەرەسەندنانە بە روونی ناتەواوی نێوان پێچووی مرۆڤ و مرۆڤ تۆمار کرد (ساهلینس 1960، لیڤینگ ستۆن 1969، لێڤی - شتراوس 1969).

لەکاتێکدا کە بیرکەی گرنگی خزمایەتی لە مرۆڤزانیدا پایەی یەکەم سەرەتای هەیە، کارە ناوخۆییەکانی خزمایەتی بۆ ماوەیەکی زۆر جێی قسە لێکردنێکی چڕ بووە. پێڕۆیەکانی خزمایەتی لە رۆشنبیرییەکەوە بۆ رۆشنبیرێکی تر جیاوازییان زۆرە.. هەموو جۆرە رێسای سەیر و سورمێنیان هەن کە دیاری دەکەن کێ هاوسەری MARRIAGE بکات یان نەیکات.. ئاڵۆزییە ناوخۆییەکانی واق ورمێنن. پێڕۆیەکانی خزمایەتی بۆ دەیان ساڵ ئەندێشەی زانایانی مرۆڤزانی وروژاندووە بە هەوڵی لێکدانەوەی جووت بوونی ئەوانەی کە بەهۆی نزیکی خزمایەتی وەك خوشك و برا، کوڕ و دایك، باوك و کچ کە نابێت لەگەڵ یەکتریدا دەست تێکەڵ بکەن.. ژن بە ژنێی ئامۆزا و خاڵۆزا و پوورزا.. مەرجەکانی گواستنەوەی خاوەنێتی و نازناو لەنێو خزماندا.. بەزۆر جووت بوونی ناڕەوا.. هۆبە و توێژ و هتد.. ئەمانە خەریکی کردبوون.

لە سەدەی نۆزدەمدا چەند بیرمەندێك هەوڵی لێکدانەوەیەکی گشتگیری سروشت و مێژووی پێڕۆیە زایەندییەکانی مرۆڤیان داوە (تەماشای فی 1973 بکە). یەك لەوانە: "کۆمەڵی کۆن" ی لویس هێنری مۆرگانە. ئەم نووسراوە بوو هانی "ئەنگلز" ی دا دەربارەی "نەژادی خێزان، خاوەنێتی تایبەت، دەوڵەت" بنووسێت. بیردۆزی "ئەنگلز" لەسەر ستایشەکانی مۆرگان دەربارەی رەچەڵەکی و هاوسەری دامەزراوە.

بە وەرگرتنی پرۆژەی ئەنگلز و دەرهێنانی بیردۆزی چەوساندنەوەی زایەند لە لێکۆڵینەوەی خزمایەتی، بواری پشکوتنی "رەچەڵەك زانی" ETHNOLOGY لە سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستی پێکرد. هەروەها بوارێکی تاك و تایبەت بۆ نووسراوەیەکی شیاوی "لێڤی - شتراوس"

بەناوی "دامەزرە سەرەتاییەکانی خزمایەتی The Elementary Structures of Kinship کرایەوە.. ئەمە وێراترین نووسینی سەدەی بیستەمی پرۆژەی سەدەی نۆزدەیەمە بۆ تێگەیشتنی هاوسەری مرۆڤ.. نووسراوەیەکە بە روونی دەری بڕیوە کە خزمایەتی سەپاندنی دامەزرەی رۆشنبیرییە بەسەر راستییەکانی "زاوزێی ژیواریدا" BIOLOGICAL PROCREATION.. بە پێزانینی گرنگی زایەندێتی لە کۆمەڵانی مرۆڤایەتیدا چۆتە ناو بابەتەکەوە..

ستایشی کۆمەڵە کە گری بیرکەی بابەتی مرۆڤی بێزایەند ناکات.. بەپێچەوانەوە بابەتی مرۆڤ لە کاری "لێڤی شتراوس" دا هەردەم یان نێرە یاخود مێیە... کەواتە هەمەلایەنی چارەنووسە کۆمەڵایەتییەکانی نێرو مێ دەتوانرێت نیشان بکرێن. "لێڤی – شتراوس" کە چییێتی پێڕۆیەکانی خزمایەتی لە گۆڕینەوەی ژنان لەنێو پیاواندا دەبینی، بیردۆزی دەربارەی چەوساندنەوەی زایەند دانا.. شیاوانە نووسراوەکە پێشکەشی یادی "لویس هێنری مۆرگان" کراوە.

"نزمی و بازرگانی شمەکی بەهادار" – (مۆنیك ویتیگ)

"VILE & PRECIOUS MERCHANDISE – Monique Wittig"

"دامەزرە سەرەتاییەکانی خزمایەتی" بڵاوکراوەیەکی مەزنی نەژادو سروشتی کۆمەڵی مرۆڤایەتییە. لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی پێڕۆیەکانی خزمایەتی نزیکەی سێ – یەکەکی نیشتەنییانی زەوی.. هەوڵێکە بە بنچینەترین شێوە بۆ دەرخستنی سەرەتا دامەزرەکییەکانی خزمایەتی.

"لێڤی شتراوس" قسە لە بەکارهێنانی ئەو سەرەتایانە دەکات (لە دوا بەندی"دامەزرە سەرەتاییکانی.." کورت کراوەتەوە) لەسەر زانینەکانی خزمایەتی کە بیرساییەکی روون دەردەخات INTELLIGIBLE LOGICK دەربارەی رێنەدراوەکان TABOOSو رێساکانی هاوسەری MARRIAGE RULES کە مرۆڤزانە خۆرئاواییەکانی ئاڵۆز و سورمێن کردبوو. یارییەکی شەترەنجی دەربارەی ئەو چەشنە ئاڵۆزییە دامەزراند کە لێرەدا ناتوانرێت کورت کرێتەوە.. بەڵام دوو پارچەی شەترەنجەکەی تایبەتن بە ژنان: "خەڵات" GIFT. و "جووت بوونی نێو خزمانی نزیکی رێنەدراو INCEST TABOO کە هاوبەندییە دووانەییەکەی سەربارە بۆ چەمکەکەی دەربارەی گۆڕینەوەی ژنان.

"دامەزرە سەرەتاییەکان" لە بەشێکیدا درەوشانێکە دەربارەی بیردۆزییەکی بەناوبانگی تری دامەزرەی کۆمەڵایەتی سەرەتایی، وتاری ماوس دەربارەی خەڵات (تەماشای ساهلینس 1972 بەندی چوارەم بکە). ماوس بۆ یەکەم جار یەك لە هەرە سەرنج راکێشی رووالەتەکانی کۆمەڵانی سەرەتایی بیردۆزی کرد THEORIZED: رادەی کە پێدان و وەرگرتن و پێدانەوەی خەڵات زاڵە لە جووت بوونی کۆمەڵایەتیدا.. لەو جۆرە کۆمەڵانە هەموو جۆرەکانی شتان بە گۆڕینەوە دەخولێنەوە: خۆراك، جادوو، وشە، خشڵ، شێوەکاری ئاینی، ئامراز و هێز.

دایکی خۆت، خوشکی خۆت، بەرازی خۆت، پەتاتەی خۆت کە لەوانەیە نەیخۆی.. دایکی کەسانی تر، خوشکی کەسانی تر، پەتاتەی کەسانی تر کە لەوانەیە بیخۆی. (ئاراپەش، لە "لێڤی – شتراوس" دا باسکراوە 27:1969).

لە گۆڕینەوەیەکی خەڵات هیچ لایەك قازانج ناکات.. لە دوورگەی "ترۆبریاند" هەر خێزانە بێستانێکی "یام" ی "جۆرە پەتاتەیەکە" هەیەو

هەر خێزانەش یام دەخوات.. بەڵام ئەو یامەی کە خێزانەکە دەیچێنێت و ئەوەی دەیخوات یەك شت نیە.. یامی کۆکراوە پیاوەکە بۆ خێزانی خوشکی دەنێرێت، ژن برایەکەشی یامی خۆی بۆ ئەو دەنێرێت (مالینۆفسکی 1929).

دیارە ئەو ڕێبازە لەڕووی بازاڕکاریەوە بێکەڵکە، بەجێییەکەی لە شوێنی تر مەبەستە. "ماوس" دەڵێت دەڵێت بایەخی پێدانی خەڵات پێوەندییەکی کۆمەڵایەتی لەنێوان هاوبەشانی گۆڕینەوەیەك پێك دێنێت.. پێدانی خەڵات پێوەندییەکی تایبەتی متمانەو هاوکاری و یارمەتی گۆڕاوە بە بەشداربووانی دەدات.

کەسێك دەتوانێت لەڕێی بەخشینی خەڵاتەوە پێوەندییەکی دۆستانە بخوازێت.. هەروەهالەوانەیە گۆڕینەوەی خەڵات مۆرکی پێشبڕکێی وەربگرێت.. نموونە هەیە کە کەسێك بەرامبەرەکەی شکاندووە بە پێدانی خەڵاتێك کە لە توانای وەرگرەکە نەبێت ئەوەندە بداتەوە. هەندێ دەسەڵات وەك ئەوەی "پیاوی گەورە" ی بەرزاییەکانی "نیوگینیا" لەسەر گۆڕینەوەی نایەکسان دامەزراوە.. بەرزفرینی "پیاوی گەورە" زۆرتر شمەك دەدات لە ئەوەی کە بکرێت بیدرێتەوە.. لەشێوەی دەستکەوتنی پایەی دەسەڵات پاداشتی خۆی وەردەگرێتەوە.

هەرچەند "ماوس" و و "لێڤی – شتراوس" هەردووکیان جەختی لایەنی هاوکاری خەڵات گۆڕینەوە دەکەن، مەرامی تری هۆیەکی هەردەمی بوونی بازاڕکاریی کۆمەڵایەتییە.. هۆیەکی لێك بەستنی کۆمەڵایەتییە لەو سەردەمەی کە دامەزرە تایبەتمەندە میرییەکان نەبوون. خەڵات ڕێبازێکی سەرەتایی وەدەست هێنانی ئاسوودەییە کە لە کۆمەڵی شارستانێتیدا بەهۆی دەزگا میرییەکانەوە دابین دەکرێت... پێکهێنانی کۆمەڵ، خەڵات ئازادیی ڕۆشنبیری بووە (ساهلینس 1972 :169، 175).

"لێڤی – شتراوس" بیرکەی IDEA هاوسەری MARRIAGE هەرە شێوەی بنچینەیی گۆڕینەوەی خەڵات بووە، خستنە سەر بیردۆزیی گۆڕینەوەی سەرەتایی، تیایدا ژنان بەهادارترین خەڵاتن. دەڵێت ڕێنەدان بە جووت بوونی خزمانی نزیك دەبێت بزانرێت شێوازێك بووە بە مسۆگەرکردنی ڕوودانی ئەو شێوە گۆڕینەوە لەنێو خێزانان و هۆباندا. لەکاتێکدا کە ڕێنەدانی جووت بوونی خزمانی نزیك جیهانییە، شێوەو ناوەڕۆکی ئەو ڕێنەدانە لە هەموو شوێنێك وەك یەك نییە.. ناتوانرێت بە بوونی مەرامی ڕێگرتنی ڕوودانی تێك هەڵکێشی نزیك لێك بدرێنەوە. ڕاستتر ئەوەیە کە ڕێگرتن لە جووت بوونی خزمانی نزیك، مەرامی کۆمەڵایەتی هاوسەریکردنی دوورو دروستکردنی خزمایەتی بەسەر ڕووداوە ژێوارییەکانی زایەند و زاوزێ دەسەپێنێت. ڕێنەدانی جووت بوونی خزمانی نزیك جیهانی هەڵبژاردنی زایەند دابەش دەکاتە چەندین جۆری هاوبەشانی زایەندی ڕێدراو و ڕێنەدراو.. بەشێوەیەکی ورد بەڕێنەدانی هاوسەری نێو دەستەیەك ڕێ دەکاتەوە بۆ هاوسەری گۆڕینەوەی نێو هۆبان.

ڕێنەدانی بەکارهێنانی زایەندی کچ یان خوشك ناچاریان دەکات بیاندەنە پیاوی تر.. لە هەمان کاتدا مافێك بۆ ئەو پیاوە بۆ کچەکە یان خوشکەکە پێك دەهێنێت... ئەو ژنەی کە یەکێك لەبەر ئەو هۆیە وەری ناگرێت، دەبەخشرێت. (لێڤی – شتراوس، 1969 :51).

ڕێ نەدانی جووت بوونی خزمانی نزیك ڕێسایەکە هاوسەری لەگەڵ دایك و خوشك و کچ قەدەغە دەکات و ناچاریان دەکات بدرێنە کەسانی تر.. ئەمە ڕێسایەکی باڵای خەڵاتە ... (هەمان سەرچاوە : 481).

ئەنجامی خەڵاتی ژنان قووڵترە لە ئەنجامی گۆڕینەوەکانی تری خەڵات، چونکە ئەو پێوەندییەی بە ئەو شێوە دامەزراوە تەنیا گۆڕینەوەیەک نییە، بەڵکو خزمایەتییەکە، گۆڕینەوەی هاوبەشان PARTNERS بووەتە پێوەندی زاوزێ، نەوەکانیان بە خوێن پێوەندن: "دووکەس لەوانەیە بە دۆستایەتی بگەنە یەک و خەڵات بگۆڕنەوە، کەچی لەکاتی تر ناکۆک بن و شەڕ بکەن، بەڵام ژن بەژنێ (هاوسەری بەرامبەر) بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەیەکیان دەبەستێت". (بێست، باسکراو لە لێڤی - شتراوس 1969 :481). هەروەک لە باری پێدانی خەڵاتی تر، هاوسەری هەموو دەم ئەو چالاکییە نییە ئاسان ئاشتی پێک بهێنێت. هاوسەری لەوانەیە زۆر پێشبڕکێی بێت، زۆر خزم لەئەنجامی هاوسەری شەڕ لەگەڵ یەکتری دەکەن. لەگەڵ ئەوەش دا بە واتای گشتی ڕێگرتن لە جووت بوونی خزمانی نزیک تۆڕێکی فراوانی پێوەندی لێ دەبێتەوە، تاقمێک کەسان کە پێوەندییان بەیەکەوە دامەزرەی خزمایەتییە. هەموو ئاستەکانیتر و بڕو ئاکارەکانی گۆڕینەوە، بە دوژمنکارییەکانەوە، بەم دامەزرەیە هەڵدەسووڕێنرێن. زەماوەندەکانی هاوسەری کە لە نووسینەکانی "مرۆڤزانیی ستایشەکی" ETHNOGRAPHY تۆمارکراون ترووکەی کاروانی ڕێک و بێ وەستانی کە تیایدا ژن، منداڵ، شەیتانۆک SHELLS، وشە، ناوی ئاژەڵ، ماسی، پێشینان، ددانی نەهەنگ، بەراز، یام (جۆرە پەتاتەیەکە)، جادوو، سەما، حەسیر و هتد. دەستاودەست دەکەن و جێ دەهێڵن.. خزمایەتی ڕێکخستنە، ڕێکخستنیش هێزە. بەڵام کێ ڕێکخراوە؟

ئەگەر ژنان بن کێ سەودا کراوە، لە پاشدان پیاوانن کە دەیاندەن و وەریان دەگرن کە هاوبەندن.. ژنان لوولەی پێوەندین زیاتر لەوەی هاوبەش بن، گۆڕینەوەی ژنان مەرج نییە ئەو ژنانەش بگرێتەوە کە بە شت دانراون، بە واتای هاوچەرخ، کە شت لە جیهانی سەرەتایی بە ئەوپەڕی خووە کەسییەکان ڕەنگ کراوە. بەڵام جیاوازی نێوان خەڵات و بدەرەکەی دەگرێتەوە. ئەگەر ژنان خەڵات بن، کەواتە پیاوانن هاوبەشانی گۆڕینەوەن. هاوبەشانیش نەک دیارییەکان کە بەوان گۆڕینەوەی گۆڕاوە هێزی ورەیی بەستنەوەی کۆمەڵایەتی خۆی دەبەخشێت. پێوەندییەکانی ئەو جۆرە پێڕۆیە بەشێوەیەکە کە ژنان ئەو پایەیان نییە سوودەکانی خولانەوەی خۆیان بزانن. تا پێوەندییەکان دەری دەخەن کە پیاوان ژنان دەگۆڕنەوە، پیاوانن سوودوەرگرانی بەرهەمی ئەو چەشنە گۆڕینەوانە - ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی.

سەرجەمی پێوەندی گۆڕینەوە کە هاوسەری لەنێوان پیاو و ژن پێک دەهێنێت.. هەر لە نێوان پیاوێک و ژنێک دانامەزرێت، بەڵکو لەنێوان دوو تاقمە پیاو و ژنەکە کە تەنیا وەك یەك لە شتەکانی گۆڕینەوەکە دادەنرێت نەك وەك یەك لە هاوبەشەکان، دادەمەزرێت... ئەمە ڕاستییەکە بگرە لە بایەخدانیش بە هەستی کچەکە، ئاسایی هەر ئەوها دەبێت. قایل بوون بە یەکێتییە پێشنیازکراوەکە، کچەکە پەلە دەکات یان ڕێ دەدات کە گۆڕینەوەکە بکرێت، ناتوانێت سروشتەکەی بگۆڕێت... (لێڤی - شتراوس، هەمان بەند :115).

بۆ چوونە ناو گۆڕینەوەی خەڵات وەك هاوبەش، کەسێك دەبێت شتێکی هەبێت بیدات. ئەگەر ژنان بۆ پیاوان بۆ لەکۆڵ بوونەوە، ئەو دەسەڵاتەیان نییە خۆیان پێشکەش بکەن.

"ژن چییە" پیاوێکی لاوی "باکووری مەلپا" بیری لێکردەوە، "ئەو هێزەی هەیە ڕۆژێك ڕاست بێتەوەو بلێت، "با (مۆکا) Moka بکەین، با دوژمنانمان بکوژین! .. "نە لە ڕاستیدا

وانی‌یه !... شتی بچووکی بۆ که‌ڵکن که ته‌نیا شوێنیان ماڵه، تۆ نابینی وایه؟"

(ستراثرن 1972 :161)

به‌راستی ژنان چین! ژنانی "مه‌ڵپا" که پیاوه لاوه‌که قسه‌ی له‌سه‌ر کردن ناتوانن ژن بهێنن، خۆیان ژنن، ئه‌وه‌ی بۆیان ببێت مێرده، که به ته‌واوی کێشه‌یه‌کی جیاوازه. ژنانی "مه‌ڵپا" ناتوانن کچانی خۆیان بده‌نه پیاوان، چونکه هه‌مان مافی پیاوانیان نی‌یه، مافی به‌خشین (هه‌روه‌تر مافی خاوه‌نێتی یان نی‌یه).

گۆڕینه‌وه‌ی ژنان چه‌مکێکی دڵبه‌ر و به‌هێزه .. دڵبه‌ره له رووی ئه‌وه‌ی که چه‌وساندنه‌وه‌ی ژنان له‌نێو پێڕۆیه کۆمه‌ڵایه‌تی‌یه‌کان داده‌نێت.. له‌وه‌ش زیاتر پێشنیازی ئه‌وه ده‌کات که بگه‌ڕێن له شوێنی ئه‌وپه‌ڕی چه‌وساندنه‌وه‌ی ژنان له نێو بازرگانی کردن به ژنان. مسۆگه‌ر گران نی‌یه نموونه‌ی مێژوویی و نیشته‌نی‌یانی له بازرگانی کردن به ژنان بدۆزرێت. ژنان به شوو ده‌درێن، له شه‌ڕدا ده‌برێن، بۆ پیاوه‌تی ده‌گۆڕدرێنه‌وه، وه‌ك سه‌رانه ده‌نێردرێن، ده‌کڕێن و ده‌فرۆشێن. ئه‌م دراوانه هه‌ر جیهانی سه‌ره‌تایی ناگرێته‌وه، به‌ڵکو له کۆمه‌ڵانی شارستانێتیش پتر ره‌چاو ده‌کرێن. بازرگانی به پیاوانیش ده‌کرێت، به‌ڵام وه‌ك کۆیله، سووك، وه‌رزشه‌وان و هه‌ندێ کارو پایه‌ی نزمی تر، نه‌ك وه‌ك پیاو، سه‌وداش له‌گه‌ڵ ژنان وه‌ك کارکه‌ر، کۆیله، ئافره‌تی سووك، هه‌روه‌تر وه‌ك ژن ده‌کرێت. ئه‌گه‌ر پیاوان بابه‌تی زایه‌ندی بن – گۆڕینه‌وان بن – ژنانیش نیمچه شمه‌کی زایه‌ند بن – خه‌ڵات بن – له زۆری مێژووی مرۆڤایه‌تی، که‌واته زۆر له نه‌ریته‌کانیان، کلیشه‌کان، روخساره‌کانی که‌سێتی له‌وه ده‌چێت تاراده‌یه‌کی زۆر واتا دروست بکه‌ن (له‌نێو هی‌تر، نه‌ریتی هه‌ڵقوتینه‌کی CURIOUS CUSTOM که به‌پێی ئه‌وه‌وه باوك راهی ده‌بێت کچه‌که‌ی ببێته بووك).

گۆڕینه‌وه‌ی ژنان

چه‌مکێکی گیروگرفته‌کی‌یه. که "لێڤی – شتراوس" قسه له جووت بوونی ناره‌وای خزمانی نزیك و ئه‌نجامه‌کانی ئه‌و ره‌فتاره ده‌کات بنه‌چه‌ی رۆشنبیری پێك ده‌هێنێت... ده‌توانرێت له‌مه‌وه ده‌رئه‌نجام ده‌ربکرێت که شکانی ژنان له‌مێژوودا له‌گه‌ڵ بنه‌چه‌ی رۆشنبیری روویداوه، مه‌رجێکی بنچینه‌یی رۆشنبیری‌یه. ئه‌گه‌ر شیکاری‌یه‌که‌ی "لێڤی – شتراوس" به‌شێوه پوخته‌که‌ی وه‌ربگیرێت، به‌رنامه‌ی یه‌کسانی خوازیی نێرو مێ ده‌بێت ئه‌رکه‌کی شه‌که‌تکارتر له ناودانی پیاوان بگرێته‌وه.. ده‌بێت هه‌وڵی نه‌هێشتنی داب و نه‌ریتی خراپ و جێگرتنه‌وه‌ی رووالّه‌تی نوێ له‌سه‌ر زه‌وی بدرێت. هه‌رچۆنێك بێت، له‌باشترین باردا پێشنیازێکی گومان لێکراو ده‌بێت قسه له ئه‌وه بکرێت ئه‌گه‌ر بێت و گۆڕینه‌وه‌ی ژنان نه‌بوایه رۆشنبیری نه‌ده‌بوو.. ئه‌گه‌ر له‌به‌ر هۆی تر نه‌بێت له‌وه‌ی که رۆشنبیری، به ناساندن، شاکاری‌یه. بگره شیاوی قسه لێکردنه که "گۆڕینه‌وه‌ی ژنان" به‌ته‌واوی ستایشی هه‌موو به‌ڵگه تاقیکاری‌یه‌کانی پێڕۆیه‌کانی خزمایه‌تی ده‌کات. هه‌ندێ رۆشنبیری وه‌ك "له‌له" و "لۆما" ئاشکرا ژنان ده‌گۆڕنه‌وه.. له هه‌ندێ رۆشنبیری تر گۆڕینه‌وه‌ی ژنان ده‌کرێت مه‌زه‌نه بکرێت، چونکه ئاشکرا ناکرێت.. له هه‌ندێکیش– به‌تایبه‌تی ئه‌و راوکار و کۆکه‌ره‌وانه‌ی ده‌رهاوێژراون له نموونه‌ی "لێڤی – شتراوس" دا کارایی چه‌مکه‌که جێی پرسینه. ئێمه کێن چه‌مکێك دابنێین که پێ‌بچێت ئه‌وه‌نده به‌سوود بێت و ئه‌وه‌نده‌ش گران بێت؟

"گۆڕینه‌وه‌ی ژنان" له‌خۆیدا و به‌خۆی نه ناساندنی رۆشنبیری‌یه و نه پێڕۆیه. چه‌مکه‌که توندو چڕه، تێگه‌یشتنی چه‌ند رووالّه‌تێکی

پێوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانی زایەند و نێر و مێ‌یە. پێڕۆی خزمایەتی سەپاندنی مەرامە کۆمەڵایەتی‌یەکانە بەسەر بەشێکی جیهانی سروشتی.. کەواتە "بەرهەم هێنانە" لە هەرە واتا گشتی‌یەکەی زاراوەکە: قالبێك، گۆڕینی شت (لەم بارەدا، کەسان) بۆ و بە مەرامی خۆیتی Subjective purpose (بۆ ئەم واتەیەی بەرهەم هێنان، تەماشای مارکس، 1971 ا :80 -99)... پێوەندی‌یەکانی بەرهەم هێنان و دابەش بوون و گۆڕینەوەی خۆی هەیە کە چەند شێوەیەکی خاوەنی دەگرێتەوە ئەم شێوانە دەرهاوێژراو نین، مافەکانی خاوەنی تایبەت، بەڵکو راستتر جۆرەها مافی جیان کە کەسان لەسەر کەسانی تر هەیانە. پێویستی‌یەکانی هاوسەری - خەڵات و ئەو شتانەی کە زەماوەندەکە هەڵدەسووڕێنێت هاوسەری رێك دەخەن - سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی زانینە بۆ بەتەواوی دیاریکردنی کێ چ مافێکی هەیە و لەسەر کێ هەیەتی. گران نی‌یە لەو جۆرە شێوەکاری‌یانە دەرئەنجام وەربگیرێت کە لە زۆرترین کێشەکانی مافەکانی ژنان تارادەیەکی زۆر لە ئەوانەی پیاوان پتر ماونەتەوە.

پێڕۆیەکانی خزمایەتی هەر تەنیا ژنان ناگۆڕنەوە.. گۆری زایەندی، پایەی رەچەڵەکی، ناوی پێشینان و نەوە، مافەکان و کەسەکان (پیاوان، ژنان و منالان) لە پێڕۆیە پتەوەکانی پێوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان دەگۆڕنەوە. ئەم پێوەندی‌یانە هەردەم مافی دیاریکراو بۆ پیاوان و هی تر بۆ ژنان دەگرێتەوە.

"گۆڕینەوەی ژنان" کورتەیەکە بۆ دەربڕینی ئەوەی کە پێڕۆی خزمایەتی دیاری دەکات کە پیاوان چەند مافێکیان لە ژنەکانیان هەیە و ژنان هەمان مافیان نی‌یە چ بۆ خۆیان یان لە پیاوەکانیان.

بەم واتایە، گۆڕینەوەی ژنان پێزانینێکی قووڵی پێڕۆیەکە کە تیایدا ژنان، مافی تەواویان بۆ خۆیان نی‌یە. گۆڕینەوەی ژنان ئەگەر وەك پێویستی‌یەکی رۆشنبیری تەماشا بکرێت شێواو دەردەکەوێت.. کەی وەك تاکە ئامراز بەکاربهێنرێت بە هۆیەوە شیکاری پێڕۆی خزمایەتی ئاسانتر دەبێت.

ئەگەر "لێڤی - شتراوس" لە بینینی گۆڕینەوەی ژنان وەك سەرەتای بنچینەیی خزمایەتی راست بێت، مل کەچی ژنان دەتوانرێت وەك بەرهەمێکی پێوەندی‌یەکان ببینرێت کە بەهۆیەوە زایەند و نێر و مێ رێکخراون و دروستکراون. چەوساندنەوەی ئابووریی ژنان وەرگیراو و لاوەکی‌یە.. بەڵام "ئابووری زانی" ی زایەند و نێرو و مێ هەیە، ئەوەی بمانەوێت ئابووریی رامیاری پێڕۆیەکانی زایەندی‌یە. پێویستیمان بە لێکۆڵینەوەی هەر کۆمەڵێکە بۆ دیاریکردنی رێبازی تەواو کە بەهۆیەوە داب و نەریتی زایەندێتی تایبەت دروستکراوە و پارێزراوە. گۆڕینەوەی ژنان گاڤێکی سەرەتایی‌یە بۆ دانانی کۆمەڵە چەمکێك کە بەهۆیانەوە پێڕۆیە زایەندی‌یەکان ستایش دەکرێن.

## قووڵتر بۆ ناو رێڕەوی دەرنەبوو
## DEEPER INTO LABYRINTH

دەتوانرێت چەمکی زۆرتر لە وتاری "لێڤی - شتراوس" بەناوی "خێزان" دەربهێنرێت کە تیایدا تێگەیشتنی تر دەربارەی شیکاری‌یەکەی خزمایەتی پێشکەش دەکات. لە "دامەزرە سەرەتاییەکانی خزمایەتی" دا، ستایشی رێسا و پێڕۆیانی پێکهاتنی زایەندی دەکات. لە "خێزان" دا کێشەی پێش مەرجەکانی PRECONDITIONS پێویست بۆ کاری پێڕۆیەکانی هاوسەری بەرز دەکاتەوە. دەپرسێت

پێڕۆیـەکانی خزمایـەتی چ جـۆرە کەسـانێکی دەوێت، لەڕێی شیکاری دابەشی کاری زایەندی.

هەرچەند هەر کۆمەڵە جۆرە دابـەش بوونێکـی ئەرکەکانی بە زایەند هەیە، دانانی هەر ئـەرکێکی تایبەت بۆ زایەندێك یان ئەوانی تـر زۆر دەگۆڕێ. لـە هـەندێ هۆبـاندا، کشتوکاڵ کـاری ژنانـە، لـە هۆبەی تر کاری پیاوانە. ژنان لە هـەندێ کۆمـەڵدا باریان قورسە، پیاوان لە هی تر. بگرە نموونـەی راوکـار و جـەنگاوەری مـێ هەیـە.. نموونــەی پیـاوانیش هەیـە ئـەرکی منـاڵ بـەخێوکردنیان لەسـەرە. "لێڤـی - شتراوس" لـە کۆکردنـەوەی زانیاری دەربارەی دابەش بوونی کار بەپێی نێر و مێ دەگاتـە ئـەو ئەنجامـەی کـە تایبەتمـەندی ژێواری نییە، بەڵکو دەبێـت مـەرامی تـر هـەبێت. ئــەم مەبەســتە، لەســەری دەڕوات، بــۆ مسـۆگەرکردنی یـەکێتی پیـاوان و ژنانـە بـە دروستکردنی بچووکترین یەکەی ئابووری شیاو بۆ پێگەیشـتن کـە بـەلای کـەمی لـە پیـاوێك و ژنێـك پێکهاتووە.

زۆر راستە کە دابـەش بوونـی کـاری زایـەندی بێ دواهاتن دەگۆڕێ بەپێی کۆمەڵی هـەڵبژێردراو بۆ لێکۆڵینەوە دەری دەخات کە .. تـەنیا راستی بوونەکــەی کــە بــە پڕنهێنیـیــەوە ویسـتراوە، MYSTERIOUSLY شـێوەیەکە کە لەژێر ئەودا دێت بۆمان کە بەتەواوی پێوەندی پێـوە نییـە، بـەلای کـەمی لـە رووی هــەر پێویستـییەکی سروشتـییەوە... دابەش بوونـی کاری زایەندی لە ئامراز زیاتر نییە بۆ پێکـهێنانی بارێکی گۆڕاوەی پشت بەستن لەنێوان نێر و مـێ. (لێڤی - شتراوس 1971 : 347-48).

دابەش بوونی کار بـەپێی زایـەند (نـێر و مـێ) کەواتە دەتوانرێت وەك "رێ نەدراوێك" ببینرێت: رێنەدراو دژی هاویەکی SAMENESS پیـاوان و ژنـان، رێ نـەدراوێك کـە زایـەندەکان (نـێر و مێیەکان) دابەش دەکاتە دوو "پۆلی دەرهـاوێژراو لـەرووی هاوبەشـــییەوە "MUTUALLY EXCLUSIYE CATEGORIES، رێنەدراوێك کە جیاوازییە ژێوارییەکانی نێوان زایەندەکان (نێرو مێ) بـەگوڕی پتر دەکاتو بە ئـەو شـێوەیە زایـەند دروسـت دەکـات. دابـەش بوونـی کـار هـەروەها دەتوانرێت وەك رێ نـەدراو دژی پێکهێنانە زایەندییەکان بێجگە لـە ئەوانـەی کە بەلای کەمەوە لە پیاوێك و ژنێك پێکـهاتوون.. بـە ئـەو شـێوەیە هاوسـەری "زایـەندی جیـا" (نـێر لەگــەڵ مـێ) HETEROSEXUAL دەسەپێنێت.

لێـدوان دەربـارەی "خـێزان" پرسـینەکی گەوهەری لەمـەڕ هـەموو پێکهێنانـەکانی زایـەندی مرۆڤ دەهێنێتە پێش، کە تیایدا هیچ رووالەتێکی زایەندی وەك رووالەتی "سروشتی" وەرنـەگیراوە (هێرتز، 1960، بۆچوونی پێچووی ئەمەی هەیە لێکدانەوەیـەکی گشـتگری رۆشـنبیری دەربـارەی "شکاندنی چەپەوانی" LEFT-HAKDNESS DENIGRATION راسـتر، هـەموو شـێوە دیارەکـــانی زایـــەند و نـــێر و مـــێ وەك پێویســتـییەکانی پێڕۆیــە کۆمەڵایەتیـیـــەکان دەبینرێن. بە ئەو جۆرە تەماشاکردنە، "دامـەزرە سـەرەتاییەکانی خزمایـەتی" ش چـەند پێـش مـەرجێك دادەنێت. بـە دەربڕینـی بیرسـاییانەی LOGICALپوخت، رێسایەك هـەندێ هاوسـەری قەدەغە کردبێت و فەرمانیش بە کەسانی تر بدات پابـەندی رێسـایەك بـن هاوسـەری بسـەپێنێت. هاوسـەری کەسـانێك پابـەند دەکـات کـە لایـەنی هاوسەرین.

چاك وایـە دەرئـەنجامی ئـەوها بکرێت، بگرە پتر لە ئەوەی کە "لێڤی - شتراوس" کردوویـەتی ... دامەزرە بیرساییەکەی کـە جـەختی تێکڕای شیکارییەکەی "خزمایەتی" دەکات راڤە بکرێت. لە هەرە ئاستی گشتیدا، رێکخستنی کۆمەڵایـەتی زایـەند لەسـەر نـێر و مـێ، تـەوزیمێتی حـەزی

زایەندی جیاواز (نێر لەگەڵ مێ)، لەگەڵ ناچاری زایەندێتی مێ دامەزراوە.

نێرو مێ دابەشکردنێکی سەپێنراوی زایەندەکانە لەلایەن کۆمەڵەوە.. بەرهەمی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی زایەندێتییە. پێڕۆیەکانی خزمایەتی لەسەر هاوسەری دامەزراوە.. نێرو و مێ دەکرێنە مێرد و ژن.. هەر نیمچە ناتەواوێك بە یەکێتی لەگەڵ ئەوی تر دەبنە تەواوکەری یەکتری. پیاوان و ژنان هەڵبەت جیاوازن.. بەڵام وەك رۆژ، زەوی و ئاسمان، جیاواز نین، لە راستیدا پیاو و ژن لەڕووی سروشتەوە، لە هەموو شتێك زیاتر لە یەکەوە نزیکن - بۆ نموونە، چیا، کانگرۆ، داری گوێزی هیند. جیاوازی نێوان پیاو و ژن دەبێت لە رووی ترەوە بێت نەك لەڕووی سروشتییەوە.

لە ئەمەش زیاتر، هەرچەندە جیاوازییەکی تێکڕایی لەنێوان نێر و مێ لە زۆر خوویاندا هەیە، رادەی جیاوازی ئەو خووانە بەیەکداچوونێکی گەورە دەردەخەن. بۆ نموونە هەردەم هەندێ ژن هەن کە لە هەندێ پیاو باڵابەرزترن، هەرچەند پیاوان بەتێکڕا لە ژنان باڵا بەرزترن. بەڵام بیرکەی کە پیاوان و ژنان دوو پۆلی دەرهاوێژراوی هاوبەشن دەبێت لە شتێکی ترەوە بێت جیا لە نەبوونی پێچەوانەی سروشتی. دوور لەئەوەی دەربڕینی جیاوازییە سروشتییەکان بێت، تەنیا پێناسی نێر و مێ کپکردنی پێچوونە سروشتییەکانە. مل کەچ کردنی دەوێت: لەپیاوان هەرچییەکی وەرگێڕانی خووەکانی ناوچەیی مێیەتییە، لەژنان ناساندنی خووەکانی ناوچەیی نێرێتییە. دابەش بوونی زایەندەکان ئەنجامی مل کەچ کردنی هەندێ تایبەتمەندی کەسێتی هەموو کەسێکی پیاو و ژنی هەیە. هەمان پێڕۆی کۆمەڵایەتی کە ژنان لە پێوەندییەکانی گۆڕینەوە دەچەوسێنیتەوە، هەموو کەسێك لە سووربوونی لەسەر دابەشبوونە توندەکەی کەسێتی دەچەوسێنێتەوە.

لەوە زیاتر، کەسان پێدەگەن بۆ مسۆگەرکردنی هاوسەری.. "لێڤی - شتراوس" بە سڵەوە دەڵێت حەزلێکردنی زایەندی جیا (حەزی نێر بۆ مێ) کردەیەکی دامەزرێنراوە. ئەگەر پێویستییە هۆرمۆنی و ژێوارییەکان ئەوەندەی داستانە میللییەکان کشاوو زاڵ بن، کەم ئەوها پێویست دەکات یەکێتی حەزلێکەرانی نێر و مێ بەهۆی "هاوپشت بەستنی" INTERDEPENDENCY ئابووری مسۆگەر بکرێت. بێجگە لەوەش رێنەدانی جووت بوونی خزمانی نزیك، "پێشترێك" aprior "پێشگری دەکات" presupposes، قەدەغەی کەمتر لەسەر "نێربازی" HOMOSEXUALITY. قەدەغەکردن دژی هەندێ زایەندی نێر و مێ، رێنەدان دژی یەکێتی ناحەزلێکەرانی نێر و مێ پێك دێنێت.

نێرو مێ تەنیا جووت بوون نییە لەگەڵ یەك زایەند (نێر یان مێ)، بەڵکو ئاراستەکردنی ئارەزووی زایەندییە رووەو زایەندەکەی تر. دابەش بوونی کاری زایەندی لە هەردوو زایەندی نێرو مێدا هەیە - نێر و مێ دروستیان دەکەن و حەزلێکردنی زایەندی نێر و مێ دروست دەکات.

نەهێشتنی دروست بوونی نێربازی لە زایەندێتی مرۆڤ، ئەنجامێکی ئاسایی چەوساندنەوەی نێربازانە، کەواتە بەری هەمان پێڕۆیە کە رێساو پێوەندییەکانی ژنان دەچەوسێننەوە.

لەراستیدا چۆنێتییەکە ئەوها سووك و ئاسان نییە، هەروەك ئاشکرا دەبێت کەی ئێمە لە گشتاندنەکانەوە بۆ شیکاری پێڕۆیە زایەندییە تایبەتەکان بچین. پێڕۆیەکانی خزمایەتی تەنیا هانی حەزلێکردنی زایەندی نێر و مێ و دژ بەنێربازی دەدات. لە یەکەم شوێندا، شێوەی تایبەتی حەزلێکردنی زایەندی نێر و مێی دەوێت. بۆ نموونە، هەندێ پێڕۆی هاوسەری رێسای

تەوزیمی هاوسەری بەرامبەر هەیە. کەسێك لە ئەو جۆرە پێڕۆیە نەك تەنیا حەزپێکەری زایەندی نێرو مێیە، بەڵکو هی زایەندی بەرامبەری خزمانی نزیکیشە. ئەگەر ڕێسای هاوسەری لە ئەوە زیاتر هاوسەری خزمانی نزیکی بەرامبەری دیاری بکات، ئەوسا پیاوێك دەبێتە "دایکی - برای - کچی زایەندی" و ژنێکیش دەبێتە "باوکی - خوشکی - کوڕی زایەندی".

لەلایەکی ترەوە، زۆر ئاڵۆزیێیەکانی پێڕۆی خزمایەتی لەوانەیە ئەنجامی شێوەی تایبەتی نێربازی لێ بکەوێتەوە. لە زۆر هۆبەکانی "نیوگینیا"، پیاوان و ژنان دادەنرێن ئەوەندە دژی یەك بن ئەوها لە منداڵێکی نێر دەکەن رقی لە نێرێتی خۆی بێتەوە. لەبەر ئەوەی ئەوها بیردەکرێتەوە کە هێزی ژیانی نێر لە "تۆو" یە SEMEN، کوڕ دەتوانێت بە دەسکەوتن و لەکارهێنانی تۆو بەسەر کارتێکردنە قیناوییەکانی مێژووی "ئاوڵەمەییەکەی" FETAL زاڵ بێت.. ئەمە بەهۆی هاوبەشێکی نێرباز لەگەڵ نێرێکی گەورەتری خزم دەکات (کێلی 1974، هەروەها تەماشای ڤان بال 1966، ویلیامس 1936) بکە.

لە ئەو پێڕۆیە خزمایەتییانەی کە سامانی بووك BRIDEWEALTH پایەی مێرد و ژن دیاری دەکات، مەرجە بنچینەییە سادەکانی هاوسەری و زایەندیی نێر و مێ لەوانەیە بخرێنە پشت گوێ. لەنێو "ئازاندە"، لەلایەن پیاوانی گەورەتر پاوان دەکرێن.. پیاوێکی لاوی دەوڵەمەند لەوانەیە، هەرچۆنێك بێت، کوڕێك بکاتە ژنی خۆی و چاوەڕێ بکات تا گەورە دەبێت.. مارەیی (لەشێوەی چەند رمێك) بە کوڕەکە دەدات و بەو شێوەیە کراوتە ژن (ئیڤانس - پریچارد، 1970). لە "داهۆمەی" ژنێك دەتوانێت خۆی بکاتە مێرد ئەگەر مارەیی پێویست بدات (هێرسکۆڤیتز 1937).

بەرکی زایەندی تر لەبەرکردن (پیاو هی ژن و ژن هی پیاو) لە "مۆهاڤە"دا ڕێ بە کەسێك دەدات زایەندی خۆی بگۆڕێت.. پیاوێك دەتوانێت لەڕێی زەماوەندێکەوە ببێتە ژن.. ژنێکیش بەهەمان شێوە دەتوانێت ببێتە پیاو.. ئەو هاوسەرییانە ناوی "زایەندی هاوتا" ی لێنراوە ! !.. هەرچۆنێك بێت، کەسێك ڕێی نەدراوە ببێتە هەردوو زایەند (نێرو مێش بێت) (دەڤەراوکس 1937، هەروەها تەماشای مك مۆتری 1914، سۆنەنشین 1966 بکە).

لە هەموو ئەو نموونانەی سەرەوە، ڕێسای دابەش بوونی زایەندی نێر و مێ و "حەزلێکردنی زایەندی جیا" بگرە لە گۆڕینیشیان تەوزیمی یان تێدان. پێڕۆیەکانی خزمایەتی جۆرە زایەندێتییەکی داتاشراوی هەردوو زایەندەکە دەسەپێنێت. بەڵام دەتوانرێت لە "دامەزرە سەرەتاییەکانی خزمایەتی" دەرئەنجام بکرێت کە ناچارکردنی زیاتری ژنان لە پیاوان پەیرەو دەکرێت بۆ ڕاژەی خزمایەتی.

بەکورتی، هەندێ گشتاندنی بنچینەیی دەربارەی ڕێکخستنی زایەندێنی مرۆڤ دەتوانرێت لە ڕاڤەکەی بیردۆزییەکانی لێڤی - شتراوس دەربارەی خزمایەتی دەربهێنرێت. ئەمانە ڕێ نەدراوەکەی جووت بوونی ناڕەوای خزمانی نزیك، تەوزیمی حەزلێکردنی زایەندی نێر و مێ، دابەش بوونە ناهاوتایەکەی زایەندەکان. ناهاوتایی زایەندی نێر و مێ - جیاوازی نێوان گۆڕینەر و گۆڕاوە - مل کەچ کردنی زایەندی مێی دەوێت. وەچەی نوێ دەبێت فێر بێت پەیڕەوی داب و نەریتی پێشینان بکات.

مرۆڤزانی و ستایشەکانی پێڕۆیەکانی خزمایەتی، شێوازی پەروەردەکردنی منداڵان، بە داب و نەریت و ڕەفتاری باو لێك نادەنەوە. شیکاری دەروونی، لەلایەکی ترەوە، بیردۆزی بەرهەم هێنانەوەی خزمایەتییە. شیکاری

دەروونی ستایشی ئەو شوونانەی کە لە کەساندا پاشماون بە لە روو وەستانیان بەرامبەر بە ڕیساو ڕێکخستنەکانی زایەندێتی ئەو کۆمەڵانەی کە تیادا لەدایك بوون.

## شیکاری دەروونی و بێزاریەکانی
## PSYCHOANALYSIS & ITS DISCONTENTS

شەڕی نێوان شیکاری دەروونی و ژنان و بزووتنەوە خۆشەکان شێوەی داستانی وەرگرتوە. لە بەشێکیدا، ئەم لەروو وەستانەی نێوان شۆڕشگێڕەزایەندیەکان و دامەزرەی نۆشدەرگەیی دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی شیکاری دەروونی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا.. لەوێ دابی نۆشدەرگەیی "توێژکاری جادوو کردووە" FITISHIZED ANATOMY.. باوەڕ ئەوهایە کە منداڵ بە کاروانگەکانی گیانداریدا دەڕوات تا دەگاتە "چارەنووسی توێژکاریەکی" ANATOMICAL DESTINY، "شوێنی مژدەبەری " MISSIONARY POSITION. کاری نۆشدەرگەیی زۆرجار وای دەبینی کە ئەرکی چارەکردنی ئەو کەسانەیە کە لەرێ لادراون. بە گۆڕینی یاسای رەوشتی بۆ یاسای زانستی، کاری نۆشدەرگەیی CLINICAL بۆ سەپاندنی نەریتی زایەندیە بەسەر لاساران. بە ئەم واتەیە، شیکاری دەروونی لە بیردۆزی شێوازی بەرهەم هێنانەوەی ڕێکخستنە زایەندیەکان زیاترە، بووەتە یەك لەو شێوازانە. کە مەرامی "یەکسانی خوازی نێر و مێ" و شۆڕشی خۆشی هەڵوەشاندنی دامەزرەی سەپاندنی زایەندیە، رەخنەی "شیکاری دەروونی" لە ئارادایە.

بەڵام نەلێکردنی REJECTION "فرۆید" لەلایەن بزووتنەوەکانی خۆشی و ژنان رەگی قووڵتری لە نەلێکردنەکە هەیە لەلایەن شیکاری دەروونی بەپێی بینینەکانی. لە هیچ شوێنێکدا کارتێکردنەکانی پێڕۆیە کۆمەڵایەتی‌یەکانی زاڵیی نێر بەسەر ژناندا لە نووسینەکانی نۆشدەرگە چاکتر بەڵگەنامە نەکراون. بە باوەڕی فرۆیدی وەدەست هێنانی مێیتی FEMININITY ئاسایی تێچوونی توند لە ژنان وەردەگرێت.. بیردۆزی پەیداکردنی زایەندی نێر و مێ بنچینەی رەخنەی کاری زایەندە. لەجیاتی پەیڕەو کردنە توندەکانی بیردۆزی فرۆید بەتوندی کپکراوە. ئەم لایەنی‌یە روونە بگرە لە داڕستنە بنەچەکی‌یەکانی بیردۆزیەکەش، بەڵام بەتێپەڕبوونی مادە توندیەکەی پترکراوە تا توانا بۆ "بیردۆزی شیکاری دەروونی رەخنەیی"THEORY CRITICAL PSYCHOANALYTIC زایەندی نێر و مێ لە "دیاردەزانی" SYMPTOMATOLOGY لە بوردنەکەی بینراوە پاکانەی ئاڵۆزی کارەکانی زایەند وەك هەن. مەبەستی ئەم وتارە پەیڕەوکردنی شیکاری دەروونی‌یەکی ناهۆشیار نی‌یە، بەڵکو خستنە رووی ئەوەی کە هەیە. شیکاری دەروونی دەستەیەك چەمکی هەیە بۆ تێگەیشتنی پیاو وژن و زایەندێتی.

## نوشتەی ئۆدیپس (ئۆدێب)
## THE OEDIPUS HEX

تا دوایی 1920 ەکان، بزووتنەوەی شیکاری دەروونی، بیردۆزی‌یەکی جیای پەرەسەندنی مێ نەبووە. لەجیاتی "گرێی لایەنی کچ" ELECTRA COMPLEX (حەزلێکردنی باوك لەلایەن کچیەوە) لە ئافرەتدا پێشنیاز دەکرا.. ئەوها بیر لە شارەزایی مێ دەکرایەوە کە ئاوێنەی ئەندێشەی گرێی ئۆدیپسی‌یە بۆ نێر ستایشکراوە. کوڕەکە دایکی ویستووە، بەڵام

لەترسی هەڕەشەی گون دەرهێنان (خەساندن) CASTRATION دەستی لێ هەڵگرتووە. کچەکە باوکی ویستووە، لە ترسی دایکی وازی لە بیرکردنەوە هێناوە. ئەم داڕشتنە ئەوهای داناوە کە هەردوو منداڵەکە پێویستی دابین کردنی زایەندییان بووە. هەروەها ئەوهاش دادەنێت کە منداڵەکان (کچ و کوڕەکە) ئەوساکە، پێش ئۆدیپسی، پیاو و ژنی بچووك بوون. چەمکی باری پێش - ئۆدیپسی یارمەتی "فرۆید" و "جەن لامپل دی گرووت" ی دا، بیردۆزی شیکاری دەروونی مێیەتی دابڕێژن. بیرکەی باری پێش - ئۆدیپسی لە ئافرەتدا، ئەو پێش گرییە ژێوارییانەی هەڵتەکاند کە بیرکەی "گرێی ئۆدیپسی کچی" (حەزلێکردنی باوك لەلایەن کچیەوە) ELECTRA COMPLEX ژێر چین کردبوو.

فرۆید هەمووجار دەیوت زایەندێتی SEXISM لاو بەری دەروونییە نەك بەری ژێواری و پەرەسەندن..نووسینەکان زۆر وابووە روون نەبن.. دەربڕینەکانی بواری زۆری بۆ لێکدانەوەی ژێواری هێشتۆتەوە کە لە شیکاری دەروونی ئەمریکی باوە. لە فەڕەنسادا، لەلایەکی تر، لایەنی لە بیردۆزی شیکاری دەروونیدا پێچەوانەی ژێواریکردنی فرۆید de-biologize Freud.. شیکاری دەروونی بە بیردۆزی زانین دادەنێن نەك هی ئەندامانی لەش.. "جاکس لاکان" هاندەری ئەم هێڵەی بیرکردنەوە بووە.. لاکان سوور بووە لەسەر ئەوەی کە فرۆید نەیویستووە هیچ دەربارەی توێژکاری ANATOMYبڵێت.. لەجیاتی یان بیردۆزی فرۆید دەربارەی زمان و واتە رۆشنبیرییەکانی سەپێنراو بەسەر توێژکاری بووە.

## خزمایەتی، "لاکان" و نێرێتی
## KINSHIP, "LACAN" & PHALLUS

لاکان پێشنیازی ئەوە دەکات کە شیکاری دەروونی لێکۆڵینەوەی شوونەکانی TRACES جێماون لە دەروونی کەساندا لە ئەنجامی بەشدارییان لە پێڕۆیەکانی خزمایەتی.

ئایا سەرنج راکێش نییە کە "لێڤی - شتراوس" ، لە پێشنیازکردنی بەکارهێنانی دامەزرەکانی زمان لەگەڵ ئەو بەشەی یاسا کۆمەڵایەتییەکان کە خزمایەتی و پێوەندییەکانی هاوسەری رێك دەخەن، ئێستاکە لایەکی مەیدانی زانیاری داگیرکردووە کە تیایدا فرۆید شوێن بۆ ناهۆشیار دیاری دەکات؟ (لاکان 1968 :48).

خزمایەتی رۆشنبیری کردنی زایەندێتی ژێوارییە لەسەر ئاستی کۆمەڵ، شیکاری دەروونی گۆڕانی زایەندێتی ژێواری کەسان کە رۆشنبیریکراون ستایشی دەکات.

زاراوەزانی TERMiNOLOGYخزمایەتی زانینی پێڕۆیەکەی تێدایە. "کین" Kin جیاکردنەوەی پایە دەگەیەنێت.. بۆ نموونە، لە "دوورگەی ترۆبریاند" دا پیاوێك ژنانی هۆبەی خۆی بەناوی "خوشك" بانگ دەکردن. ژنانی ئەو هۆبانە کە دەتوانن ژن بهێنن، بەناوێك ناویان دەبات کە گونجاوی شووکردنیان بێت.. کە پیاوی "ترۆبریاند" فێری ئەم ناوانە دەبێت، ئەوساکە دەزانێت کام ژن داوابکات. لە بەرنامەی "لاکان" دا، قەیرانی ئۆدیپسی روو دەدات کەی منالێك فێری رێساکانی زایەندی ببێت لەنێو زاراوەکانی خێزانی و خزمایەتیدا.. قەیرانەکە دەست پێدەکات کەی منالەکە شوێنی خۆی لە پێڕۆیەکەدا بزانێت هەمان قەیران بە ئەو چارە دەکرێت کە منالەکە شوێنی خۆی لە ئەو پێڕۆیەدا قایل بێت. کەی منالەکە "ماوەی ئۆدیپسی" جێ هێشت، حەزی زایەندی و پێناسی نێر و مێ

بەپێی ڕۆشنبیریی (داب و نەریتی) کۆمەڵەکەی ڕێک دەخرێت.

"گرێی ئۆدیپسی" دەزگای بەرهەم هێنانی کەسێتی زایەندیە.. بەڵگەنەویستە کە کۆمەڵانی مرۆڤایەتی خووی جیا لە مێشکی ڕۆڵەکانیان دەچێنن کە گونجاوی باری کۆمەڵایەتی یانە. بۆ نموونە، "ئی. پی. تۆمسن 1963" لە گۆڕانی پێکهاتنی کەسێتی چینی کرێکارانی ئینگلیز دەدوێت لە شاگردی‌یەوە بۆ وەستایی .. هەر شێوە کۆمەڵایەتی‌یەی کارێک جۆرە کەسێتی‌یەکی تایبەت دەخوازێت، شێوە کۆمەڵایەتی‌یەکانی زایەند و نێر و مێ جۆری تایبەتی کەسان دەخوازێت. بەشێوەیەکی گشتی، گرێی ئۆدیپسی سازدەری کەسانی زایەندی گونجاون.

(هەروەها تەماشای قسەکردن لە شێوە جیاوازەکانی "کەسێتی مێژوویی" لە "ئاڵتۆسەر و بالیبار" 1970 :112، (25-53 بکە).

لەبیردۆزی شیکاری دەروونی "لاکان" دا زاراوەکانی خزمایەتی ئەو پێوەندی‌یانە دەگەیەنن کە کار و شوێنی هەر کەسێک یان شتێک لە شانۆی "ئۆدیپسی"دا دیاری دەکرێن.. بۆ نموونە، "لاکان" ئەرکی باوک و باوکەکی تایبەت کە جەستەی ئەو ئەرکە دەکات جیایان دەکاتەوە.. بەهەمان شێوە جیاوازی ئەندام و زانین.

ئێستاکە دەگەڕێینەوە بۆ پیاو و ژنی "پێش ئۆدیپسی"، لەسەر سنووری نێوان ژێواری BIOLOGY و ڕۆشنبیری دادەنیشن. "لێڤی - شتراوس" ڕێنەدراوەکانی جووت بوونی نارەوای خزمانی نزیک لەسەر سنوورەکە دادەنێت، قسە لەوە دەکات کە دەسپێکی گۆڕینەوەی ژنان بنەچەی کۆمەڵ پێک دەهێنێت. بەم واتەیە، ڕێ نەدراوەکانی جووت بوونی نارەوای خزمانی نزیک و گۆڕینەوەی ژنان ناوەڕۆکی سەرەتای ڕێکەوتنی کۆمەڵایەتی‌یە (تەماشای ساهلینس 1972 بەندی 4 بکە).

تەنگەژەی ئۆدیپسی بە هەندێ بابەت پەلە پێکراوە.. منالان جیاوازی دوو زایەندەکەیان بۆ دەردەکەوێت.. هەروەها ڕێ نەدانی جوون بوونی خزمانی نزیک دەزانن - لە ئەم بارەدا دایک بۆ کوڕی ناشێت وەی باوکە.. بۆشیان روون بۆوە کە نێر و مێ هەمان ماف و ئایندەیان نی‌یە.

لە رەوەنی ڕۆژاندا، کوڕ لە ترسی گون دەرهێنانی (خەساندنی) لەلایەن باوکی‌یەوە لەدایکە دوور دەکەوێتەوە. بەرامبەر بە دان نانی کوڕەکە بە مافی باوکی لەدایکی، باوکەکە کوڕەکەی ناخەسێنێت.. کوڕە دەبێت چاوەڕێ بکات تا ژنی خۆی دەبێت.

ئەوەی لە کچەکە ڕوودەدات ئاڵۆزترە.. ئەویش وەك کوڕەکە پێ دەزانێت کە جووت بوونی لەگەڵ خزمانی نزیک ڕێ نەدراوە.. ئەو ڕێنەدانە بۆ کوڕەکە لەگەڵ چەند ژنێکی دیاریکراوە.. بۆ کچەکە ڕێ نەدانە لەگەڵ هەموو ژنان. ڕێسای جووت بوونی زایەندی نێر لەگەڵ مێ کە زاڵە، باری کچەکەی ناخۆش کردووە و هیچیشی بۆ ناکرێت، ژن تەنیا دەکرێت لەگەڵ پیاو هاوسەر بێت.

### ئۆدیپۆس سەرلێدراوەتەوە
### OEDIPUS REVISITED

بیردۆزی شیکاری دەروونی دەربارەی مێیەتی ئەوهای دەبینێت کە پەرەسەندنی مێیەتی بەزۆری لەسەر ئازار و دەستەمۆکردن دامەزراوە، هەندێ جێ گۆڕکێی حەز وەردەگرێت بۆ لێکدانەوەی کە بۆچی یەکێك دەبێت خۆشی لە بوونی بە ژن وەربگرێت. لەم خاڵەدا دەمەتەقی‌یە کۆنەکانی ژێواری گەڕانەوەیەکی سەرکەوتووانە دەکات. جێ گۆڕکێی حەز پێکهاتووە لە خۆشی بینین لە ئازاری ڕاهاتووی

ژنان لە بەرهەم هێنانەوەدا، کە بێ بنکردن و منالّ بوون ئازارە، ئایا بەجێتر نابێت لە تێکڕای رەوتەکە بپێچرێتەوە؟ ئەگەر ژنان لە دۆزینی جێی خۆیان لە پێڕۆی زایەندیدا، لە حەزی زایەندی کراون و رووەو بەفاڵهێنانی زایەندی لادەرانە ناچارکراون، بۆ شیکاران لە پێکهێنانە ناباوەکان نادوێن، لەجیاتی پاکانەکردنی کۆنەکان؟

بیردۆزی فرۆید دەربارەی مێیەتی تووشی رەخنەی یەکسانی خوازان هاتووە.. بە ئەو رادەیەی کە پاکانەی مل کەچ کردنی ژن دەکات، ئەم رەخنەیە پەسەندە.. بەرادەی کە ستایشی کردەیەکە بۆ مل کەچ کردنی ژنان، ئەم رەخنەیە هەڵەیە. وەك ستایشێك کە چۆن نێری ژنان ماڵی دەکات و کاریگەرییەکانی لە ژناندا لە ماڵی کردنیان، بیردۆزی شیکاری دەروونی هاوتایی نییە (هەروەها تەماشای میچل 1971 و 1974، لاش 1974 بکە). لەبەرئەوەی شیکاری دەروونی بیردۆزی نێر و مێیە، لەبیردەباتەوە کە خۆکوشتنەکەی دەبێت بە بزووتنەوەیەکی رامیاری بۆ نەهێشتنی دەسەلاتی زایەندی (یان زایەند بەخۆی). ناتوانین شتێك هەڵبوەشێنین کە بەکەمی بزانین یان تێی نەگەین. چەوساندنەوەی ژنان قووڵە، مووچەی یەکسان، کاری یەکسان، هەموو رامیارانی ئافرەت لە جیهاندا ناتوانن رەگەکانی زایەندێتی هەڵبکێشن. "لێڤی - شتراوس" و "فرۆید" ئەوە روون دەکەنەوە چی دەبێت ئەگەر بێت و بەشانی دامەزرە قووڵەکانی چەوساندنەوەی زایەند بە چاکی تێیان نەگەن.

## ژنان یەك دەگرن بۆ نەهێشتنی پاشماوەی رۆشنبیریی ئۆدێپسی

## WOMEN UNITE TO OFF THE OEDIPAL RESIDUE OF CULTURE

نووسینەکانی "فرۆید و لێڤی - شتراوس" کە بە توندی جووتی یەکترن سەرنج راکێشە. پێڕۆیەکانی خزمایەتی دابەش بوونی زایەندەکانی دەوێت.

دەمی ئۆدێپسی زایەندەکان دابەش دەکات. پێڕۆیەکانی خزمایەتی دەستە رێسایەکی هەڵسوڕاندنی زایەندێتی دەگرێتەوە. تەنگەژەی ئۆدێپسی تێگەیشتنی ئەو رێساو رێنەدراوانەیە. حەزپێکردنی تەوزیمی زایەندەکەی تر (حەزی نێر بۆ مێ و بەپێچەوانەش) بەری خزمایەتییە. دەمی ئۆدێپسی ئارەزووی زایەندی جیاواز (نێر بۆ مێ) پێك دێنێت. خزمایەتی لەسەر جیاوازی زۆری نێوان مافەکانی پیاوان و ژنان دامەزراوە. گرێی ئۆدێپسی مافەکانی نێر بە کوڕ دەدات، کچ ناچار دەکات لەگەڵ مافی کەمتر خۆی بسازێنێت.

ئەم جووتییە لەنێوان فرۆید و لێڤی - شتراوس لە ناوەڕۆکیدا قسەلێکردنە کە پێڕۆی زایەندی نێر و مێ ئێستاکەش بە سەرەتاکانی دیاریکراو لەلایەن "لێڤی - شتراوس" ەوە رێکخراون، سەرەڕای تێکڕای ناهاوچەرخی خووی بنکەی زانیارییەکانی. نزیکترین زانیاری کە فرۆید بیردۆزییەکانی لەسەر دامەزراندووە مانەوەی ئەو دامەزرە زایەندییانە دەردەخات. ئەگەر خوێندنەوەم دەربارەی فرۆید و لێڤی - شتراوس راست بێت، پێشنیازی ئەوە دەکات کە بزووتنەوەی یەکسانی خوازانی نێر و مێ پێویستە هەوڵ بدات قەیرانی رۆشنبیریی ئۆدێپسی چارە بکات بە دان نان بە زاڵی زایەند و نێر و مێ بەشێوەیەك کە هەر شارەزاییەکی ئۆدێپسی کەسێك کەمتر روخێن دەبێت. لایەنەکانی ئەو جۆرە ئەرکە گرانن ئەندێشە بکرێن، بەلام بەلای کەمی هەندێ مەرج دەبێت بهێنرێنە دی.

چەند توخمێکی "تەنگەژەی ئۆدێپسی" دەبێت بگۆڕدرێن بۆئەوەی دەمەکە ئەنجامی خراپی بەسەر لاوی مێ نەبێت. دەمی ئۆدێپسی پێچەوانە لە کچەکە پێك دەهێنێت بە دانانی

خواستی دژەیەك بەسەریدا. لەلایەکەوە، خۆشەویستی کچ بۆ دایك ئەنجامی ئەرکی دایکە بە بەخێوکردنی منداڵ. کچەکە ئەوساکە ناچار دەکرێت دەست لەو خۆشەویستییە هەڵگرێت لەبەر کاری زایەندیی مێ - بۆ پیاوە. ئەگەر دابەش بوونی زایەندی کار بەشێوەیەك بوایە کە لاوانی نێر و مێ وەك یەك بایەخیان بە منداڵ دایا، مەرامی هەڵبژاردەی سەرەتایی نێرەمووك دەبێت. ئەگەر حەزی زایەندی جیاواز (نێر بۆ مێ) تەوزیمی نەبوایە، ئەم خۆشەویستییە زووە کپ نەدەکرا، نێریش بەهای خۆی زیاتر نەدەدرایە. ئەگەر پێڕۆی خاوەنی زایەندی بەشێوەیەك ڕێك دەخرایەوە کە پیاوان مافی زیاتریان لە ژنان نەبێت (ئەگەر گۆڕینەوەی ژنان نەبوایە) و زایەندی نێر و مێ نەبوایە، تێکڕای شانۆگەری ئۆدێپسی دەبووە باوەڕێکی بەسەرچوو. بە کورتی، یەکسانی خوازیی نێر و مێ پێویستە داوای شۆڕشێك لە خزمایەتیدا بکات.

ڕێکخستنی زایەندو نێرو مێ جارێکیان چەند ئەرکێکی بووە بێجگە لە خۆی - کۆمەڵی ڕێکخستووە. جۆرەکانی پێوەندییەکانی زایەندێتی لە رابردووی مرۆڤایەتی کە ئێستاکەش بەسەر ژیانی زایەندیمان زاڵە، بیرو رامانی دەربارەی پیاوان و ژنان و ڕێبازی پەروەردەکردنی منداڵانمانی دامەزراندووە. بەڵام ئەو ئەرکانەی کە جاران دەیان کرد ئێستاکە ئەو تواناییانەیان نەماوە. یەك لە رووالەتە زەقەکانی خزمایەتی ئەوەیە بە پلە لە ئەرکەکانی رووتکراوەتەوە - لە ئەرکە رامیارییە، ئابوورییە، فێرکاری و ڕێکخستنەکییەکانی - کەم کراوەتەوە تا رووت ترین ئێسقانەکانی - زایەند و نێر و مێ.

ژیانی زایەندیی مرۆڤ هەردەم تووشی داب و نەریت و دەست تێخستن بووە. هیچ بەتەواوی سروشتی نابێت، چونکە جۆرەکانمان کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و قسەکەرن. زۆریی کێوێتی زایەندێتی منداڵانە هەردەم ماڵی دەکرێت. ڕووبەڕووبوونی نێوان منداڵانی ناپێگەیشتوو و بێ دەسەڵات لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی پەرەپێدراوی ئەوانەی لە خۆیان گەورەترن هەردەم لەوانەیە پاشماوەی پەشێوی جێ بهێڵن. بەڵام ڕێباز و مەرامەکانی ئەم کردەیە مەرج نییە بە زۆری لە هەڵبژاردنی هۆشیارانەوە سەربەخۆ بێت.

پەرەسەندنی رۆشنبیری هەلی راگرتنی زاڵی هۆیەکانی زایەندێتی و بەرهەم هێنانەوەو کۆمەڵایەتی کردن و بڕیاردانی هۆشیارانە بۆ ئازادکردنی ژیانی زایەندی لە پێوەندییە کۆنەکانمان دەداتێ. لە دواییدا، شۆڕشێکی سەرتاپای یەکسانی خوازانی نێر و مێ لە ژنان زیاتر ئازاد دەکات. شێوەکانی دەربڕینی زایەندی ئازاد دەکات، کەسێتی مرۆڤ لەکۆتەکانی زایەندی نێر و مێ ئازاد دەکات.

## "بابا، بابا، هەی زۆڵ، من دەرباز بووم" سیلڤیا پلاث

"Daddy, daddy, you bastand, Iam thnough Sylvia Plath"

لە ئەم وتارەدا هەوڵم داوە بیردۆزییەك دەربارەی چەوساندنەوەی ژنان بە وەرگرتنی چەمکەکانی مرۆڤزانی و شیکاری دەروونی دابنێم. بەڵام لێڤی - شتراوس و فرۆید لەچێوەی دابێکی رۆشنبیرانە دەنووسن کە دروستکراوی رۆشنبیرییەکە کە تیایدا ژنان چەوساوەن. ترسناکی لە پرۆژەکەمدا ئەوەیە کە زایەندێتی لە دابێکدا کە ئەوان بەشێکن لە هەر "وام وەرگرتنێکدا" borrawing لایەنی ئەوەیەرابکێشرێت. "ناتوانین تاکە پێشنیازێکی روخێنەر بڵێین کە تاکو ئێستاکە نەچووبێتە شێوەو بیرساو ناوەڕۆکی خواستەکانی ئەوەی کە بەتەواوی دەیەوێت هەوڵ بدات" (دیریدا 1972

:250). ئەوەی دەخلیسکێتە ناو زلە. هەردووک "شیکاری دەروونی" و "مرۆڤزانی دامەزرەکی" بە یەک واتە، هەرە بیروباوەڕانی مشت و ماڵکراوی زایەندێتین.

بۆ نموونە، لیڤی – شتراوس ژنان وەک وشەی خراپ – بەکارهاتوو دەبینێت کەی نەگەیەنرێن یان نەگۆڕدرێنەوە. لە دوا لاپەڕەی نووسراوەیەکی زۆر درێژ، تێبینی دەکات کە ئەمە شتێکی پێچەوانە لە ژنان دروست دەکات کە ژنان لە هەمان کاتدا قسەکەر و قسەکراون. تەنیا لێدوانی دەربارەی ئەم پێچەوانەیە ئەمەیە:

بەڵام ژن ناتوانێت لە نیشانەیەک زیاتر بێت، کە بگرە لە جیهانی پیاودا تا ئێستا کەسێکە، کە وەک نیشانەیەک ناساندراوە دەبێت وەک دروستکەری نیشانان دانی پێ‌بنرێت.

لە پەیڤینی هاوسەری پیاوان، ژنان بە پوختی قسەیان لەسەر نەکراون، چونکە ئەگەر ژنان بە گشتی بابەتێکی دیاریکراوی نیشانان بن، بۆ جۆرە پێوەندییەک دانراوە، هەر ژنە جۆرە بەهایەکی تواناکەی دەپارێزێت.. پێش و پاش شووکردن، بۆ بەشداری کردن لە رەوەنێکدا. جیاواز لەگەڵ وشان کەهەموو دەبنە نیشانە، ژن پێکەوە بە نیشانەو بەها ماوەتەوە. ئەمە لێکی دەداتەوە بۆ پێوەندی نێوان نێر و مێ ئەو دەوڵەمەندییە کاریگەرییەی پاراستووە، جۆش و نەدیاری کە بێ گومان لە بنچینەدا چووەتە ناو تێکرای جیهانی پێوەندییەکانی مرۆڤەوە. (لیڤی – شتراوس 1969 :496، نووسینەکانم بە پیتی لار).

ئەمە وتەیەکی ئاسایی بەدەرە.. بۆ ئەو، لە ئەم خاڵەدا، نیگەرانە دەربارەی ئەوەی کە پێڕۆیەکانی خزمایەتی بە ژنانی دەکەن، لەجیاتی هێنانە پێشی یەک لە گەورەترین لێکردوەکانی هەموو دەمەکان وەک رەگی گێڕانەوەی دلداری؟

هەست مردووەتییەکی پێچوو دەردەخرێت لەنێو شیکاری دەروونی بە پێچەوانەێتی کە بەهۆیەوە لەناوەڕۆکە رەخنەییەکانی بیردۆزی خۆی وەردەگرێت. بۆ نموونە، فرۆید دوودڵ نەبوو لە دان نان کە دۆزینەوەکانی پرسێک دەربارەی لە روو وەستانی رەوشتی باو دەخاتە روو:

ناتوانین لە دیتنی بەچاوی رەخنەوە لابدەین، بۆمان دەرکەوتووە کە ناکرێت پشتیوانی رەوشتی زایەندیی باو بکەین یان توند ئەو هۆیانە پەسند بکەین کە بەهۆیانەوە کۆمەڵ هەوڵ دەدات گیروگرفتە زایەندییە کارەکییەکانی ژیان رێک بخات. ئێمە بە ئاسانی دەتوانین ئەوەی کە جیهان دەستووری رەوشتی ناودەنێت قوربانی زۆرتری دەوێت لەئەوەی کە بهێنێت.. رەفتارەکەی نە پاکی دارێژراو و نە بەژیری دامەزرێنراوە (فرۆید 1943 : 376 – 77، جەختەکانم).

هەرچۆنێک بێت، کەی شیکاری دەروونی بە ئاسان کردنی یەکسان بیخاتە روو کە پێکهاتنە ئاساییەکانی کەسێتی مێ لادانی زایەند و رق لەخۆبوونەوە و خۆدانە دەستن، بڕیارێکی پێچوو نەدراوە. لەجیاتی، دوو پێوانەیی وەرگێڕان بەکارهێنراوە. لادانی زایەندی بۆ پیاوان خراپە، بنچینەییە بۆ ژنان. خۆدانە دەست لە پیاودا شکستییە، کەچی نەبوونی خۆدانە دەست لە ژناندا شکستییە.

ئەمە ئەو دوو پێوانەییەیە کە توانا بە نۆشدەران دەدات هەوڵ بدەن ژنان بگونجێنن بۆ کارێک کە رووخاندنییەکەی بە روونی لە بیردۆزییەکانی باسکراون. هەمان هەڵس و کەوتی ناگونجاوە کە رێی پسپۆڕان دەدات بزانن پانۆکێ وەک گیروگرفتێک چارەسەر بکرێت، نەک وەک بەرهەڵستی بارێکی خراپ کە بیردۆزییەکەیان پێشنیازی دەکات.

خاڵ هەیە لە نێو شیکارییەکەی مێیەتیدا کە یەکێك لەوانەیە بڵێت، "ئەمە چەوساندنەوەی ژنانە"، یان "ئێمە دەتوانین بە ئاسانی بیخەینە روو کە ئەوەی جیهان ناوی دەنێ مێیەتی قوربانی زۆرتری دەوێت لە ئەوەی دەیهێنێت." بە تەواوی لەو خاڵانەدایە کە ناوەڕۆکەکانی بیردۆزییەکە لەبیرکراون، دانراونەتەوە بە داڕشتنەکانی کە مەرامەکانیان هێشتنەوەی ئەو ناوەڕۆکانەیە بەتوندی خراونەتە بیردۆزی ناهۆشیار. ئەم خاڵانەیە کە هەموو جۆرەکانی کەرەستە کیمیاییە مەتەڵەکییەکان و خۆشییەکانی بە ئازار و مەرامە ژیوارییەکان گۆڕدراون بۆ خەملاندنێکی رەخنەییانەی تێچوونەکانی مێیەتی. ئەم گۆڕینەوانە دیاردەکانی مل کەچ کردنی بیردۆزین.. لەمەدا لەگەڵ یاساکانی شیکاری دەروونی گونجاو نین. رادەی ئەم پاکانە کردنانەی مێیەتی دژی بیرسای شیکاری دەروونی بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ پێویستی دامرکاندنی ناوەڕۆکە بنەڕەتی و یەکسانی خوازییەکانی نێر و مێی بیردۆزی مێیتی (لێدوانەکانی "دۆتش" نموونەی چاکی ئەم کردەی جێگرتنەوە و مل کەچ کردنەن).

لێدوانی پێویست بۆ پێچواندنی "لیڤی - شتراوس" و "فرۆید" بۆ بیردۆزی یەکسانیخوازیی نێر و مێ تارادەیەك شەلە... من بۆ چەند هۆیەك بەکارم هێناوە: یەکەم، لەکاتێکدا نە لیڤی - شتراوس و نە فرۆید لە زایەندێتی بێگومانی ئەو پێڕۆیانەی ستایشیان کردووە ناپرسن، ئەو پرسانەی کە پێویستە روون بکرێنەوە بەشێوەیەکی دەرنەبوو دیارن.. دووەم، کارەکانیان توانامان دەداتێ زایەند و نێر و مێ لە "شێوازی بەرهەم هێنان" جیا بکەینەوە و وەڵامدانەوەی هەندێ لایەنی بۆ لێکدانەوەی چەوساندنەوەی زایەند وەك دانەوەی هێزەکانی ئابووری. کارەکانیان چێوەیەکی سازدراوە کە تیایدا تەواوی کێشی زایەندێتی و هاوسەری دەکرێت بخرێنە شیکارییەکی چەوساندنەوەی زایەند. پێشنیازی پێزانینی بزوتنەوەی ژنان دەکات وەك پێچووی بزووتنەوەی چینی کرێکار.. هەر یەکەیان ئاراستەی سەرچاوەی جیاوازی بێزاری مرۆڤ دەکەن.

بە بینینی مارکس، بزووتنەوەی چینی کرێکاران زیاتر لە رزگاربوون لە چەوسانەوە دەکات.. هەروەها توانای گۆڕینی کۆمەڵی هەیە، لەپێناو ئازادکردنی مرۆڤایەتی ، بۆ دروستکردنی کۆمەڵی بێ چین. لەوانەیە بزووتنەوەی ژنان ئەرکی ئەنجامدانی هەمان جۆری گۆڕینی کۆمەڵایەتی بۆ پێڕۆیەك ببێت، کە مارکس تەنیا پێزانینی هاوبەندییەکی ناتەواوی بووە. هەندێ شتی لەو جۆرە لە "ویتیگ 1973" هەیە - زۆرداری چەکدارانی ئەمەزۆن رێبازێکی کاتی گەیشتنە کۆمەڵی بێ زایەند.

پێڕۆی زایەندی نێر و مێ بەشێوەی چەسپاو ستەمکار نییە و زۆر لە ئەرکە ئاساییەکانی لەدەست داوە. هەرچۆنێك بێت، بەنەبوونی نەیاری سست نابێت.. ئێستاکەش باری کۆمەڵایەتی زایەند و نێر و مێ، کۆمەڵایەتی کردنی لاو، سازدانی دوا پێشنیازەکان دەربارەی سروشتی مرۆڤ هەڵدەگرێت..

راژەی ئامانجە ئابووری و رامیارییەکان دەکات، بێجگە لە ئەوانەی کە لە بنەچەدا بۆ لایەنگری کردنن (سکۆت 1965). پێڕۆی زایەندی نێر و مێ پێویستە لەڕێی کاری رامیارییەوە رێك بخرێتەوە.

لەکۆتاییدا، لێکدانەوەی لیڤی - شتراوس و فرۆید پێشنیازی هەندێ بینین دەربارەی رامیاری یەکسانی خوازی نێر و مێ و ئەندێشەی یەکسانی خوازی نێر و مێ. پێشنیازی ئەوە دەکات کە ئێمە نابێت ئامانجمان نەهێشتنی پیاوان بێت، بەڵکو نەهێشتنی ئەو پێڕۆیە کۆمەڵایەتییە بێت

کە زایەندێتی نێر و مێی دروستکردووە. من وێنەی دایك سالاریی ئەمەزۆن دەبینم، کە تیایدا پیاوان کەم کراونەتە کۆیلە یان لەبیرکراون، ناگونجاو و ناخۆشەویستە. ئەو جۆرە وێنەیە نێر و مێ و دابەش بوونی زایەندەکان دەپارێزێت.وێنەیەکە کە بە ئاسانی لێدوانەکانی ئەوانەی کە کێشەکانیان هەر بۆ زاڵی نێر لەسەر جیاوازییە ژێوارییە گرنگ و بنبڕنەکراوی نێوان دوو زایەندەکە هەڵدەگێڕێتەوە.

بەڵام ئێمە هەر تەنیا وەك ژنان ستەملێکراو نین، ئێمە ستەملیکراوین بە ئەوەی دەبێت ژن بین، یان پیاو بین بەپێی بارەکە چۆن بێت. من خۆم هەست دەکەم کە بزووتنەوەی یەکسانی خوازی نێر و مێ دەبێت پتر لە خەون بە نەهێشتنی ستەملێکردنی ژنان ببینێت.. پێویستە خەون بە نەهێشتنی زایەندێتییە تەوزیمییەکان و کارەکانی زایەند ببینێت، ئەو خەونەی کە من دەیبینم کە زۆرجار خۆی دێنێتە پێش خەونی کۆمەڵی نێرەمووکی و بێ نێر و مێیە (هەرچەندە بێ زایەند نییە)، کە تیایدا پێکهاتنی زایەندیی کەسێك بێ پێوەندییە بە ئەو کەسە، ئەوەی کەسێك دەیکات و لەگەڵ کێ "جووت دەبێت" (دەیکات).

## ئابووریی رامیاری زایەند
## THE POLITICAL ECONOMY OF SEX

شتێکی خۆش دەبێت لێرەدا لەگەڵ ناوەرۆکەکانی مێیتی و خۆشی ئازادی بەیەکداچووی نێوان فرۆید و لیڤی - شتراوس بتوانین کۆتایی پێ بێنین. بەڵام دەبێت بە تاقیکارییەوە پێشنیازی هەنگاوی داهاتووی بەرنامەکە بکەم: شیکاری مارکس دەربارەی پێڕۆیەکانی زایەند / نێر و مێ. پێڕۆیەکانی زایەندی نێر و مێ بەری مێژوویی ژێیری مرۆڤ نین، بەرهەمی مێژوویی چالاکی مرۆڤن.

ئێمە، بۆ نموونە، پێویستیمان بە شیکاری پەرەسەندنی گۆڕینەوەی زایەندی لەگەڵ هێڵەکانی لێدوانەکانی مارکس لە "سەرمایە" دا دەربارەی پەرەسەندنی پارە و شمەك. پێڕۆیەکانی زایەند/ نێر و مێ، ئابووری و رامیاری هەیە کە بە چەمکی گۆڕینەوەی ژنان شێوێندراون.. بۆ نموونە، پێڕۆیەك کە تیایدا ژنان بکرێت بگۆڕدرێنەوە تەنیا یەك بە ئەوی تر کاریگەریی جیاوازی لەسەر ژنان دەبێت لەوەی شمەك هەبێت یەکسان بێت بە ژن.

ئەو هاوسەرییە لە کۆمەڵانی ساکاردا گۆڕینەوەی تێدایە کە تاڕادەیەك بڕکەی شێواوە و زۆرجار شیکاری پێڕۆیە کۆمەڵایەتییەکانی تێکداوە. کێشەی هەرە توندی گۆڕینەوەی خوشکانە کە لە پێشدان لە هەندێ بەشی ئوستراليا و ئەفریقا دەکران. لێرەدا زاراوەکە واتای وردی فەرهەنگی (وەك وەرگرتن بەرامبەر بە) ی هەیە، "پێدان و وەرگرتن بەشێوەی گۆڕینەوانە".

لە بۆچوونی جیاواز قەدەغەکردنی جووت بوونی نارەوای خزمانی نزیك لەسەر ئاستی جیهاندا ئەوە دەگەیەنێت کە پێڕۆیەکانی هاوسەری بەپێویست گۆڕینەوەی خزمانی بۆ هاوسەری تێدایە.. بەڵام لە زۆربەی کۆمەڵان هاوسەری بە نێوانکاری دەکرێت.

ئەو پێڕۆیانەی کە تیایاندا بەرامبەر بۆ ژنێك نییە.. بۆئەوەی ژنی ببێت پیاوێك پێویستە کچێك، خوشکێك یان خزمێکی تری مێی هەبێت کە مافی بەخشینی هەبێت. "لەلە" و "کۆما" نموونەی ئەو بارەن.. نەخشەی پیاوانی "لەلە" بۆ سەپاندنی خواست بەسەر کچێك کە هێشتا لەدایك نەبووبێت!! (دۆگلاس 1963). شووکردنی کچە "کۆما" یەك بە تەپکەیەکی ئاڵۆزی چەند وامێك دیاری دەکرێت.. کچەکە هیچی بۆ نامێنێتەوە بۆ هەڵبژاردنی مێردی..

ئاسایی دژی ئارەزووی خۆی بە شوودەدرێت.. زاوا تیرێك دەگرێتە نێوان لینگەکانی وەك نیشانەی بەستنەوەی.. ژنە لاوەکان بەشی زۆری هەڵدێن و بە فێڵ و پیلانی کەس و کاریان دەگێڕدرێنەوە (ڕەیی 1959).

لە کۆمەڵی تر بۆ ژنان بەرامبەر هەیە.. دەکرێت ژنێك بکرێتە مارەیی، مارەییش بکرێتە ژن. جیاوازی و گۆڕانی ئەو پێڕۆیانە دەکەوێتە سەر جۆری گوشار بەسەر ژناندا. شووکردنی ژنە "مەڵپا" یەك دانەوەی وامی پێشوو نییە. هەر سەودایەکی هاوسەری سەربەخۆیە.. مارەیی بەشێوەی بەرازو مووروو بێت، وامەکە دەکوژێنرێتەوە. ژنە "مەڵپا" یەك بواری لە هەڵبژاردنی مێردی لە ژنە "کۆما" یەك زیاترە. لەلایەکی ترەوە، چارەنووسەکەی بەستراوەی مارەیییە، ئەگەر خزمی مێردی لەسەرخۆ بن بۆ بەخشینی، خزمی خۆی لەوانەیە هانی بدەن جێی بهێڵێت. لەلایەکی ترەوە، ئەگەر خزمی نزکیی خۆی بەبڕی ماوەی بەخشینەکە قایل بن، بۆ بەجێهێشتنی مێردەکەی پشتی ناگرن. لەوەش زیاتر، خزمە پیاوەکانی مارەییەکە بۆ مەرامەکانی خۆیان بەکاردەهێنن.. بۆ ژن هێنانی خۆیان (ستراثرن 1972).

لە هەندێ کۆمەڵاندا، وەك "نوەر" تەنیا سامانی بووك دەتوانرێت بکرێتە بووك، لە هی تر دەتوانرێت بکرێتە شتی تر، وەك پایەی رامیاری. لە پێڕۆیی "پیاوی گەورە" ی بەرزایی گینیای نوێ"، ئەو کەرەستەی کە بۆ ژنان دەستاودەست دەکات، هەروەها لەو گۆڕینەوانە دەیکات کە دەسەڵاتی رامیاری لەسەر دامەزراوە.. کاربەدەستانیان پێویستی یان بە شتی بەهادار هەیە بۆ بەخشین، پشت بەستەی داهاتن.

بەکورتی، پرسی تری پێڕۆی هاوسەری دەربارەی ئایا ژنان دەگۆڕنەوە یان.. ئایا ژنەکە بۆ ژنێك کڕاوە یان بەرامبەری تر هەیە؟ ئایا ئەم بەرامبەرییە تەنیا بۆ ژنانە، یان دەکرێت بکرێتە شتی تر؟ ئەگەر بکرێت بکرێتە شتی تر، ئایا دەکرێتە دەسەڵاتی رامیاری یان سامان؟ لەلایەکی ترەوە، ئایا سامانی بووك تەنیا لە گۆڕینەوەی هاوسەری وەدەست دێت، یان لەشێوەی تر؟ ئایا ژنان لەرێی سامان کۆکردنەوە کەڵەکە دەکرێن؟ ئایا سامان بە فرۆشتنی ژنان پێك دێت؟ ئایا پێڕۆی هاوسەری بەشێکی پێڕۆی چەند چینییە؟

ئەم دوا پرسانە ئاماژە بۆ ئەرکەکی تری ئابووریی رامیاریی زایەند دەکات. خزمایەتی و هاوسەری هەردەم بەشێکی تێکڕای پێڕۆیە کۆمەڵایەتییەکانە و هەردەم بەستراوەی ناو رێکخستنە ئابووری و رامیارییەکانن.

"لێڤی – شتراوس"... بەڕاستی قسە لەوە دەکات کە ناوەڕۆکە دامەزرەکییەکانی هاوسەرییەك تەنیا دەکرێت تێی بگەیت ئەگەر ئێمە وەك یەك شت لە هەموو زریزەکانی سەوداکارییەکانی نێوان دەستانی خزم بیری لێبکەینەوە. تا ئێرە باشە. بەڵام لە هیچ لەو نموونانەی کە لە نووسراوەکەیدا دەیدات ئەم سەرەتایە هەڵناگرێت.. گۆڕینەوەیی پابەندی خزمایەتی تەنیا نموونەی هاوسەری نییە، بەڵکو سەوداکاریی ئابووریو رامیاری و دەستووری مافەکانی ماڵ و زەوی بەکارهێنانیشە. ناکرێت وێنەیەکی سوودبەخش کە "چۆن پێڕۆیەکی خزمایەتی کاردەکات" ساز بدرێت مەگەر ئەم چەند رووالەتە یان ناوەڕۆکەکانی رێکخستنی خزمایەتی پێکەوە دادەنرێت (لیچ 1971 :90).

لەنێو، "کاچین" دا، پێوەندی کرێگرتە بە خاوەن زەوی، هەروەها پێوەندییە لە نێوان زاوا و خەزوور. "رێبازی دەرکەوتنی هەر جۆرە مافێکی زەوی، نزیکەی لە هەموو کێشەکان بەرامبەرە بە شووکردنی ژنێك لە خزمانی دەرەبەگ" (هەمان سەرچاوە:88).

لەڕووی ئابووری‌یەوە، ئەنجامی هاوسەری خزمانی نزیك (ئامۆزا و خالۆزا و پوورزا) ئەوەیە کە نەوەی گەورەی خێزان بەردەوام سامان دەداتە نەوەی سەرۆك لەشێوەی سامانی بووك. پێدانەکە لەڕووی شیکاری‌یەوە، وەك کرێیەك لەلایەن کرێگرتەی خاوەن زەوی بدرێتە دەرەبەگی لەپێش. گرنگترین بەشی ئەم پێدانە لەشێوەی شمەکی لەکارهێنانە – وەك ئاژەڵ. سەرۆکەکە ئەم سامانەی کە شیاوی لەناوچوونە دەکاتە پایەی ناتێکچوو لەڕێی خوانێکی رووەتی. لەکارهێنە دوایی‌یەکانی شمەکەکان لەم رێیەوە بەرهەم هێنی بنەچیین (هەمان سەرچاوە:89).

بگرە هەندێ زانینی کەمکراوە و دوورخراوە پێشنیازی ئەوە دەکەن کە پێڕۆیەکانی هاوسەری لەوانەیە لە ناوەڕۆکی پەرەسەندنی سەردەمەکانی کۆمەڵایەتیدا بن. لەوانەشە لە پەرەسەندنی بارە زووەکاندا بن، یەکەم هەوڵی یەکخستنی رامیاری کە ئەنجامی پێکهێنانی دەوڵەتی "مەدەغەشکەر" بوو روویداوە.. کەی سەرۆکێك ناو و دەسەڵاتی لەڕێی حەزی ژن هێنان و نەوە زۆرکردن بەسەر چەندین ناوچەدا بسەپێنێت. (هێنری رایت، پێوەندی کەسانە).

ئەو نموونانە – وەك "کاچین" و "ترۆبریاند"، ئەوە دەگەیەنن کە پێڕۆیە زایەندی‌یەکان لە دوا شیکاریدا، ناتوانرێت لە دابڕینێکی تەواودا تێی بگەیت. شیکاری‌یەکی تەواوی ژنان لە کۆمەڵێکدا یان بە درێژایی مێژوو، دەبێت ژمێرە بۆ هەموو شتێك بکات: پەرەسەندنی شمەك پێك دێت لە ژنان، خاوەنێتی زەوی، رێکخستنە رامیاری‌یەکان، هونەری پیشەسازی (تێکنۆلۆجی) و هتد. هەروەها ئەگەر ژنان، هاوسەری و زایەندێتی وەرنەگیرێن، شیکاری‌یە ئابووری و رامیاره‌یەکان تەواو نابێت. بایەخی ئاسایی مرۆڤزانی و کۆمەڵزانی، وەك پەرەسەندنی چەند چینی کۆمەڵایەتی و بنەچەی دەوڵەت، دەبێت کاری تێدا بکرێتەوە بۆئەوەی ناوەڕۆکەکانی ژن بە ژنێی خزمان، بەری لەشێوەی کچان، وەرگێڕانی کاری کچ بۆ سامانی نێر، وەرگێڕانی ژیانی مێ بۆ خزمایەتی و هاوسەری، بەشداری هاوسەری لە دەسەڵاتی رامیاریدا، لەگەڵ گۆڕانەکانی هەموو ئەو رووالەتە کۆمەڵایەتی‌یانەی کە لە ماوەی رۆژگاردا بەسەرچوون.

ئەم جۆرە هەوڵە، لە دواشیکاریدا، تەواو وەك ئەنگلز هەوڵی بۆ داوە.. هەوڵێ داوە پیاوان و ژنان، شار و ولات، خزمایەتی و دەوڵەت، شێوەکانی خاوەنێتی، پێڕۆیەکانی خاوەنێتی زەوی، گۆڕینی سامان، شێوەکانی گۆڕینەوە، پیشەسازیی بەرهەم هێنانی خۆراك، شێوەکانی بازارکاری و هتد. لێکیان ببەستێت. لە دواییدا، کەسێك پێویستە سەرلەنوێ دەربارەی "بنەچەی خێزان و خاوەنێتی تایبەت و دەوڵەت" بنووسێت، بە دان پێنانی پشت بەستنی یەکتری زایەندێتی و ئابووری و رامیاری بێ کەم کردنەوەی گرنگی هەر یەکەیان لە کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا.

## ▪ تێبینی (NOTES):

· جوولان لەنێو مارکسێتی و دامەزرەێتی STRUCTURALISM و شیکاری دەروونی جۆرە پێکدادانی زانیاری دروست دەکات.

· زۆر قسەکردن لەسەر ژن و کاری ماڵ لە دەوری پرسی ئایا کاری ماڵ بەرهەمدارە یان نا بووە. بەتوندی بوترێت، کاری ماڵ ئاسایی بە واتای هونەری‌یەوە بەرهەمدار نی‌یە (ئای . گاو 1972، مارکس 1969 : 387=413). بەلام ئەم جیاکردنەوە روون نی‌یە بۆ هێڵی سەرەکی وت و وێژەکە. کاری ماڵ لەوانەیە بە واتای راستەوخۆی بەرهەم هێنانی زێدەبایی و سەرمایە بەرهەمدار

نـەبێت.. لەگـــەڵ ئەوەشـــەوە توخمێکـــی بڕێنـەرەوەی بەرهـەم هێنـانی زەیدەبـایی و سەرمایەیە.

. کە هـەندێ لـە ئـەوان تاڕادەیـەک، بـە بۆچوونـی ئێمـە، نـەوازەن، تـەنیا خـاڵی زایـەندێتی لـەرێی دەسـت تێخسـتنی رۆشنبیری‌یەوە دەخەنە روو (تەماشای فۆرد و بیچ 1972 بکە). هەندێ نموونـە لەوانەیـە لـەنێو غـەوارانی کـە زانایـانی مرۆڤزانـی دڵخۆش بکات هەڵبژێردرێت.

. "ئەنگلز" ئـەوهای بۆچووە کە پیـاو لـە شێوەی رانە مەڕ و گاگەل سامان وەدەست دێنێت... ئەم سامانەی بۆ منداڵـەکانێتی .. بـە لابردنـی مـافی بەشـی دایـک لـەپێناو دەستەبەرکردنی ماوەتی باوک بۆ کوڕ بووە.. لابردنی مافی بەشی دایک بـەزینی مێژوویی زایەندی مێ بووە.. پیاو لـە مـاڵیش جڵـەوی گرتە دەست، ژن پایەی هێنرایە خوارەوە.. بوو بـە کۆیلـەی حـەزی زایـەندی پیـاوو ئـامرازێکی رووتـی بەرهـەم هێنـانی منـاڵ (ئەنگلز 1972 : 120 –21، بە پیتی لار لە بنەچەکەی).

. ئـەم شـیکاری‌یەی کۆمـەڵ کـە لەسـەر هاوبەندی پیاوان بەهۆی ژنانەوە دامـەزراوە، ئـەوها دەکـات کـە جیابوونـەوەخوازیی بزووتنەوەی ژنان بە تەواوی تێـی بگـەیت.. جیابوونـەوەێتی SEPARATISM وەک گۆڕانێکی دامەزرەی کۆمەڵایەتی دەبینرێت.. وەک هـەوڵێک بـۆ پێکـهێنانی دەسـتەی کۆمەڵایـەتی دامـەزراو لەسـەر هاوبـەندی بـێ نێوانکاری ژنان.. هەروەها وەک نەویستنێکی تونـدی مـافی پیـاوان لـە ژنـاندا.. وەک داوایـەکیش لەلایـەن ژنانـەوە بـۆ مـاف لەخۆیاندا.

. "ژن بەرگی پیاو لەبەر ناکـات.. پیـاویش بەرگی ژن لەبەر ناکات.

. مـن شـوێنی خـۆم دەربـارەی فرۆیـد لـەنێوان لێکدانـەوەکانی فەرەنسـایی‌یە دامەزرەیی‌یـــــــــــــــــەکان STRUCTURALISTS و ئەمەریکایی‌یە ژێواری‌یەکان BIOLOGISTS گرتووە.

. دایکی پێش – ئۆدیپسی، دایکێکی نێرباز بووە.

. بەشـەکانی "ویتیـگ لیـس گوەریلـەرس 1973" دەردەکەوێت کە ئاخـاوتنی درێـژی دژ لێڤی – شتراوس و لاکان بن.

. "هـەر ژنێـک فاشـی‌یەک دەپـەرسـتێت" – سیلڤیا ثلاث.

# فێمینیزم‌و کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی

■ لیندا گۆردن

● و: محمد حمەصالح تۆفیق

تێبینی:

**فێمینیزم Feminism دیاردەی بانگەشەو هەوڵدانە، چ وەك تاكە كەس یان بزووتنەوەی جۆراوجۆر، بۆ یەكسانیی نێوان ژن‌و پیاو. فێمینیست Feminist هەڵگرو بانگەشە بۆ كردووی ئەو بۆچوونەیە. من لێرەدا هەندێ جار هەر بەو ناوەی سەرەوەو هەندێ جاریش بەیەكسانی خواز ناوی دێنم.**

**وەرگێڕ**

لەم سەد ساڵەی دواییدا، یەكسانی خوازەكان بوون بەداكۆكیكەری گرنگی شێوازی نوێی كۆنترۆڵی كۆمەڵایەتی. ئێستا تیۆریستە هاوچەرخەكانی یەكسانی خوازو لێكۆڵەرەوان بەلای تۆمەتباركردنی كۆنترۆڵی كۆمەڵایەتیدا دایدەشكێنن. ئەو دژوارییە هەر تەنها لەنێو فێمینیزمی رابوردوو و ئێستادا نیە، بەڵكو كەموكووڕیی یەكتر تەواوكردنی تیۆریی یان (رێبازی) رۆژگاری ئەمڕۆ دەخاتەڕوو لەمیانەی مامەڵەكردن لەگەڵ ئامانجە لێكدوورەكاندا.

تۆژینەوەیەك لەسەر مێژووی توندوتیژیی خێزان نموونەیەكی سەرنجڕاكێش دەداتە دەستەوە سەبارەت بەم كەلێنە. چیرۆكی هەوڵ و كۆشش بۆ پاراستنی قوربانییان لەتوندو تیژیی ناو ماڵ، كەزۆربەی زۆریان ژن‌و منداڵن، كاری كردووەتە سەر بەرنامەی راهێنانم لەبواری كۆنترۆڵی دژە – كۆمەڵایەتیدا. راستێكەی ئەمەش تەگەرەیەكی دڵساردكەرەوەیە لەڕێگەمدا لەڕووی بەڕێوەبردنی پسپۆریی ژیانی تایبەتییەوە، بەڵام قەناعەتی ئەوەم پێپەیدا دەكات كەوا رەخنەو رەخنەكاریی

زیرەکانە تادێ زیاتر پێویست دەبێت، بەتایبەتی رەخنەو نارەزایی کەسانی یەکسانی خواز (فێمینیست)، بۆ کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتی.

من لەم بابەتە نووسینەدا دەمەوێ وتووێژ بکەم نەك داکۆکی بکەم لەکۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی، وەك رەخنەیەك لەو رەخنانەی لێیدەگیرێ. لێدوانەکانم هەوڵدانن بۆ تیۆریزەکردنی رووداوە مێژووییە راستەقینەکانو دەمەوێ کێشەکە وەك چۆن دێتە لام ئاوها مامەڵەی لەگەڵدا بکەم، لەدیدو روانگەی تۆژینەوە لەسەر ستەمکردن لەمنداڵ و کەمتەرخەمی لێکردنی. شەش ساڵ لەمەوپێش، کاتێ کەدەستم کرد بەلێکۆڵینەوەی مێژووی توندوتیژیی خێزان لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، وام لێکدایەوە کەوا زۆر بەفراوانی لەمەسەلەی لێدانی ژن بکۆڵمەوە، لەوانەی کە لەکۆششو چالاکیی یەکسانی خوازانەوە سەرنجی راکێشاوم بۆ کێشەکەو بەتایبەتی بۆ نەبوونی شتێکی ئەوتۆ لەو بارەیەوە. بەهەرحاڵ، من سەرم سورما لەو توندوتیژییەی دژ بەمنداڵان بەرپاکراوەو ئەمەش بەرەنگارییەکی یەکجار ئاڵۆز دەخاتەروو بۆ راستیی لێکدانەوەی رێبازی خێزانێکی فێمینیستو تیۆرییەکی فێمینیست سەبارەت بەکۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی.

### کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی:

(کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی) چەمکێکە دەگەرێتەوە بۆ زانای سۆسیۆلۆجی ئی. ئەی. رۆس E.A.Ross. ئەو ئەم دەستەواژەیەی لەساڵی 1901دا بەکارهێنا (وەك ناونیشانێك بۆ کۆی وتارەکانی)و ئاماژەیە بۆ شێوازێکی بەرفراوانی کاریگەریو رێکخستن کەوا لەلایەن کۆمەڵەوە سەپاوە بەسەر تاکە کەساندا[1]. لەسەر بنەمای دیدو بۆچوونی هۆبزیی بۆ تاکە کەسی نێو کۆمەڵ وەك شێوەیەکی سروشتیی ململانێ، رۆس وا دەروانێتە (کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی) کەمەسەلەیەکی حەتمییە. رۆس بەشوێن کەوتنو تۆژینەوە لەسەر تاکە کەسی لیبراڵ وتووێژ لەسەر کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دەکا بەمانایەکی زۆر دیاریکراو، کەوا رێنماییەکی چالاكو وردو پسپۆر لەبارەی ژیانی مرۆڤەوە، نەك بەتەنیا سەرچاوە بێت بۆ پەرەسەندنو پێشکەوتنی، بەڵکو باشترین وەڵامیش بێت بۆ ئەزموونو تاقیکردنەوەیەکی کۆنتر، کەشێوازی خێزانو کۆمەڵگەبێت بۆ کۆنترۆڵ کردنی دلگەرمیو زیادەرۆیی تاکە کەس.[2].

ئەو دەزگایانەی هەوڵ دەدەن بۆ کۆنترۆڵ کردنی توندوتیژیی خێزان نموونەو شێوازێکی پێش – سەرکەوتنو خۆسەلماندن بۆ جۆرێك لەئینستیتیوتە پسپۆرەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی کەوا لە لایەن رۆسو ریفۆرمیستەکانی تری "سەردەمی گەشەسەندنەوە" پتشگیرییان لێکراوە. ئەم دەزگایانە زۆر نموونەیی بوونو کۆمەڵەی پاراستنی منداڵ بوون لەتوندوتیژی (Societies for the Prevention of Cruelt to childern) لەمەودوا بەکورتی و بەم شێوەیە SPCC ناودەبرێنو لە ساڵانی 1870 وە دەستیان بەکارکردووە، لەسەر وەختی بەئاگاهاتنەوەیەکی توندی جیهانیدا بۆ ستەمکردن لەمنداڵ. ئەوان وەك هەوڵێکی ئەخلاقی – خێرخوازیی – سزا ئامێز دەستیان پێکرد کەوا خاسیەتی ریفۆرمە هەڵبژاردەو ئاکارە پوختەکانی سەدەی نۆزدەیەم بوو، کەبەگلەییو گازندەبوون لەکێشەو گرفتەکانی بەدرەوشتیو خراپەکاریو بەدمەستی. ئەم مۆرکە بەزۆری بەسووك تێروانینی کۆچکردووەکانی immigrants دەگرتەوە کەوا بەشێکی گەورەی ئامانجو مەبەستی ریفۆرمیستەکانیان پێکدەهێنا. لەساڵانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا

SPCC پەلیان بۆ ئەرکی بەربلاو کوتا بەنیازی چاککردنی ژیانو گوزەرانی خێزانو پەروەردەو بەخێوکردنی منداڵ بەپێی مۆدێلێك لەڕاگرتنی باری تەندروستی خێزان، نەك چارەسەرکردنی تەنها نەخۆشیی خێزان. وەك باسێك لەگۆڕانو جیاوازییەکی کەم، دەزگاکانی پارێزگاری لەمنداڵی سەدەی نۆزدەیەم خۆیان وەك سەروو یاسا دەبینیو سزای خراپەکاریی تایبەتیان دەداو منداڵانیان لەمەترسیی دیاریکراو دەپاراستو تا سەرەتای سەدەی بیستەمیش هەر بەردەوام بوون لەسەرپەرشتی کردنو ئاراستەکردنی ژیانی ئەو خێزانانەی کەبەلادراویان لەقەڵەم دەدان.

ئەم جۆرە دەزگاو ڕێکخراوانە جێی پلارو تاوانبارکردن بوون لەلایەن کەسانو لایەنگرانی بیری چەپخوازی نوێوە New Left. لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا "شەپۆلی دووەم"ی فێمینیزم بە بەرفراوانی لەنێو ئەم چەپرەوە نوێیەدا گەشەی کرد، بەقۆستنەوەی دژایەتیکردنی پسپۆڕانو گریمانەی ئەوەش کەوا کۆنترۆل کردنی کۆمەڵایەتی خۆی لەخۆیدا ئامانجێکی بەرپرسیارە.

ڕەخنەو ڕەخنەکاری بەتایبەتی بۆ بوارەکانی یارمەتی دەوڵەت welfare state ئاراستە دەکرا، وەك فریاکەوتنی منداڵانی ناکام Aid to Dependent Children (شێوە یارمەتییەکی حوکومەتە دەدرێتە دایکی سەڵت لەویلایەتە یەکگرتوەکاندا) بۆئەوەی دەوڵەت تواناو هێزێکی بۆ برەخسێ بۆ سەرپەرشتی کردنو بەدەمەوەچوونی ژیانی تایبەتی ژنانو مامەڵەکردن لەکاروباری تەندروستی (جەستەییو دەروونی) کەوا کاری کۆنترۆڵ کردنیان بەزۆری دژ بەیاخیبوون یان ملکەچ نەکردن ئاراستە دەکرا، بەتایبەتی لەنێو ئافرەتدا. ڕەخنەکان بەعادەت "ئێمە"و"ئەوان"ی جیادەکردەوە وەك چەوساوەو چەوسێنەر، چەشنی پەیوەندیەکی دابەشبوون بەسەر دوو شێوەدا. ئەوان وای بۆ دەچوون کەوا کۆنترۆڵ کردن کارێکی لەباربووە سەبارەت بەو شتانەی بەرژەوەندییان بووە بۆ تاقمێکی دەست باڵاو کارێکی نەشیاو یان ڕووخێنەر بووە سەبارەت بەو شتانەی بەرژەوەندییان تێدا نەبووەو لاوەکی بوون. زۆری ئەم ڕەخنانەی لەمەڕ کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی پێ لەوە دەنێن کەوا ئەو سوودانەی لەئەنجامی ئیجرائاتی لەم چەشنەوە دێنە کایەوە وەك بیمەی بێکاری unemployment insurance یان ڕێکخستنی پەیوەندیی تەلەفۆنو فاکسو تاد Telicomunication. شێوازی ئەوان بۆ هەڵسەنگاندنی ئیجرائاتی لەو بابەتە بەشێوەیەکی ئاسایی دوو لایەنە بووو جیاوازیی لەنێوان چاکردنو کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتیدا، ئەو مافو ئیمتیازانەی لەخوارەوە داوا دەکرێن، نارەزایی دەربڕین لەسەر ئەو ئەرکو زەحمەتەی بەپێی سەرو بەرگرتنێکی تایبەتی سوود بەوانەی سەرەوە دەگەیەنێ[3].

ئەو فێمینیستانەی کەوا بەزۆری ئەم خەتەی ڕەخنەیان لەسەر کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتی دووبارە دەکردەوە، ئاڵوگۆڕیان بەڕەگەزو توخمو چین دەکرد لەجیاکردنەوەی لایەنەکاندا. ڕەخنەکانی یەکسانی خوازیی دژە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی هاوکاریی کردووەو گونجاوە لەگەڵ پشتگوێ خستنی مێژووی چڕو ئاڵۆزی سەرقاڵ بوونی بەشاڵاوی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتییەوە، لەریفۆرمی ئەخلاقیدا بەبزووتنەوەی (دژە لەشفرۆشی)و دژە بەدمەستی لەشاڵاوەکانی مێژووی پەرەسەندوودا بۆ چاککردنی نەریتو عادەتی ژیانو خەرج و مەسرەفی هەژاران، لەشاڵاوی پاسادانانی پاراستنی پیشەسازیو کاروباری ئیجابیدا، ئەمڕۆش لەشاڵاوی دژە بەرەڵلاییدا یەکسانیخوازەکان بەزۆریی مەسەلەی

کۆنترۆڵ کردنی بیروکراتیو پیشەییو حوکومی دەوروووژێنن.(4)

لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا ئەو فێمینیستانەی کەڕادیکاڵن (چونکە لەناو خۆیاندا زۆر دابەش بوون) لەهەولی سەرزەنشتو ناڕەزایی دەربڕیندان دەرهەق بەبزووتنەوەیەکی گەورەی فێمینیستە لیبراڵەکان (کەبەفێمینیستە بۆرجوازییەکان دەناسرێن) بۆ ئەم نەریتە. مارکسییە چەپەکانیش دنەی لێکدانەوەو بۆچوونێک دەدەن کەوا ئیدانەی فێمینیزمی بۆرجوازیی سەدەی نۆزدەیەم بکات لەبەرئەوەی بناغەکەی چینەکانی ناوەڕاست بوونو تەنها بەڕیفۆرمی یاساییەوە گرتبووی، بۆ نموونە وەک مافی دەنگدان(5). یەکسانی خوازە چەپەکان سکاڵای ئەوە دەکەن کەوا یەکسانی خوازە لیبراڵەکان (جارانو ئێستاش)، لەهەوڵدانیاندا بۆ رەخساندنی پێشکەوتنو ئیمتیازدان بەژنان بەبوونی زنجیرەی هەرەمی، پشتگیریی کۆنترۆڵی یاسایی و پیشەییان کردووە وەک هۆکارێک بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان. کەواتە چارەسەرکردنی کێشە لەلایەن ئەم فێمینیستە لیبڕالانەوە کارێکی هەڵەو خۆخەڵەتێن بوو، چونکە ئەوان تەنها خەریکی تاکە کەس بوون، لەکاتێکدا کەئێمە چارەسەری بەکۆمەڵی داهێنەرمان هەیە بۆ تەنیاییو دابڕانو، ئاکاری خۆتێکشکاندنو هەڵسوکەوتی ئامرازیو خۆبەزل زانین، توندوتیژی سەرجادە، بەدرەوشتیی گشتی، پشتگوێخستنی پیرو بەتەمەن، ئیستیغلال کردن بۆ قازانجو بازرگانی. راستێکەی فێمینیستی سەربەگشت تاقمو باوەڕە سیاسییەکان بەر هەمان دژواریو بەدرۆخستنەوە دەبوونەوە: ئێمە چەمکو بۆچوونی بەرفراوانو جیهانگیریمان هەیە بۆ ئەو مافو سەربەستییەی ئافرەتان داوایان دەکەنو مافگەلێکی بەو فراوانییە دیاریکراو ناگونجێ لەلایەن کۆمەڵگایەکی بچووکەوە داکۆکییان لێبکرێت. ئەوان پێویستیان بەکۆنترۆڵی ئەندازە گەورەیە.

سەرەڕای ئەوەش، ئەم مافانە لەڕاستیدا کاریگەریی (زانستییان) لەسەرە، بێجگە لەوەش کەئێمە وەک کارێکی پرۆفێشنال تەماشای دەکەین.

لەیارمەتیدانی منداڵدا child welfare روونو ئاشکرایە کەوا (مافەکان) کراونەتە چەمکێك لەسەر بناغەی ئەگەرەکانی گۆڕانی مێژوویی. کاتێ کەچاودێریی پزیشکی، پەروەردەو فێرکردن، خواردنی باشو جلوبەرگی رێكوپێك دابین دەبن ئەوە لەلایەن دەزگای یارمەتیی منداڵانەوە وەردەگیرێنو بەهەمان شێوەو بێ‌هیچ سڵەمینەوەیەکیش لەلایەن هاوولاتیانەوە، وەك سەلماندنی (مافەکانی) منداڵان.

کارێکی هەڵەو پڕ ناتەواوییە بۆ رادیکاڵەکان کەداوای خۆپارێزی بکەن لەدژواریو درۆو دەلەسەی فێمینستە لیبراڵەکان لەبەکارهێنانی دەوڵەتدا بۆ مسۆگەرکردنی مافەکانی تاکە کەس. سنووردارکردنی ئەم جیاکارییە نەریتی فێمینیستێکی چەپ لە لیبڕالێك زۆر بەزەحمەت روون دەبێتەوە لەسالانی 1980داو هێرشی لابالی راسترەو بۆ سەر یارمەتی دەوڵەت state welfare دەستی پێکرد بۆ بردنەوەی گرەوە سیاسیەکانو هێزی پاڵنەر. لەم حاڵەتەدا چەپڕەوەکان کەوتنە داکۆکیکردن لەپرۆگرامی فریاکەوتنی منداڵانی ناکام Aid to Dependent children کەمایەی رقو قینێکی زۆری فێمینیست بوو دەساڵ لەوەوپێش. فێمینیستە سۆشیالیستەکانیش بوون بەهاوپەیمانی فیدراسیۆنی پلانی باوكو دایکان Planned Parenthood Federation بۆ بەرگری کردن لە(هەڵبژاردە choice)، (وەك لیبڕاڵەکان دروشمی مافی لەبارچوونیان

بەرزکردەوە لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا)و دەساڵ لەمەوپێش ئێمە هێرشمان دەکردە سەر پشتگیریی ئەوان لەسیاسەتەکانی کۆنترۆڵی دانیشتوان (السیطرة السكانية)ی ئیمپریالیستی نوێ، بەنەزۆك کردنیشەوە. کاتێ کەهەژاریو ئیجرائاتی زیادکردنی باج، بودجەی شارەوانیەکانو دەوڵەتی تێکدا ئێمە دەبوو بەرگریی لەو خزمەتگوزارییە بکەین کەلەلایەن دەوڵەتەوە پێشکەش دەکرا کەچی تەنانەت تەئکیدیشمان نەکردەوە لەسەر جیاوازی کردنو سەرپێ شۆڕکردن کەوا لەڕاستیدا دابەش کردنەکەیان ئەمانەیان تێدابوو. رەخنەی چەپخوازی نوێ بۆ کۆنترۆڵ کردنی کۆمەلایەتیو بۆ بەرهەم هێنانی بووژانەوەی ئابووری فەرامۆش کراو حوکومەتی لیبراڵیش بەشێوەیەکی کاتی خرایە لاوە.

ئەم مەسەلەیە چاکتر وابوو نەخرێتە لاوە بەڵکو پێداچوونەوە بوایە. رەخنەی دەست باڵایی لەڕووی کاری کۆمەلایەتیو خزمەتگوزاریی مرۆڤایەتییەوە، بیروکراتیو پرۆفێشناڵ هەڵە نیە بەڵکو ناتەواویی ئەوە بوار بەهەندێ لادانی جیددیی دەدات. من ئێستا کێشەیەکی مێژوویی بەکورتی دەگێڕمەوە، کەیەکێکە لەوانەی کاری کردووەتە سەر بیرکردنەوەم لەبارەی کۆنترۆڵی کۆمەلایەتییەوە.

ساڵی 1910 خێزانێکی بەڕەچەڵەك خەڵکی سوریا، لە بۆستن تووشی کێشەیەك بوو و لەڕێگەی کۆمەڵەی ماساچوسێتس بۆ پاراستنی منداڵ لەتوندوتیژی

Massachusetts Society for the provention of Cruelty to Childern.

کە لەمەودوا بە MSPCC کورتی دەکەینەوە، هاتە ناساندن بەهۆی مامەڵە خراپیو ستەمکردنەوە لەکچێکی سیانزە ساڵە لەلایەن دایکیەوە. ئێمە لێرەدا خێزانەکە بەخێزانی کاشی ناودێنین. مستەرکاشی دەمێك نەبوو مردبوو بەهۆی ریخۆڵە کوێرەوە. پێشتریش خێزانەکە وەك گەلێ کۆچکردووی تر چەندین جار لەنێوان سوریاو ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هاتوچۆیان کردووە. ئەوان دوو منداڵێ تریان لەسوریا بەجێهێشتبوو لەلای باپیرو نەنکیان لەباوکیانەوەو لەبۆستن بێجگە لە(کچە قوربانییەکە)، کەلەمەودوا بەفاتمە ناوی دێنم، کوڕێکی تەمەن شەش ساڵو کچێکی تەمەن سێ ساڵیش لەخێزانەکەدا بوو و خاتوو (کاشی)ش سکی هەبوو. ئەوی کەشکاتەکەی کردبوو خوشکی مێردەکەی بوو و راستێکەشی هەموو خزمو کەسو کاری باوکەکە حەزیان لەخاتوو کاشی نەدەکرد. ئیدیعاکانی ئەوان لەلایەن کۆمەڵەی ماساچوسیتسەوە MSPCC تۆمارکراو لێکۆڵینەوەیان تێدا کرا کەوا خاتوو کاشی بەدار یان بەکورسی لەفاتمی دابوو و گوێچکەی بریندارکردبوو و نەیهێشتبوو بچێتەوە بۆ قوتابخانەو خستبوویە بەرئیشکردن لەماڵداو هەرچی کاری ناوماڵ هەیە دابووی بەسەریداو چاودێریکردنی هەردوو منداڵە بچووکەکەشی پێسپاردبوو. کاتێکیش فاتمە نەخۆش کەوتبوو دایکی نەیهێشتبوو بچێ بۆ نەخۆشخانە. رقو ناحەزیی کەسوکاری باوکەکە تەنها هەر بەشکات کردن لەمامەڵەکردنی نەشیاوی دایکەکەوە بۆ فاتمە نەوەستا بەڵکو مەسەلەی مافی چاودێریکردنی منالەکانیشی لەبنەڕەتدا گرتەوە. ئەوان هەولیان دەدا کەوا چاودێریکردنی منداڵەکان لەدوای مردنی باوکیانەوە بەوان ببڕێو بیانوویان ئەوەبوو کەوا (لەسوریادا مافی ژن لەچاودێری کردنی (منداڵەکانی) یان دەستبەسەردا گرتنی کەلوپەلی ناوماڵ نەسەلمێنراوە). هەروەها بەپێی دابو نەریتی ئەوان باپیر لەباوکەوە هەقداری منداڵەکانەو ئێستا ئەو ئەم هەقدارییە دەدا بەکوڕەکەی تری

كەمامی منداڵەكانە. ئەوان رێكورەوان چاوەڕێی ئەوەبوون كەخاتوو كاشی ملكەچ بێ بۆ ئەم مافەیانو باری ئابووریی گرانیو دۆخی كۆمەڵایەتیی وا كەوتووەتەوە كەڕازی بێت. شكاتكەرەكە خوشكی باوكی منداڵەكان بوو و خاوەن خانووی ئەم منداڵانەو دایكەكەیان بوو، كەوا لەتاقە ژوورێكی خراپی بێئاودا دەژیانو دەبوو بچێتە نهۆمی خوارەوە بۆئەوەی ئاو بباتە سەرەوە. لێرە خزمو كەسوكار هیچ یارمەتییەكیان نەدەدا پاش ئەم كۆست كەوتنەی، زۆر نائومێدبوو و بۆئەوەی بتوانن بژین چووەسەر كاری عەتاریی گەڕۆكی مێردەكەی كەوا كارێكی نزمو تورەهات بوو. بەمجۆرە دەبوو فاتمە لەماڵەوە بمێنێتەوەو چاوی لەمنداڵەكانەوە بێت.

كاتێ كەخاتوو كاشی ملی بۆ داواكاریی ماڵە خەزوورانی نەدا، ئەوان پەنایان بردە بەر ناوبژیوانێك، كەدەم سپییەكی كۆمەڵگەی سوورییەكان بوو و رۆژنامەیەكی عەرەبیی لەبۆستن دەردەكرد بەناو (سوریای نوێ)وە. ئەنجام كێشەكە چارەسەر نەكراو گەیشتە دادگاو لێرەدا خزمان كێشەكەیان دۆڕاند چونكە دابونەریتی چاودێری كردنیان پێچەوانەی ئەوەی ویلایەتە یەكگرتوەكان بوو كەوا ژن مافی چاودێریكردنی منداڵی هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەتەواوی نەبڕایەوە و كێشەكە جۆرە هاوسەنگییەكی لەخۆگرتو فاتمە هەندێ جار دەپاڕایەوە كەلەدایكی دووربخرێتەوەو كاتێ دووریش دەكەوتەوە دیسان دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی بیگێڕنەوە لای دایكی. لەدواییدا هەرچۆنێك بوو خاتوو كاشی مافی چاودێریكردنی بردەوە بەڵام یارمەتی مادیی دەست نەكەوت بۆئەوەی بتوانێ سەربەخۆ منداڵەكانی پێ بژێنێ. بەم جۆرەو وەك چەندین كێشەی جەورو ستەمكردن لەمنداڵ، كەقوربانی تێیدا سزا دەدرێو، فاتمە نێردرا بۆ یەك لەو ماڵانەی كەدەزگاو رێكخراوە خێرخوازەكان بەڕێوەیان دەبردو لەوێش خزمو كەسوكاری وایان دەبینی كەمامەڵەی باشی لەگەڵ نەكراوەو دیسانەوە تووشی زوڵمو ستەم بووەتەوە.

ئەگەر ئەو چیرۆكو بەسەرهاتە لەوێدا بوەستایە لەوانە بوو كەسێك مەراقی ئەوەی هەبوایە كە كێشەكە وابېینێ گوایە خاتوو كاشی تاڕادەیەك گلەیی لەسەر نەبووەو لەوانەیە ناوبەناو ناچاری ئەو مامەڵەكردنە سەختەبووبێتو باری قورسو سەختی وایكردبێت میزاجی لەجێدا نەبووبێت. بەڵام سیانزەساڵ دواترو لەساڵی 1923دا، دووەم كچ كە ئەوكاتە شانزە ساڵ بووە، لەلایەن (سەردانیكەرێكی قوتابخانەكەیەوە) هێنراوە بۆ كۆمەڵەی ماساچوسێتس MSPCC بۆئەوەی شكات لەدەست زوڵمو ستەمی دایكیو فاتمەی خوشكە گەورەی بكات كەئەوكاتە شوویكردبوو. لەساڵی 1910 وە كچی دووەم نێردرابووەوە بۆ سوریاو رەنگە خاتوو كاشی وازی هێنابێت لەهەوڵو تەقەللای منداڵ بەخێوكردن. كچە هەژدە مانگ بوو گەڕابووەوە بۆ ویلایەتە یەكگرتووەكانو تەماشایكردبوو دایكی نیازیە بەناچاری شووبكا بەكابرایەكی لاوەكی. كچەش خوێنی بەكراسەكەیدا كردبوو وتبووی كەوا دایكی لێیداوەو خوێنی لووتی پژاندووە. پاشان یەك لەدەزگاكانی كۆمەڵەی ماساچوسێتس چاوپێكەوتنی لەگەڵ خاتوو كاشیدا كرد، كە ئەو دەمە بەئاشكرا هەڵسوكەوتی دوژمنكارانەبوو و سوور بوو لەسەر ئەوەی كەهەر كاتێ بیەوێ لەكچەكەی دەداتو بەكەیفی خۆی لەگەڵی دەجووڵێتەوە.

ئەگەرچی هیچ كێشەیەكی تاك نموونەیی نیە بەڵام بەحوكمی ئاڵۆزیی كێشەكەی خێزانی كاشی، ئەمەیان وەك نموونەی حاڵەتێكی گشتیی

خۆی دەخاتەڕوو و بەردەوام بێنەو بەردەی لەسەرە. لەم کێشەیەدا گرانە پێناسەی قوربانییەکی جیاکار بکەیت. خاتوو کاشی تەنها قوربانیی نیە بەهۆی دابڕانو بێوەژن کەوتنی و دایکایەتی سەڵتیو مەسەلەی پاتریارکیو خەزوورانی ناحەزیەوە. ئەو کچەکەی خۆیشی چەوساندبۆوە. مەسەلەیەکی سەرسامکەریش نیە کەخاتوو کاشی خۆیشی چەوساوە بێتو بەردەوام تووڕەو توندوتیژ بێت، بەڵام زمان پاراویو قسەزلیی فێمینیست سەبارەت بەتوندوتیژی خێزان بەزۆری خۆ لەقەرەی ئەم بارە ئاڵۆزە نادات.

ڕاستێکەی هەڵوێستی خاتوو کاشی بەرانبەر بەفاتمە دەبێ وەك مەسەلەیەکی پاتریارکی تەماشا بکرێت. وەك ئەوەی کەمنداڵ دەبێ خزمەتی باوكو دایك بکەن نەك بەپێچەوانەوە(6). ئەم بوارەی نەریتی پاتریارکی خزمەتی خاتوو کاشیی کردووە، بەڵام لەلایەکی ترەوە بەرژەوەندیی گشتی کۆمەڵە چەوساوەکە – کەلێرەدا کۆچکردووە سوورییەکانن وەك رابەرەکەیان (کەپیاوەو پیتی بۆرژوایە) دەریدەبڕێ، بەزۆری دژ بەمافو خواستەکانی خاتوو کاشین (هەروەها ژنانی تریش)، نموونەی ئەو ژنانەی کێشەکانیان چووەتە دەزگا هەڵبژاردەکانی چەشنی کۆمەڵەی ماساچوسێتسەوە MSPCC. زیاد لەوەش بەجێیە گەر کەسێك وای بۆ بچێت کەوا کچەکانیش ئەکتەری ئەم درامایە بوون، کەوا بەرهەڵستی ویستو خواستی دایکیان کردووە وەك گیانی دەسەڵاتدارێتیی پیاو لەکۆمەڵگاداو لەبەشێکیشدا وەك ئەنجامێك بۆ کاریگەرێتی ئایدیای جیهانی نوێ New World هەست بەکارتێکردنێك دەکرا کەوا گونجاو بوو لەگەڵ گیانو خواستی شەخسییاندا بەو پێیەی خۆیان خاوەنی تەواوی خۆیان بوون. لێرە هیچ کام لەو

ڕەخنەو ڕەخنەکارییانەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی نەیانتوانی یەکبگرنەوە لەگەڵ هەوڵدانو کۆششی ئاڵۆزی خێزانی کاشیداو هیچ ڕێگەیەکی وا کەنەیانچەوسێنێتەوە نەیتوانی (مافەکانی) فاتمە بپارێزێ.

## فێمینیزمو ستەمکردن لەمنداڵ

تیۆریی فێمینیست بەگشتیو مێژووی ئافرەت بەتایبەتی پێویستیان بەدیدو بۆچوونێکی پتر ئاڵۆز هەیە بۆ کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتیی کێشەکان، جۆری ئەوەی خێزانی کاشی پێویستیان پێی بوو. نموونەی بەقوربانیکردن لەوەی کەباوە لەنێو نەریتو ڕۆشنبیریی فێمینیستدا، لەماوەی بیست ساڵی رابوردووداو فشار بۆ وەسف کردنو شیکردنەوەی ئەو پێکهاتەو بونیادانەی دەسەڵاتی پیاو، پێویستە تێپەڕبکرێن.

ئێستا ئێمە بەشێوازێکی داخراوتر دەڕوانینە هەوڵو کۆششی ئافرەتان بۆ هاوکاری کردنو خۆگونجاندن لەڕەوتی بەرهەڵستی کردنی دیاردەکانی دەست باڵایی پیاودا.

هەنگاونان بۆ پێشەوە بەتایبەتی گران کەوتووەتەوە لەو ڕووانەوە کەپەیوەندییان بەسیاسەتی کۆمەڵایەتیو توندوتیژیی خێزانەوە هەیە، بەهۆی نەریتی باوی سەرکوتکردنی قوربانییەوە. بەرگریکردنی ئافرەت دژ بەتوندوتیژی هێندە پێویستە کەوا دەترسین ئەو بارەی ژنان لەدەست بچێت وەك (قوربانی) سیاسیو پێویست بەیارمەتی بوو، ئەگەر ئێمە پێ لەدژەکاریی (عدوانیة) ژنان خۆیان بنێین. ئاڵۆزییەکان لەوە دان کە ئاسایی نینو گەورەن. چونکە ئەوان وەك دایك قوربانیو قوربانیدەرن، بێدەسەڵاتن،و پشتوپەناشن، لاوازو بەتواناشن لەهەمان کاتدا.

ئەگەر تیۆریی فێمینیست پێویستی بەدیدێکی تازەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بێت، ئەوە بیرکردنەوە لەبارەی ستەمکردن لەمنداڵ، لەڕاستیدا ئەو دیدەیە. کێشەکانی ستەمکردن لەمنداڵ ئەو ناسۆرییە دەردەبڕن کەوا هیچ بگرەو بەردەیەك هەڵناگریّو پێویست بەوە ناکا، ئەو کارانەی کەوەك چارەسەر پەیڕەوی دەکرێن پێدەچن خۆیان خۆیان لێکبدەنەوە. بەهەرحاڵ ئاوڕپێدانەوەی کارمەندانی کۆمەڵایەتی هەوڵدانە بۆ (رزگارکردنی) منداڵانو چاککردنی باوكو دایکیانو من زۆرشتم هەیە دەربارەی رەچاوکردنی ئەو حاڵەتانە. هیچ کەسێکیش ناتوانیّ داکۆکی لەڕیّو شوێنی سەلامەتی بکات سەبارەت بەو منداڵانەی بەجێگەی خەوتنیانەوە شەتەك دەدرێنو، چەندین رۆژ لەنێو نوێنو بەڕەی پیسو بۆگەندا بەجێهێڵراونو لەبەر سەرما هەڵگورماون. لەوەش زیاتر، منداڵ لەکۆمەڵگای نوێدا، بەپێچەوانەی ئافرەتەوە، تەنانەت ئەگەری سەربەخۆیی کۆمەڵایەتیو ئابووریشیان نیە.

سیاسەتێکی کۆمەڵایەتی باش تاڕادەیەکی باش دەگونجیّ کێشەی لەژن دان رەچاو بکات بەپشتگیریکردنی ژنان بۆ بەجێهێشتنی بارودۆخی ستەمکاریی یارمەتیان بدریّو بۆئەوەی بەئاسودەییو دابین کردنی رێزو حورمەتی پێویست بەبیّ پیاو بژینو سەرنجیان بۆ ئەوە رابکێشین کەوا خەڵکی تر بەرێزەوە تێیان دەڕوانیّ. کەوابوو ئێستا ئەوە روونە کە چۆن کەسێك دەتوانیّ ورەو توانایەکی لەو چەشنەش بداتە منداڵان. ئەگەر ئەوان (مافی) خۆیانیان پیّڕەوا ببینریّ ئەوە دەبیّ خەڵکی گەورە یان کۆمەڵ قسەیان بۆ بکەن.

ئەو ئافرەتانەی کەکاری سەرەکیی باوك دەکەنو پەیوەندییەکی توندوتۆڵتری سۆز یان بەمنداڵەوە هەیە، لەململانیّو تێکۆشانی سەدو پەنجا ساڵی ئەم دواییەدا مافی چاودێری کردنی منداڵانیان پیّبراوە. ئێستا ئەوانەی کەوا ستەم لەمنداڵ دەکەنو پشتگوێیان دەخەن بەزۆری ئافرەتن. راستێکەی ستەمکردن لەمنداڵ ئێستا پتر سەرنجی فێمینیستی راکێشاوە، چونکە لەمەدا ئێمە بەرەو رووی رقو تووڕەیی ژنانو دەسەڵاتی ستەم دەبینەوە.

بێجگە لەوەش ستەمکردن لەمنداڵ دیاردەیەکی پەیوەندیدارە بەڕەگەزی نێرو مێوەو پەیوەندیشی بەچەوساندنەوەی ژنانەوە هەیە، بەلام پیاو یان ژن خەتاکارن چونکە ئەوە دابەشبوونی جنسیی زیادبوونی نەوە دەنوێنیّ. رقوکینە لەمنداڵ هەرگیز مەسەلەیەکی دابڕاو نیە لەفاکتەرەکانیتر، چونکە ئەوە لەسەر بنەمای نێرو میّ بەرهەم هاتووە.

کاتیّ کەوا رێکخراوەکانی منداڵپارێزیی، منداڵان بەسەر دەکەنەوە یان سەرپەرشتیی چاودێرانیان دەکەن، ناسۆریی زۆرتر بەشی ژن دەبێت بەحوکمی دایکایەتی.

ئێستا لەم بیست ساڵەی دوایداو بەهۆی گرژیی سەرتاپا گیرەوە سەبارەت بەستەمکردن لەمنداڵو کەڵەکەبوونی نووسراوی کلینیکیو ئامارو لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم کێشەیە، رۆڵی فێمینیست پشتگویّ خراوەو کەم بووەتەوە. ئەمەش مەسەلەیەکی سەیرو نائاساییە لەسەردەمی شەپۆلی یەکەمی فێمینیزمەوە، بەتایبەتی لەماوەی نێوان ساڵانی 1880-1930دا بزووتنەوەی مافی ئافرەتان پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەبوو بەکۆششی چاککردنی یارمەتی منداڵەوە. بەپێچەوانەوە، دووەم شەپۆلی فێمینیزم، کەبزاڤێك بوو کێشەی ژنی گەنجو بیّ منداڵ زۆر بەقورسی کاری تێکردبوو، بەکەمی بایەخیدا بوو بەمەسەلەی منداڵ. ئەم کەمتەرخەمییە بوو بەدیاردەیەکی بەرچاو لەنێوان ژنانی رادیکاڵی چالاکدا لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا، بێجگە لەلێشاوێکی پەلامار بۆ

چاودێریی منداڵو، لەم چەند ساڵەی دوایشدا، دژ بەچەوساندنەوەی جنسیی منداڵان.
تیۆریستەکانی یەکسانی خواز لەکێشەکانی زاوزێو رێکخستنو سەروبەر گرتنی کۆمەڵایەتیو دایکایەتیان کۆڵیبووەوە، بەڵام ئەزموونێکی راست و دروستیان لەسەر پەروەردەکردنی منداڵ نەبوو و بزووتنەوەکە بەتەواوی کاریگەرییەکی وایان دروست نەکرد کەوا بوارەکانی یارمەتیدانی منداڵ قسەو بێنەو بەردەی تەواویان لەسەر بکرێت.
کاتێ کێشەی لەم بابەتە باس دەکرێ، بەزۆری گریمانەی ئەوە دێتە پێشەوە کەوا سوودو بەرژەوەندییەکانی ژنو منداڵ هەمیشە هاوکاتو یەکتر تەواوکەرن، ئەمەش گریمانەیەکە نەك هەر راستییەکانی ستەمکردن لەمنداڵو کەمتەرخەمی کردن بەرەنگاری دەبێتەوە بەڵکو هەندێ جاریش پێویستی خزمەتگوزاریی چاودێریی دایکایەتیش لەپێناو پاراستنی منداڵدا ئەو راستییە دەسەلمێنێ.

سەرچاوە: کتێبی
What is Feminism
Edited by:
Juliet Mitchell & Ann Oakley

بەشی پێنجەم. ل 63–70

پەراوێز/

1- E.A Ross, Social Control (New york 1901)

2- Helen Everett social control', Encyclopaedia of the social sciences, 1934; Herman Schwendinger and Julia R. schwendiger, sociologists of the chair: BBBBBBBBB Radical Analysis of the formative years of North American Sociology 1883-1922 (Basic Books, New york 1974) 203 ff.

3- John Ehrenreich, the Altrustic Imagination: a History of Social Work and Social policy in the united states (cornell university press)

4- راستیەکەی لێکدانەوەی باوی ئەم مێژووە، چونکە بەگونجاوی لەلایەن فێمینیستەکانەوە گفتوگۆی لەسەر نەکراوەو بووە بەدژە فێمینیست. بۆ نموونە بروانە:

Christophes Lasch, The culture of Narcissism (W.W. Norton, New york 1976).

5- ئەم دیدوبۆچوونە لەلایەن Zillah Eisensteinەوە رەخنەی کاریگەری لێگیراوە لەکتێبی:

The Ridical Future of Liberal Feminism (Longman, New york, 1981).

6- بروانە دواتر بۆ پێناسەکردنی پاتریارکییەت.

# گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەنتوانێت فۆك

# Antwanette Fouque دا

• و: سەهەند

* بایەخدانی ئێوە بەمەسەلەی ئافرەت لەکوێوە سەرچاوە ئەگرێ‌و لەبنەڕەتدا هۆشیاری بەرامبەر بەئافرەتێتی چۆن لای ئێوە سەریهەڵدا؟

—من لەناوچەیەکی فەرەنسا هاتوومەتە دونیاوە کەبەدژایەتیکردنی ئافرەت بەناوبانگە. لەدوورگەی کرس دا ئافرەتبوون دەکاتە نەبوون. بەڵام لەخێزانەکەی ئێمەدا بارەکە جیاواز بوو، باوکم پیاوێکی دادپەروەروەر و ڕەوابین بوو، لەوانەیە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەخەباتکارێکی سیاسی بوو. باوکم ڕێزو سۆزێکی فرەی بۆ دایکم هەبوو، تابڵێی عەدالەت پەروەربوو، گەرچی هەندێ ئاسەواری تەقلیدی (واتە کەلتوری پیاو سالاری)ی تێدا مابوو. ژیانی دایکم‌و باوکم بەژیانێکی ئاسایی دەهاتە پێش چاو. ئەوەی بەڕای من هاوسەنگی‌ی ئەم خێزانە باشەی تێك ئەدا ئەو جیاوازییە بوو کەلەنێوان براو خوشکەکەمدا دەبینرا. بۆ نموونە خوشکەکەم بۆی نەبوو سواری پایسکیل بێت، باوکم نەیدەهێشت ماکیاژ بکات، یان هاوڕێیەتی کوڕێك بکات. ئەوەی کەئێستا لەکۆمەڵگا تەقلیدیەکانی خۆرهەڵاتدا دەیبینن‌و هەندێ کەس بەرەفتارەکانی پێنج سەد ساڵ لەمەوبەری بەراورد دەکەن، لەڕاستیدا پەنجا ساڵ لەمەوپێش لەباشووری فەرەنسادا پیادەدەکرا. ئەو دەمە بۆ تەنها جارێك کچێکیان لەگەڵ کوڕێکدا ببینیایە دەبووایە شووی پێ‌بکردایە، بەڵام ئەم بارە

بەتایبەتی پاش جەنگی جیهانیی دووەم گۆڕاو تەنانەت ڕەفتاری باوکم لەگەڵ مندا کەچواردە ساڵ لەخوشکەکەم بچووکتر بوومو دوای جەنگ پێم نایە قۆناغی باڵقبوونەوە، ئازادانەتر بوو. لەڕووی مافەکانیشەوە پێگەی ئافرەتان پاش جەنگ باشتربوو و ئافرەتان مافی رادەربڕینیان هەبوو. بەڵام هێشتا ڕکەبەرایەتی ئافرەتان لەکۆمەڵگادا بەرچاو دەکەوت. بۆ نموونە بیرم دێ کاتێ هەندێ لەهاوپۆلەکانم دەیانویست ببن بەفڕۆکەوان یا کەشتیەوان یان باڵوێز، قبووڵ نەدەکران. تەنانەت قوتابخانەی پلی تەکنیکیش قوتابیی کچی وەرنەدەگرت. من ئەم شتانەم دەبینیو بەمجۆرە پەیم بەبوونی پیاوسالاری برد. ئەبێ ئەوەش بڵێم کەدایکم هەمیشە جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کەپێویستە ئافرەت سەربەخۆیی ئابووریی خۆی هەبێ.

*چۆن پەیوەندیتان بەبزوتنەوەی یاخیگەریانەی ئایاری 1968ەوە کرد؟

– لەئایاری ساڵی 1968دا لەگەڵ دووسێ ئافرەتی تردا گروپێکی ڕۆشنبیریمان پێکهێنا. ئێوە دەزانن کەڕووداوەکانی ئایاری 1968 جۆرە شۆڕشێکی بەسەر پەیوەندیەکانی ئافرەتو پیاودا هێنا. لەهەمان کاتدا سەرنجمان دا کە ئەم شۆڕشە هەموو ڕەهەندەکانی ئەم پەیوەندیەی نەگرتۆتەوەو تەنها لەسنووری پەیوەندییە سێکسیەکاندا بەکارە. ئێمە گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کەپێویستە سەبارەت بەم مەسەلانە قسان بکەین، هەربۆیە بڕیارماندا کۆمەڵێك کۆڕو کۆبوونەوە بۆ ئەم مەبەستە ڕێك بخەین. کارەکەمان بەم سادەییە دەستی پێکرد.

*ئەو گروپە هەمان گروپی "دەروون شیکاری و سیاسەت" بوو؟

– نەخێر، هێشتا ئەو کۆبوونەوەیەمان ئەو مانایەی بەخۆیەوە نەگرتبوو. بریتی بووین لەچەند نووسەرێكو چەند دەرهێنەرێك، هەروەها قوتابیەکی ئامادەییشمان لەگەڵدا بوو. گفتوگۆمان سەبارەت بەهەموو شتێك دەکرد، هەر لەمارکسیزمو ترۆتسکیسیزمەوە تاوەکو پەیوەندیە تایبەتیەکانمانو پەیوەندیە خێزانیەکانمان. گروپەکەمان زیاتر مەیلی بەلای لێکۆڵینەوە سیاسیەکاندا دەچوو. بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە بڕوامان وابوو کەدەبێ بەتەواوی بوونمانەوە لەسیاسەتدا بەشداربین، هەر بۆیە لەتەواوی ڕەهەندەکانی ژیانمان دەکۆڵییەوە.

*ئایا لەو کاتانەدا بەنووسینەکانی سیمۆن دی بۆڤوارو فێمینستە ئەمریکاییەکان ئاشنا بووبوویت؟

–زۆرنا، من کتێبێکی دی بۆ ڤوارم خوێندبۆوە، بەڵام کتێبی "ڕەگەزی دووەم"ی پاش چەند ساڵێك هاوسەرەکەم بۆی کڕیم، من زۆر لەگەڵ بۆچوونەکانی دی بۆ ڤواردا نەبووم، یەکەم لەبەرئەوەی کەلایەنێکی گرنگی ژیانی ئافرەت فەرامۆش دەکات کە ئەویش ژیانی ناو ماڵێتی. دووەمیش لەبەرئەوەی تەنها بەدەسکەوتنی مافی رادان بۆ ئافرەت دەوەستێ. واتە ئەو بڕوای وایە وەختێ ئافرەتان مافی رادانیان بەدەستهێنا ئیدی "خەبات لەپێناوی ئافرەت" دا کۆتایی دێ. ئێمە زانیاریەکی ئەوتۆمان سەبارەت بەنوسینەکانی فێمینستە ئەمریکاییەکان نییە.

کتێبەکانی مارکسو ئەنگلز کەدەربارەی ڕەچەڵەکی خێزانو خاوەنداریێتی تایبەتیو دەوڵەتن، دەمانخوێندنەوە. هەروەها کتێبەکانی لینینو ماوتسی تۆنگو ژۆرژ پولیتزەریش. بێگومان من حەزم بەخوێندنەوەی کتێبی دەروونناسیش دەکرد. لەو ڕۆژگارەدا ئێمە

ئەوەندە ئاشنای ئەدەبیاتی فێمینیستی نەبووین، هەربۆیە مـن هەمیشـە دەڵێم کەفێمینیست نیم، چونکـە ئاشـنای نووسـراوەکانیان نـەبووم‌و بەمجۆرەش ناتوانم خۆم بەمیراتگریان بزانم.

*ئایا ئـەو گروپـەی ئێـوە، ڕۆژنامـە، یـان گۆڤـارێکی دەردەکـرد؟ ئایـا نووسـینگەو سەنتەرێکتان هەبوو؟

– نەخێر، ئێمـە بۆ ناوچـە جیاجیاکـانی شار دەڕۆیشـتین، بەتایبـەتیش بـۆ قـەراغ شـارو، هـەوڵمان دەدا کـۆڕ ببەسـتین، لەگـەڵ ئافرەتـاندا ئـەدواین‌و سـەبارەت بەهەلومـەرجی ژیـانی ڕۆژانـەیان پرسـیارمان لـێ‌ئەکردن: ئایـا لەگەڕەکەکـەیاندا باخچـەی سـاوایان هەیـە؟ پەیوەندیی خێزانییان چۆنە؟ و هتد... لەزانکۆش کۆڕمـان سازدەکردو جارێکیـان نزیکـەی هـەزار ئافرەت لەکۆڕێکماندا بەشدارییان کـرد. هـەر ئـەو دەمـەش بـوو بیرۆکـەی دامـەزراندنی بزاڤێـك بـۆ ئافرەتان هاتە گۆڕێ.

*پەیوەندیتان بەو گروپە چەپانەوە چۆن بوو کە لەبزوتنەوەی ئایاری 68دا ڕۆڵی سـەرەکییان هەبوو؟

– پـەیوەندیمان بـاش بـوو. ژمـارەی ئـەو چەپانە کەم نەبوون کەهانیان دەداین، یان بڵێـین بەچاوی ڕکەبەرەوە سەیری ئێمەیان نەدەکرد.

- بەڵام ئایـا ئێوە بـەحیزبێك یا بەبزواتێکەوە پابەند نەبوون؟

- نـەخێر، بـەهیچ کلۆجێـك. هـەندێ‌جار ڕووی دەدا هـەندێ لەگروپـەکان ئافرەتیان دەنارده ناومانەوە تاریزەکانمان تێکبدەن‌و کارمـان لـێ‌بکەن. بـەڵام پـاش ماوەیـەك هـەمان ئـەو ئافرەتانـە لەڕێکخ[ـراو]ەکانی خۆیـاندا دەستپێشخەرییان بۆ پێکهێنانی کۆمیسیۆنی ئافرەتان دەکرد. واتە لەڕاستیدا ئەمە ئەوەی دەگەیاند کەئێمە توانیومانە کار لەوان بکەین.

* ئێـوە خۆتـان لـەنێو بزاڤـی ئافرەتـاندا گروپێکتـان بـەناوی گروپـی "دەروون شـیکاری‌و سیاسـەت" پێکـهێناوە. لـەچ ڕوویەکـەوە ئـەم پەیوەندیەی نێـوان دەروون شیکاری‌و سیاسـەت بۆ ئێوە گرنگی هەیە؟

–بـەڕای مـن لەبزوتنـەوە سیاسـی‌و کـارە سیاسیەکانی ئـەو ڕۆژگارەدا چەندەها نیشانەی ئازارکێشانی دەروونـی‌و لادان‌و پەرێشانی ڕۆحـی دەبینرا. وا دەهاتە بەرچاو کەکاری سیاسی بەلای خەڵکانێکـەوە قـەرەبووی دەرپـەڕاندن‌و بەرەڵلاکردنی چەپاندنە ڕۆحیەکانە. ئەگـەر ئەمە وابێت ئەگەری ئەوەش دەبێ کەئەم دەرپەڕاندنـە شێوەی خەتـەرناکی وەکـو شـێتی‌و تـیرۆریزمی بەخۆیـەوە بگـرێ. لـەم ڕووەوە مـن‌و هـەندێ لـەهاوکارانم بڕوامـان وابـوو کـەدەبێ ڕەفتـاری سیاسـی کەسـانیش بخەینەبـەر توێژینـەوەی دەروونناسییانە. کاری بێ‌بیرکردنەوە، واتە کارێك کەئەنگێزەکـەی خۆیـەتی، جیاوازییـەکی ئـەوتۆی لەگەڵ شێتی‌دا نییە.

مـن نـاڵێم دەروون شـیکاری چـارەی دەردە کۆمەڵایەتیـەکانی جیهانـە، بـەڵام ئـەبێ بـۆ چارەسـەری کێشـە کۆمەڵایەتیـەکان سـوود لەدەسـکەوتەکانی دەروون شـیکاری‌و دەروونشیکارەکان خۆیان وەربگرین.

*ئـەو بوارانـە چـین کـەچالاکیتان تیایـاندا نواندووە؟

یـەکێك لـەگرنترین کێشـەکانی ئافرەتـان لـەو ڕۆژگارەدا ئـازادی لـەکۆنترۆڵی منـاڵبووندا بـوو. ئەم خواستەش لـەناوەڕۆکی دوو دروشمدا خـۆی دەبینییـەوە کـەبریتی بـوون لـە: "جەسـتەمان

پەیوەندیی بەخۆمانەوە هەیە"و"کەی ویستمان ئەوکات منالمان دەبێ". رای ئێمە وابوو کەدووگیانی بەبێ خواستی ئافرەتو هەروەها منالیش بەبێ خواست هاوسەنگی ژیان تێکدەدا. ئەودەم لەفەرەنسادا هێشتا کار بەو یاسایە دەکرا کە لەسالی 1920دا بڕیاری لەسەر درابوو و لەبارخستنی بەتاوان دەناسی. بوارێکی دی کەزۆر پێویستی بەبایەخ پێدان هەبوو مەسەلەی دەستدرێژیکردنی سێکسی بوو کەهیچ یاسەیەك نەیدەگرتەوە. لەسەرێکی ترەوە ئێمە بایەخێکی تایبەتمان بەمەسەلەی زمانو، وشەو، چۆنێتی دەربڕین دا کەهەموو ئەمانە مۆرکێکی پیاو سالارییان بەخۆیانەوە گرتبوو و هەولماندەدا کەگوتراو لەو هەلانە پاك بکەینەوە.

*پەیوەندیی ئێوە بەبزاڤەکانی ئافرەتانی تەواوی ولاتانی ترەوە. چۆن بووە؟

– هەر لەسەرەتاوە پەیوەندیمان بەتەواوی بزووتنەوەکانی ئەوروپاوە کردو لەسالی 1970دا دیدارێکی ئەوروپاییمان سازکرد.

جیاوازیەکان کەم نەبوون. زۆربەیان بەلایانەوە سەیربوو کەئێمە گرنگی بەمەسەلە دەروونشیکاریەکان ئەدەین. بزووتنەوەی ئافرەتان لەئەمریکا لەبزووتنەوەی ئەوروپا لەپێشتربوو. ئەم مەسەلەیەش هەم یارمەتیی ئێمەی دەداو هەم نیگەرانی ئەکردین. یارمەتیی ئەدایین چونکە سودمان لەدەقەکانیان وەردەگرتو نیگەرانی ئەکردین چونکە دەرفەتی ئەزموونی سەربەخۆی لەئێمە دەسەندەوە.

*سەبارەت بەئەزموونتان لەبواری بلاوکردنەوەدا بۆمان بدوێن.

– سەرنجم دا زۆربەی ئەو کتێبانەی دەربارەی ئەزموونی ئافرەتان دەنووسرێن لەولاتە جیاجیاکاندا ناگەنە دەستی زۆربە. ئەو کتێبانەی ئێمە چاپمان دەکرد پتر لەنووسینی ئافرەتان بوو، زۆربەشیان بریتیبوون لەشیعرو چیرۆكو رۆمان. هەلبەت بایەخمان بەو کتێبانەش ئەدا کەدەربارەی فێمینیزمو سۆسیۆلۆژیای پەیوەست بەئافرەتانو سێکس بوون. ئەو چاپکراوانەی ئێمە لەسەر ئاستێکی فراوان بلاونەدەبوونەوە، هۆکەشی دەگەڕایەوە بۆ نەبوونی سەرمایەو، رکەبەریی کۆمەلگاو هەروەها ئەو راستییەی کە ئێمە هیچ وەختێ وابەستە نەبووین نەبەدەولەتێکەوەو نەبەدەزگایەکی خاوەن پارەو سەرمایەوە.

*بەرەنجامی خەباتی بیستو پێنج سالەی بزووتنەوەی ئازادیی ئافرەتان لەفەرەنساو جیهاندا چۆن دەبینن؟

– لەم بیستو پێنج سالەی دواییدا، وێڕای ئەو کێشەو گیروگرفتە زۆرانەی هاتوونەتە ڕێمان توانیومانە هەندێ سەرکەوتن بەچنگ بهێنین، مافی ئازادی، ئیختیارمان بەرامبەر بەجەستەمانو، مافی یەکسانی. بەلام ئەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێت کە ئەم دەسکەوتانە جێگیرنینو ئەبێ بەردەوام بۆ جێگیرکردنیان لەخەباتدا بین. لەکۆنفرانسی پەکین داو بەهۆی فشاری چەند ولاتێکەوە نزیکەی سێیەکی دەسکەوتەکانمان لەبواری دووگیانیو، تەندروستیی سێکسیو، مافی یەکسانی کەوتە بەر پرسیار. ئەو ولاتانە کەم نین کەلافی ئەوە لێئەدەن گوایە ئافرەتانیان حەز ناکەن لەگەل پیاودا، یەکسان بن. ئەمانە ولاتگەلێکن کەرژێمی سەرکوتکەر تیایاندا حوکمڕانەو دەولەت مافی ئەوەی بەخۆی داوە کە لەبری خەلکی قسە بکات. رەقیبانی تری ئەم مافە بەدەست هاتووانە گروپە راستڕەوە توندەکانی ئەوروپان. ئەو دوژمنایەتیەی ئەوان بۆ مافی ئافرەتان هاوشانە لەگەل دوژمنایەتیاندا بۆ دیموکراسی. لەراستیشدا

دوژمنایەتیکردنی ئەوان بۆ ئازادیو مافی ئافرەتان لەهەمان سەرچاوەی دوژمنایەتی کردنیانەوە بۆ دیموکراسی ریشەئەگرێ. بەمانایەکی دی، مافەکانی ئافرەت بەشێکی سەرەکیە لەڕەوتی دیموکراتیزەبوونی گشتی‌ی کۆمەڵگا. مەسەلەیەکی دیکەش ئەبێ ئەمڕۆ جەختی لەسەر بکەین مەسەلەی وەبەرهێنانی ئەو مافی یەکسانی‌یەیە کەبەدەستهاتووە. واتە ئەبێ کارێك بکرێ کەبەشداریی ئافرەتان لەکۆمەڵگادا بەڕاستی‌و نەك هەر لەڕووی مافەوە بگاتە ئاستی بەشداریی پیاوان.

* لەکتێبەکەتاندا" هەردوو رەگەزەکە هەن" ئەو جیاوازییانەتان خستۆتە روو کە لەهەردوو رەگەزەکەدا لەتەواوی بوارەکانی کۆمەڵگادا هەن، کەواتە هێشتا رێگایەکی درێژمان لەبەردەمدایە؟

- بەڵێ، هێشتا کاری زۆرماوەو زۆر بوارماون ئیشیان تیانەکراوە. بۆ نموونە، یاسای سەرەکی‌ی فەرەنسا جەخت لەسەر یەکسانی‌ی ژن‌و پیاو ئەکات. بەڵام هەر لەپێشەکی‌ی ئەو یاسایەداو لەشوێنێکدا کەباسی "مافی پیرۆزو دوانەخراو" ئەکرێ، قسەکە تەنها ئاراستەی پیاوان کراوە. تەنانەت گەر بەتەنها لایەنی رەمزیی مەسەلەکەش لەبەرچاو بگرین، ئەبێ بمانەوێ ئەو رستەیە بەجۆرێك بنووسرێ کەئافرەتانیش بگرێتەوە، بەتایبەتی کەدەشزانین وڵاتی فەرەنسا "پەیمانی دژایەتیکردنی هەموو جۆرە جیاوازی دانانێك بۆ ئافرەتان"ی ئیمزاکردووە.

* ئەمڕۆ دەبینین لەوڵاتە ئەوروپاییەکاندا زیاترو زیاتر رۆڵی ئافرەتان بەرەو پێشەوە دەچێت. ئایا لەو بڕوایەدا نین کە لەم وڵاتانەدا خەریکین دەگەینە کۆتایی شەڕی نێوان هەردوو رەگەزی نێرو مێ؟

- قسەکەتان راستە کەلەوڵاتە ئەوروپاییەکاندا ئامادەگیی ئافرەتان شتێکی بەرچاوو دیارە. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەئافرەتان لەکاردا لێهاتوویی‌و شایستەیی خۆیان سەلماندووەو پیاوانێکیش هەن کەپشت گیرییان لێدەکەن‌و پێزانینی خۆیان لەو رووەوە دەردەبڕن. بەڵام لەهەمان کاتدا کاردانەوەی نابەجێی پیاوانێکی تریش بەرچاودەکەوێ. ئەم ئامادەگیەش ئەوە دەگەیەنێ کەتا ئەو دەمەی پیاوان دەست لەرۆڵی ئەمرو نەهیدەرانەی خۆیان نەکێشنەوە، واتە ئامانجی پێویست نەهاتۆتەدی. پیاوان کاتێ ئامادە دەبن دەست لەم رۆڵەی خۆیان هەڵگرن کەتێبگەن ئەم رۆڵە ئەمرو نەهیدەرەیان لەڕاستیدا رۆڵی منداڵێکی هەتا هەتاییە. دەستهەڵگرتن لەرۆڵی پیاوی دەسەڵاتدار لەواقیعدا دەستهەڵگرتنە لەرۆڵی کوڕێکی منداڵی نازپێدراو. بەڕای من پیاوان کەحەز ناکەن ئەو دەسەڵاتەیان لەدەست بچێت، لەبەرئەوەیە کەحەز ناکەن‌و نایانەوێ ئەو منداڵێتیەی خۆیان تێپەڕێنن.

* ئایا شارستانێتیەکانی ئەمڕۆ گەیشتوونەتە ئەو پلەیەی دەستپێشخەری بکەن‌و گفتوگۆی یەکسان لەنێوان ئافرەتان‌و پیاواندا بێتە ئاراوە؟

- هێشتا نەخێر، ئێمە ئێستاش پێناخۆشبوون‌و هێرشی پیاوانێك دەبینین کەئامادەنین بەشداریی زیاتری ئافرەتان قبووڵ بکەن‌و هێشتا هەر خەمی ئەو تایبەتمەندێتیانەیان دەخۆن کەلەدەستیان داوە. بەڵام پیاوان لەمەدا بەهەڵەداچوون. ئەوان پەی بەو ئازادی‌یە نابەن کەهەر لەئەنجامی خەباتی ئافرەتانەوە بۆ ئازادی بەدەستیان هێناوە. بەڵام من لەو بڕوایەدام کە وردە وردە ئەوانیش دەگەنە ئەو قەناعەتە.

* ئەمڕۆ دوو ئاراستە لەبزاڤی فێمینیزمدا دەبینینەوە: یەکێکیان کەئامانجی پاراستنی یەکێتیی ڕەگەزی نێرو مێیەو کۆمەڵگایەك کەتیایدا ڕەگەز نیشانەی جیاوازی نییە، ئەوی تریشیان ئەو ئاراستەیەیە کەجەخت لەسەر بەها ئافرەتیەکان دەکاتو ئامانجی کۆمەڵگایەکە کەتەوەرەکەی ئافرەتە. هەڵوێستی ئێوە لەم بارەیەوە چییە؟

– من هیچیانم پێ باش نییە جەخت کردن لەسەر بەهای ئافرەتیانە ئەنجامەکەی بەجەختکردن لەسەر بەهای پیاوانە دەشکێتەوەو کۆمەڵگایەك کە تەوەرەکەی ئافرەت بێ هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ کۆمەڵگایەکدا نییە کە تەوەرەکەی پیاوە. هەروەها کۆمەڵگایەك کەتیایدا جیاوازی لەرەگەزدا نەمێنێ، واتە کۆمەڵگایەك کەتیایدا هەموو بەچاوی پیاو یا ئافرەتەوە تەماشا بکرێن، ئەمەش بەلای منەوە کۆمەڵگایەکی داواکراو نییە. قسەیەکی بەناوبانگی ژۆرژساند هەیە کەدەڵێ: "بەتەنها یەك ڕەگەز هەیە" بەڕای من ئەمە ڕاست نییە. پێشتر ئەنجامی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە ئەوەبوو کەئافرەتیان بەجۆرێکی نزمی ئەم ڕەگەزە لەقەڵەم داوە. ئەمڕۆش ئەم بیرکردنەوەیە بەلەبەرچاونەگرتنی بەها تایبەتیەکانی هەریەك لەم دوو ڕەگەزە دەشکێتەوە. ئەو بەهایانەی کەهەر کەسێك ئەتوانێ بۆ جووتەکەی خۆی دابینی بکات.

من هەر لەبنەڕەتەوە دژ بەم دابەشکردنە ڕەشو سپییە بووم کەبزاڤی ئافرەتانیشی گرتۆتەوە. لەسەرەتای بزوتنەوەکەشدا هەندێك ڕۆڵی ئافرەتیان تەنها لەچوارچێوەی ماڵدا دەبینییەوەو هەر تەنها لەم چوارچێوەیەشدا خوازیاری مافەکانی بوون. هەندێکی تریش، وەکو گروپە چەپەکان ڕۆڵی ئافرەتیان بەتەنها لەڕووی پەیوەندییەوە بەکاری دەرەوەی ماڵەوە دەبینییەوەو، هەر بۆیە داخوازییان لەمافی باخچەی ساوایانو شتی لەمجۆرە تێنەدەپەڕی، من سیمون دۆبۆڤواریش کەڕۆڵی ئافرەتانی لەچوارچێوەی ڕۆڵی ڕۆشنبیریدا دەهێشتەوە، دەخەمە ناو دەستەی دووەمەوە. بەهەرحاڵ بەڕای من ئافرەت هەردوو ڕۆڵەکە دەبینێ. یان تەنانەت ئەبێ بڵێم کەبەڕای من ئافرەت سێ ئەرکی جیاوازی هەیەو پێویستە دان بەم سێ ئەرکەدا بنرێ: ئەرکی ماڵەوە، ئەرکی ناو کۆمەڵگاو، ئەرکی بەرهەمهێنانەوەی ئینسانی.

* ئەمڕۆ لەئەمریکا باس لە"ڕەگەز لەڕوانگەی کەلتورەوە" دەکرێ. زۆرکەس ڕایان وایە کەئەم تێڕوانینە دەرئەنجامی کاریگەریی تێوریەکانی پۆست مۆدێرنیزمە لەسەر ناوەڕۆکە فێمینیستیەکان، ڕای ئێوە لەم بارەیەوە چییە؟

–من ئەوەم بەلاوە گرنگ نییە ئەم دیدگایە لەکوێوە سەرچاوە ئەگرێ، بەڵام خودی بابەتەکەم بەلاوە گرنگە. بەڕای من دەبێ ڕەگەز لەڕوانگەی کۆمەڵایەتیەوە بخرێتە بەر باسو لێکۆڵینەوە، نەك لەڕوانگەی کەلتوری یا بایۆلۆژییەوە کەتوانای دۆزینەوەی ڕەگوریشەو هەروەها چارەسەری جیاوازیی ڕەگەزێتیان لەکۆمەڵگادا نییە.

* ئەمڕۆ لەهەموو کاتێك زیاتر ئافرەتان بەشداری لەپلەو پایە سیاسیەکاندا ئەکەن، هەر بۆ نموونە ئەمڕۆ دوانزە وەزیری ئافرەت لەدەوڵەتەکەی ژاك شیراکدا دەست بەکارن. ئەو شتەی کەبیست ساڵ لەمەوبەر بەبیری کەسدا نەدەهات. لەم پێشکەوتنە قایلن؟

_ نەخێر قایل نیم، چونکە ئەمانە دامەزرێنراونو هەڵنەبژێردراون. ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کەهەڵدەبژێردرێن هێشتا کەمە. ئافرەتان بەتەنها 6٪ی نوێنەرانی ئەنجوومەنی



شوراو 4٪ی نوێنەرانی ئەنجوومەنی پیران پێکدەهێنن. لەشورای شارەکانیشدا ڕێژەکە شتێك بەرزترە. لەسوید بارەکە بەمجۆرە نییەو لەناو کۆمەڵگادا هاوسەنگیەکی باشتر لەنێوان ژن و پیاودا هەیە. مەسەلەی بەشداریی سیاسی ئافرەتان مەسەلەیەکی زۆر گرنگەو هەڵەیە گەروا تێبگەین کەئەوە شتێکە تایبەت بەکۆمەڵگا پێشکەوتووەکان. لەمانگی مارتی ساڵی پاردا لەکۆنگرەی کۆمەڵایەتی سەرانی وڵاتاندا کەبابەتەکەی لەسەر هەژاری لەجیهاندا بوو بەشداریم کرد. لەوێ لەگەڵ ئافرەتانی ئەفریقیایی و هندیدا بەرامبەر سێ هەزار کەس مێزگردێکمان سازکرد. ئەوەی جێی سەرنجە هەموومان، چ ئەوروپاییەکان و چ ئەفریقیاییەکان و چ هندیەکان جەختمان لەسەر مەسەلەی یەکسانی، چوونیەکی لەیاساداو هەروەها پێداگرتن لەسەر ئەوەی کەپێویستە ئافرەتان لەسەرچاوەکانی بریاردا بەشداربن، کردەوە. تەنانەت ئەو ئافرەتانەی لەهەژاریشدا ژیانیان ئەبردەسەر خوازیاری بەشداربوون لەدەسەڵاتی بەڕێوەبردن و سیاسیی وڵاتدا بوون. بەڕای من لەدەساڵی ئایندەدا بزاڤی خەباتگێریی ئافرەتان ئەم ئاڕاستەیە دەگرێ.

*وەك دوا پرسیار حەزدەکەم وەکو نوێنەری ئەنجوومەنی ئەوروپا دەربارەی چالاکیەکانی خۆتان بدوێن؟

– یەکەمین شت دەربارەی ئەنجوومەنی ئەوروپا کەشایانی باس بێ ئەوەیە کەسێیەکی نوێنەرانی لەئافرەت پێکهاتووە، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کەئەوروپا سەرباری تەواوی کەموکورتیەکانی پێشکەوتووترین ناوچەی دونیایە لەڕووی پاراستنی مافی ئافرەتانەوە. ئێستاش کەباس لەوەدەکرێ تورکیا دەیەوێ بێتە ناو یەکێتیی ئەوروپاوە، ئومێدەوارم لەپاڵ ئەمەدا مەسەلەی دیموکراسیی و پێشێل نەکردنی مافی ئافرەتانیش لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بێتە ئاراوە. مەسەلەیەکی تریش کەلەپەرلەمانی ئەوروپادا بایەخێکی فرەی پێئەدرێ مەسەلەی نیشتەجێبوون لەشارداو کاریگەرییەکانی لەسەر مەسەلەکانی ئافرەتە. بوونی ژمارەیەکی بەرزی نوێنەرانی ئافرەتیش لەپەرلەمانی ئەوروپاو لەکۆمیتە ئیدارییە جیاجیاکاندا بۆتە مایەی بایەخێکی پتر بەکێشەکانی ئافرەت و گەر ئێمەش هوشیارانە و چالاکانە درێژە بەکاری خۆمان بدەین دەشێ پێشکەوتنی جیددی بەدەست بهێنین. *

هاوینی 1995

*ئەم گفتوگۆیە "رامین جهانبگلو" ئەنجامی داوەو لەم کتێبەوە کراوە بەکوردی: (نقد عقل مدرن – گفتوگوهایی بااندیشمندان امروز جهان – رامین جهانبگلو – ترجمە: حسین سامعی، مجموعە سپهر اندیشە – تهران 1367 (1997) ص ص260–270.

# وێستگەکانی سەردەم



- مریشکە ئاوەڕووتکراوەکەی ستالین



- دڵڕەقی و بێدەنگی

- لاسارێکی کۆن و شۆڕشێکی ڕەسەن

- جیابوونەوەی هەمیشەیی لەبەهەشت



- گۆنتالۆ تۆرنتی بایستێر ئەو نووسەرەی بەسەر فەرامۆشکردنی ڕەخنەگرەکانیدا زاڵبوو

- لویس بگلی و کتێبی (دادگایی کردن)ی کافکا

# مریشکە ئاوەڕووتکراوەکەی ستالین

جەنگیز ئیتماتۆف

و: ب. قانع



سەرەتا بەوە دەست پێئەکەم خۆم چی ئەزانم و ژیان چی فێرکردوم.

جارێکیان چووم بۆ پرسەی پورێکم – باوکم تەنیا هەر ئەو خوشکەشی مابوو – لەدیوەخانێکدا لەگەڵ کابرایەکی خەڵکی لای خۆماندا قسەمان دامەزراند. لەپرسەکەدا، دوای ئەوەی چایان گێڕا، گفتوگۆ دەستی پێکرد، هەریەکەی لەئاشێك، وەك لەم جۆرە بۆنانەدا باوە، لەکەلەرمەوە بۆ پاشاکان و لەوێوە باس هاتە سەر ستالین.

پیاوێکی ریش سپی سەرگوزەشتەیەکی سەیرو خۆشی گێڕایەوە، چیرۆکەکە ئاوا دەست پێئەکات: جارێکیان ستالین دەستو پێوەندەکانی کۆئەکاتەوەو پێیان ئەڵێت: (ئێوەم بۆیە کۆکردۆتەوە فێرتان بکەم چۆن حوکمی خەڵك ئەکەم، چۆن هەر تاکە کەسێك لەسەر زەوی و لەژێر خۆردا وا لێ ئەکەم راستەوخۆ چاو ببڕێتە چاوم. چاو نەتروکێنێت تاچاو ئەتروکێنم، بۆئەوەی ببم بەخوایەکی زیندوو بۆ هەموو کەسێك، چونکە دەمێکە وتراوە: فەرمانڕەوا خوا نیە بەڵام هیچیشی

لەخوا کەمتر نیە. ئێستا من فێرتان ئەکەم چۆن بەدروستی حوکمی خەڵك بکەن.)
فەرمانیدا مریکشێکی بۆ بێنن. دەستی کرد بەپەڕهەڵکێشانی تابەتەواوی ئاوە رووتی کردو تەنیا پێستەکەیو پۆپنەکەی مایەوە.
(ئێستا سەیرکەن) ستالین رووی تێکردنو مریشکەکەی بەرەڵلاکرد. لەجیاتی ئەوەی کێشی سووک بووەو تاقاچی ئەیگرێ رابکات، ئەو شتە بەستەزمانە فسی دایەوەو سنگی لەزەوی توندکردو خۆی دایەپاڵ پۆستاڵەکانی ستالین. تیشکی رۆژ فێنك پێستە رووتەکەی هەڵئەقرچاند، لەبەرامبەردا سێبەرەکەی زۆر بەلاوە فێنك بوو. دوای ئەوەی سەرکردەکە مشتێ گەنمی بۆ رۆکرد، لەو کاتەوە ئیتر مریشکەکە ئالوودەی بوو، بەبست لێی دوور نەئەکەوتەوە، بەدەوری قاچیدا سەرە خولێ بوو، بۆ هەر کوێیەك قاچی بجولایە لەگەڵیدا ئەجولا، ئیتر نەیئەتوانی بەتەنیا بۆ خۆی چینە بکاتو بجولێت.
(خەڵك ئاوا حوکم ئەکرێت) بۆ زیاتر رونکردنەوە لەسەری رۆیشت. لەیادمە خەڵکەکە دوای ئەوە هەموو بێدەنگ بون، ئەوە تەنیا چیرۆکێك بوو پیرەمێردێك گێڕایەوەو هیچیتر، بەلام ئەو خەڵکەی لەوێبون، سەرسامیی قووڵی خۆیان بۆ حیکایەتەکەی کابرا نیشان دا، رائەمانو ئەحەپەسان، هەریەکە لەلای خۆیەوە بەگوێرەی عەقڵی خۆی لێکی ئەدایەوەو شەنو کەوی ئەکردو پەندێکی لێ هەڵئەکراند. ستالین چۆنی سەلماندوە چەند دووربینە !.
یەکێك لەئامادەبوان، رستەیەکی فڕێدا سەرجەم وتووێژەکەی لەو بابەتە بەتامەوە گۆڕی بۆ مەسەلەیەکیتر. (ئەوە هەموی راستە، بەلام ئەوە تەنیا لەوانەیە پەندو سەرگوزەشتەبێ) سەری باداو بۆڵەیەکی لێوەهات.
(ئەوە بۆیە کۆلاکەکان هەڵمەتێکیان دژی ئێمە دەست پێکرد، دژی باوکی ئێوە بۆئەوەی وەکو مریشکە ئاوەڕووت کراوەکەمان لێبکەن. ئەو نامەردانە بۆ ئەبوو پەڕو باڵمان بکەن؟)
(ئێمە دەسەلاتی سۆڤێت زەویو سەربەستی پێبەخشیوین. ئێمەش گیانمان دەرچو تا کێڵگەکانمان بەرهەم هێناو دانەوێڵەمان لێ پاشەکەوت کرد، لەسەرەتاوە بەناڕەحەت راهاتین لەسەر ئاژەڵداریو ساوا بەخێوکردن، بەلام لەو هەموو رەنجو ماندوبونە چیمان دەست کەوت!، لەبەیانیەوە تا ئێوارە ئارەقمان ئەڕشت، سەرەنجام خۆمان بوین بەدوژمنی خۆمان، پارچە پارچە بوین، لەیەك دابڕاین، یەکتریمان تالان کرد، ماڵی یەکتریمان کاول کردو، وەکو توخمی ئاژەڵێکی ناڕەسەن فڕێ دراینە زیندانە پەرشو بلاوەکانی سیبریا. ورتەمان لێوەنەهات دەربارەی ئەو هەموەی گوللە باران کران. ئەمەش سەرەتا بەوانە دەستی پێکرد کەتۆزێك دەوڵەمەندو حاڵیان باشتربوو، منالەکانیشیان تاتوانیان رایان کردو خۆیان شاردەوە بۆئەوەی نەیاننناسنەوە، ئەوەیشی مایەوە جلەویان کردنو راپێچی کێڵگە هەرەوەزیەکانیان کردن، لەژێر ئیشو فەرمان دا پشتیان شکاندنو رسوایان کردنو لەپاداشتی ئەوەدا بەبێژنگ ئاویان ئەدانێ. ئەوە واقیعەکە بوو، لەبەرئەوە برادەرە ئازیزەکان، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکان، ستالین بەرژەوەندی خەڵکی نەئەویست بەقەد ئەوەی ئەیویست قورتمیان بگرێتو بەریان بداتە گیانی یەکتری بۆئەوەی لەپاڵ جزمەکانیا لەترسا خۆیان مەلاس بدەنو نەیەڵن کەسی تر لێی نزیك بکەوێتەوە..



لەپڕ وتووێژەکە پەرەی سەندو چەندین بیرەوەری تاڵ هێنرایەوە گۆڕێ، کێ ئەو ساڵانە کێ ی خستە زیندانەوە!، کێ کێ ی دا لەدەمەوەو پەشیمانی و شەرمەزاری بۆمایەوە!، تۆ بیر لەو هەمو سامان و ئاژەڵە بکەرەوە کەبەخۆڕایی بەفیڕۆدران و ئەو نەهامەتی و برسێتی یەی لێ کەوتەوە.

(من خۆم ئەو ساڵی 1932ەم لەبیرە). ستالین خۆی لەو هەمو گێروگرفت و کێشەیە بەرپرسیارە، لەجیاتی ئەوەی وەکو سەرکردەی پارتێکی شۆڕشگێڕی مەزن کاربکات- ئەو پارتەی بانگەشەی ئەکرد ئامانجی ئەوەیە ژیانێکی کامەرانتر بۆ کارگەران - دابین بکات!. بووبەهۆی -ولقاندنی پشێوی و دروست کردنی کێشەکانی ناوخۆ.

دەمەتەقێکە بەوە کۆتایی هات، جەنگاوەرێکی بەئەزمون کە لەئەنجامی برینداربون و کەم ئەندام بون بەدارشەق ئەڕۆیشت، بەرویاندا تەقیەوەو بەچاوی فرمێسکاویەوە هەڕەشەی لێ کردن ئەگەر واز لەو قسانەو بەدناوکردنی ئەو پیاوە گەورەیە نەهێنن، بەدارشەقەکانی ئەکەوێتە سەرو گوێلاکیان... ئەی بۆ کەجەنگ دەستی پێکرد ناوی لەسەر زمانی هەمو کەسێك بوو؟ ئێوە هەمووتان ئەوکاتە، پێش سەردەمی خرۆچۆف لەکوێ بوون؟ وا ئێستا هەموتان دەمتان گەرمە؟. بەپێی لێکدانەوەی خۆی ئەویش حەقی بوو.

لەم سەرگوزەشتەی مریشکەدا، خەڵکەکە باس و گوزارەیان لەیەکێك لەتراجیدیا هەرە گەورەکانیان نەکرد، یەکێك لەسەخت ترین و دژوارترین ئەو کارەساتانەی پیاتێپەڕبوون، کەشوێنەوارە تێکدەرەکانی هەتا ئەمڕۆش بەردەوامە. باهەوڵ بدەین و بیریکەینەوە، کەی؟وکێ؟ بەو تواناو هێزە مەزنەی خەڵکانی کارامەو ماندونەناس و ژیانپەرست و نان پەیداکەرە لەناوچوون؟ چ پێویست بوو کێڵگە هەرەوەزیەکان لەکێڵگەی جوتیارە رەنجدەرەکانەوە بگۆڕێت بۆ مۆنۆپۆلێکی دەوڵەتی و وەکو سەدەکانی ناوەڕاست بێگاریان پێ بکەن؟ (من بۆیە ئەمە ئەڵێم چونکە خۆم پێم پیاچزاوەو هەموم تاقی کردۆتەوە. کاتێك لەگەڵ براکەمدا لەکێڵگەیەکی هەرەوەزیدا کارمان پێ ئەکرا، بەرامبەری هیچ، تەنیا خواردن و شوێنی نوستن). سودەکەی تەنیا دەرپەڕاندنی جوتیاربوو لەسەر زەوی و زارەکەی. بێ بەری کردنی خەڵك بوو لەهەست کردن بەخاوەندارێتی هەمو ئەو سەروەت و سامان و موڵك و کەرەستانەی لەژێر دەسەڵاتی حکومەت دابوو، پەردەپۆش کردنی بەرژەوەندی تاکە کەس بوو لەو بەرهەمەی

بەدی ئەهێنا، دابڕینو دورخستنەوەی خەڵك بوو لەزێدو گوندی خۆیان بەتایبەتی لەدەڤەرەکانی ناوەڕاستی روسیادا، هەروەها سەرهەڵدانی ناهاوسانگی بوو لەنێوان ریزەکانی ئەو خەڵکانەی لەبواری بەرهەم هێنانی ماددیدا بەکارئەهێنرانو ئەوانەی وەکو زالوو خوێنو ئارەقیان ئەمژین بەناوی ناوەندی کۆنترۆڵو کارگێڕییەوە.

ئەمە تەنیا نیوەی گرفتەکەیە، بیرە چەسپاوە بێهوودەو نامەعقول (absurd)ەکەی ستالین (ideefixe): حکومەتێکی دەوڵەمەندو پۆشتەی خەڵکێکی رەشو رووتو شەکەتو برسی – کە، شتێکە هەموو جیهان هەرگیز پەیڕەوی نەکردوەو نایکا – هەتا سەرەتای پێرۆسترۆیکایش مێشکی هەموو سەرکردەکانی وڵاتی بەنیکیتا خرۆچۆفیشەوە داگیرکردبو، کەئەویش تەسلیمی هەندێ لەلایەنە هەڵخەڵەتێنەرو بریقەدارەکانی بوو بوو.

ئەمڕۆ موستەحیلە تێبگەیت، بۆ ئەبوو حکومەتو دەسەڵاتی ناوخۆ ئەو هەموو هەوڵە بێسنورە بدەن بۆئەوەی نەیەڵن جوتیارێك، مەڕێك یان گوێرەکەیەك زیاتری هەبێت لەماڵە پەرپوتەکەیداو، و بەحەرام دابنرێتو وا لێك بدرێتەوە لادانو سەرپێچییە لەپرنسیپەکانی سۆشیالیزم (یان تێگەیشتنو لێکدانەوەی ستالین بۆ ئەو پرنسیپانە)؟.

ئەو راستیەی کەکێڵگە هەرەوەزیەکان وەکو بنەمایەکی کشتوکاڵیی ئابوری سۆشیالیستی مانەوە، پێچەوانەی حوکمی زۆردارانەی ستالین بوو، هەتا لەو بارودۆخە سەختە لێکدانەوە هەڵنەگرەدا، خەڵك هێشتا بەتەنگ ژیانو مانەوەوە بوون، خۆیان گونجاندو رێڕەوی خۆیان پاراست کەئەویش تەنیا لەڕێی کارکردنەوە بەدی ئەهات.

هێشتا لەگەڵ ئەو نرخە گران کەوتوەو ئەو هەموو رەنجە بێسنورەدا، کێڵگە هەرەوەزیەکان وەکو مۆدێلێکی پێشکەوتوی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. هێزی کارو بەرهەمی ئاژەڵیو ئاژەڵداریو برشتی دانەوێڵە لەکێڵگە هەرەوەزیەکان و مەزرا دەوڵەتیەکاندا بەهیچ جۆرێك ئاستی ئەوەیان نەبوو بەراوردبکرێن لەگەڵ بەرهەمەکانی ئەو بوارانە لەوڵاتە پیشەسازیەکاندا.

ئایا هۆی ئەمە نیە کەوڵاتەکەی ئێمە لەگەڵ ئەو هەمو روبەرە فراوانەو ئەو هەمو سەرچاوەی ئاوەدا (یان بەبێ رەچاوکردنی ئەو دوو بنەمایەش) ناتوانێت پێویستی دانیشتوانەکەی لەدانەوێڵە دابین بکاتو ناچارە لەدەرەوە بیکرێت؟ زەحمەتە بیهێنێتە بەرچاوی خۆمانچۆن ئەمانتوانی بژێویمان لەدانەوێڵە دابین بکەین ئەگەر گازی سروشتیو نەوتو ئاڵتونو تەختەو دارمان نەفرۆشتایە، کەهەمویان نیشانەی بەفیڕۆدانو لەناوبردنی بەرفراوانی سەرچاوەی سروشتیو توانای ناردنە دەرەوەی وڵاتەکەمانن.

کەسێك نیە لەئێمە ئەوەی لەیاد بچێت، یان شانازی بەوەوە نەکات وڵاتەکەمان وڵاتێکی پێشکەوتوە لەبواری تەکنەلۆجیای بۆشایی ئاسماندا. ئەمە راستە، بەڵام چ تامێکی هەیە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەوەدا ئێمە نانی رۆژانەمان لەدەرەوە ئەکرین؟. بێگومان دوو بابەتی دژی یەکن کەهەریەکەیان ئەوی تر لەبەرچاو ئەخات!.

بەبێ بوژانەوەی لادێکان – کەستالینو ئەوانەی دوای ئەوهاتن چەوساندنیانەوەو بەزوڵمو زۆر شەکەتیان کردن – بۆ ئاستێکی پێشکەوتنی ئابوری واقیعیانە، یان روونتر بڵێین گەشەکردنیان

تاسەرەتاکانی دەست نیشان کردنێکی هۆشیارانەی هۆکارەکان، ناتوانین گیروگرفتە ئابوریە ئاڵۆزە بەیەکاچوەکانی ئەمڕۆ چارەسەر بکەین.

بۆ هەنگاو هەڵگرتنو چوونە ناو بوارەکانی پیرۆسترۆیکا پێویستە شێوازێکی نوێی ئاشکرای کێڵگەی هەرەوەزیو کێڵگەی دەوڵەت پەیڕەو بکرێتو بۆ ڕاگرتنی ئابوریی کشتوکاڵی وڵاتو ئەبێ دێهات لەپاشماوەو میراتی ستالینیەت ڕزگار بکرێت.

ئایا ئەم کێشەیە ئەوە ناهێنێت هێمنانەو ڕاستگۆیانە سەبارەت ڕابوردو، و، پاشەڕۆژی بدوێین؟.

کردنەوەی پێوەندەکانی ڕابوردو مانای ئەوە نیە سۆشیالیزم تێك ئەشکێنین یان لەپرنسیپەکانی لائەدەین، وەك هەندێ کەس لەوانەی تا ئێستاش لەژێر سیحری ستالین پەرستیدان، لێکی ئەدەنەوە.

ئایا ڕەوایە لەکاتێکی وەك ئێستاشدا پاساو بۆ ئەو تاوانانە بێنینەوە کەبەرامبەر جوتیارانو کەلتورو حیزبو کادرە سەربازیەکانمان ئەنجام دراونو چاو لەو هەمو کردەوە ناڕەوایانە بپۆشین کەبونە هۆی تێکدانو هەڵوەشانی بێچارەسەری کۆمەڵگاکەمان، لەساڵەکانی سیەکانەوە تا پەنجاکان؟.

ئایا بەردەوام بین لەسەر گرەو کردنو پێشبڕکێ لەسەر ئەسپی ناو زڕاوی دیماگۆجیەتو تاودانی لەهەمان بازنەداو ئۆباڵەکەی بکەینە ئەستۆی خەباتی چینایەتی لەژێر سایەی سۆشیالیزم دا؟.

جارێکیترو جارێکی تریش، ئەبێ ئەو پەندە دوبارە بکەینەوە (تۆ ناتوانیت هێلکەو ڕۆن بکەیت تاهێلکەکان نەشکێنیت) کارێکی زۆرچاكو گونجاویشە ئەگەر قسەکەر خۆشبەختانە ڕزگاری بووبێت لەوەی خۆی هێلکەکە یان هێلکەو ڕۆنەکە بێتو یەکێك نەبووبێت لەو هەزاران کەسە دڵسۆزو خوێن گەرمانەی حەماسو کەرامەتیان نەگونجاوبێت لەگەڵ خەونو ئاواتە فراوانخوازیەکانو هەڵپەی دەسەڵاتی ئەو سەرکردەیەی کەهەموتانی ڕەوانەی مل پەڕاندن کرد، کارێکی چاكو بەجێیە ئەوانەی بڕوایان بەو ڕێبازو پەندە هەبوبێت لەوانە نەبوبن کەدەستەپاچەی ناو دیوارو تەلبەندی ئۆردوگا زیندانەکانی دورگە چۆڵو دوورەکانو دامەزراوەکانی ناو بیابانە شەختەو سەهۆڵبەندانەکانی ستالین بونو دوچاری گەڕیو نەخۆشیو هەوکردنی گەدەو ڕیخۆڵەو دەستو پێ بەفر بردنو ئەسکەربوت مێشکیان تێك ئەچوو،و، ژیانی خۆیان کۆتایی پێئەهێنا..

ستالین پەرستەکان لەپاساو هێنانەوەدا شانازی بەهەندێ ڕواڵەتی مێژوویەوە ئەکەن کەبەڕای خۆیان بەرپەرچ نادرێنەوە، یەکێك لەوانە ڕواڵەتی پێشکەوتنی پیشەسازی وڵاتە وەکو وێستگەی کارەبای دنیپەرو کارخانەکانی مەگنیتۆگۆرسك، وەکو هێمایەك بۆ سەردەمو ڕۆڵی مێژوویی ستالین.

بەڵام هەمو سەردەمێك بەرئەنجامی کاری سەرجەم خەڵکانە کەکارە سودمەندەکانیان پێویستیە ئابوریەکانی ئەو سەردەمە دابین ئەکات.

من لەدڵنیا دڵنیاترم ئەگەر ستالینیش نەبوایە (وزەگای) دنیپەرو کارخانەکانی مەگنیتۆگۆرسك هەر دروست ئەکرانو وڵات لەئاستی 1913دا نەئەچەقیو ڕێگای پێشکەوتنی پیشەسازی هەر ئەگرتەبەر.

شۆڕشی ئۆکتۆبەر کەشو هەوایەکی نوێی هێنایە ئاراوەو جەماوەر خۆیان لەتەکدا گونجاندو سودیان لێوەرگرت.

بەڵام ئایا سودی تەواویان لێوەرگرتو وەك ئەبوایە بەرهەمیان هێنا؟

بەڕای من، لێکدانەوەو نرخاندنی پێشکەوتنی پیشەسازی وڵات، یان هەر بوارێکی تر نابێ بەتەنیا بەوە بکرێت، بەراوردبکەین بوارەکان چ گۆڕانکاریەکیان بەسەرداهاتوە، یان سنورکێشان لەنێوان جاران چیمان هەبو، وە ئێستا چیمان هەیە. بەڵکو بەلێکدانەوەی هەمو لایەنە مێژوییە پەیوەندیدارەکان: دەستکەوتێکی مەزن پەیوەندی چیە بەدەستکەوتێکی هاوشێوەی لەوڵاتانی تردا؟.

کەوێستگەی دنیپەرو کارخانەکانی مەگنیتۆگرۆسک ئەکەینە ناونیشانی دەستکەوتی مەزنو شاکاری پیشەسازی سەردەمی ستالین نابێ چاوپۆشی لەو راستیەش بکەین لەهەمان کاتو سەردەمدا پرۆژەی هاوشێوەو لەوە مەزن تریش لەوڵاتانی تردا دامەزراوە ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ زیادەڕۆیی ئەکەین لەئاکارەکانی کەسێکو لەبەرامبەردا رەنجی هاوتای کەسانی‌تر بەکەم ئەزانین، هەمان کێشو پێوانە راستە.

ئەوترێت ستالین جەنگی بردەوە، وەکو یەکێك دانیشتبێ شەترەنجی کردبێ! راستە فەرماندەی مەزن مایەی شانازیو سەربەرزیە، کەواتە ئەشبێ جێدەستو ئەو رۆڵەی ئەیبینێ مەزن بێت، پلەو پایەکەی ئەخوازێت ئەو فەرماندەیە شارەزاو سەردەرچوو، و کارامە بێت لەمەسەلە ستراتیجیەکاندا، وەك تاکتیكو هەمو لقەکانی زانستی سەربازی، بەڵام کێ ئەتوانێ بیسەلمێنێت وڵات ئەو جەنگەی ئەدۆڕاند ئەگەر فەرماندەیەکی سەربازیتر لە هەمان پلەو پایەی ستالین دا بوایە؟. رەخنەگرتن لەستالین مانای رەت کردنەوەی ئەوسەرکەوتنە مەزنە نابەخشێ، چونکە ئەو سەرکەوتنە مەزنە بەری خوێنو ئارەقەی سەرجەم گەلە، نەك، قارەمانێتیو ئازایەتی لەبن نەهاتوی تاکە کەسێك، باتواناو بلیمەتیەکی سەرسوڕهێنیشی هەبێت راستیەکان ئەوەیە ئێمە کاتێك باسی جەنگ ئەکەین، ئەبێ شێلگیرانە پێ لەسەر بەرزیی گیانی نیشتمانپەروەریی خەڵکی سۆڤیێت دا بگرین، ئەو گیانەی هەمو جەماوەری هەژاند هەر لەمناڵەوە تا ئەو کەسەی بەگۆچان ئەڕوات و بوە هۆی ئەوەی دوژمن تێك بشکێنێتو زیانێکی سەختی لێ‌بکەوێت کەزیاتر رێکەوت ستالینی کرد بەسەرکردەو خاوەنی نەك ئازایەتیو بلیمەتی خۆی، من فاکتەرێکی تریشی ئەخەمە پاڵ، کەتائێستاش قسەی لەسەر ئەکرێت، بەناڕەزاییو بەرپەرچدانەوەیەکی زۆرەوە: ئەو یارمەتیو بەدەنگەوەهاتنەی ئەمەریکاو بەریتانیا، کەهاوپەیمانی روسیابون لەجەنگی جیهانی دوەمدا، نزیکەی 14795 فرۆکەی جەنگی ئەمەریکا بەفرۆکەوانەوە خرایە ژێر دەسەڵاتی وڵاتەکەمانەوە بەپێی رێکەوتنامەی (گرێ بەندی کرێ بەقەرز – Lend Lease Act) ئیتر با باسی ئەو هەمو یارمەتیە ماددیو خۆراکیانەی تر نەکەین. بەڕاستی یارمەتیەکی پێویستو گرنگ بون کەئەبێت هاوکاری گەلی ئەمەریکا لەو رووەوە فەرامۆش نەکرێت. سەرکەوتن دانە پاڵ تاکە کەسێكو مامەڵە کردنی وەکو خواوەندێكو بەرزکردنەوەی بۆ ئاستی کەسایەتیەکی ناوازەو بێگەرد کەخەرمانەیەك پیرۆزی دەورەی داوە وەکو ئەوەی ستالین لەهەندێ فیلمدا نیشان دراوە کارێکە ویژدانو دادپەروەری تیانیە، نەمەعقولەو نەعاقڵانەیە.

کەسێك لەژیانی خۆیدا بیکەیت بەئەفسانەو وەکو بابەتێك بۆ پەرستن بخرێتە ڕوو (کە هەرگیز لەوە کەمتر نیشان نەدراوە)و بکرێت بەکەسێك لەسروشت بەدەرو نیشان دانی گەلێك وەکو دەستەوسانو بێکەلتور، بەکورتی ئەو بنەمایانەن کەئەبێ هێزەکانی گلاسنۆست لەڕویاندا بوەستێتەوە.

مرۆڤ هەندێ جار ناچار ئەبێت ئاواتی پێ بخوازێت و بەراورد بکات بەچی خێراییو نەخشەیەك هەندێك لەوڵاتە بەزیوەکان کەلەگەڵ خاکدا تەخت بونو تا پەناگوێیان چەقیونەتە نەهامەتی زیانەکانی جەنگ، لەژێر دارو پەردوی ئەو کاولکاریە ڕاست ئەبنەوەو ئابوری پاش جەنگ (Post War) دائەمەزرێتەوەو بەخێراییو دڵنیاییو پشت ئەستوریەوە ئاستی گوزەرانی دانیشتوان بەرزئەکەنەوەو دەستئەکەنەوە بەگەشەسەندنو پێشکەوتنی پیشەسازی، لەکاتێکدا وڵاتێك لەجەنگدا سەرکەوتوەو گۆرانیو هەڵبەست بەسەر پێشکەوتنو گەشەسەندنی بێوێنەیدا هەڵئەدرێت لەژێر سایەی ستالینی سەرکردەدا، هەتا لە سرودی نیشتمانیشدا کەبەردەوام ئەوترایەوە؛ هەرگیز نەیتوانیوە هاوئاهەنگیو پەیوەندیەکی هاوسەنگ لەنێوان پێشکەوتنی پیشەسازیو کشتوکاڵیو پێویستیەکانی گوزەرانی خەڵکدا دروست بکات بەبەراورد لەگەڵ خەڵکانی وڵاتانی تردا

قسەو باسو تووێژێکی زۆر کراوە بۆ بیانو هێنانەوەو پاساودانەوەی ئەم دیاردە نامۆیە (هەر لەسیاسەتەوە تا ئەگاتە کەشناسی)، بەڵام ڕاستیەکەی ئەمەیە، بەڕای من، کاریگەرترین هۆکار سیاسەتی نائومێدانەی گۆشەگیرخوازی (Isoiationism) ستالینە بەمەبەستی خۆپاراستنو دابڕان و دوورکەوتنەوە لەسیاسەتی جیهان.

دەستکەوتێکی گرنگو مەزن نیە، بۆ بەرژەوەندی جەنگ پەیوەندی توندوتۆڵ لەگەڵ دراوسێکانتدا ببەستیت، بەڵکو زاناییو دڵسۆزی لەوەدایە توانای تێگەیشتنو چەسپاندنی ئەو میکانیزمەت هەبێ کەسیستمە جیاوازەکانی جیهان پەیڕەوی ئەکەن لەپێناوی بەرژەوەندی مرۆڤدا.

هەندێك لەوانەی هەوڵ ئەدەن پێوەرێك بۆ داناییو مەزنی ستالین بخەنەڕوو، ئەیانەوێت لەگەڵ (پیتەری مەزن)دا بەراودبکرێت. تەنیا لەیەکچوون —ئەگەر شتێك لە یەکچوون هەبێت — ئەوەیە هەردوکیان ئۆتۆکرات بوون.

بەهێزترینو ئاشکراترین گوتاری ئەوانە ئەوەیە، ئەو دوو مەزنە دەروازەیان بەڕووی ئەوروپادا کردەوە، ڕاستە پیتەری مەزن دەروازەیەکی بۆ سۆڤێت بەڕووی ئەوروپادا کردەوە ستالین دەرگا کراوەکانی پاراست، بەڕزگار کردنی ئەوروپا لەنازیزم، بەخوێنی سەربازی سۆڤێتی، بەڵام لەگەلەکەی خۆی داخستن.

ماوەیەکی درێژەو تائێستاش ئاسەواری زوڵمو توندوتیژیی سەردەمی ستالین لەدڵو دەروونو مێشکی خەڵکی سۆڤێت داماوە، ستەمناکترینو بەسوێترین شوێنەوارەکانی سەردەمەکەی سیاسەتە دووفاقە دووڕوەکەی بوو، لەکاتێکدا بەرەو ڕوی جیهان، دیموکراسیزم وەکو ڕێبازی سەرەکی ستالین بانگەشەی بۆ ئەکرا، بەناوی چەسپاندنەوە هەمو دیموکراسیەکان پێشێل ئەکرانو بەزنجیرە کارەساتی

تراجیدیو پرمەترسی جێبەجێ ئەکران. دیموکراسی هونەرو کەرەستەی جەماوەرەو بۆ چەسپاندنی سەربەستیو ئازادی بیرو را بۆ یەکەیەکەی ئەندامانی کۆمەڵگا، بەکارئەهێنرێ، بەمەرجێ نەبێتە مایەی گێرەشێوێنیو هەر کەس بۆ خۆی.

ئەوە رێکەوت نیە ئێمە کاتێك دەنگ بەرزئەکەینەوە بەرامبەر زەرورەتی گەشەسەندنی دیموکراسی بەوجۆرەی کەپێویستە بێتەدی، دەستبەجێ روبەروی بیروباوەڕی جیاواز ئەبینەوە، ئەو مەسەلەیەو چەندان لقی تریش کەستالین سڵی لێئەکردەوە.

هەر کەسێك ئازادە بیروڕای جیاوازی خۆی هەبێت، بەلام ئەگەر ستالینیزم بەسۆشیالیزم لێك بدرێتەوە ئەوە نیشانەی کەم ئاوەزیەو ئەو کەسە ئەوە گرفتی خۆیەتی، ئەگەر بنەماو ئاراستەو پەیرەوەکانی ئەو دوو رێبازە یەك نەگرنەوەو لەیەك هەڵبەزنەوە، ئەوە ناگەیەنێت شەرە قسەو دژایەتی یەکتری کردن کارێکی حەتمیە، بەڵکو ئەبێ بەهەر نرخێك بێت راستیەکان روون ببنەوەو ئاشکرا بکرێن.

ستالین دەمێکە نەماوەو لەساڵی 1953وە کەمردوە، ئێستا، تەواوی حەقیقەتەکانو زانیاریەکان دەربارەی خۆیو سەردەمەکەی ئەخرێتەروو، یەکێك لەو حەقیقەتە دڵتەزێنانە ئەوەیە، گەلەکەمان لەژێر سایەی حوکمی دەسەلاتپەرستی (Authoritarian) یانەی سەرکوتکەری ستالین دا بەتوندیو دڵرەقانە ئازادی بیروڕای لێزەوت کراو کۆمەڵگا ئیفلیج بوو.

ئەمڕۆ، کاتی ئەوەیە نەوە لاوەکان رۆڵی خۆیان ببینن. جیهانی ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوەشدا ئاڵۆزتر بوە، پەیڕەوکردنی رێبازی مرۆڤایەتی بەسەرەکیترین سیماو ئەرکی خۆی ئەزانێ لەسەر زەوی، بەشێوازێك کەلەسەرجەم ئەزموونە مێژوویی یەکانی گەلانی سەرزەوی وەرگیرابێت. هیچ ئەلتەرناتیڤێکی تر نیە.

من بەتوندی پێ لەسەر ئەوە دائەگرم مرۆڤی ئەم سەردەمەمان تەنیا بەدەرکردنی ستالینیەت لەمێشكو بیرکردنەوەی خۆی ئەتوانێ لەجیهانی نوێی ئەمڕۆ تێبگاتو بەشداریی لەپێشکەوتنیدا بکات.

سەرچاوە

گۆڤاری Sputnikی رووسی کەلەرۆژنامەی (Sovietskaya Kirghizia) وە کردویەتی بەئینگلیزی گۆڤارەکە بەرگی پێوە نەماوە، لەبەرئەوە ژمارەکەی دیارنیە.

بەلام لەناوەوە

May -1989 ی لەسەرە

# دڵڕەقیو بێدەنگی

نووسینی/ کەنعان مەکیە

رانانی/ ماردین ئیبراهیم

بۆ تێگەیشتن لەبەعس تەنیا ئەوە بەس نییە توێکاری بەعس بکەین وەکو دەسەڵاتێکی سیاسی کەهەم لەسەر میکانیزمی کۆنترۆڵو هەم لەسەر میکانیزمی سزا (بەچەمکە فۆکۆییەکەی) زۆر بەتووندو تیژی کاردەکات، هەر شیکردنەوەیەکیش بۆ تێگەیشتن لەبەعس کەتەنها کایەی سیاسی وەردەگرێتو کاری لەسەر دەکات ئەوا گومانی تیانییە کە ئەو شیکردنەوەیە لەدەرئەنجامی کۆتاییدا شیکردنەوەیەك دەبێت کەخاوەن پایەیەکی تیۆری تۆکمەو وردبوونەوەیەکی میتۆدی قووڵ نابێت، چونکە بەعس بەتەنها دەوڵەتێکیش نییە کەهەموو جیاوازیەکان دەسڕێتەوەو هەموو ئەو دەنگو رەنگانە کپو وێران دەکات کەلەدەنگو رەنگی خۆی ناچنو لەدڕندانەترین ئاستدا هاوشێوەیی بەرهەم دەهێنێت.

بۆ خوێندنەوەی بەعس بەر لەهەموو شتێك پێویستە بەعس وەکو سیستمێك بناسین کەخاوەنی گوتاری خۆیەتی، خاوەنی دامودەزگاو کایەگەلی خۆیەتی، سیستمێك کەدەبێت لەقوڵایی کولتورێکدا بۆ جووڵەو میکانیزمەکانی بگەڕێین، واتە بەعس وەکو سیستمێك لەپشتیەوە کولتورێك ئیش دەکات کەچنگو دانی بەخوێنەو بەترسناکترین شێوە هەموو ئەو جەستەو عەقڵانە لەتو پەت دەکات کەلەفەزای ئایدیایەکی دیاریکراودا بۆ هەمەڕەنگی دەگەڕێن، هەر بۆیەشە وابەئاسانی ئەو سیستمە (بەعس) بەرهەم دێت کەبەشێوەیەکی سەیر توندوتیژی پیادە دەکاتو فاشیزم دەکاتە سیفەتی بنچینەیی هەموو دامودەزگاکانی خۆی، بۆیە نەبوو ئەو فاشیزمەی لەناو دامودەزگا رۆشنبیریو پەروەردەییەکان دا هەبوو هیچی کەمتر نەبوو لەو فاشیزمەی کەلەدامو دەزگاکانی بەعسدا دەبینرا خەتەرتریش لەمە مۆراڵی بەعس دەبوو بەمۆراڵی تاکەکانی عێراقیش (وەك مەریوان وریا دەڵێت).

ئــــەو پەیوەندیـــــە دیالەکتیکی و پتەوەی لەنێوان بەعس و کولتوردا هەیە بەرەو شوێنێك دەمانبات کەدان نان بەو پەیوەندیەدا بەتەنها وەك شیکردنەوەیەك نامێنێتەوەو بەڵکو بەرەو رووی هەڵوێستێکی ئەخلاقی ئێجگار گەورەمان دەکاتەوە، ئەمەش پەیوەندیەکە رۆشنبیرانی عەرەب بەئاسانی بۆیان قووت ناچێت و جگە لەوەش بەهەزاران کەس ستایشی بەعس دەکەن بە بیانووی زۆر رواڵەتی و تەنانەت تەسك بینانەش گوایە بەعس رەمزی ناسیونالیزمی عەرەبە بەرامبەر ئەمەریکاو ئیسرائیل.

ئایا ئەوە غەفڵەتزەدەیی رۆشنبیرانی عەرەب نی یە؟

غەفڵەت زەدەیی و وەهمێك کەلەناو هەموویاندا تاقە دەنگێکی جوان کە(کەنعان مەکیە) بەتێروانینێکی تیوری و دیدگایەکی هیومانیستی بەرزەوە سنورەکانی دەبەزێنێت بەمەش خۆی لەخوێنی قوربانیەکان پاك دەکاتەوە.

کتێبی "دڵرەقی و بێدەنگی" دووەم کتێبی "مەکیە"یە لەدوای کتێبی "کۆماری ترس" جگە لەووتارەکانی.

ئەم کتێبە کەسێك نووسیویەتی کەپرۆسەی نووسین وەکو ئیلتیزامێکی ئەخلاقی و کردەیەکی ئێجگار جدی سەیر دەکات و بەتەنیا بەلێکدانەوەی سەرپێیی و نامەنهەجی قایل نابێت و بۆئەوەش نانوسێت گۆشەو ستوونی رۆژنامەو گۆڤارەکان پڕکاتەوە. ئەم کتێبە بەنیەتێك نووسراوە کەنووسەرەکەی ناتوانێت چاوداخات لەئاست دیمەنی شەرم هێنەری ئەو ئینسانانەی لەکوچەو کۆڵانەکانی هەڵەبجەدا کیمیاباران کران و گوێی خۆی کەڕناکات لەئاست ئەنفالکردنی سەدان هەزار کەس (شیاوی باسە ئەدوارد سەعید لەچاوپێکەوتنێکدا گومانی خۆی دەربڕی بەوەی عێراق کیمیایی بەکارهێنا بێت لەهەڵەبجە).

مەکیە کەدێتە سەر دیفاع کردن لەکوردو مافی ئەوەیان پێ دەدات کەوەك هەر ئینسانێکی‌تر شایستەی ژیانێکی باش بن لە گۆشە نیگایەکی هیومانیستی رووتەوەیە نەك وەکو بۆچوونی هەندێك عەرەب زمانی‌تر (لەوانە مەشعان جبوری) کەپێیان باشە کورد دەوڵەتی هەبێت چونکە هەڵگرتنی چەوسانەوە لەسەرکورد ئارامی بۆ ئەمنی قەومی عەرەب فەراهەم دەکات نەك ئەوەی هەستی مرۆیی پاڵیان پێوەبنێت.

کەش و هەوای ئەو کتێبە کەش و هەوای عێراقە لەساڵانی هەشتاکاندا کەزۆر لەو کەش و هەوایە ترسناکترە کە (جۆرج ئۆرێل) لەرۆمانی (1984) دا باسی دەکات (وەك نووسەر ئاماژەی بۆ دەکات).

ئەو کتێبە خوێنەر وا لێدەکات بەشێوەیەکی سەیر بڕوانێتە سیستمی بەعس، بۆیەش دەڵێم سەیر چونکە ئەوەی لەعێراق دا نەژیابێت ئاسان نی‌یە بڕوا بەو هەموو زەبرو زەنگو تۆقاندنە بکات کەبەعس کردوویەتی.

کتێبەکە سەرەڕای پانۆرامایەکی روون و ئاشکرای رەفتارەکانی بەعس بەدرێژایی هەشتاکان بەداگیرکردنی کوەیت و شەڕی کەنداویشەوە هەروەها دەرخستنی روخساری ماکیاڤیللیانەی بەعس (ئەگەر

بەکارهێنانی ئەم چەمکە لەجێگەی خۆیدا بێت) لەبرندەترین ئاستیدا بەڕادەیەك كەبەهیچ شێوەیەك سڵ لەقەتڵو عامكردنی عەرەبەكانیش ناكاتەوە هەر لێرەشەوە خۆشی خەیاڵی ئەو ڕۆشنبیرە شۆڤینیستانەشمان بۆ دەردەكەوێت كەپێیان وایە بەعس پارێزەری بەرژەوەندیەكانی عەرەبە بەڕووی ئەوانی تردا (بێگومان خوێنەر باش تێدەگات كەمەبەستم ئەوە نییە بڵێم بەعس شۆڤێنی نییە).

ئەوەی سەرنج ڕاكێشە لەو كتێبەدا ئەوەیە كەمەكیە هێرشێكی ڕەواو ویژدانیانە دەكاتە سەر ڕۆشنبیرانی عەرەبو تاوانباریان دەكات بەوەی كەهەمان گوتاری دەسەڵاتە ملهوڕەكانی دەوڵەتە عەرەبیەكان دووبارە دەكەنەوەو لەودیو گوتاری شۆڤینیزمی عەرەبیەوە قسەیەكیان نییە بیكەن، هەربۆیە ئەو ڕۆشنبیرانە بەچاوی گلەییو دڕدۆنگیو هەندێك جاریش ئیهانەوە سەیری دەكەنو لەهیچ تاوانباركردنو تۆمەت دانە پاڵیشی سڵناكەنەوە (ئەی ئەوە نییە "ئەدوارد سەعید" تۆمەتی هاوكاریكردنی دەزگایەكی وەكو C.I.A دەداتە پاڵ). ڕەنگە تاڕادەیەكیش ئەو دژایەتیكردنە ئاسایی بێتە بەرچاو چونكە ئەو كەسانەی بەپێچەوانەی گوتاری (باو) جووڵەیان كردووە هەمیشە نەفرەتلێكراوبوون.

ئەم كتێبە پرۆژەیەكی زۆر گرنگەو بۆ هەر كەسێك بیەوێت بەعس بناسێت پێویستە بیخوێنێتەوە، هەموو عێراقیەك پێویستە بیخوێنێتەوە، چونكە مەرج نییە ئەوەی لەژێر زەبری بەعسدا ژیابێت بەعس بناسێت، بەعسێك بەو هەموو تۆقاندنو سەركوتكردنەوە كار بكات بێگومان توانای ئەوەشی هەیە كەبیركردنەوەی ئەندامانی كۆمەڵگاكەی بەڕادەیەك بشێوێنێت كەتوانای ناسینی دەسەڵاتەكەیان نەبێت.

**

پێناسەی (سارتەر) بۆ ڕۆشنبیر ئەوەیە كە ڕۆشنبیر ئەو كەسەیە كەخۆی لەقەرەی كارێك دەداتو بەرگری لەمەسەلەیەك دەكات كەهیچ پەیوەندی بەخودی خۆیەوە نییە. بەڵام ڕۆشنبیرانی عەرەب خۆیان لەقەرەی كارێك نادەن كەلەڕاستیدا پەیوەندی بەخۆشیانەوە هەیە، ئەوان نابینن كەفەیلەسوفێكی وەكو (پێر بۆردیۆ) لەسەر شەقامەكانی پاریس بەشداری لەخۆپیشاندانی هۆمۆسێكسواڵەكان دەكات؟ ئایا كارەساتی هەوڵ دان بۆ جینۆسایدی ملیۆنان كەس تەنانەت بەقەدەر كێشەی هۆمۆسێكسواڵەكانیش گرنگ نییە؟ ئەمە پرسیارێكی كراوەیە بۆ ڕۆشنبیرانی عەرەب خۆیان.

# لاسارێکی کۆن و شۆڕشێکی ڕەسەن

## پێشەنگی ڕۆمانی نوێ سەردانی بەیروت دەکات پاش ئەوەی چووە لیستی کلاسیکییەکانەوە

سەوسەن ئەلئەبتەح

و: ئازاد صدیق محمد

ئەو ساتەی چەند ڕۆژێك لەمەوبەر بەڕێوەبەری کۆڕەکەی وەك لوتکەیەك لە لوتکەکانی کلاسیکیاتی ئەدەبی پێشکەشی کرد ئالان ڕۆب گرێ تووڕەنەبوو و بەجۆرێکیش هەڵنەچوو کە پێوەی دیار بێت. هەرچەندە ڕۆب گرێ بەردەوام ناوی لکابوو بە یاخیبوون و شۆڕش و بەرهەڵستیکردن لە دژی کۆن، ئەوەتا بەجۆرێك لەجۆرەکان ئەوە قبووڵ دەکات بچێتە نێو لیستی کلاسیکییەکانەوە هەرچەندە بەهەموو مەعریفەو توانایەوە لە ڕەخنەگرتن و لێکدانەوەدا دژی هەندێکیان لە جەنگدا بوو.

جەنگی ڕۆب گرێ کە سەرکردەی بزوتنەوەی بەرگری کردنە لە (ڕۆمانی نوێ) لە فەرەنسادا ئاراستەی میراتی ڕۆمانی کلاسیکی کرابوو کە ڕۆژگار کردبووی بە پێوەرێك بۆ پێوانەکردنی بەرهەمەکان (ڕۆمانەکان) و جیاکردنەوەی چاکیان لە خراپیان. یەکێك لە گاڵتەجاڕییەکانی ئەم سەدە ئەهریمەنییە، ئەو خێراییەیە کە پێشەنگ و نوێگەران لەماوەی کەمتر لە بیست ساڵ دا دەبنە کلاسیکی، ئەو سەرکێشییە ئەدەبییە دلێرانەیەی کە ڕۆب گرێ لەگەڵ هاوڕێیانی وەك ناتالی ساروت، کلۆدسیمۆن، میشال بوتۆر و مارگرێت دوراو ئەوانی تردا لەپاش جەنگی دووەمی جیهانی بەشداری پێکرد، تێکۆشانێکە لەپێناوی جێگیرکردنی کۆڵەکەکانی ڕۆمانی نوێ کە خۆی وابەستەی مۆرك و خەسڵەتەکانی ڕۆمانی تەقلیدی ناکات لە ڕووی ڕێڕەوی درامایی و کەسایەتییەکان و چنین -یەوە بەڵام هەر ئەم بزاوتە بوو کە لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکاندا وادەرکەوت کە تووشی ڕاچڵەکینێکی بەرهەڵستکارانە ببێتەوە لەلایەن کۆمەڵێك ئەدیبی لاوەوە. ئەوێ کاتێ نەوەیەکی نوێی ڕۆماننوس دەرکەوت ئارەزووی سەرکێشییەکی هێندە سەرپەڕی دەکرد کە زۆر زیاتر بە ناخی ئازادی و دەربازبوون لە کۆت و پابەندبووندا ڕۆبچێت. بەڵام ئەم گروپەی کە لە سەرەتای هەشتاکاندا گەیشتە ترۆپکی ئارەزووی خۆی گەڕایەوەو زریانەکەی هێمن

بووەوە تا ڕۆمان بۆخۆی ئەو هاوسەنگی‌یەی بەدەست بهێنێتەوە کە سوود لەکۆن و نوێ وەربگرێت بێ‌ئەوەی دەمارگیری گروپێکی ئەدەبی یان ڕێبازێکی گوزارشت کردن یان فۆرمێکی ڕۆمان بێت.

ئالان ڕۆب گریێ بە باوکی (ڕۆمانی نوێ) دانرا چونکە لە سالانی پەنجاکاندا و لەگەڵ دەرچوونی ڕۆمانە بەرایی‌یەکانی دا توانی هەموو دەنگەکانی ڕۆمانی نوێ سەرەڕای جیاوازی ئاڕاستەکانیان کۆبکاتەوەو قورسایی‌یەک پێک بهێنێت کە نیگەرانی و مشتومڕێکی زۆر دروست بکات و کێشەکانی خۆی بخاتە ڕوو بۆئەوەی گفتوگۆیان لەسەر بکرێت. لەلایەک هەوڵی دەدا ڕۆمانەکەی بلاوبکرێتەوە کە تەنها دەزگای بلاوکردنەوەی (مینۆی) ناوی لێنابوو ڕۆمانی نوێ، خۆی وەک ڕاوێژکاری ئەدەبی ئیشی تیادا دەکرد لەلایەکی تریشەوە وتارە ڕەخنەیەکانی دەنووسی و بلاودەکردەوە کە تیایدا بەرگری لە ڕۆمانێک دەکرد گۆڕاوەو جیاوازە و دیدو شێوازی خۆی هەیە.

ئالان ڕۆب گریێ دەڵێت: دەزگای گالیمار چاپ و بلاوکردنەوەی یەکەمین ڕۆمانمی ڕەت کردەوە چونکە ڕۆمانێک خوێنەری نی‌یە، هەروەک بلێی داهێنانی نوێ ڕوودەکاتە جەماوەرێك پێشتر ئامادەیەو هەیە. گریێ لە درێژەی قسەکانی‌دا دەڵێت: وەلامی نێگەتیڤانەی دەزگای گالیمار پرۆگرامێکی کارکردنی بۆ دروست کردم کە ئیدی وروژاندنی فزولیەتی خوێنەر و هاندانی بۆ گەڕان و ئاشکراکردنی داهێنانە تازەکانمان بووە ئەرکی سەرەکیم. نووسەر خوێنەری خۆی پەیدادەکات نەك بەپێچەوانەوە.

لەوانەیە شتێك کە لە هەمووی زیاتر بتوروژێنێت کاتێك گوێ بۆ ڕۆب گریێ دەگریت ئەو حەماسەتە بێت کە هەستی پێ دەکەیت و تێکەڵ بە تواناو بەرەنگاری پێت دەگات لەپیاوێکی تەمەن حەفتاوحەوت سالەوە لەکاتێکدا باسی سەرکێشی‌یە ئەدەبی‌یەنوێگەری‌یەکەی دەکات هەروەک بلێی لەوساتەدا دەژی. گریێ گالتەو قەشمەری بەوانە دەکات کە بە شێتیان لەقەلەم دەداو داوایان دەکرد دوور بخرێتەوەو بفەوتێنرێت و دەقەلاسارەکانی نەهێلدرێن. بەلام گریێ (دیدرۆ) ی خۆش دەوێت چونکە بە وتەی ئەو لە سەدەی نۆزدەدا ڕۆمانی نوێی نیگەران و بەرهەلستکاری نووسی بەپێچەوانەی (بەلزاك) ەوە کە تەواو دلنیابوو لە بەها بۆرژوازیەکانی و پشتێنی لێکردبووەوەو تەواو دلخۆش بوو.

ئەمڕۆ سەرکێشی (ڕۆمانی نوێ) کۆتایی هاتووە کە ڕۆب گریێ سەرکردایەتی کرد، کەچی هێشتا بەجۆرێکی هێندە حەیەوی و بە حەماسەتێکەوە لەبارەیەوە دەدوێت، دەیهێنێتە بەردەمت و زیندووی دەکاتەوە. گومانی تێدانی‌یە گریێ و هاوەلەکانی جێپەنجەی خۆیان و داهێنانە ئەدەبی‌یەکانیان جێ هێشت کە مێژوو تۆماری کردوون و هیچ ڕۆژێکیش ئەدەب نکوولی لێ ناکات. هەر بەسای ئەوانەوەیە ڕۆمان وای لێهاتووە بە ئازادی لەدایك بێت و دەرباز بێت لەو مەرجانەی کەلەپچەیان دەکرد یان ئەو کۆتانەی دیلیان دەکرد.

کاتێك گوێ لە ئالان ڕۆب گریێ دەگریت کە باسی ئەو جەنگ و بەرەنگاریانە دەکات کە ڕووبەڕووی بوونەوە گومانی تێدانی‌یەو دلخۆشی دەکەن چونکە ئەو لە زەمەنی هەلچوونی فیکریدا ژیاوە ئەوکاتەی خەلکی تینووی بوون بە خاوەنی کێشەکان یان پەلاماردانی بوون یان لانی کەم هەولیان دەدا بۆ تێگەیشتنی کێشەکان.

رۆب گرێ بۆمان دەگێڕێتەوە چۆن خاوەنی ڕۆمانی نوێ دەینووسی و بڵاوی دەکردەوە لەکاتێکدا پێش وەخت دەیزانی نووسەرێکە خوێنەری نییە. لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام بوون لە هەوڵدان و کەسیان هیوا بڕاو نەبوون چونکە خەڵك یەکجار فزوولی بوون.

تەنانەت ڕەخنەگرەکانیش کە قەڵس و بێزاربوون لەو ئەدەبە پشت گوێیان نەخست وەك ئەمڕۆ روو دەدات، بەڵکو بەدوورو درێژی لەبارەیەوە دووان. لەنێوان وتاری ئەدیبەکان و وەڵام و نەفرەتی ڕەخنەگرەکاندا حەماسەتی خەڵکی بۆ ئاشنابوون بەم ئەدەبە نوێیە زیادو گەشەی دەکرد. ئیدی لە ماوەی پێنج یان شەش ساڵدا کتێبەکان دەگەیشتە دەستی خوێنەران.

لە بیست سی ساڵی رابردوودا ئەو دەزگایانەی کە هەندێك کتێبیان چاپ دەکرد کە لە رووی بازرگانییەوە قازانجیان نەدەکرد وەك دەزگای (مینۆی) دەزگای راقی بوون و خاوەنەکانیان خەڵکی خاوەن پرەنسیپ بوون بەڵام ئەمڕۆ ئەو دەزگایانەی لە رووی ماددییەوە زیان دەکەن شایستەی بەزەیی و گومان کردنن لە بەهای مانەوەیان.

ئەو ڕێسایەی کە دەکرێ بە باڵای کتێب دا ببڕدرێت بەهەمان شێوە کاڵای پڕ باڵای فیلمە سینەماییەکانیشە. ڕۆژانێك بوو مایەی شانازی بوو کە دەرهێنەر ببێتە خاوەن و بەرهەم هێنی فیلمێك کە جەماوەری نەبێت بەڵام ئەو بڵاوی بکاتەوە بۆئەوەی فتوحاتی نوێگەری پێ بەئەنجام بگەیەنێت. هەر ئەمەش بوو وای لە گرێ کرد خۆی بکات بە قووڵایی سینەماشدا و تیایدا سەرکەوتووش بێت و چەندین خەڵات بچنێتەوە پاش ئەوەی تەواو دڵنیابوو لە شکۆمەندی خۆی وەك رۆماننوسێك. ئەم شۆڕشگێڕەی ئەمڕۆ وەك کۆن و گەڕاوە دێتە بەرچاوت دان بەوەدا دەنێت کە بارودۆخەکە گۆڕاوەو ڕۆمانووسەکان خۆیان و ئەوانەشی کتێبەکانیان چاپ و بڵاودەکەنەوە چیتر ئارەزووی قوربانی گرانبەهای تێکۆشان ناکەن.

پێش ئەوەی حوکم لەسەر ئەزموونی ئەم پیاوە یان سروشتی ئەو قۆناغە بدەیت کە بەشێك بوو لە هەڵچوونی، ناچاریت کە دەبێت زۆر بە باشی گوێی بۆ بگریت کاتێك ئەو دان بەوەدا دەنێت سەراپای ڕۆمانەکانی هیچ نین بێجگە لە تۆماری ژیاننامەی خۆی بەوشێوەی بەگەڕۆکی لە قوژبنەکانی زەویدا ژیاوە، ئەوکاتەی ئەندازیاری کشتوکاڵی بوو مرۆڤی لە دژوارترین حاڵەتیدا تاقی کردۆتەوە بەهەمان شێوە ئەوکاتەی بووە ڕۆماننوس و سینەماکارێکی داهێنەریش هەر مرۆڤی تاقیکردوەتەوە. سەرەڕای هەموو شتێك دوایین بەرهەمی کە لە سێ بەشداو بەچەند قۆناغێك پێشکەشی کرد ژیاننامەی ڕەسمییەتی وەك چۆن ئەدیبەکان لە پاییزی تەمەنیاندا ژیاننامەی راستەقینەیان دەخەنە بەردەستی خوێنەران، بەڵام هێشتا ڕۆمانەکانی رووی ئەودیوی ئەم ژیاننامەیەتی. ئیدی ئەو ڕەخنەگرو توێژەرانەی دەخوازن زیاتر لە بارەی ئەم پیاوە سەرکێش و سەرچڵ و یاخییەوە بزانن، دەبێت، هەموو بەرهەمەکانی لەبەر ڕۆشنایی ئەم دان پیانانەیدا بخوێننەوە کە جارێکی دیکە تەئکیدی دەکاتەوە شۆڕشە نوێخوازەکان دەبێت لە ناخی خاوەنەکانیان و لە قووڵایی ڕێڕەوەکانیانەوە هەڵقوڵێت و تەنها وشەی بریقەدارو شێوازی دەستکرد بەس نین بۆ بەدیهێنانی شکۆیەکی ئەدەبی یان فەتحی گۆڕانکارییەك کە مێژوو لەنێو کلاسیکە شکۆدارەکانیدا تۆماری دەکات.

پەراوێزەکان:

ئەم بابەتە لە زمانی عەرەبی و لە ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط) ەوە کراوە بە کوردی: ژمارەی 7412 – 1999/3/15.

# جیابوونەوەی هەمیشەیی لە بەهەشت

## بەبۆنەی کۆچی دوایی رۆمان نووسی ئینگلیز (ئیریس مۆرداک) ەوە

و: ستار کریم

-1-

ئیریس مۆرداک یەکێکە لە گەورەترین خانمە رۆمان نووسەکانی ئینگلستان لە سەدەی بیستەم دا، لەم مانگەی پێشوودا دوای ئەوەی پێنج ساڵ بوو دووچاری نەخۆشی (ئالزایمەر) ببوو سەرئەنجام لە نەخۆشخانەیەکی شاری (ئۆکسفۆرد) لە تەمەنی (79) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

(جان بیلی) هاوسەری مۆرداک کە مامۆستای زانکۆیەو رەخنەگرێکی شارەزای ئەدەبییە لە وتەیەکیدا دەربارەی یادگاریەکانی خۆی لەگەل (مۆرداک) دا لە ماوەی 43 ساڵی ژیانی هاوسەریدا وتی: مۆرداک دووچاری نەخۆشی ئالزیمەر ببوو، بەلام ئەو هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ ئەوەشا بەردەوام بوو لە کارکردن ئیتر گەیشتە مەبەستی خۆی، منیش پێویستە وەك ئەو بگەمە جێیەك.

(مۆرداك) لە 9 ساڵییەوە دەستی بە نووسین کردووە، بەلام یەکەم رۆمانی کە (لەناوتۆڕ) دابوو لە 35 ساڵیدا 1978 دا خەلاتی (بوکەر) ی لە رۆمانی (دەریا، دەریا) پێ درا، کە باشترین خەلاتی ئەدەبییە لە زمانی ئینگلیزیدا.

مۆرداك زۆری دەنووسیو لە باسەکانی دا دەربارەی (نهێنییەکانو کێشمەکێشی قووڵی نێوان خێرو شەڕ) دەدوا، هەروەها کەسایەتی رۆمانەکانی زیاتر عاتفی بوون.

(جین ئیریس مۆرداك) لە 15 ی مانگی جولای 1919 دا لە دبلن هاتۆتە دنیاوە، دایكو باوکی ئینگلیزی ئێرلەندیبوون. لە ئینگلستان لە دەزگای (فوربل) و دوایی لە خوێندنگەی (بەدفیتون) خوێندویەتی لە زانکۆی (سومەرویل) ی ئۆکسفۆرد فەلسەفە و زمانە کلاسیکیەکان فێربووە، لە ساڵی 1942 دا خوێندنی تەواو کردووە.لە رۆژانی خوێندنی دا لە زانکۆ مەیلی بەلای کۆمۆنیست دا لەوپەڕی گەرمو گوڕیدا بوو، بەلام ئەو گەرمو گوڕییەی بۆ کۆمۆنیست ئەوەندە نەخایاندو لە حیزب دوور کەوتەوە.

لە ساڵەکانی جەنگی جیهانی دووەم دا لە وەزارەتی خەزێنەو دارایی ئینگلستان کاری دەکردو لە ساڵی 1944 دا لە ئۆردووگاکانی پەنابەران

لە نەمساو بەلجیك خەریکی کارکردن بوو، هەر لەو رۆژانە دابوو راپەرینی وجودی یەکان کاریان کردە سەری.

لە ساڵی 1953 دا لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی ژان پول سارتەر فەیلوسوفی فەرەنسی بڵاوکردۆتەوە، مۆرداك بەهۆی ئەوەی کاتی خۆی لە حیزبی کۆمۆنیست دا چالاکی هەبووە، نەیتوانی بۆرسەی خوێندن لە ئەمریکا وەربگرێت، بەڵام لە تەمەنی 29 ساڵیدا مۆڵەتی وانە وتنەوەی فەلسەفەی لە ئۆکسفۆرد وەرگرت.

لە ساڵی 1948 ەوە تا 1963 بۆ ماوەی 15 ساڵ وانەی فەلسەفەی بەبەردەوامی وتۆتەوە، بەڵام ئەمساڵ بەهۆی تەمەن درێژی کە لە توانایدا نەمابوو وانە بلێتەوە دەستی لە وانە وتنەوە هەڵگرت.

لە ساڵی 1961 دا رۆمانی (سەری جیابۆوە) هەر بەزوویی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا، ئەم رۆمانە زیاتر شێوازی کۆمیدی لەخۆگرتبوو پڕیش بوو لە سۆزو عاتیفە.

کۆی بەرهەمەکانی مۆرداك بێجگە لە 27 رۆمان، چەندین شانۆنامەو چەندین بەرهەمی فەلسەفیو دیوانێکی شیعریشی هەیە، ئەم بەرهەمانە بۆ زۆربەی زمانە ناسراوەکانی جیهان تەرجوومە کراوە.

مۆرداك دوای چەندین ساڵ وانە وتنەوەی فەلسەفە لە زانکۆدا، رووی کردە رۆمان نووسین و ئاوێتە کردنی هونەرو فەلسەفە، لە ململانێی خێرو شەڕ، راستو درۆ، رەوشتو بەدڕەوشتی.

لە ئەنجامی تێکەڵاوی و کارکردنی لە ئۆردوگای پەنابەران لە بەلجیکاو نەمسا کاریگەری قووڵیان لەسەری بەجێ هێشتبوو، ئەنجام بینییەکەی (داتەپینی تەواوی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی) ناوزەدی کرد.

بە بڕوای مۆرداك ئەرکی فەلسەفە (رێ پیشاندانی مرۆڤە بەرەو چاکە) و پێوانەی چاکەش لە دیدی ئەوەوە ئەوەیە کە (مرۆڤ لە ئۆردوگاکانی پەنابەران دا دوور لە هەر خۆویستنێك خەریکی خزمەت کردن بێت).

مۆرداك سەردانی ژان پول سارتەری لە پاریس کردووە، یەکەمین رۆمانیشی (لەناو تۆڕ) دا لەژێر کاریگەری بیرو ئەندێشەی وجودیو فەلسەفەی هاوچەرخی فەرەنسادا نووسیوە.

بە بڕوای زۆربەی رەخنەگران رۆمانی (شازادەی رەش) باشترین بەرهەمی (مۆرداك) ە، هەندێکی تر لە رەخنەگران لەو باوەڕەدان رۆمانی (دەریا، دەریا) شایستەی ئەم پێناسەیە بێ.

مۆرداك لە داستانی نووسین دا هەموو جۆرە شێوازەکانی فێرببوو، لە رۆمانی فەلسەفییەوە بیگرە تا سەمبولیزم، ئەفسانەو کۆمیدی لەهەموویان دا سۆزی مرۆڤایەتی پایەی سەرەکی نووسینەکانی بووە.

خاتوو (مۆرداك) دەی وت:

(هەرکاتێك کتێبێك تەواو دەکەم سیی دەقیقە پشوو دەدەمو دوایی دەست دەکەم بە نووسینی کتێبێکی تر).

مۆرداك بەبەردەوامی هەتا تەمەنی پیری ئارەزووی لە فەلسەفە هەبووە، لە ساڵی 1992 دا لە تەمەنی 72 ساڵدا کتێبێکی 500 لاپەڕەیی دەربارەی (لەودیو سروشتەوەو رەوشت نمایی) نووسی؟

لەم ساڵانەی دواییدا وەکو پێشتر مۆرداك ئەوەندە لەبەر دیدی رەخنە گران دا نەبوو، بەڵام بەرزی بەرهەمەکانی، هەمەجۆریو فراوانیو رەسەنایەتی بیرو ئەندێشەکانی، بەرزی ئەو لە پایەی یەکێك لە هەڵکەوتووترین نووسەرانی هاوچەرخی خۆی ئەپارێزێت.

تووش بوونی مۆرداك بە نەخۆشی (ئالزایمەر) ڕێکەوتێکی ناخۆش بوو، (جان بیلی) هاوسەری مۆرداك لە نووسینێکی لە گۆڤاری (نیویورکەر) دا دەڵێت: لەم دواییەدا ئیتر هۆشی کاری نەئەکرد، نەی ئەزانی کە 27 ڕۆمان و چەندین کتێبی دەربارەی فەلسەفە نووسیوە، لە چەندین زانکۆی ناسراودا دکتۆرای فەخری پێ دراوە.

## بیروڕای نووسەران دەربارەی مۆرداك

مالکوالم بەرادبەری، ڕۆمان نووسی ئینگلیزی دەڵێت: مۆرداك کەسایەتی‌یەکی هەڵکەوتووی هاوتای نووسەرانی وەکو (ئانتۆنی برجس) و (ولیام گولدینگ) بوو. ئەو یەکێکە لەو چوار یا پێنج ڕۆمان نووسە گەورەیەی ئینگلستان لە نیوەی دووەمی ئەم چەرخەدا، لەوەوە نەك کۆتاییی‌یەکی خەمناکی چیرۆکی ژیانی بەڵکو بیرێکی درەوشاوەی وەکو یادگار بۆ بەجێ هێشتووین).

جاك کیسی، مامۆستای زانکۆو ڕەخنەگری ئینگلیزی دەڵێت: (ئەو لەناو ئینگلیزەکان دا نزیکترین کەس بوو لە ژان پۆل سارتەرەوە، زۆر دەگمەنە کە فەیلەسوفێك فەلسەفە لە قالبی ئەدەب دا دەربهێنێ!

ئەو ئەم کارەی کردبوو، مۆرداك بە مانای تەواوی وشە ڕۆشنبیر بوو، کارەکانی لەم بارەوە نیشانەی گرنگی و بەرزی ئەو بوو کە توانی بابەتی (لەودیو سروشت) ەوە لەسەر تەواوی ژیانی ڕۆژانە تاقی بکاتەوە، ئەو فەیلەسووف و بیریارو بەتوانابوو).

ئەی . ئان. ویلسون، نووسەری ئینگلیزی ئەڵێت:

(ئەو داهاتێکی باشی لە کتێبەکانی بەدەست دەهێناو هەمیشە کۆمەکی شایستەی بە دەزگا خێرخوازی‌یەکان دەبەخشی، هەر کەسێك ئەوی بدیبایە ناچار دەبوو هاوڕێیەتی بکات، ئەویش نەك وەك پەیوەندی‌یەکی ئینسانی بەڵکو وەك پەیوەست بوونی عاشق و عەشقی گەورە، ئەو خێرە ڕەهایەی کە ئەفلاتوون لەسەری دواوەو ئەو خۆیشی بە ڕەوانبێژی تەواوەوە دەربارەی ئەوی دەنووسی).

کارمن کالیل، پەخشکاری بەرهەمەکانی مۆرداك دەڵێت:

(نووسینەکانی ئەو بە جۆرێك بوو کە خاڵبەندی بە تەواوی لەجێی خۆیدا پەیڕەو کرد، زۆر بە دیقەتەوە جێگۆڕکێی پێ دەکردن لە ڕستەدا. هەرجارێك کە لە گەڵیا دەبووم، کاتێ دەمویست لێی جیا ببمەوە وام هەست ئەکرد کە لە بەهەشت دێمە دەرێ، چونکە زۆر میهرەبان و دڵپاك و زۆر سەرنج ڕاکێش بوو. کۆچی دوایی ئەو جیابوونەوەی هەمیشەیی ئێمەیە لە بەهەشت).

ئەندەروموشن، شاعیری ئینگلیزی و مامۆستای ئەدەبیاتی زانکۆ دەڵێت:

(مۆرداك) خانمێکی دەگمەن بوو، کاتێ داوای چاوپێکەوتنی لێ‌بکرایە قبوولی نەدەکرد، بۆ ناساندنی کتێبەکانیشی بەکردەوە هەنگاوی نەدەنا. کتێبەکانیشی لە ڕووی شێوازو بیرو ئەندێشەوە لە ئاستێکی بەرزدا بوون، نووسینەکانی بە شێوازێکی ڕوون و ڕەوان زەمینەیەکی دیاری لەگەڵ چەمکە فەلسەفی‌یە زۆر باڵاکان دا هەبوو).

لە ڕۆژنامەی (همشهری) ژمارە 1770 وە ئامادەکراوە.

# گۆنتالۆ تۆرنتی بایستیر ئەو نووسەرەی بەسەر فەرامۆشکردنی رەخنە گرەکانی‌دا زاڵبوو

و/ سازان قادر حمەصالح



ماوەیەك لەمەوبەر وڵاتی ئیسپانیا یەكێك لەبەناوبانگترین نووسەرە هاوچەرخەكانی سەردەمی لەدەست دا.. كە بۆ نیو سەدەیە كاریگەری بەسەر ژیانی رۆشنبیری‌یەوە هەیەو دیارترین نووسەریشە كەخەڵاتی ئەدەبی پێ‌بەخشرابێت.. وەك خەڵاتەكانی (میر ئەستۆریاس)و(سێرڤانتیس). كە بۆ نووسەرانی ئیسپانیا لەدوای خەڵاتی (نۆبل) بەگەورەترین‌و بەنرخترین خەڵات دادەنرێت.

(گۆنتالۆ تۆرنتی بایستیر) رۆماننووس‌و شانۆنووس‌و رەخنەگر دوای تەمەنێكی دوورو درێژی پڕ لەكارەسات لەتەمەنی هەشتاو هەشت ساڵیدا جیهانی وشەو ئەفراندنی جێهێشت. گۆنتالۆ لەساڵی (1910) لەگوندێكی نزیك شاری (میزۆل)ی باكووری رۆژئاوای ئیسپانیا لەخێزانێكی مام ناوەندا لەدایك بووە، باوكی دەریاوانێكی ناسراو بووە، دەریاوانی پیشەی زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بوو كەبەسەر دەریادا دەیڕوانی، گوێی مناڵەكانیشیان هەمیشە لانەی ئەو چیرۆكانەبوو كەپیرەكان دەیان گێڕانەوە كە باسی جنۆكەو بوكی دەریاو دنیای كۆن‌و زەمانی نادیاری دەكرد.

گەنجەكانیش بەو چیرۆكە فۆلكلۆریانە گوێش كرابوون كەناوبانگێكی تایبەتیان هەبوو وەك (ئافرەتانی عیشق)

چیرۆکی ئەو جادوگەرانەی لەکلیلی دڵەکانەوە گاڵتەیان بەبوونەوەرە نامۆکان دەکرد لەتێرکردنی ئارەزووەکانیان دا. لەم کەشە ئەفسووناویەوە کەواقیع ئاوێزان بەخەیاڵ دەبێت گۆنتالۆتۆرنتی لەسەر ئەو چیرۆکانەی کەداپیرە کوێرەکەی بۆی دەگێرایەوە پەروەردەکرابوو، چیرۆکەکانیش وەك قەرەبوویەك وابوو بۆ داپیرە کوێرەکەی کەپڕبوون لەو ڕەنگانەی ئەوان ناتوانن راستەوخۆ بەچاویان بەرجەستەی بکەن.

گۆنتالۆ لەسەردەمی لاوێتیدا نووسەرێکی ناودار نەبووە، تەنانەت نووسینەکانیشی دەنگدانەوەیەکی وایان نەبووە، چ لای رەخنەگرەکان و چ لای جەماوەری رەمەکی. ئەمەش دەگەڕایەوە بۆئەوەی کەگۆنتالۆ سەربەهیچ کۆمەڵەو رێکخراوێکی ئەدەبی نەبوو.

نووسەر تا ماوەیەکی زۆر خۆی بەنامۆیەك لەجیهانی ئەدەبی‌دا دادەنا، وەك ئەوەی لەهەندێ ساتدا دەیوت: (من کەسێکم لەبواری ئەدەبدا پەسەندکراونیم بەڵام رێگای خۆم گرتوە، بەچاوپۆشی لەسەرجەم ئەو رەخنانەی کەلێم دەگرن گوێشم نەداوەتە مۆدە ئەدەبیەکان، هەمیشە ئەوەم نووسیوە کەبڕوام وابووە ئەدەبێکی راستەقینەیە).

بەرهەمەکانی نووسەر لەئەزموونەکانی ژیانی رۆژانەیەوە سەرچاوەیان گرتووە، وەك مرۆڤێکی سادەو ساکار خۆی دەبینی، هەروەها هەوڵی سەرکەوتنی دەدا لەرێگەی بەردەوام بوون و راهێنان لەبواری نووسین دا، هەمیشە لەنووسینە باوەکانی ئیسپانیا خۆی کەلاخستووە، بەڵام لەبەریتانیاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا نزیك بووە لە شێوازە باوەکەی ئەوانەوە.

وەك خۆی دەڵێت: لەندەن و نیویۆرك و بوینس ئایرس لەمەدرید بۆ من نزیکترن"، ئەمەش بەبۆچوونی رەخنەگرەکان ئەوە دەگەیەنێت کەگونتالۆ پێش ئەوەی ئەدەبی کلاسیکی ئیسپانیا راقە بکات ئەدەبی کلاسیکی ئینگلیزی خوێندۆتەوە.

هەر لەسەرەتای ژیانیەوە هەتا مردنی خولیای ئەدەبی (سێرڤانتیس) بووە، لەو بڕوایەدا بووە کەبەزمانێك دەنووسێت رێزو حورمەتی ئەدەبی لێ‌ناگیرێت. هەروەها ساڵی (1975) لەسەر (دۆن کیخوتە)ی سێرڤانتسی نووسیوە کەیەکێکە لەبەرهەمە گرنگەکانی بەناوی (کیخوتە وەك گەمەیەك).

نووسەر خولیای بۆ نووسەرە ئینگلیزەکان، دەگەڕایەوە بۆ کاریگەری زیاتری سێرڤانتیس لەسەر ئەو نووسەرانە وەك لەنووسەرە ئیسپانیەکان هەرچەندە خودی سێرڤانتیس کلتوری سەرەکی خودی ئیسپانیەکانە.

بەدرێژایی تەمەنی لاوێتی کەسێکی یاخی‌بووە لەبواری نووسین لەنەریتە ئەدەبیە باوەکان، کەئەمە بووە هۆی چەند گیروگرفتێك لەگەڵ سانسۆردا.

لەگەڵ ئەمانەشدا کەلاوێکی کۆماری خوازبوو بەڵام خۆی لەشەرەنگێزی دەپاراست، دواجاریش هەر ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە بۆ خۆپاراستن لەتورەیی رژێمی (فرانکۆ) بچێتە نێو ریزەکانی پارتی (تالانج)ی راست ڕەوەوە، دوای گەڕانەوەی لەپاریس کە کۆماریەکان لەشەڕی ناوخۆدا تێك شکان، بەئامۆژگاری یەکێك لەقەشەکانی کڵێسەی کاسۆلیکی بووە بە ئەندامی ئەو حیزبە، بەڵام ئەم پەیوەندی یە لەگەڵ رژێمدا زوو کۆتایی هات، دوای ئەوەی ساڵی 1962 بەیانێکی دژ بەرژێمی فرانکۆ ئیمزاکرد تیایدا دژ بەتوندوتیژی پۆلیس دەوەستێتەوە کەدژ بەکرێکارانی کانی خەڵوز نواندبوویان بۆ چاك کردنی ژیانیان رێپێوانیان سازدابوو، پارتەکەش لەئەنجامدا لەریزی خۆی کردنیە دەرەوە، هەروەها نووسینیشی لێ‌قەدەغەکرد لەرۆژنامەکەدا، لەوساتەدا گۆنتالۆ خەریکی وتنەوەی وانەی مێژوو بوو لەیەکێك لەخوێندنگە سەربازی‌یەکانداو لەوێش دەریان کرد.

سانسۆرچیەکان زۆر توانجیان لەنووسینەکانی دەگرت و داوایان لێدەکرد

زۆربەیان بسڕێتەوەو لەبەرچاودا ونیان بکات.

لەم دواییەدا رای گەیاندبوو بەدەستی ئەنقەست سانسۆرچی فریودەدا ئەوەیش بەنووسینی هەندێك دیمەنی زەق کەتایبەتە بەچەند نمایشێك کەخۆی لەخۆیدا رەت کراونەتەوە بۆ زیاتر سەرنجدانی سانسۆرچیەکان‌و دوورخستنەوەی لەو بۆچوونە راستەقینانەی کەخۆی حەزی لێدەکردن. لەم بوارەدا زۆربەی جار سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لەبەرئەوەی رەقیبەکە بەردەوام داوای لێدەکرد کەئەم جۆرە دیمەنە شورەییانە لابرێت بۆئەوەی لەبەشەکانی تری رۆمانەکە دەربازبن.

لەئەنجامی بەرپەرچدانەوەی جەماوەرو رەخنەداو دوای دەرچوونی رۆمانی (دۆن خوان) لەساڵی 1963دا کاتێك نووسەر لەپێشانگایەکی کتێبدا چاوەڕوانی جەماوەر بوو تەنها تاقە نوسخەیەکی لەرۆمانەکەی خۆی فرۆشت، بەڵام لەگۆشەیەکی تری پێشانگاکەدا نوسەرێکی مام ناوەندی کەم بەها زۆرترین فرۆشیار کۆبوونەوە بۆ کرینی کتێبەکەی، بانگێشت کردنی بۆ دەرس وتنەوەی لەئەمەریکادا رزگاری کرد لەوبارودۆخە ناهەموارو ناخۆشە مادیـیە کە دووچاری بوو بوو، هەروەها رزگاریشی بوو لەناڕەزایی جەماوەرو رەخنەگران.

دوای ئەوەی کەبوو بەمامۆستا، سیانیەکەی (ثلاثیة) خۆی نووسی بەناوی (چێژو سێبەرەکان) کەلەڕاستیدا جۆرێك بوو لەڕووبەڕووبوونەوەی کاری یەکێك لەو نووسەرە سەرکەوتووانەی کەبەهرەیەکی مامناوەندی یان هەبوو. ئەم کارەشی بووە هۆی بیرخستنەوەی سێ رۆمانی پێشووی کە بریتی‌بوون لە (پیاوێك دەگات - 1957)،(لەوکاتەی هەوا ئەسووڕێتەوە - 1960)، (جەژنە غەمبارەکە - 1962)...

ئەم رۆمانانە بەدوای ژمارەیەکی یەکجار گەورەی کاری شانۆیی‌دا هات کەهەرگیز رۆشنایی یان نەبینیووە، لەبەرئەوەی لەوکاتەدا بەبیروبۆچونی رەخنەگرەکان ئەم بەرهەمانە کۆمەڵێك بەرهەمی زەیینی روناکبیران بوون کەبەکەڵکی جەماوەری ئاسایی نەدەهات.

ئەو جەماوەرەیش بریتی‌بوون لەدەوڵەمەندە تازەکانی ئەو سەردەمە، ئەوانەی کەسامانەکانیان لەشەڕی ناوخۆی ئیسپانیادا لەسەر ژیان‌و ئازاری خەڵك کەڵەکە کردبوو.

هەروەها رۆمانە شاکارەکەی کەبەناوی (خێزان - هەڵهاتن.خ.ب) کەساڵی (1971) خەڵاتی شاری بەرشەلۆنەی وەرگرت، لەوساڵەدا دووبارە خەڵاتێکی تری وەرگرت کەبریتی بوو لەخەڵاتی رەخنەگرەکان.. بەڵام سەرەتای ناوبانگی راستەقینەی ئەم نووسەرە لەوکاتەوەیە کەرۆمانی (چێژو سێبەرەکان) لەزنجیرەیەکی تەلەفزیۆنی‌دا پێشکەش دەکرا ئەم ناوبانگە ئەدەبیە کاتێك هات کەتەمەنی لە(61) ساڵیدا بوو.

لەرۆمانە گرنگەکانی تری (دوورگەی زەعفەران، ساڵی 1980)و(پەراوەکانی جادوگەرێکی تەمەڵ ساڵی 1982)و(مێژووی پاشای مۆمیاکراو لەساڵی1989).

کۆچی دوایی نووسەری گەورە بایستیر بۆشایی‌یەکی گەورەی جێهێشت لەنێو ئەو نەوەیەی کەئازارو خەمەکانی جەنگی ناوخۆیان چەشتبوو.

هەروەها بۆشاییەکی بەجێهێشت لەنێو نووسەرە خاکیەکاندا کەنووسین لایان شێوازێکە لەجەخت کردن بۆ چەسپاندنی شوناسی کەسیەتی، نەك بۆ لەخۆبایی بوون. (خۆزیە ساراماغۆ)ی نووسەری پورتوگالی کە لەساڵی (1998)دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت لەبارەیەوە دەڵێت: (کۆچی دوایی گۆنتالۆ گورزێکی گران بوو.... مرۆڤ لەبەردەمی ئەم گورزەدا تەنها بێ دەنگی شك دەبات.. بێدەنگی ئەو مرۆڤەی کەڕۆشت‌و لەدوای خۆی کاریگەرییەکی گەورەی بەجێهێشت).

سەرچاوە/ رۆژنامەی "الحياة "

# "لویس بیگلی"

## به رای من: کتێبی (دادگایی کردن) ی فرانتس کافکا کتێبی ئەم سەدەیەیە

و/ تارا شێخ عثمان

لە راپرسییەکیدا رۆژنامەی (دەی سایت) ی ئەڵەمانی لە نووسەران و بیرمەند و سیاسەتمەدارانی بەناوبانگی جیهانی پرسیوە کام کتێبەی کە لە سەدەی بیستەمدا نووسراوە، کاری تێکردوون؟!

لەو کەسانەی کە وەڵامی ئەم پرسیارەیان داوەتەوە، نووسەرێکی هەنگارییە کە ناوی (لویس بگلی) یەو لە ساڵی (1913) دا لە هەنگاریا لەدایك بووە، یەکێ بووە لەو جوولەکانەی کە لە قەسابخانەکانی هیتلەر رزگاری بووە.

بیگلی لە رۆمانی (درۆکانی کاتی شەڕ) دا باس لە رووداوە راستەقینەکانی ئەوکاتانە دەکات، لەبەرهەمەکانی تری ئەو نووسەرە (بەو شێوەیەی کە ماکس رووداوەکەی دی)، (ئەو پیاوەی درەنگ هات)، (ئەشمیت و ماڵئاوا میستر)ە.

بیگلی لە شیکردنەوەی (دادگایی کردن) دا وێنەیەکی رەش و تاریکی جیهانی خۆرئاوا لە سەدەی بیستەم دا بەدەستەوە دەدات.

بەمەش دەبێتە کتێبێکی گرنگی سەدەی بیستەم. تێڕامانی زۆرتریش هەڵبژاردنەکەم ناگۆڕێ تەنها ئەوەندە نەبێت کە زیاتر وردبمەوە، هیچ کتێبێکی بە تەنها ئەو پایەیەی نیە، بەڵام بە حوکمی سادە روانین و خۆ بە بچووك زانین دەڵێم "دادگاییکردن" ی (کافکا) یەکێکە لە گرنترین کتێبەکانی سەدەی بیستەم.

یەکەم: لەسەر بەها ئەدەبییەکەی، شێوازی کافکا، ئەو تایبەتمەندییەی کە نووسینەکە نەمرئەکات، نموونەیەکی رۆشنی ئەم سەدە ترسناکەیە ئەو سەدەیەی کە هۆش و بیر لەوپەڕی سنوورەکانی شێتییەوە رێی لێوون بووە و گۆڕەپانی رۆشنی بیرکردنەوەیان تەنگ کردووە.

راز و نهێنیی شێوازی کافکا. لە (راستی گەرایی) وشکی (ئەو) و وەسفەکانی کافکا، راستەقینەن و دوورن لە هەر جۆرە پیاهەڵدانێکی سۆزداری، ئەمەش وا لە خوێنەر ئەکات، بابەتە سەرسوڕهێنەکان، پێکەنیناوییەکان و ئابڕووبەرەکان وەك رووداوێکی

راستی قبوڵ بکات. راکردن لەو راستی‌یەی کە (کافکا) دەری دەخات مەحاڵە. ڕووداوەکانی (دادگایی‌کردن) زۆرتر لە شوێنی تاریک دایە، کەش و هەوای دادگا لەخانوویەکی لە (لەوح) دروست کراودا، حاڵەتی پارێزەرەکە کە ناوی (هۆڵد)ە، ئەو کلێسایەی کە لەوێدا چیرۆکی یاسا دەگێڕدرێتەوە، ئەو هەموو دیمەن و وێنانە کە کافکا بەشێوەیەکی (فەنتازی) دروستی کردوون، لەو وێنانە دەچن کە ڕۆشناییەکی زۆریان داگیرکردبێت.

بەوشێوەیە ئەوەی دەبووایە لە تاریکی‌دا بە شاراوەیی بمێنێتەوە، ئاشکرا دەبێت و لەگیانی ئێمەدا تێکەڵەیەك لە شەرم و نەفرەت دروست ئەکات.

بەڵام لە راستیدا ئەوەی لە ئێمەدا هەڵئەقوڵێ و وامان لێ‌دەکات (دادگایی‌کردن) هەڵبژێرین و ئەو سیفەتە (کافکا)یی‌یە کە وەك (دانتەیی) یان (شەکسپیری) یە و بۆتە دەستەواژەیەکی باوی ناو خەڵکی رۆشنبیر.

(کافکا) لە هەموو بەرهەمەکانی‌دا بەگشتی و لە (دادگایی کردن" دا بەتایبەتی، لە هەموو نووسەرەکانی دیکەی هاوچەرخی خۆی زیاتر بە توانا بووە بۆ دەرخستنی چەپەڵی سەدەی بیستەم و زۆری قسە لەسەر ئەو برینانە کردووە کە مرۆڤ و کۆمەڵگای خۆرئاوا لە سەدەی بیستەمدا پێوەی ناڵاندوویانە.

هەریەك لە ئێمەش (خۆمان لە خودی – جوزف، ك–) دا دەبینینەوە کە پاڵەوانێکی کافکایە و هەروەکو ئەو کەم و زۆر بەهوشیاری‌یەوە بەدەست خەسارەتێکەوە ئەناڵێنین: ئەوەمان لەدەست چووە کە پشتمان قایم بێ بەوەی لەگەڵ هاوشێوەکانی خۆماندا لە کەشێکی ئارام بەخشدا بژین، دڵنیابوونی خۆمان لەدەست داوە، ڕێزگرتن لە دامەزرا و و یاساکان لەنێوچوون. پەیوەندیمان لەگەڵ (خودا) دا لەدەست داوە. شەرم ئەکەین، چونکە نازانین چۆن لەو تەنگانەیە دەرچین کە تێی کەوتووین.

هەرچەندە لەسەردەمی ئێمەدا مرۆڤ بە سواری موشەکەوە بەرەو مانگ سەفەر دەکا، (چەند زۆرن ئەوانەی بەرەو مەریخ دەڕۆن). هەرچەندە پێشکەوتن و داهێنان بەشێوەیەکی بەرفراوان لەبرەودایەو بێکۆتایی دێتە پێش چاو، بەڵام ئێمەش وەك (جۆزف ك) وا هەست ئەکەین کە جیهانی ئێمە لە رووی رەوشتەوە دووچاری نەخۆشی (ترس لەشوێنی تەنگ و تاریك) بووە.

ستەمگەری، کەمتەرخەمی و دوو روویی بۆتە یاسا و بنچینە. ئێمەش بۆ قوتاربوون لە تەنهایی تەنها ڕێگەیەك دەبینین، ئەویش پەنابردنە بەر پەیوەندی (سێکسی)یە.

ئێمە، سووکایەتی کردن بە مرۆڤەکان دەبینین: ئەو دیاردەیەی کە لە (دادگایی کردن) دا لەو شوێنەی کە (جۆزف. ك) وەك (سەگ ئەمرێ)، ئاشکرا دێتە پێش چاو، لە زۆربەی بەرهەمەکانی تری کافکاشدا، لەودیمەنەی کە (گریگۆر سامسا) دەبینین کەبۆتە مێروویەکی زەبەلاح)، لەوێدا کە سەگێك، مەیموونێك، ئاژەڵێکی بێناونیشان لە ئەشکەوتدا دەژی یان کۆمەڵێك مشك پاڵەوان و نوێنەری بۆچوونەکانی کافکان سەبارەت بە مەرجی مرۆڤایەتی، هەمان ئەو دیاردانە هێمای بەرجەستەیان هەیە.

ئێش و ئازاری (جۆزف. ك) هەروەك ئێش و ئازاری (ئەیوب) دەست پێ‌دەکات. (جۆزف. ك) ش بۆئەوەی هیچ کارێکی خراپ بکات. بەیانیەکی زوو کۆمەڵێك چواردەوری دەگرن و راپێچی زیندانی ئەکەن، زۆر زوو پەی بە دووخاڵی گرنگ دەبات یەکەمیان: کەسی نیە پەنای بۆ بەرێت. تەنانەت هاوڕێ‌یەتی‌یەکی پتەو شك نابات کە لەو ساتەدا و لەوکاتەی گومانی (تاوانبار) ی لێ‌دەکرێ فریای بکەوێت.

ڕێك دوای چەندین ساڵ. کاتێ مافی هاوولاتی‌بوون و خاوەنداریێتی لە جوولەکەکان سەندرایەوە، پەیوەندی زۆر کەس پچڕاو، هاوڕێو دراوسێ کۆنەکان لە بێدەنگی‌یەکی بەرد ئاسادا ئازاری جوولەکەکان و

ڕەوانــــەکردنیان بــــەرەو زیندانـەکانیان تەماشا دەکـرد. تەنانـەت هــەندێ جـاریش بـۆ دەستخۆشـیکردن و پشـتگیری ئـــەو کـــارە چەپەڵەشــــیان لـێدەدا.

دووەم: (ك) پــەی بـــەوە دەبرد زۆر زیانمەندە، مەسەلەی گرنـگ ئەوەنیـە لێپرســـراوانی دۆسیەکەی ئەم گەندەڵن و ئـەو یاسـایانەی کـە پشـتیان پـێ بەســـتووە، کـــەس لێیـــان تێناگات، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە (ك) ڕێگەی قوتاربوونی نیە و ناتوانێ داوای (ئیســتئناف) یـش بکـات. (ك) دووچـــاری ڕێکەوتێك بووە کە هیچ شتێکی دەربارە نازانێ. ئـەنجامی ئـەو بارودۆخەشی، هەست بە شـەرم کـردن و خۆبـە بچووك زانینـی، شـەرم و خـۆ بـە بچـووك زانـی (حورمـــەتی مـــرۆڤ بوونـــی (جـۆزف، ك) نـابود دەکـات و سەرەنجامیش دەیداتـە دەست مەرگ"

شـەرم دەبێتـــە ســـێبەری ســـەری (ك) و هـــەموو ئـــەو شتانەی کـە (ئـەو) دەربـارەی مرۆڤ بوونی خۆی فێری بـووە. ئەمەش لاوازی دەکات بەجۆرێك کـە نـەتوانێ لـە بەرامبـەر ئـەو کەسانەی هـاتوون بۆ بینینـــی جێبـــەجێکردنی حوکمـــی دادگاییکردنەکەی خۆی بگرێـت "ئەکتـەری پـیرو بـێ بایـەخیان ناردووە بۆلام"

لـــە ســـەرەمەرگیش دا حـاڵێکی وای هەیـە کـە "وەك بڵـێی لـەدوای مردنیش شـــەرم کۆتایی نەبێت"

من نـاڵێم (کافکا) کاتـێ لـە ساڵی (1914) دا دەستی کـرد بە نووسینی (دادگایی کردن)، پێشـــــبینی ئــــــاپۆرەی قوربانییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی دەکرد، بـەڵکو لـەوە زیـــاتر، پێشـــبینی ئـــەو ڕووداوانەشی کرد کـە لـە دوو دەیـەی دواتریـش دا ڕوویـاندا، شێتیی هیتلـەر و پاشان ئـەو دارمانـە ترسـناکانەی کـە لـە پـەیوەندیی مرۆڤـەکاندا هاتـە ئاراوە ئەوەش لە ئەنجامی ئـەو کارەساتانەدا بوو کە (ستالین و ماوتسـیۆنگ و پۆلپـــۆت) بـــۆ میللەتـەکانی خۆیانیـــان کـــردە دیاری.

بـەڵام کافکـا بـە (هەسـتی) خـــۆی و هۆشـــیاریـیە لەڕادەبەدەرەکەی لە (پراگ) ی ئاشووب دیـدەی پێش جـەنگی جیهانی یەکـەمدا، تـامی ئـەو ڕەگەزانـەی دەکـرد کـە بـۆ بەرجەســــــــــتەکردنی دووربینییەکانی خۆی پێویستی پێیان بوو.

پاشـانیش دەرکـەوت کـــە دووربینـــی (ئـەو) پێشـبینی ڕاسـتیەك بـووە کــە خـــۆی نەیبینی.

(کافکا) لــە (دادگـاییکردن) دا بـــەهۆی زیرەکییەکــــەی خۆیـــەوە و بـــەو شـــاکارەی (جیــــــهانی خـــــەیاڵ) و بەرجەسـتەترین ئەفسـانەکانی سـەدەی بیسـتەم دەنگێکـــی بەرزی بەخشیە دووربینییەکەی خۆی.

لە گۆڤاری (نگاه نو) ژمارە (40)

وەرگــێڕە بــەڕێزەکان ئاگـــادار دەکـــەین کـــە لـــەژمارەکانی داهـــاتووی (ســـەردەم)دا ئـــەم فایلانـە دەکەینـەوە، چـاوەڕێین بەوەرگێڕانی بابـەتی هـەڵبژاردەو نـوێ لـەم فایلـە تایبەتانـــەدا بەشداری بکەن:

1- فایلی تایبەت بەفەیلەسوفی گەورە (فریدریك نیچە)ە.
2- ئیگزستانسیالیزم (وجودیەت).
3- بونیادگەری.
4- ئەفسانە.
5- قوتابخانەی فرانکفۆرت.
6- ڕەخنەی ئەدەبیی نوێ.
7- ناسیۆنالیزم.
8- جیهانگیری.
9- دیموکراسی.

